# تەفسیری ڕەوان

## (بۆتێگەیشتنی قورئان)

نوسینی :

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەرگی (دەیەم)

جزمی (٢٨، ٢٩، ٣٠)

# تەفسیری ڕەوان

(بۆ تێگەیشتنی قورئان)


نوسینی:

**مەلا مەحموودی گەلاڵەیی**


بەرگی ﴿دەیەم﴾

جزمی ﴿٢٨، ٢٩، ٣٠﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★.★


**ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان**

**نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی**

**تیراژ: ٢٠٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردن: (٢١٤٠)ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.**

**چاپو دیزاین: (سامان محمد أمین).**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی المجادلة

ئەم سورەتە مەدەنییەو (٢٢) ئایەتە لە (الكلبی )یەوە ریوایەت کراوە: کە ئەم سورەتە هەمووی لە مەدینە نازڵ بووە جگە لەئایەتی ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾ ئەو لە مەککە نازڵ بووە .

عەطا دەڵێ: (١٠) ئایەتی یەکەمی سورەتەکە مەدەنین‌و ئەوانی تر مەکین.

ناوی لێ نراوە (المجادلة) چونکە بە ئایەتی ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا....﴾ دەستـــــتی پێ کردوە.

باسی سەرەکی ئەم سورەتە وەکوو زۆربەی سورەتە مەدەنییەکان ئەحکامە شەرعییەکان ڕون دەکاتەوە، حوکمی ظیهارو کەفارەتی ظیهارکردن‌و حوکمی قسەکردن بە سرتە سرت‌و ئەدەبی کۆڕو مەجلیس‌و بەخشینی کەمێك لە ماڵ‌و سامان پێش ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەروەها حوکمی دووڕوویی‌و سزای تاوانەکانیان‌و دۆستایەتی لەگەڵ دوژمنانی خودا ڕون دەکاتەوە. سەرەتا بە باسی ظیهار دەست پێ دەکا.

### حوکمی ظیهارکردن‌و کەفارەتەکەی

﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿١﴾ الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا الَّتِي

وَلَدْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتە: حاکم لە عائیشەوە ریوایەتی کردوە کە دەفەرمووی: پاك‌و مونەززەهی بۆ ئەو خودایەیە کە هەموو شتێك دەبیستێ، من گوێم لە قسەکانی خەولەی کچی ثەعلەبە بوو برێکی تێگەیشتم‌و لە برێکی حاڵی نەبووم، دەمزانی: کە لەلای پێغەمبەرﷺ شکات لە مێردەکەی دەکا، گوێم لێ بوو دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! گەنجی بردم لەگەڵیا پیرو خەرِو بوم، چەند منداڵم لێی بوون. ئێستا کە پیر بووم لەسك‌و زا وەستاومەوە ظیهاری لێ کردم، خودایە! من شکاتی خۆم لای تۆ دەکەم. ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو حەزرەتی جوبرائیل هات ئەم ئایەتانەی بۆ پێغەمبەرﷺ هێنان.

ئیمام ئەحمەدو بوخاری‌و ئیبن‌و ماجەو بەیهەقی ئەم ریوایەتەیان بە هەندێ جیاوازییەوە ریوایەت کردوە، بوخاری لەتاریخەکەیدا ریوایەتی کردوە دەفەرموێ:

خاتو خەولە رۆژێك لە رێگادا حەزرەتی عومەری وەستاند، هەندێ قسەی توندی ئاراستە کرد، پیاوێك وتی: ئەی فەرمانڕەوای موسولمانان! بۆ ئەوەندە گوێت بۆ ئەو پیرەژنە گرتو ئەوەندە لەگەڵیا نەرم بووی؟ قەت وام نەدیوی! عومەر فەرموی: چۆن گوێی بۆ ناگرم ئەمە ئەو ئافرەتەیە خودا گوێی لە وتەکانی بوو، دەربارەی ئەو، ئایاتی قورئانی نازڵ کردوە !!

دیاردەی ظیهار لە سەردەمی پێش ئیسلامدا باو بوو، ئەوە بوو مێرد لە سەر شتێك رقی لە خێزانەکەی هەڵدەستاو پێی دەگوت: تۆ وەکوو پشتی دایکم وای بۆ من، ئیتر بەمە ژنەکەی لێ حەرام دەبوو، تەلاقیشی نەدەکەوت! بەم جۆرە ئەم ئافرەتە لە ماڵی مێردەکەی دەمایەوە، بۆ یەکتر حەلاڵ نەبوون تا پەیوەندی ژنو مێردی خۆیان ئەنجام بدەن، تەلاقیشی نەدەکەوت تا ئافرەتەکە رێگا چارەیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. ئەمەش جۆرە چەوساندنەوەیەکی تر بوو لەو سەردەمە نەفامییەدا ئافرەتی پێوە گیرۆدە بووبوو.

کە ئایینی ئیسلام هات ئەم روداوەی (ظیهار) لە نێوان خەولەو مێردەکەی: کە ئەوسی کوڕی صامیت بوو رویدا، تا ئەو کاتەش لە ئیسلامدا حوکمی ظیهار دیاری نەکرابوو. ئیتر ئافرەتەکە هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ روداوەکەی نێوان خۆیو مێردەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەم بارەوە تا ئێستا هیچ نیگاوو سروشم بۆ نەهاتووە، رەنگە لێی حەرام بووبی..

وتی: قوربان! ئەو باسی تەلاقی نەکرد، چەند جارێك لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کەوتە جیداڵەوە. دوایی گوتی: خودایە من شکاتی خۆم لای تۆ دەکەم، شکاتی بێ کەسیو تەنیاییو خەمو پەژارەیو کۆست کەوتویی خۆم لای تۆ دەکەم، وتی: خودایە من ئێستا کۆشێك منداڵی وردم هەن، ئەگەر لای مێردەکەم بمێننەوە دەفەوتێن، ئەگەر بیان هێنمە لای خۆم بۆم بەخێو ناکرێنو برسیان دەبێ، ئیتر سەری بۆ لای ئاسمان بەرز کردەوەو دەپاڕایەوەو دەیگوت: خودایە من شکاتی خۆم لای تۆ دەکەم. ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو پێغەمبەر ﷺ نیگای بۆ هاتو

حوکمەکەی دیاری کرا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی خەولە مژدەت لێ بێ دەربارەی خۆت و مێردەکەت ئایاتی قورئان نازڵ بوو ئەمجار ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ﴾ی بۆ خوێندنەوە.

﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خودا دوعاو نزای ئەو ئافرەتەی قبوڵ کرد: کە دەربارەی کێشەی نێوان خۆی و مێردەکەی گفتوگۆی لەگەڵ تۆ کرد، ئەی پێغەمبەر! شکاتی وەزعو حاڵی خۆی لای خودا کردو خودا گفتوگۆی نێوان تۆو ئەوی بیست کە لەو بارەوە گفتوگۆتان کردو دەتانەویست رێگا چارەیەك بۆ دەرچوون لەو کێشەیە بدۆزنەوە. بێگومان خودا شنەوایەو هەموو قسەیەك دەبیسێ، هەموو شتێك دەبینێ و هیچ شتێکی لێ گوم نابێ. ﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلاَّ اللاَّئِي وَلَدْنَهُمْ﴾ ئەوانەی لە ئێوە ـ ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان ـ ظیهار لەگەڵ ژنەکانیان دەکەن، ژنەکانیان دەشوبهێنن بە دایکیان و بەم جۆرە یەکێك بە ژنەکەی دەڵێ: تۆ وەکو پشتی دایکم وای بۆ من، واتە: لێم حەرامی. وەکو چۆن دایکم لێم حەرامە. ئەوانە بە هەڵە چوون، درۆیەکە دەیکەن، بەو قسە پڕوپوچە ژنەکانیان نابن بە دایکیان. دایکیان ئەوانەن کە بە وەلەدیان هێناون. ناشێ ئەوانە ژنەکانیان بشوبهێنن بە دایکەکانیان.

﴿وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَراً مِنَ الْقَوْلِ وَزُوراً وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ بێگومان ئەوانەی ظیهار دەکەن بەم جۆرە مێرد بە ژنەکەی دەڵێ: تۆ وەکوو پشتی دایکم وای بۆ من، قسەیەکی ناشرین و قێز لێکراو دەڵێن: قسەیەك دەڵێن: شەرع بە ڕەوای نازانێ و عەقڵ وەری ناگرێ و درۆیەکی شاخدارەو بوختانێکە دەیکا. بێگومان خودا لێ بوردنی زۆرەو لێخۆشبووە، کەفارەتی دیاری کردووە بۆ ئەوەی لەو تاوانە رزگارتان بێ. هەروەها لە تاوانی رابوردوتان خۆش دەبێ ئەگەر تۆبە بکەن، ئەگەر مەیلی بێنێ بەبێ تۆبە کردنیش لێتان خۆش دەبێ.

ئەمجار حوکمی ظیهار دیاری دەکاو دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾ ئەوانەی ظیهار لەگەڵ ژنەکانیان دەکەن، بەناحەق حەڵاڵ لەخۆیان حەرام دەکەن، دوایی پەشیمان دەبنەوەو دەیانەوێ پەیوەندی ژن و مێردایەتی لەگەڵ ژنە ظیهار لێ کراوەکەی ئەنجام بدا، دەبێ پێش ئەوەی بچێتە لای، بەندەیەك ئازاد بکا، بۆ ئەوەی ببێتە کەفارەت و قەرەبوو کردنەوەی ئەو قسە ناشرین و بوختانەی کردویەتی. هەتا کۆیلەیەك ئازاد نەکا نابێ بچێتە لای ژنەکەی و نابێ لەگەڵیدا جوت ببێ.

﴿ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ ئەو حوکمە دیاریکراوە، یان دانانی یاسای کەفارەت، ئەوەیە کەفەرمانتان پێ دەکرێ پابەندی بن. یان دەتانگێڕێتەوە لەوەی ظیهار لەگەڵ ژنەکانتان بکەن. بێگومان خودا ئاگادارە بەکردەوەکانتان و هیچی لێ گوم نابێ و ڕۆژی قیامەت سزاو پاداشتان دەداتەوە، هەرکەسەو بەگوێرەی کردەوەی خۆی.

﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾ کەسێك نەیتوانی بەندە ئازاد بکا، یان دەستی نەکەوت ئەوە دەبێ دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژو بێ بەبێ نێوان، ئەمجار بۆی ڕەوایە بچێتە لای ژنەکەی و پەیوەندی ژن و مێردایەتی لەگەڵدا ئەنجام بدا.

﴿فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً﴾ ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك نەیتوانی دوو مانگ بەڕۆژو بێ، ئەوە پێویستە لەسەری خۆراکی شەست فەقیر و هەژار بدا، بەگوێرەی کە لەکتێبە شەرعییەکاندا شی کراوەتەوە.

﴿ذَلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەو حوکم و یاسایەی ڕونمان کردەوە دەربارەی کەفارەتی ظیهار بۆ ئەوەیە شەریعەتی خودا بەڕاست بزانن و پابەندی فەرمان و جڵەو گیرییەکانی بن، شوێن پەیامی پێغەمبەر بکەون، لە چوار چێوەی یاساو شەریعەتی خودادا کار بکەن. دیاردەی

ظیهار لە ناوخۆتاندا نەهێڵن، کەدابو نەریتێکی ناشرینو درۆو بوختانێکی گەورەیە. ئەو حوکمانەی بۆمان رون کردنەوە سنوری خودان، لێیان دەرمەچن، پێیانەوە پابەندبن، ئەوە پێتان راگەیەندرا کە ظیهار تاوانە، کەفارەتەکەی دەبێتە مایەی لێبوردنو لێخۆشبونی خودا، هەیە بۆ ئەو کافرانەی لە سنووری خودا دەردەچن عەزابی بە ئێشو دژوار کە عەزابی دۆزەخە لە قیامەت دا، کەوابێ ئێوە خۆتان توشی ئەو عەزابە مەکەنو لەسنوری شەریعەتی خودا دەرمەچن.

## هەرِەشە لەوانەی دوژمنایەتی خوداو پێغەمبەری خودا دەکەن

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ كُبِتُواْ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ وَقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٥﴾ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ أَحۡصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٦﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجۡوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمۡ وَلَا خَمۡسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمۡ وَلَآ أَدۡنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمۡ أَيۡنَ مَا كَانُواْۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ ﴾

لەوەپێش ئەحکامی ظیهاری لە شەریعەتی ئیسلام دا بەیان کرد، سەر زەنشتی ئەوانەی کرد کە کەوتونەتە ئەو هەڵەیەوە، مەدحی ئەو خاوەن باوەڕانەی کرد کە لەسنوری خودا دەرناچن، ئەمجار باسی ئەو عەزاب و سزایە دەکا کە توشی ئەوانە دەبێ دژایەتی فەرمانی خوداو پەیامی پێغەمبەری خودا دەکەن، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ بێگومان ئەوانەی دوژمنایەتی خوداو پێغەمبەری خودا دەکەن، پێچەوانەی شەریعەت و یاسای خودا هەڵس و کەوت دەکەن، زەلیل و ریسوا دەکرێن نەفرینیان لێ دەکرێ، وەکوو کافرو بێ بڕواکانی گەلە پێشینەکان ریسواکراون و نەفرینیان لێ کراوە بەهۆی دژایەتی کردنیان بۆ فەرمانی خودا، بێگومان ئەم هەڕەشەیەی پەروەدگار هاتە دی، موشریکەکانی مەککە بەکوشتن و بەدیلکردن و تێکشکاندنیان لە غەزای بەدرو غەزای خەندەقدا ریسوا بون، لەقیامەتیشدا سزای دۆزەخ چاوەڕێیانە.

واوەیلا بۆ ئەو فرمانڕەواو کاربەدەستە بەناو موسوڵمانانەی شەریعەتی خودا پاشگوێ دەخەن و نایکەنە یاساو دەستووری وڵات و کاروباری موسوڵمانانی پێ بەرێوە نابن. یاسای دەستکردی فەرەنسی و رۆمانی دەکەنە دەستورو قانونی خۆیان!

﴿وَقَدْ أَنْزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُهِينٌ﴾ بێگومان ئێمە ئایاتی ئاشکراو شەریعەتی ئایابمان بۆ ئادەمیزاد ناردوەتە خوار، بۆ ئەوەی بیکەنە یاسای خۆیان و بەگوێرەی ئەو شەریعەتە کاروباری خۆیان هەڵسورێنن، کەسێك کافرو ستەمکار نەبێ پێچەوانەی ئەو شەریعەتە ناجوڵێتەوە، ئەوانەی ئینکاری ئەو شەریعەتە دەکەن، لوتبەرزیی دەنوێنن لەروی پابەند بوون بە شەریعەتی خوداوە، عەزابی بە ئێشیان بۆ دیاری کراوە لە دونیادا ریسواو نەفرین، لەقیامەت دا عەزابی دۆزەخ بۆ هەتاهەتایە.

﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ ئەی پێغەمبەر سام و هەیبەتی ئەو رۆژە بخەرە پێش چاو، هەواڵ بەو

کافرانـە بـدە کـە عـەزابی ریـسوکەریان هەیـە لـەرۆژێك دا خـودا حەشـری هـەموو ئـادەمیزاد دەکـا، هـەمووانیان لـە سـارای مەحـشەردا کۆدەکاتـەوە، کـەس نـابوێرێ و کەسی لەبیر ناچێ، ئەمجار هەواڵی کردەوە خراپەکانیان دەداتێ کە لە ژیانی دونیادا ئـەنجامیان داوە، هەرچـی کردویانـە لـەخێرو شـەڕ دەیخاتـەوە بـەر چـاویان، خـودا تۆماری کردوەو لەسەری نوسیون، ئەوان لەبیریان چۆتەوە، خودا بـە سـەر هـەموو شتێکدا ئاگادارەو هیچی لێ گوم نابێ و هیچی لەبیر ناچێتەوە.

﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلاثَةٍ إِلاّ هُوَ رَابِعُهُمْ وَلا خَمْسَةٍ إِلاّ هُوَ سَادِسُهُمْ وَلا أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْثَرَ إِلاّ هُوَ مَعَهُمْ أَيْـنَ مَـا كَانُوا﴾ ئەتۆ نازانی ئـەی پێغەمبـەر! (هـەروا هـەر کەسـێك شـیاوی خیطـاب لەگـەڵ کردنە)، نابینی زانیاری خـودا فـراوان و شـامیلە، هەرچـی لـە نـاو ئاسمانـەکان و نـاو زەویدا هەیە کۆنترۆڵی کردوە. بەجۆرێك هیچی لێ گوم نابێ و لێـی تێـك ناچـێ، لـە هەر شوێنێك سێ کەس بەیەکەوە سرتە بکەن، خودا بەعیلم و زانیاریی خۆی ئاگای لێیە، ئەگەر پێنـج بـن خـودا شەشـەمیانەو ئاگـاداری هـەموو هەسـت و نەسـتێکیانە، سرتەو ورتەیان دەبیستێ، سرتەکەرەکان کەمتربن یان زیاتربن و بگەنە ملیارەهاش خودا هەر ئاگای لێیانەو هیچی لێ تێـك ناچـێ و گـوم نـابێ. چـونکە زانیـاریی خـودا داگرنـدەی هەموو شتێکەو هیـچ شـتێك لـەژێر کـۆنترۆڵی دەرناچـێ. زەمـان و مـەکان نابنە لەمپـەڕ و کۆسـپ لـە بـەردەم زانیـاریی بـەرفراوانیدا. وێـڕای ئـەوەش هـەموو ئادەمیزادێك دوو فریشتە بەسەریەوەن چی دەکاو چی دەڵێ لەسەری تۆمار دەکەن!

نمونەی ئەم ئایەتە لەقورئاندا زۆرە وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ وَأَنَّ اللّهَ عَلاّمُ الْغُيُوبِ﴾ (التوبة/٧٨) یـان دەفـەرموێ: ﴿ أَمْ يَحْـسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ (الزخرف/٨٠).

پەروەدگار بەزانیاریی خۆی و بیستن و دیتنی بۆ هەموو شتێك، ئاگادارە بەسـەر هەموو کاروبارێکی مەخلوقاتدا، دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَـا عَمِلُـوا يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ إِنَّ

اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پاشان خودا ڕۆژی قیامەت خەبەری تەواوو بێ پێچو پەنا دەداتە بەندەکانی بەکردەوەکانیان، بۆ ئەوەی بزانن کە خودا ئاگاداری کردەوەکانیانە، هەست بکەن کە هەموو سرتەو ورتەیەکیان لای خودا ئاشکراو عەیانە، بێگومان خودا زاناو ئاگادارە بە هەمووشتێك.

## سزای سرتەکردن بەخراپە، داب ونەریتی سرتە کردن لەقورئان

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ ۚ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا النَّجْوَىٰ مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾﴾

دوای بەیانکردنی ئەوە کە خودا ئاگاداری هەموو شتێکە، سرتەو ورتە دەبیستێ، ئەمجار حاڵو وەزعی ئەو جولەکەو دووڕوانە دیاری دەکا کە نەهیان لێ کرابوو لەوەی سرتەسرت بکەنو پیلانو موئامەرە دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی دابڕێژن، هەروا نەهی ئەوەشیان لێ دەکا کە بەناشرینی سڵاو لەپێغەمبەر بکەن، بەمجۆرە لەجیاتی (السلام علیکم) بڵێن: (السام علیکم) ئەمجار فەرمان بە خودا پەرستان دەکا کە سرتەو قسەی نهێنیان بریتی نەبێ لەسەر پێچی پێغەمبەر ﷺ بەڵکوو پێویستە سرتەو قسەی نهێنیان بریتی بێ لەتەقواو خوداپەرستی. دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنْ النَّجْوَى ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ﴾ ئایا ئەتۆ ناڕوانیو نابینی ئەوانەی نەهیت لێ کردبوون کەواز لە سرتەسرتو پیلان دانان دژی موسوڵمانان بێنن، واز لە فسکە فسکو وتی وتی بێنن. کەچی دوایی دەگەڕێنەوە سەر ئەو کارە ناشیرینو بەد ڕەوشتییەی پێشوویانو سەرگەرمی پیلان دارشتنو نانەوەی ئاژاوەو سرتەسرتی گوماناوین، دژی کۆمەڵی موسوڵمانو سەرپێچکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ هەڵنانی کەسانی دیکە بۆ گرتنە بەری ڕێبازی دژایەتیکردنی پێغەمبەر ﷺو موسوڵمانان.

﴿وَيَتَنَاجَوْنَ بِالإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَةِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ﴾ تەنانەت کاتێك دێن سڵاوت لێ دەکەن وشەی سڵاوەکە دەگۆڕن بۆ ئەوەی مانایەکی خراپ ببەخشێ، بەجۆرێك سڵاوت لێ دەکەن کە خودا بەو جۆرە سڵاوی لێ نەکردوی، ئەوان دێن دەڵێن: (السام علیکم) واتە: مردن بۆ ئێوە بێ!! پێغەمبەر ﷺ بە وشەی (وعلیکم) وەڵامی دەدانەوە.

لەصەحیحی بوخاریو موسلیم دا هاتوە عائیشە دەفەرموێ: کۆمەڵێك جولەکە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان (السام علیك یا أبا القاسم) پێغەمبەر ﷺفەرموی (وعلیکم) واتە لە سەر ئێوەبێ. عائیشە دەڵێ: منیش وتم: ئێوە مردنتان لەسەر بێ نەفرینو عەزابی خوداتان لێ بێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی

عائیشە لەسەرە خۆبە، توند رەوی مەکەو زێدە مەڵێ: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا نابیستی چی یەژن؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەی ئەوە نیە منیش بە (وعلیکم) وەڵامم دانەوە، ئیتر ئایەتی ﴿وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ﴾ نازڵ بوو.

﴿وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ﴾ لە دڵی خۆیاندا دەڵێن. ئەگەر موحەممەد پێغەمبەر بوایە خودا لە سەر ئەم سرتە سرتو پیلان دانانە دژی موحەممەدو سڵاو لێ کردنمان بەو جۆرە سزای دەداین و لەدونیادا توشی تەنگو چەڵەمەی دەکردین، چونکە خودا نهێنی دەزانێو سرتە دەبیستێ. ئاگاداری نیازو مەبەستمانە. ئیتر پەروەدگار پێیان دەفەرموێ: ﴿حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەوانە دۆزەخیان بەسە، سزای تاوانەکانیانمان بۆ رۆژی قیامەت هەڵگرتووە، ئەو رۆژە توریان دەدەینە ناو دۆزەخەوە ئیتر بۆ خۆیان دەزانن چییان بەسەر دێ. دۆزەخ خراپ شوێنێکە کە دەبێتە جێگای حەوانەوەیان.

ئەمجار پەروەدگار ئادابی سرتەو قسەی نهێنی فێری موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَةِ الرَّسُولِ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان، ئەگەر رێکەوت لە کۆڕو مەجلیسدا لە بەر چاوی خەڵك قسەی سرتەو پەنامەکیتان کردن، وەکوو جولەکەو موناقیقەکان مەکەن سرتەو قسە نهێنیەکانتان بریتی بێ لە تاوانو سەرپێچیکردنی فەرمانی پێغەمبەرو پیلان دانان دژی ئایینی خودا.

﴿وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ ئەگەر بەسرتە ئاخاوتنتان ئەنجامدا، باسرتەکەتان بریتی بێ لە خودا پەرستیو خێرو خۆپاراستن لە هەموو شتێك کە دەبێتە هۆی نارەزامەندی خودا لێتان، ئێوە هەمووتان رۆژی قیامەت بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە. ئەو کاتە هەواڵتان دەداتێ چیتان کردوەو چیتان گوتووە.

بوخاریو موسلیمو تیرمیذیو ئەبو داود لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەتی کردوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی‌ەتی: (إذا كنتم ثلاثا فلا يتناج اثنان دون الثالث الا باذنه فان ذلك يحزنه) ئەگەر سێ کەس بوون با دوتان بە سرتە قسە نەکەن بەجۆرێك کەسی سێیەم گوێی لێ نەبێ مەگەر ئیزن بدا، چونکە ئەوە دڵی دەگوڕێو خەفەتی پێ دەخوا.

﴿إِنَّمَا النَّجْوَى مِنْ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ شَيْئاً إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّـهِ﴾ سرتە سرتو پیلان دارشتن بە دزییەوە دژی ئیسلام، سەرپێچیکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بەختوکەو دەنەدانی شەیتانە، ئەو کارە لە دڵی جولەکەو دوڕوو هەواخواهەکانیاندا شیرین دەکا، بۆ ئەوەی دڵەڕاوکێو خەم وخەفەت بخاتە دڵی موسوڵمانانەوە، وایان دەخاتە بەر چاو کە ئەو گومڕایانە خەریکی پیلان دارشتنن دژیان. جاخۆ شەیتان یان سرتە سرتو وتەوت زیان بە خودا پەرستان ناگەیەنێ، مەگەر بەئیرادەو ویستی خودا!

﴿وَعَلَى اللَّـهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ﴾ با موسوڵمان پشت هەر بەخودا ببەستنو تەوەکولیان لەسەر ئەوبێ. پەنا بەزاتی ئەو بگرن لە وەسوەسەی شەیتانو فرتو فێڵی.

وا دیارە لەو سەرو بەندەدا، هەندێ لە موسوڵمانەکان لەوانەی هێشتا دڵو دەرونیان بەهەستی تەنظیمی ئیسلامی جۆش نەدرابوو، کە هەواڵێکی گرنگ دەبیسترا کۆمەڵ کۆمەڵ دەبوون، بۆ ئەوەی لە ناو خۆیانداو دوور لە چاودێری سەرکردایەتی وتو وێژی نهێنیو مەشورەت بکەن، ئەمەش سروشتی کۆمەڵگای ئیسلامیو تەنظیمی ئیسلامی پەسندی ناکا، چونکە بەگوێرەی بەرنامەی ئیسلامو یاسای رێکخستنو دامەزراندنی کۆمەڵگای ئیسلامی پێویستە هەموو فکرەو بیروڕایەك سەرەتا ئاڕاستەی سەرکردایەتی بکرێو کۆڕو کۆبونەوەی لاوەکی ئەنجام نەدرێ، بەتایبەت وادەبوو هەندێ لەو کۆڕو کۆبونەوانە گێژاوو بەلبەلەی لێ

دەکەوتــەوەو کۆمــەڵگای ئیــسلامی دەخــستە دڵــە راوکێــوە، هــەر چــەندە سرتەســرتکەرەکان ئەوەشــیان مەبەســت نــەبوبێ، وەلێ تــەنها وروژانــدنی بــاس‌و خــواس‌و وتوێــژکردن دەربــارەی رووداوەکــان‌و دەربڕینــی بــیروڕا دەربارەیــان بــەبێ زانیــاری ســەرکردایەتی لەوانــەبوو ســەر بکێــشێ بــۆ زیانگەیانــدن بــە موســوڵمانان‌و سەرپێچی کردنی فەرمانی سەرکردایەتی.

## ئەدەبی کۆڕو مەجلیس لەئیسلامدا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١١﴾ ﴾

قــەتادە دەڵێ: ئــەم ئایەتــە دەربــارەی کــۆڕە زیکرییــەکانی پێغەمبــەر ﷺ نــازڵ بووە، ئەوە بوو هاوەڵانی کە دەیان بینی وایەکێك دێ بۆ کۆڕەکەیان بەرچاویان تەنگ دەبوو، یان بڵێین پەرۆشی مەجلیسەکەیان بوو چونکە جێگایان نەدەبوو، نەشیان دەویست کۆڕەکە جێ بێڵن‌و ئەوان لە شوێنیان دانیشن. ئیتر پەروەدگار لەم ئایەتــەدا فــەرمانی پــێ کــردن کــە جێگــا بــۆ یــەکتری بکەنــەوەو کۆڕەکــە بــەرفراوان بکەن. کەمێك خۆیان کۆبکەنەوە، بۆ ئەوەی جێگای کەسانی دیکەش بێ.

موقاتیل (ئیبنو حەییان) دەڵێ: ئەم ئایەتــە رۆژی هــەینی دابــەزیوە، ئــەو کاتــە پێغەمبەر ﷺ لە صوففە بوو، شوێنەکە تەنگە بەر بوو، ئامادەبووانی غــەزای بــەدر لە کۆچکەران‌و یارمەتیدەران رێزێکی تایبەتیان هەبوو، هەندێ لە بەدرییەکان هاتن

بۆ کۆڕەکەو کەسانی دیکە پێش ئەوان شوێنیان گرتبوو، بەدریەکان هاتن بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ بە پێوە وەستانو وتیان: (السلام علیکم أیها النبی ورحمة الله و برکاته) پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دانەوە، پاشان سڵاویان لە دانیشتوەکان کرد، وەڵامیان درایەوە..

ئەمجار لەسەر قاچ وەستان، چاوەڕێ بوون جێگایان بکرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ زانی کە جێگایان ناکەنەوە، پێی ناخۆش بوو، ئیتر بەکۆچکەران و یارمەتیدەرانی فەرموو (لەوانەی بەدری نەبوون) فلان هەڵسە، فیسار تۆش هەستە، ئیتر بە ئەندازەی هاتووە بەدرییەکانی بە پێوە بوون دای نیشاندن، ئەوانەی هەڵسێنرابوون پێیان ناخۆش بوو، پێغەمبەر ﷺ لە دەمو چاویانەوە هەستی بە نارەزاییان کرد.

دوڕووەکان وتیان: باشە ئێوە نالێن: ئەم پێغەمبەرەی ئێمە عەدالەت بەکار دێنێ لەناو مەردمدا؟ وەڵلاهی ئێستا ئێمە عەدالەتمان لێ نەدی، کۆمەڵێك دەست پێشخەرییان کردوەو شوێنی خۆیان گرتووەو پێیان خۆشە لە نزیك پێغەمبەرەکەیانەوە دانیشن، کەچی هەڵیساندنو کۆمەڵێك کە دواکەوتون لەشوێنی ئەوان داینیشاندن...

ریوایەت کراوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە کەسێك جێگا بۆ براکەی دەکاتەوە. ئیتر هاوەڵان خێرا راست بوونەوەو جێگایان بۆبراکانیان چۆڵ کرد ئیتر ئەو رۆژە رۆژی هەینی بوو ئەم ئایەتەی تێدا نازڵبوو.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحْ اللَّهُ لَكُمْ﴾

ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەخوداو بەپێغەمبەری خودا هەیە، ئەگەر داوایان لێ کردن کۆڕو مەجلیستان بەر فراوان بکەنو جێگای کەسانی دیکە بکەنەوە لەگەڵتان دابنیشن، بەگوێیان بکەن، با جێگەی خەڵکی تریش ببێتەو، ئەگەر وابکەن خودا گوشادی دەخاتە شوێنی کۆڕو مەجلیستان، دڵتان فراوان دەکا، رزقو رۆژیتان خێرو بەرەکەتی تێ دەکەوێ..

ئایەتەکە گشتییە هەموو کۆڕو کۆمەڵێك دەگرێتەوە کە موسوڵمانان بۆ خێرو پاداشت تێیدا کۆبوبنەوە، کۆڕی جەنگ بێ یان ذیکرو خوداپەرستی بێ، یان فێربونو فێرکردن بێ، یان نوێژی هەینیو جەژن بێ.

بەکورتی هەرکەسێ ئاسانکاری بۆ برای موسوڵمانی بکا، ویسعەتو شادی پێ ببەخشێ، یارمەتی بداو هاریکاری بکا لەسەر خێرو چاکە، خودا خێرو بەرەکەتی دونیاو قیامەتی بەسەردا دەڕێژێ. هەرکەسێك دەروێك لە برای موسوڵمانی بکاتەوە خودا دەروی خێری لێ دەکاتەوە.

ئیمامی موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووێەتی: کەسێك یارمەتی نەبوو بیدا، تەنگانە لەسەر برای موسوڵمانی سوك بکا، خودا لە دونیاو قیامەت تەنگانەی بۆ رەها دەکاو لە ناخۆشیو چورتمدا یارمەتی دەدا، خودا یارمەتی دەری بەندەی خۆیەتی بە مەرجێ بەندە یارمەتی برای خۆی بدا لەسەر خێرو چاکە.

بێگومان پابەندبوون بەم ئەدەبە ئیسلامییەوە کاریگەرییەکی مەزنی هەیە لە رواندنو چاندنی خۆشەویستیو رێز لێنان لەناو دڵەکاندا. دابو نەریتێکی جوان وکردارو رەفتارێکە خۆشەویستی لەناو موسوڵماندا بڵاودەکاتەوە.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێشبرکێیان دەکرد بۆ ئەوەی لەنزیك پێغەمبەرەوە دانیشن، فەرمایشتی لێ ببیستنو سود لە ئەدەبو هیدایەتی وەربگرن.

ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێ بچوبایە بۆ کۆڕو مەجلیس، لە کوێ جێگا هەبوایە لەوێ دادەنیشت، وەلێ لەهەر لایەکی مەجلیسەکە تەشریفی دابنیشتایە کۆڕو مەجلیسەکە روی لەو دەکرد. وا باو بوو هاوەڵان بەپێی پلەو پایەیان لە خزمەتیدا دادەنیشتن، ئەبوبەکر لەلای راستیو عومەر لەلای چەپیەوە، زوربەی کات عوثمانو علی لەبەر دەمیا رۆ دەنیشتن، چونکە لەنوسەرەوەی نیگاو سروش بوون. وا دەبوو خۆی ﷺ فەرمانی پێ دەکردن لەبەر دەمیان دانیشن.

موسلیمو ئەحمەدو (اصحاب السنن) جگە لە تیرمیذی لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی‌ەتی: (لیلي منکم اولو الاحلام والنهی ثم الذین یلونهم ثم الذین یلونهم) با خاوەن ڕەئیو عاقڵمەندو زیرەکەکانتان لێم نزیك بن، ئەمجار ئەوانەی پلەیەك لەوان خوارترن، پاشان ئەوانەی لەمانیش پلەیەك نزم ترن. ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا بەباشی ئەوەی دەیفەرموێ وەربگیرێو هەزم بکرێ..

هەر بۆیەش کە هاوەڵە بەدرییەکان هاتن بۆ مەجلیسەکەیو جێگایان نەبوو دابنیشن، فەرمانی بەهەندێ لە هاوەڵانی تر کرد کەهەڵسنو جێگایان بۆ چۆڵ بکەن. جا یا لەبەر ئەوە بوو ئەو هاوەڵانە وەکوو پێویست ڕێزی هاوەڵە بەدریەکانیان نەگرت ، یان بۆئەوەی بەدرییەکانیش بەشی خۆیان زانیاری وەربگرن وەکوو چۆن ئەو هاوەڵانە لەپێش ئەواندا بەشی خۆیان وەرگرتبوو.

**زانایانی ئیسلام ڕا جیاییان هەیە لەوەدا ئایا دروستە لەبەر هاتوو هەڵسی؟**

١- هەندێك پێیان وایە دروستە، بەڵگەشیان ئەو فەرمودەیە کە ئەبوداود لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ریوایەتی کردوە کە کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی مەعاذی بانگ کرد ببێتە دادوەر دەربارەی جولەکەی بەنو قورەیظە، جا کاتێ سەعد هات پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (قوموا الی سیدکم) ڕێز لەگەورەی خۆتان بنێنو لەبەری هەڵسن.

٢- هەندێکی تر پێیان وایە نادروستە، بەڵگەشیان ئەو فەرمودەیەیە کە ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیذی لە معاوییەی کوڕی ئەبو سەفیانەوە ریوایەتیان کردوە کە دەفەرموێ: (من أحب ان یتمثل له الرجال قیاما فلیتبؤ مقعده من النار) کەسێك پێی خۆش بێ پیاوان لەبەری هەڵسنو لەبەردەمیا دەستەو نەزەر رابوەستن، با جێگای خۆی لە ناو ئاگردا خۆش بکا.

٣- هەندێکی تر ڕێبازێکی مام ناوەندییان گرتووە، فەرمووی‌انە دروستە هەڵسان لە بەر کەسێك لەسەفەر دەگەڕێتەوە، هەروەها بۆ فەرمانڕەوا لە شوێنی

فەرمانڕەواییەکەیدا. وەلێ ئەگەر بکرێ بە عادەت ئەوە دروست نیە، چونکە شیعاری لوتبەرزو ملهوڕەکانی رۆمو عەجەمە.

هاوەڵان کەسیان بە ئەندازەی پێغەمبەر ﷺ خۆش نەدەویست کەچی کە تەشریفی دەهاتە ناویان لەبەری هەڵنەدەستان چونکە دەیانزانی پێی ناخۆشە .

﴿وَإِذَا قِيلَ انشُزُوا فَانشُزُوا﴾ ئەگەر داواتان لێ کرا لە کۆڕو مەجلیسدا کە بڕێکتان هەڵسن بۆ ئەوەی کەسانی شیاوتر بەو مەجلیسە جێگایان هەبێو دابنیشن، داواکە قبوڵ بکەنو هەڵسن. شوێن بۆ ئەهلی عیلم فەضل چۆڵ بکەن، باڕۆڵی خۆیان بگێڕن.

﴿يَرْفَعْ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خودا لە دونیاو قیامەتدا پلەو پایەی ئیمانداران بەرز دەکاتەوە، رێزیان لێ دەگرێ، بەشێوەیەکی تایبەتی پلەو پایەی زانایان بەرزتر دەکاو رێزیان لێ دەنێ، لە دونیادا رێزیان لێ دەگیرێو لە قیامەت دا پاداشتی باشیان دەداتێ. جاکەسێك هەردو صیفەتی ئیمانو زانستی تێدابن، ئەوە خودا بە هۆی ئیمانەکەیەوە پلەی بەرز دەکاتەوەو بەهۆی عیلمەکەشیەوە پلەی بەرزی تری پێ دەبەخشێ، بێگومان خودا ئاگادارو زانایە بەوەی کێ شیاوی رێزو تەقدیرەو کێ شیاو نیە، دەزانێ چی لەدڵو دەروونی بەندەکانیدا هەیەو نیازو مەبەستیان چیە، لە سەر کردەوەو نیازەکانیان پاداشیان دەداتەوە.

## ماڵبەخشین پێش ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەرﷺ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٣﴾﴾

**دەربارەی سەبەب نزولی ئەم دوو ئایەتە ریوایەت زۆرن:**

ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: موسوڵمانان زۆر پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺدەکرد، بەجۆرێك کە ماندویان دەکرد، خوداویستی تۆزێك ئەو قورساییە لەسەر پێغەمبەرﷺ سوك بکا، ئایەتی ﴿إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً﴾ی نازڵ کرد. کە ئایەتەکە نازڵ بوو موسوڵمانان خۆیان گرتەوەو وازیان لەزۆر پرسیارکردن هێنا، دوایی ئایەتی ﴿أَأَشْفَقْتُمْ ......﴾ی نازڵ کرد.

موقاتیلی کوڕی حەییان دەڵێ: ئەم ئایەتە دەرحەق بە دەوڵەمەندەکان نازڵ بووە، ئەوە بوو دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺو زۆریان قسە لەگەڵ دەکردو کاتی پێغەمبەریان واڵ کردبوو بەشی هەژارەکانی نەدەکرد، پێغەمبەر ﷺ ئەو درێژ دانیشتنو قسە زۆرییەی دەوڵەمەندەکانی بەلاوە ناخۆش بوو، ئیتر پەروەدگار ئەو ئایەتەی نازڵ کردو فەرمانی کرد: کە پێش ئەوەی بچنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ گفت وگۆ، خێرێك بکەن..

ئیتر هەژارەکان نەیانبوو بیدەن، دەوڵەمەندەکانیش خۆیان گرتەوەو چروکیان کرد، ئەم حاڵە لەسەر هاوەڵان قورس بوو، ئیتر دوایی بۆیان سوک کرا. وا دیارە پێشبڕکێو فەرمبالغیەك هەبوە لە سەر پێغەمبەرﷺ بۆ وتو وێژ لەگەڵ کردنی، هەر کەسە ویستویەتی بۆ کاروباری خۆی ئاخاوتنی لەگەڵدا بکاو راو تەوجیهاتی لێ وەربگرێ، یان چەند کاتێك بەتەنیا لە خزمەتیدا دابنیشێو پرسیاری لێ بکا، تەقدیری ئەومیان نەکردوە: کە ئەرکی پێغەمبەرﷺ ئەرکێکی جەماعییەو بەشی هەموو کەسی تێدایە.

هەستیان بەوە نەکردوە: کە کاتی پێغەمبەرﷺ بە نرخەو دەبێ لەکاری بەنرخدا سەرف بکرێ هەروەها کۆبونەوە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەبێ بۆ کاری گرنگ ئەنجام بدرێ نەك هەرچی راست بووەوە هەرکارێکی ئاسایی هەبوو ماوەیەکی درێژی لەکاتی پێغەمبەرﷺ پێ بکوژێ..

پەروەدگار ویستی موسوڵمانان وای بکا هەست بەو مانایانە بکەنو کاتی بەنرخی پێغەمبەرﷺ بەشتی لاوەکی بەفیڕۆنەدەن. زەریبەو باجێکی دانا لەسەر ئەو کەسەی دەیەوێ بەتەنیا ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەردا بکاو برێ لەکاتی بەنرخی بکوژێ: کە ئەو کاتە لە حەقیقەت دا موڵکی هەموو موسوڵمانانەو ئەو داگیری دەکا...!! ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمْ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً﴾ی نازڵ کرد.

عەلی کوڕی ئەبوطالیب دەڵێ: لەقورئاندا ئایەتێك هەیە پێش من کەس کاری پێ نەکردوەو دوامنیش کەس کاری پێ نەکردوە. ئایەتەکەش ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمْ الرَّسُولَ﴾ یە ئەوە بوو من دینارێکم خورد کردەوە کردمە دیرهەم، هەرکە بم ویستایە لەگەڵ پێغەمبەردا قسەی تایبەتی بکەمو لەگەڵیدا کۆببمەوە دیرهەمێکم دەبەخشێ، ئەمجار دەچومە خزمەتی، تا دیرهەمەکان تەواو بوون. ئەمجار ئایەتی ﴿أأشفقتم﴾ نازڵ بوو. ئەو ئەرکە لەسەر موسوڵمانان لاچوو!

ده‌فه‌رموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً﴾ ئه‌ی ئه‌و که‌سانه‌ی ئیمانتان هێناوه‌و خودا به‌تاك‌و ته‌نها ده‌زانن‌و پێغه‌مبه‌ری خوداتان به‌لاوه راستگۆیه‌و شوێن په‌یامه‌كه‌ی كه‌وتوون! هه‌ركاتێ ویستتان به‌ته‌نیا له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ردا كۆببنه‌وه‌و ئاخاوتنی له‌گه‌ڵدا بكه‌ن ده‌رباره‌ی كارێكی تایبه‌تی خۆتان پێش گفت‌و گۆكه، خێرێك به‌هه‌ژاران بكه‌ن، ئه‌وه‌ش بۆ رێزنان له پێغه‌مبه‌رﷺ و كه‌مكردنه‌وه‌ی ئه‌ركی سه‌رشانی‌و سود گه‌یاندن به هه‌ژاران وجیاكردنه‌وه‌ی موسوڵمانی ساغ‌و دوڕوو له‌یه‌كتر.

﴿ذَلِكَ خَيْرٌ لَكُمْ وَأَطْهَرُ﴾ به‌خشینی ئه‌ندازه‌یه‌ك له‌ماڵ پێش چپه كردن له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ر داﷺ بۆ ئێوه خێرو فه‌ره، چونكه فه‌رمانی خودا به‌جێ دێنن، پاداشتی قیامه‌ت ده‌سته به‌ر ده‌كه‌ن، دڵ‌و ده‌روونتان له‌چروكی‌و ڕه‌زیلی پاك ده‌بێته‌وه، هه‌ژاره‌كان سودمه‌ند ده‌بن‌و هاریكاریی كۆمه‌ڵی ئیسلامی ده‌رده‌كه‌وێ‌و رێزو نرخی زیاد ده‌كا.

﴿فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئه‌گه‌ر یه‌كێك له ئێوه دارایی ئه‌و ئه‌ندازه‌یه‌ی نه‌بوو، ئه‌وه هیچی له‌سه‌ر نیه ئه‌گه‌ر به‌بێ به‌خشینی برێ له ماڵ قسه له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌رﷺ دابكا، چونكه فه‌رمانه كه ئه‌وانه ده‌گرێته‌وه: كه داراییان هه‌یه.

﴿أَأَشْفَقْتُمْ أَنْ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ ؟﴾ ئایا ترسی كه‌مده‌ستی‌و هه‌ژاریتان هه‌یه: كه‌پێش قسه‌كردن‌و كۆبوونه‌وه له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌رداﷺ صه‌ده‌قه پێشكه‌ش به هه‌ژاران بكه‌ن!؟

﴿فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ جاكاتێ ئه‌وه‌ی فه‌رمانتان پێ كراوه له به‌خشینی ماڵ پێش (نه‌جوا) له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌رﷺ و به‌لاتانه‌وه قورس بوو، خوداش چاو پۆشی لێ كردن، رێگه‌ی دان به‌بێ به‌خشینی ماڵ قسه‌ی تایبه‌تی خۆتان له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌رﷺ دا بكه‌ن.

﴿فَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾

بەردەوام بن لەسەر کردنی نوێژو زەکات دانو فەرمانبەرداریی خوداو پێغەمبەری خوداو خۆبپارێزن لە جڵەوگیریەکانیان، بێگومان خودا ئاگاداری کردەوەکانتانە بەئاشکراو نهێنیانەوەو رۆژی قیامەت پاداشتتان دەداتەوە. چاکە بەچاکەو خراپە بە خراپە!

## حاڵو وەزعی ئەو دووڕوانەی دۆستایەتی کافرو جولەکەکانیان دەکرد

﴿ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ٱسْتَحْوَذَ

﴿عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُولَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ (١٩)﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَى إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا..﴾ ئیبنو ئەبو حاتەم لە(السدي)و (مقاتل)ەوە ریوایەت دەکا، دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی (عەبدوڵلای کوڕی نەبتەل)ی دووڕوو نازڵ بووە، ئەم مونافیقە لەلای پێغەمبەرﷺ دادەنیشتو گوێی لەقسەی پێغەمبەر دەگرت پاشان دەچوو بۆ جولەکەکانی دەگێڕانەوە، ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ لەیەکێك لە ماڵەکانی دانیشتبوو، لەپڕێکدا فەرمووی: ئێستا پیاوێك وەژوور دەکەوێ دڵی دڵڕەقانی هەیە، بەچاوی شەیتان دەڕوانێ، هێندەی پێ نەچوو عەبدوڵلای کوڕی نەبتەل هاتە ژوورەوە چاو شینێك بوو، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: لەسەر چی خۆتو هاوەڵاکانت جنێوم پێ دەدەن؟ عەبدوڵلا سوێندی خوارد: کەشتی وانەبوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نەخێر، جوێنت داوەو ڕاست ناکەی، ڕۆیی هاوەڵەکانی هێنان هەموو سوێندیان خوارد کە جوێنیان نەداوە، ئیتر پەروەدگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد.

ئیمامی ئەحمەدو حاکم لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتێکی لەم جۆرەیان کردوە، بەسەبەب نزولی ئایەتی ژمارە(١٨)..

ئیتر سەر لەنوێ قورئان دەگەڕێتەوە سەر ئەو دووڕووانەی دۆستایەتی جولەکەکانیان دەکرد، هەندێ حاڵو وەزعو هەڵوێستو کردەوەیان دیاری دەکا، هەڕەشەیان لێ دەکا بەوەی: کە پیلانو نەخشە گلاوەکانیان دەردەخاو پەردە لەسەر خراپەکارییان لادەباو لێیان لەهەرا دەدا، ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە سەرەنجام ئەوان ڕیسوا دەبنو سەرکەوتن بۆ بانگەوازیی ئیسلامییە.

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْماً غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَا هُمْ مِنْكُمْ وَلَا مِنْهُمْ﴾ ئایا ناڕوانی (ناڕوانن) بۆ حاڵو وەزعی ئەو کۆمەڵە دووڕووانەی خۆیان

کردوە بە دۆستی گەل و نەتەوەیەك خودا قاری لێ گرتون، بەنهێنی هاتوچۆیان دەکەن و نهێنی موسوڵمانانیان بۆ دەبەن و جنێو بە پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی دەدەن، ئەوانە لە واقیعدا نە لەئێوەن و نەلەوانن. نە لەگەڵ موسوڵمانانن نە لەگەڵ جولەکەن.

﴿وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ بە درۆ سوێندتان بۆ دەخۆن کە قسەی ناشرین و جوێنیان نەوتووە، بۆ خۆشیان دەزانن کە درۆ دەکەن. ﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَاباً شَدِيداً إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ خودا بۆئەوانە سزای بە ئێشی رۆژی قیامەتی ئامادە کردوە: کە ئاگری دۆزەخە. بەڕاستی ئەوانە کارێکی بەدو خراپ دەکەن و سورن لەسەر ئەنجامدانی کارە ناشیرینەکانیان.

﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ﴾ ئەو دووڕووانە بەڕواڵەت خۆیان بە موسوڵمان نیشان دەدەن، لەدڵدا کافرو بێبڕوان، سوێندی بە درۆو بێ بناغەیان کردوە بەمەتاڵ و خوێنی خۆیانی پێ دەپارێزن، بەو سوێندە بەدرۆیانەیان فێڵ لەوانە دەکەن: کە حەقیقەتی بیرو باوەڕیان نازانن، پێیان وایە ڕاست دەکەن، بەم هەڵخەڵەتاندنەیان، خەڵکی لەرێبازی خودا لا دەدەن بەهۆی تەمبەڵی و تەوەزەلییان خەڵکی لە ئیمان هێنان سارد دەکەنەوە، کاری موسوڵمانان بەسوك دەگرن و هەوڵ دەدەن لە شان و شەوکەتیان کەم بکەنەوە، ئەوانە: کە ئەوە کارو هەڵوێست و رەفتاریانە، عەزابی سەخت و دژواریان بۆ دانراوە! عەزابێکە وێڕای ئازاری زۆری ڕیسواکەریشە!

﴿لَنْ تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلا أَوْلادُهُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ڕۆژی قیامەت ماڵ و منداڵیان لە عەزابی خودا ڕزگاریان ناکا. ئەوانە ئەهلی دۆزەخن و لێی دەرناچن و بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە.

﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعاً فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەو ڕۆژە بۆ ئەو خەڵکە باس بکە: کە خودا هەموو ئادەمیزاد زیندو دەکاتەوەو لە

گۆڕەكانیـان ڕادەبـن، هـەموانیان لـە سـارای مەحـشەردا كۆدەكاتـەوەو كەسـیان لێ دواناكەوێ، كەس لەبیر ناكرێ، جا ئەوكاتە دوڕووەكان سوێند بـەخودا دەخـۆن: كـە ئـەوان لەسـەر هیدایـەت بـوون، هـەروەكوو چـۆن لـە دونیـادا سـوێندیان بـۆ خـەڵك دەخـوارد: كـە ئـەوان لەسـەر حـەقن. چـونكە ئـادەمیزاد لەسـەر چ حاڵێـك دەمـرێ لەسەر ئەو حاڵە زیندودەكرێتەوە. وا دەزانن ئەو سوێند خواردنەیان لە قیامەت دا ڕزگاریان دەكا، وەكوو چۆن لەدونیا بەو جۆرە سوێندە بەدرۆیەیان ڕزگاریان دەبوو.

﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلا إِنَّهُمْ هُمْ الْكَاذِبُونَ﴾ ئـەوان لەقیامەتـدا وادەزانـن: بـەو سـوێندە بەدرۆیـەیان سـودێكیان دەسـت دەكـەوێو زەرەرو زیانیـان لێ دوور دەخرێتەوە، وەكوو چۆن لە دونیادا هەمان گومانیان هەبوو ، ئاگاداربە ئەوانە بـەو تەصەورو بـۆچونەیان درۆزنی كوڕی درۆزنـن.

وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەم مانایە دەكاو دەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ وَاللّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ، انظُرْ كَيْفَ كَذَبُواْ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾(الأنعام٢٣–٢٤).

﴿اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمْ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمْ الْخَاسِرُونَ﴾ هـۆی گـومڕایی ئـەو تاقمـە ئەوەیـە: شـەیتان زاڵ بـووە بەسـەریاندا، عـەقڵو هۆشـی داگیركـردون، فـەرمانی خودایـان پاشـگوێ خـستوە، تاعەتو بەندایـەتی بـۆ خـودا ناكـەن، خوداپەرسـتیان لـەبیر خـۆ بردۆتـەوە ئەوانـە سـەربازی شـەیتانو دارو دەسـتەكەینی، دڵنیابـەو ئاگاداربـە: كـە هەمناهـەنگانی شەیتان خەسارەتمەندن خەسارەتمەندی بەفتارە چوو هەر خۆیـانن، چونكە ئـەوان بەهەشتیان بەدۆزەخ فرۆشتوە، لەجیاتی هیدایـەت گومڕاییـان هەڵبـژاردوە، درۆیـان لەگەڵ خـوداو پێغەمبـەری خـودا كـردوە، سـوێندی بـەدرۆیان خـواردوە، ئەوانـە لـە

گۆڕەکانیـان ڕادەبـن، هـەموانیان لـە سـارای مەحـشەردا کۆدەکاتـەوەو کەسـیان لێ دواناکەوێ، کەس لەبیر ناکرێ، جا ئەوکاتە دوڕووەکان سوێند بـەخودا دەخـۆن: کـە ئـەوان لەسـەر هیدایـەت بـوون، هـەروەکوو چـۆن لـە دونیـادا سـوێندیان بـۆ خـەڵك دەخـوارد: کـە ئـەوان لەسـەر حـەقن. چـونکە ئـادەمیزاد لەسـەر چ حاڵێـك دەمـرێ لەسەر ئەو حاڵە زیندوودەکرێتەوە. وا دەزانن ئەو سوێند خواردنەیان لە قیامەت دا ڕزگاریان دەکا، وەکوو چۆن لەدونیا بەو جۆرە سوێندە بەدرۆیەیان ڕزگاریان دەبوو.

﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ ئـەوان لەقیامەتـدا وادەزانـن: بـەو سـوێندە بەدرۆیـەیان سـودێکیان دەسـت دەکـەوێو زەرەرو زیانیـان لێ دوور دەخرێتەوە، وەکوو چۆن لە دونیادا هەمان گومانیان هەبوو ، ئاگاداربە ئەوانە بـەو تەصەورو بـۆچونەیان درۆزنی کوڕی درۆزنـن.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ وَاللّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ، انظُرْ كَيْفَ كَذَبُواْ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾(الأنعام٢٣-٢٤).

﴿اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ هـۆی گـومڕایی ئـەو تاقمـە ئەوەیـە: شـەیتان زاڵ بـووە بەسـەریاندا، عـەقڵو هۆشـی داگیرکـردون، فـەرمانی خودایـان پاشـگوێ خـستوە، تاعەتو بەندایەتی بۆ خـودا ناکـەن، خوداپەرسـتیان لـەبیر خـۆ بردۆتـەوە ئەوانـە سـەربازی شـەیتانو دارو دەسـتەکەینی، دڵنیابـەو ئاگاداربـە: کـە هەمئاهـەنگانی شەیتان خەسارەتمەندن خەسارەتمەندی بەفتارە چوو هەر خۆیـانن، چـونکە ئـەوان بەهەشتیان بەدۆزەخ فرۆشتوە، لەجیاتی هیدایـەت گومڕاییـان هەڵبـژاردوە، درۆیـان لەگەڵ خـوداو پێغەمبـەری خـودا کـردوە، سـوێندی بـەدرۆیان خـواردوە، ئەوانـە لـە

دونیاو له قیامەت خەسارەتمەندن، بێگومان کەسێك عاقڵ بێ، ئەم نەگبەتییە بەسەرخۆی ناهێنێ.

## سزای دوژمنانی خوداو پێغەمبەرﷺ، دۆستایەتی کردنی دوژمنانی خودا یاساغە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴿٢١﴾ لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

لەوەپێش خراپی حاڵی دوڕووەکانی بەیان کرد، کەلە قیامەتدا تووشی چ دەبن و چەند خەسارەتمەندن، ئەمجار پەروەدگار هۆی خەسارەتمەندییان رون دەکاتەوە، کەبریتیە لە دژایەتیکردنی خوداو پێغەمبەری خوداو سەرپێچیکردنی

فەرمانـەکانیان، ئـەوەش دیـاری دەکـا کـەخودا بڕیـاری تـەواوی داوە: کـە کۆمـەکی پێغەمبەران دەکاو دوژمنانیـان دەشـکێنێ. ئـەوەش ڕادەگەیـەنێ: کـە ئیمـان لەگـەڵ خۆشویستنی دوژمنانی خودا لەدڵدا کۆنابنەوە.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ فِي الأَذَلِّينَ﴾ ئـەو کافرانـەی سەرپێچی فەرمانی خـودا دەکـەن، دژایـەتی ئـایینی ئیسلامو گوێ نـەدان بـەخوداو پێغەمبەری خودایان کردووە بەڕەفتارو ئاکاری خۆیـانو پشتیان لەحـەق کـردووە، خۆیـان خـستۆتە بـەرێكو شـەریعەتی خـوداو پێغەمبـەریان لـە بـەرێك دانـاوەو دژایەتیکردنی خوداو پێغەمبەریانکردوە بەپیشە، ئەوانە لەتاقمو پێڕی تێـشکاوانن لـەو کۆمەڵەن: کـە خـودا زەلیلیـان دەکـاو کـەس لـەوان زەلیـل تـر نابـێ، لـەدونیادا بەکوشـتن دیلـیو دەرکـردن لـەوڵات ریـسوا دەبـن.. وەکـوو ئـەو حاڵـەی بەسـەر موشـریکەکانو جولەکەکانـدا هـات، لەقیامـەتیش بەعـەزابی ئـاگری دۆزەخ: کـە لـە واقیعـدا هـەر کەسـێ بخرێتـە نـاو دۆزەخـەوە ئەوپـەڕی ریـسوایی بەسـەر هـاتووە، بەتەواوی زەلیل بووە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ ( آل عمران/١٩٢).

بـەم جـۆرە خـودا نائومێـدی کـردن، ئـەو بیروبۆچـونەیان: کـەپێیان وابـوو جولەکەکان هێزێکن حیسابیان بۆ دەکرێو بـۆ ئـەوە دەشـێن: کە پـەیمانیان لەگـەڵ ببەسترێو دژی موسوڵمانانو پێغەمبەرﷺ بجوڵێنەوە. سەر لەبەر بە هەڵەی داناوە ڕەتی کردەوە، فەرمووی:

﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ خودا بڕیاری داوە لە ئەزەل دا نوسیویەتی: کە خوداو پێغەمبەری خودا سەرکەوتون بەسـەر دوژمنیانـداو هەموو کـاتێ هـەر ئـەوان باڵادەسـتن بەسـەر ناحـەزانی ئـایین دا، ئەمـە بڕیـارێکی ئـەزەلی پەروەدگارەو پاشگەزبونەوەی تێدانیە، سەرەنجام سەرکەوتن لـە دونیـاو قیامـەت دا بـۆ خـودا پەرسـتانە، بـەواقیعو کـردەوە ئەمـە هاتوەتـە دی، سـەیری مێـژوو بکـەو

بڕوانە، ئەوەتا بەدرێژایی ڕۆژگارخودا پێغەمبەرانی بەسەر نەتەوەکانیان دا زاڵ کردوە، ئەوە قەومی نوح وهودو صالحو لوطو قەومی فیرعەون...هتد

ئەوەتا حەزرەتی موحەممەدی باڵادەست کرد بەسەر موشریکەکانی نیوە دورگەی عەرەبدا ، پاشان لەماوەیەکی کەمدا هەردوو ئیمپراطۆریەتی ڕۆمو فارسی کۆنترۆڵ کرد. ئەوەی بەفیعلی ڕوی داوە ئەوەیە ئیمانو باوەڕی یەکتاپەرستی بەسەر کوفرو ئیلحاددا باڵادەست بووەو بڕوا بەتاکو تەنهایی خودا لەسەر زەوی جێگیربووە، هەر چەندە کۆسپو تەگەر هاتبنە سەر ڕێگای خودا پەرستی قەڵاچۆ کراونو ڕامالڕاون، ئەگەر بەیناو بەینێك کوفرو ئیلحاد هاتبێتنەوە گۆڕەپانو لەهەندێ پارچەی سەر زەوی خۆی نواندبێ، وەکوو ئێستا لە وڵاتانی کوفرو ئیلحاددا بەدی دەکرێ، ئەوە حەتمەن سەرئەنجام دەبێ بەرەو خودا پەرستی هەنگاو بنێنو ئەو دیاردەی بێ باوەڕییە بەرەو نەمان دەڕوا. چونکە دیاردەی کوفرو ئیلحاد شیاوی مانەوە نیە، لەگەڵ بڕیاری ئەزەلی خودادا دژ دەوەستێ، بەڵام بەمەرجێ موسوڵمانان ئەرکی خۆیان بەڕێوەبەرن، لەئاستی بەرپرسیاریەتی خۆیان دابن، بەگوێرەی بەرنامەی خودا هەڵسو کەوت بکەن.

هەرکاتێ بیندرا لەشوێنێك کوفر باڵادەستە، ئەوە بزانە: کە موسوڵمانان ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام نەداوە، وەکوو پێویست پابەندی فەرمانی خوداو پەیامی قورئان نەبوون. چاویان لە پێغەمبەرﷺو هاوەڵانی نەکردووە!!!

ئەمڕۆ: کە ئادەمیزاد دەڕوانێتە ئەو هێرشو پەلاماردانانەی دوژمنانی ئیسلام پەیتا پەیتا دەیکەنە سەر موسوڵمانانو خاكو وڵاتیان، ئەو هەموو زەبرو زەنگەی لە دژیان بەکاری دێنن، ئەو پیلانو فرتو فێڵو چاوو ڕاوەی لە موسوڵمانانی دەکەن، ئەو پاشقولانەی لێیان دەگرن، تەنانەت لەهەندێ وڵاتو ناوچەو هەرێم دا کار گەیشتوەتە ئەوە موسوڵمانان کۆکوژو ڕەشەکوژ بکرێن، شارو گوندو لانەیان لێ وێران بکرێو ناچاری کۆڕەویان بکەن، لەزێدو نیشتیمانی باوكو باپیرانیان

وەدەربنرێن. گەمارۆی ئابوری بدرێن، رزق و رۆزییان لێ ببڕدرێ، سوتەمەنیو پێداویستی ژیانیان لێ قەدەغە بکرێ، بەهەموو شێوەیەك بچەوسێندرێنەوە!!

کەچی وێرای ئەو حاڵەو لەوەش ناخۆشتر کە بەسەر موسوڵمانان دێ، دەبینین بیروباوەڕی راستەقینە لەدڵی خودا پەرستاندا جێگیرەو ورەیان بەرزەو ناڕوخێن، ئیمانیان بە سەرکەوتنی خۆیان هەیەو دوژمن ناتوانێ بیان توێنێتەوە، ناتوانێ سەریان پێ شۆڕبکاو بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە.

ئەوە مێژوو سەیر بکە، هەر لە ئەصحاب ولئوخدودەوە تا ئەمڕۆ، هەر لە هێرشی خاچپەرستانو تەتەرو مەغۆڵەوە، تاروخاندنی خەلافەتی ئیسلامیو بەشبەشکردنی جیهانی ئیسلامی بەسەر دەوڵەتۆکەو کوێخا دێیەکاندا، دانانی چڵکاو خۆرانی کوفرو ئیلحاد بەسەر ئەو دەوڵەتانەوەو نانەوەی دوبەرەکیو دژایەتی لەنێوان ئەم وڵاتو ئەو وڵات دا، هاوکات لەگەڵ غەزوێکی ئەقافی دارێژراوو بەردەوام دژی ئیسلامو موسوڵمانان، ئەمجار بەتاڵانبردنی داهاتو بەروبومی ئەو وڵاتانە لە ژێر پەردەی جیاجیادا..

سەرباری ئەو هەموو مەینەتییانەو سەرهەڵدانی ئەو هەموو پارتو حیزبە عەلمانیانە لەناو جیهانی ئیسلامیدا؛ کە کۆمەڵگای ئیسلامییان پچڕپچڕ کردوە، وێرای دەیەهاو سەدەها جەخارو ناسۆری تر: کەباسکردنیان زۆری دەوێ. کەچی سوپاس بۆ خودا، ئیسلام هەر لەبرەودایەو رابونی ئیسلامی لە گەشەو نەشەدایە. رۆژ لەدوای رۆژ موسوڵمانان زۆر دەبن، بانگەوازی ئیسلامی سنوورەکان دەشکێنێو بە جیهان دا بڵاودەبێتەوە.

ئەمجار پەروەدگار تەرازوی ئیمان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ ئەتۆ گەلو نەتەوەیەکت دەست ناکەوێ بڕوایان بەخوداو بە رۆژی قیامەت هەبێ، کەسێکیان خۆش بوێ، کەدژایەتی خوداو پێغەمبەری خودا بکا، بائەو دژانە باوکانیان یان کورەکانیان یان خزمو کەسو کاریان بن. واتە:

نابێ خاوەن باوەڕان، ئەوانەی ئیمانیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە. دۆستایەتیو موالاتی کەسانێك بکەن: کە دوژمنی خوداو پێغەمبەری خودان، با ئەو دوژمنانەی خوداو پێغەمبەر نزیکترین کەس بن بۆیان، بەم جۆرە باوك بن، یان ڕۆڵەو جگەر گۆشەیان بن، یان براو خزمو کەسوکاریان بن.

تیرمیذیو حاکم طەبەرانی لە فەرمودەیەکی (مرفوع) دا ڕیوایەتیان کردوە: کەتێیدا هاتووە: (یقول الله تبارك وتعالى: وعزتي لاينال رحمتي من لم يوال اوليائي، ويعاد اعدائي) پەروەدگار دەفەرموێ: سوێند بەعیزەتو جەلالی خۆم، ڕەحمەتو بەزەیی من ناگا بەکەسێك دۆستایەتی خۆشەویستانم نەکاو دژایەتی دوژمنانم نەکا.

پەیوەندی خوێنو خزمایەتی لەئاستی پەیوەندی بیروباوەڕدا بێهێزو پێزە، کاتێك ئیعتیبار بۆ پەیوەندی خوێنو خزمایەتی دەکرێ: کە لەگەڵ ئایین ناکۆك نەبێ، لایەك لەژێر ئاڵای ئیسلامو لایەکەی تریان لە کەمپی شەیتان نەبێ. بەڵکوو هەموویان لەژێر یەك ئاڵادا بن، هەرکاتێك دژایەتی کەوتە نێوانەوە، کوفرو ئیمان هاتە گۆڕێ، ئیتر ڕۆڵی خوێنو خزمایەتیو نەژاد نامێنێ. ئەوەتا ئەبو عوبەیدە ڕۆژی غەزای بەدر، باوکی خۆی کوشت ئەبوبەکری صدیق ویستی عەبدوڕەحمانی کوڕی بکوژێ، مەصعەبی کوڕی عومەیر عوبەیدی برای خۆی کوشت، زۆر لە هاوەڵانی تر خزمو کەسو کاری خۆیان کوشت.

﴿أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمْ الإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الآنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ ئەوانەی دوژمنانی خوداو پێغەمبەریان خۆش ناوێ، دۆستایەتیو موالاتیان ناکەن، ئەوانە ئیمانی صەحیحو ڕاست لە دڵیاندا چەسپاوە، لەدونیادا خودا بەهێزیان دەکا بە یارمەتیدانی خۆی بۆ سەرکەوتنیان بەسەر دوژمناندا، لە قیامەتیش دا دەیانخاتە ناو باغو باخاتی بەهەشت: کە بەژێر باڵەخانەو درەختەکانیان دا جۆگای ئاوی صافو ڕونو ڕەوان

دەبن، ئەو خودا پێداوانە لەوێدا دەمێننەوە بۆ هەتا هەتایە، طاعەتو خودا پەرستی دونیایان لێ قبول کراو خودا رەحمەتی خۆی بەسەردا رشتون، خودا لێیان رازییەو ئەوانیش لەخودا رازین‌و دڵخۆشن بەو نازو نیعمەتانەی خودا پێی بەخشیون.

﴿أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوانە کۆمەڵو تاقمی پەروەردگارن، لەژێر ئالای ئەودا کۆبوونەوە، پابەندی فەرمانو جڵەو گیریەکانی ئەون، دژی دوژمنانی خودا دەجەنگن‌و یارمەتیدەری خۆشەویستەکانێتی. ئاگادار بن هەر کۆڕو کۆمەڵو تاقمی خودا پەرست بە مراز گەیشتون‌و خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان بۆ خۆیان دەستە بەر کردوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الحشر)

سورەتی حەشر مەدینەییەو بیستو چوار ئایەتە، ناونراوە بەسورەتی (حەشر) چونکە ئایەتی: ﴿هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لأَوَّلِ الْحَشْرِ﴾ی تێدایە، پێشی دەگوترێ: (سورەتی بەنی نەضیر) چونکە باسی جولەکەی بەنو نەضیری تێدایە: کە لە غەزای (بنی النضیر) دا ئەنجام درا، ئەم خێڵە جولەکە ئەوانە بوون: کە لەسەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچیدا پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دا شکاند، پێغەمبەرﷺ لە مەدینە وەدەری نان...

سورەتەکە روداوی (بنی النضیر)مان بۆ دەگێرێتەوە، چۆن رویداو بۆچی رویداو دەرئەنجامەکانی دوایی چی بوون‌و چ کاریگەریەکی لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی هەبوو.

سـورەتەکە وەکـوو بـاقی سـورەتە مەدەنییـەکان گرنگـی دەدا بـە ئـەحکامی تەشـریعی‌و تـەنظیمـی کۆمـەڵگای ئیـسلامی، دوا بـەدوای روداوی دەرکردنـی (بنـی النضیر) لەمەدینە، ئەحکامی غەنائیم‌و دەستکەوتی جەنگ دیاری دەکا. چۆنیەتی دابەشـکردنی زەوی‌وزارو مـاڵ‌و خانویـان بەسـەر موسـوڵمانەکانداو حیکمـەتی ئـەو دابەشـکردنە روندەکاتـەوە. لـەم میانەشـدا مەردایـەتی‌و جـوانمێری کۆچـکەر (مهاجرین)ەکان‌و نەفس بەرزی ئەنصارەکان دەردەخا، هەڵوێـستی هـەردوولایان بـە پەسندو نموونە لەقەڵەم دەدا.

روداوی غەزای بەنی نەضیر وەکوو وتمان: لە سەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچی‌و دوای غـەزای ئوحـودو پـێش غـەزای (الاحـزاب) بـووە، وەکـوو ریوایـەتکراوە: پێغەمبەرﷺ لەگەڵ دەکەس لە هاوەڵانی: کە (ئەبوبەکرو عومەرو عـەلی)یـان تێـدا بوون، تەشریفی برد بۆ کوچەو هەواری خێڵی بـەنو نـەضیر؛ کە هاوپـەیمان بـوون لەگەڵی. داوای لێ کردن هاوبەشی بکەن لە خوێندانی ئەو دوو پیاوەی: کـە عـەمری کـوڕی (امیـە) بەنـەزانی‌و هەڵـە کووشـتبونی، ئـەم یارمـەتی‌و هاوبەشـی کردنـە بەگوێرەی ئەو پەیمانە بوو: کە پێغەمبەرﷺ لەسەرەتای چوونی بۆ مەدینە لەگەڵ جولەکەکاندا مۆری کردبوو.

کەتەشریفی گەییشتە ئەوێ‌و لەگەڵ سەرۆکەکانیان لەبن دیوارێك دا دانیشتن‌و باسی یارمەتیدانی بۆ دەکردن، بەسەر زاری‌و رواڵەت پێخۆشحاڵی خۆیـان دەربـڕی‌و ئامادەباشی خۆیان نیشاندا بۆ ئەوەی هەرچی داوایـان لێ بکرێ بیـدەن! لەولاشـەوە کەوتنە دارِشتنی پیلانی لەناوبردنی‌و وتیان: هەلی لەمـە باشـترمان بـۆ هەڵناکـەوێ، کێتان لەخۆی رادەبینێ بچێتە سەر ئەو بانەو لـەوێوە بـەردێکی گـەورەی پیامـاڵێ‌و بیکوژێ‌و رزگارمان بێ لەدەستی؟! عەمری کوڕی جەحاشی کـوڕی کـەعب وتـی: مـن بـەو کـارە هەڵدەسـتم، ئێـوە بیخلافێـنن مـن لەپـشتەوە سـەر دەکەومـە سـەربان‌و بەردێکی زل دەدەم بەسەریاو دەیکوژم. لەو کاتەدا کابرا هەڵسا بچێ بۆ سەربانەکە، خودای گەورە پێغەمبەری لەو پیلانە ئاگادار کرد، ئیتر پێغەمبەرﷺ خێرا هەڵساو

ڕۆیی، وەکوو کارێکی بەپەلەی هەبێ گەڕایەوە بۆ ناو مەدینە. هاوەڵەکانیشی کە پێیان زانی پێغەمبەرﷺ لەوێ نەماوەو گەڕاوەتەوە بۆ مەدینە ئەوانیش گەڕانەوە.

ئیتر پێغەمبەرﷺ پیلانی جولەکەکانی بۆ موسوڵمانان گێڕایەوەو ئەمەی بەپەیمان شکان دانا. فەرمانی کرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ شەڕکردن لەگەڵیانا. لەوەپێشیش چەند پەیمان شکێنی تریان لێ دەرکەوتبوو..

بۆ نموونە کۆمەڵێك لە جولەکەی بەنو نەضیر(کەعبی کوڕی ئەشرەف) یشیان تێدا بوو، پەیوەندییان کردبوو بە کافرەکانی قورەیشەوە بۆ پیلان دانان دژی پێغەمبەرﷺو موسوڵمانان لەکاتێکدا ئەم عەهدو پەیمانەش لەنێوان پێغەمبەرو جولەکەکاندا هەبوو، ئەوە بوو پێغەمبەرﷺ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئیزندا کەعب بکوژێ، ئەویش کوشتی.

بۆیە پێغەمبەرﷺ موحەممەدی کوڕی موسلەمەی نارد کەپێیان بڵێ: پێغەمبەری خودا منی ناردووە پێتان ڕابگەیەنم ئێوە ویستوتانە پیلانێکی ئاوا بگێڕن، دەبێ ڕەو بکەنو ئەم ناوچەیە بەجێ بێڵنو ئێمە لەگەڵ ئێوەدا ناتوانین بژین. بۆ ئەمەیش (دە) ڕۆژ ماوەتان بێ، پاش ئەو ماوەیە هەر کەسێ ببینین لەئێوە لەملی دەدەین. ئەوەشی پێ ڕاگەیاندن: کە ماڵو سامانی خۆیان لەگەڵ خۆیان بەرنو وەکیلو جێنیشن بەسەر باخو کشتو کاڵیانەوە دابنێن، جولەکەکان ترسیان لێ نیشتو کەوتنە خۆ کۆکردنەوەو ئامادەباشی بۆ بارکردن، دووڕووەکانی مەدینە بەسەرۆکایەتی عەبدوڵڵای کوڕی توبەی کوڕی ئەبی سەلول پەیوەندییان پێوە کردنو هەڵیاننان بۆئەوەی داواکەی پێغەمبەرﷺ ڕەت بکەنەوەو بەرگری لەخۆیان بکەن، پێیان وتن: ئەگەر ئێوە خۆتان ڕابگرنو نەڕۆن، ئێمەیش پشتگیریتان لێ دەکەین، شەڕیان لەگەڵ کردن ئێمەیش لەتەکتاندا شەڕ دەکەین، دەریان کردن ئێمەش لەگەڵتان ڕەودەکەین.

جولەکەکان کەوتنە ڕاوێژ کردنو متمانەیان بە قسەی سەرۆکی دووڕووەکان نەبوو، بەڵام سەرۆکی جولەکەکان کە(حیی) کوڕی ئەحطەب بوو، وتی: ڕەوناکەین

ماڵو حاڵمان لە خۆمان تێك نادەین، ئازوخەی ساڵێکمان هەیەو دەچینە ناو قەڵاکانمانەوەو خۆمان قایم دەکەین، ئیتر وەڵامی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردو وتی: ناڕۆین‌و چیت لەدەست دێ بێ منەت بە.

پێغەمبەرﷺو موسوڵمانەکان تا دە رۆژەکە کەتێپەڕین پەلاماریان نەدان، ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە موسوڵمانانان کرد خۆیان ئامادەبکەن بۆ هێرش بردنە سەر جولەکەکان، عەبدوڵلای کوڕی ئوممی مەکتومی لەسەر مەدینە دانا، ئالای جەنگی دایە دەست عەلی کوڕی ئەبو طالیب، لەمانگی رەبیعول ئەوەل دا. چونە سەریان‌و چواردەوری قەڵاو خانوەکانیان دان‌و (١٥) رۆژێك بەم حاڵە مانەوە تەسلیم نەبوون، کە هێرشیان بۆ دەکرا لەسەر قەڵاکانیانەوە بەبەردە فڕکێ دیفاعیان دەکرد.

ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرمانی بەهاوەڵانی کرد: کە دارخورمای باخەکانیان ببڕن بۆ ئەوەی شتێکی وایان نەمێنێ دڵی پێ خۆش بکەن، لە پێناویا بجەنگن. کە جولەکەکان ئەومیان بینی باخیان دەسوتێ‌و دار خورمایان دەبڕدرێن‌و هاواریان لێ هەڵساو کەوتنە گازندە کردن، دەیانگوت: موحەمەد لەوەپێش بۆخۆی باخ وێرانکردن‌و بڕینی داری بەرداری قەدەغە دەکرد، کەچی ئێستا وابۆ خۆی ئەو کارە دەکا.!!

بەلام بێ سود بوو بۆ پشتگیری پێغەمبەر ﷺ ئایەتی: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾ نازڵ بوو.

گەمارۆدان پێی نایە رۆژی بیست‌و شەشەمەوە، جولەکەکان لە بەهانا هاتنی دووڕووەکان ناهومێد بوون، خودا ترسی خستە ناو دڵیانەوە، بەناچاری داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد: کەخوێنیان پارێزراو بێ‌و رێگایان بدرێ وڵات بەجێ دێڵن. پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیاندا رێککەوت: کەهەر بەسێ کەس باری حوشترێك کەلوپەل‌و ئازوخە لەگەڵ خۆیان بەرن، چەکەکانیان بەجێبێڵن. ئیتر جولەکەکان بەناچاری

چیان بۆ هەلگیرا لەگەڵ خۆیان بردیانو وڵاتیان بەجێهێشت، بەدەستی خۆیان خانوەکانی خۆیان دەڕوخاند بۆ ئەوەی موسوڵمانانان سودیان لێ نەبینن.

هەندێ لە پیاو ماقوڵو سەرۆکەکانیان چون بۆ وڵاتی خەیبەرو ئەوانی تریان چون بۆ وڵاتی (ئەزروعات) لە شام، ماڵو سامانو زەویو زارو باخو بێستانیان بەجێما بۆ موسوڵمانەکانو بوو بەدەستکەوتێکی تایبەتیو پێغەمبەرﷺ بەسەر موهاجیرینەکاندا دابەشی کرد بەشی ئەنصارەکانی لێ نەدا جگە لەدوو کەسی هەژاریان نەبێ: سەهلی کوڕی حەنیفو ئەبو دوجانە (سماك)ی کوڕی خەرەشە. ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کۆچکەرەکان ماڵو سامانی خۆیان لەپێناو عەقیدەکەیان دا لەمەککە جێهێشت بوو. ئەنصارەکان کۆمەکییان پێکردبوون، لەناو خۆیان حەواندبویاننەوە. کردبویاننە هاوبەش لەماڵو سامانی خۆیاندا، نموونەی برایەتی ئیسلامی راستەقینەیان بەوپەری ئیثارو لەخۆ بوردوییەوە بەرجەستە کرد.

جا کەئەم هەلە هەلکەوت پێغەمبەرﷺ ویستی ئەو حاڵە نائاساییە بگێڕنەوە بۆ حاڵی ئاسایی خۆیو ئەو دەستکەوتە بەسەر هەژارەکان دابەش بکا. بۆ ئەوەی ئەرکی موهاجیرەکان لەسەر شانی ئەنصارەکان لابچێ، ماڵو سامانیش هەر لەبەردەستی دەوڵەمەندەکاندا نەبێ.

دەی بابزانین قورئان چۆن چۆن ئەو روداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە؟ لێرە بەولاوە گوێ بۆ ئەو بگرین.

## وەدەرنانی جولەکەکانی بەنو نەضیر

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١) هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ (٢) وَلَوْلَا أَن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ (٣) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٤) مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ (٥)﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی یەکەم، بوخاری لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: سورەتی ئەنفال دەربارەی غەزای بەدر نازڵ بووە، سورەتی حەشر دەربارەی غەزای جولەکەی بەنو نەضیر نازڵ بووە.

حـاکم لـە عائیـشەوە ریوایـەت دەکـا: دەفـەرموێ: غـەزای بـەنو نـەضـیر: کەخێڵێکی جولەکەبوون، پاش تێپەڕ بوونی شەش مانگ بەسەر جەنگی ئوحـودا رویدا، ئەم خێڵە بەخۆیان و باخ و بێستانیانەوە لە قەراخی شاری مەدینە بوون، پێغەمبەر ﷺ ئابلۆقەی دان، هەتا ناچاربوون بۆ رەوکردن، بەمەرجێ هەریەکەی باری حوشترێك کەل و پەل و ئازوخە لەگەڵ خۆیا بەرێ بەبێ چەك، واتە: نابێ چەکەکانیان بەرن. ئیتر ئایەتی: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ﴾ نازڵ بوو.

ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە مەدینە لەگەڵ جولەکەکانی (بنو نـەضیر)دا پـەیمانی بەسـت، کـە نـەدژی بوەسـتن، نەلەسـەری بکەنـەوە، جا: کـە موسـوڵمانەکان لـە غـەزای بـەدردا سـەرکەوتن لـە ناوخۆیانـدا وتیـان: ئەمـە ئـەو پێغەمبەرەیـە: کـە لـە تەوراتـدا بەسـەرکەوتوو نـاوی هـاتووە. کـەرۆژی ئوحـود موسـوڵمانەکان تێکشکان، گومانیـان بـۆ پەیـدا بـوو کەوتنـە پـیلان نانـەوە، کـەعبی کوڕی ئەشرەف لەگەڵ چل کەسدا چون بۆ مەککەو پەیمانیان لەگەڵ ئەبو سـەفیان دا بەسـت دژی موسـوڵمانان. پێغەمبـەرﷺ داوای لـە موحەمـەدی کـوڕی موسـلەمە کـرد: کـە بـرای شـیری کـەعب بـوو بیکـوژێ ئـەویش لەپـەناوە فرسـەتی لێ هێنـاو کوشتی.

پاشان پێغەمبەرﷺ ئابلوقەی دان و ناچاری کردن وڵات جێ بهێڵن. زوربەیان چون بۆ شام و هەندێکیشیان بۆ وڵاتـی خەیبـەرو حیرە رۆیشتن. ئیتر پـەروەدگار ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ﴾ تا دەگاتە ﴿وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ی نازڵ کرد.

دەفەرموێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ تەسـبیحاتی خـودا دەکـا هەرچـی لـە ئاسمانـەکان و زەوی دایـە، هـەموو بونـەوەر خەریکی تەمجیدو تەقدیسە، نوێژی بۆ دەکەن، بە تاك و تـەنهای دەناسـن، بـەزمانی حاڵ یـان بـە زمـانی گـوتن خوداپەرسـتی دەکـەن، سـەری بەنـدەگی بـۆ خـودا نـەوی

دەکەن، پەروەدگار خاوەنی تواناو دەسەڵاتی رەهایە یارمەتی خودا پەرستان دەداو دوژمنانیان تارو مار دەکا، حەکیم و دانایە لەکردارەکانی‌دا هیچ کارێکی بێهودە نیە.

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ (الاسراء/٤٤).

﴿هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ لأَوَّلِ الْحَشْرِ﴾ خودایەکی وەهایە بڕیاری دەرکردنی جولەکەی بەنو نەضیری دا: کە لە قۆناغی یەکەم دا لەدەوروبەری مەدینە دوور بخرێنەوە. لە تۆڵەی خیانەت و فرت و فێڵ و ناکەس بەچەیی خۆیان لە ماڵ و زێدو نیشتیمانی خۆیان دەربکرێن. جارێکی تر نەتوانن بێنەوە بۆ ئەو خاك و وڵاتە. ئەمە حەشری یەکەم بوو. جارێکی تریش حەزرەتی عومەر لە خەیبەرەوە لەسەر وەصیەتی پێغەمبەرﷺ رەوی پێکردن بۆ وڵاتی شام.

﴿مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا﴾ ئەی موسوڵمانینە، ئێوە پێتان وانەبوو ئەو جولەکانە خانوو بەرەو زێدو نیشتیمانی خۆیان جێ بهێڵن. چونکە بەرواڵەت خاوەن هێزو تواناو ماڵ و سامان و قەڵاو شورەی قایم وقوڵ بوون، ﴿وَظَنُّوا أَنَّهُمْ مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ﴾ جولەکەکان خۆشیان پێیان وابوو قەڵاکانیان لە عەزابی خودا دەیانپارێزن و کەس ناتوانێ دەستیان بۆ بەرێ.

﴿فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ﴾ سزاو عەزابی خودا لە رێگەیەکەوە بۆیان هات پەییان پێ نەبردبوو، هەرگیز بەخەیاڵیان دا نەهاتبوو بەو شێوە لە ماڵ و زێدی خۆیان وەدەربنرێن.. تەنانەت بەخەونیش ئەوەیان نەبینیبوو. ئەوە بوو خودا بۆیان هات لەناو دڵیانەوە نەك لەناو قەڵاکانیانەوە، بۆیان هات و ترسی زۆری خستە دڵیانەوە، بەدەستی خۆیان دەرگای گاڵدراوی قەڵاکانیان کردەوە.

﴿يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ﴾: كە دڵنیا بوون لەوەی دەبێ ڕەوبکەنو ماڵو سامانیان جێ بێڵن. ئیتر بەدەستی خۆیان لەناوەوە خانوەکانی خۆیان دەڕوخاند، بۆ ئەوەی موسوڵمانەکان سودیان لێ وەرنەگرن، موسوڵمانەکانیش لەدەرەوە دەستیان کرد بەڕوخاندنی قەڵاو خانوەکانیان.

زوهریو عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێن: کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دان یەکەی باری حوشترێك شتو مەكو ئازوخە بەرن، ئیتر هەر دارو کۆڵەکەو دیرەگێکیان بەلاوە باش بوایە، لە خانوەکانیان دەریان دەهێناو دەیانخستە سەر حوشترەکانیان، موسوڵمانەکانیش باقی ماندەی خانوەکانیان دەڕوخاندن. ﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الأَبْصَارِ﴾ ئەی خاوەن عەقڵو هۆشمەندەکان! پەند وەربگرن لەو ڕوداوانە، دڵنیابن هەرچی خودا بیەوێ بێتەدی دەێتە دی، هەرکەسێ خیانەتکار بێو سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بکا، با چاوەڕوان بن ئەوەی بەسەر جولەکەی (بنو النضير) هات بەسەر ئەوانیش بێ.

﴿وَلَوْلا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ﴾ ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە: کە خودا بڕیاری داوە بەو شێوە ڕیسواییە لە زێدو نیشتیمانی خۆیان دەربکرێن، ئەوە لەتۆڵەی ئەو خیانەتەیاندا لەدونیادا بەکوشتنو بڕینو دیل کردن سزای دەدان، وەکوو ئەوەی ساڵی پێنجەمی کۆچی دوای غەزای خەندەق لەگەڵ جولەکەی (بنو قورەیظة) کردی، یان وەکوو ئەو عەزابو نارەحەتیەی بەسەر موشریکەکانی هێنا، دوای غەزای بەدر، یان ئەو دەردو عەزابەی تووشی جولەکەی (بنو قەینوقاع) بوو لە دوای غەزای بەدر.

بەکورتی عەزابدانی جولەکەی (بنو النضير) بڕیارێکی خودایی بوو، دەبوایە بەو شێوە یان بە شێوەیەکی تر سزا بدرانایە، جا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە: کە

خوداویستی وابوو لە ولاتو لەسەر خانووبەرەی خۆیان دەربکرێن، بەشێوەیەکی تر عەزابی دەدان، ئەمە جگە لەو عەزابەی چاوەڕوانیانە لە قیامەتدا. ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَنْ يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ ئەو دەرکردنەیان لە ولاتی خۆیانو زاڵبونی موسوڵمانان بەسەریاندا بەهۆی ئەوەوە بوو: کە سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودایان کرد، ئەو مزگێنیو بەڵێنانەی پێغەمبەرانی پێشو دابویان دەربارەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام بەدرۆیان دەزانیو رەتیان کردەوە، لەکاتێك دا ئەوان پێغەمبەریان وەکوو کوڕی خۆیان دەناسی! کەسێکیش دوژمنایەتی خوداو پێغەمبەری خودا بکا، دۆستایەتی کەمپی کوفر بکاو پەیمان بشکێنیّ، ئەوە خودا بەسزای سەخت لە دونیاو قیامەتدا تۆڵەی لیّ دەستێنیّ.

ئەمجار پەروەدگار پاساو بۆ موسوڵمانان دێنێتەوە کە دار خورمای باخەکانی (بنو النضیر)یان بڕیو سوتاندیانن، چونکە ئەوە تاکتیکێکی جەنگ بوو، دەفەرمویّ: ﴿مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ﴾ ئەو دارخورمایەی بڕیتانو سوتانتانن لە باخەکانی (بنو النضیر) یان بەپێوە هێشتانەوە لەسەر رەگو ریشەی خۆی، ئەوە هەمووی بە ئیزنو رەزامەندیی خودا بوو، ئیزنی موسوڵمانانیدا ئەو کارە بکەن، بۆ ئەوەی بەهێزببنو چاو ترسێنی دوژمنی پیّ بکەن، جولەکەکان ریسواببن، خەمو خەفەت دایانگریّ بەوە کە دەبینن دارخورمای باخەکانیان دەبڕدرێنو دەسوتێندرێن.

## حوکمی ماڵو سامانی دەسکەوتوو لە دوژمنەوە

﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ

عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ
ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ
ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ
فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ
ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ
وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ
أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن
قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ
حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ
خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ
﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ

لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾

لەوەپێش ئەوەی بەیانکرد: کە بەسەر جولەکەکانی (بنو النضیر) هات، ئەمجار لێرەدا حوکمی ئەو ماڵو سامانەیان بەیان دەکا: کە بەبێ شەڕ کەوتە دەستی موسوڵمانان.

**ماڵو سامانی کافران: کەدەکەوێتە دەستی موسوڵمانان دوو جۆرە:**

١- غەنیمە: ئەوەیە لە ئاکامی شەڕو جەنگ دا دەستی موسوڵمانان بکەوێ. وەکوو غەنیمەتی غەزای بەدر........هتد

٢- فەیئ: ئەوەیە: بەبێ شەڕ دەستیان بکەوێ، وەکوو ماڵو سامانی (بنو النضیر). ئەمە بە فەیئ حیساب دەکرێ، چونکە موسوڵمانان لە پێناویا شەڕێکی وایان نەکردووە باسی بکرێ، چونکە وڵاغی سواریو چەکیان بەکارنەهێناوە، مەسافەیەکی دورو درێژیان رێگا نەبڕیوە، شوێنەکەیان دوومیل لە مەدینەوە دوور بوو بە پیادەیی بۆی چوون، تەنیا پێغەمبەرﷺ سواری حوشترێك بوو، شەڕێکی واشی تێدا نەکراوە، ئیتر پەروەدگار دەستکەوتی ئەو روداوەی بەفەیئ دانا، واتە. ماڵەکە بەبێ شەڕ کەوتە دەست پێغەمبەرﷺ ئەویش بەسەر موهاجیرەکان دا دابەشی کرد بۆ دووسێ کەس نەبێ بەشی ئەنصارەکانی لێ نەدا.

دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾ ئەو ماڵو سامانەی خودا گەڕاندییەوە بۆ پێغەمبەری خۆی، لەو کافرانەوە، واتە: ئەو ماڵو سامانەی لە ئاکامی ئابڵوقەدانی (بنو النضیر) دەست پێغەمبەرﷺ کەوت، ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەرﷺ خۆی، چونکە بە شەڕو جەنگ دەست نەکەوتووە، تاڵانییەك نیە ئێوە بە هۆی پەلامارو ئەسپ هەڵێنگدانو حوشتر سواریو شەڕو پێکدادان دەستتان خستبێ؛ بەڵکوو لە ئاکامی وتو وێژو دانوسان

ماڵەکەتان دەست کەوتووە، بۆیە بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش نەکرا، بەڵکوو خودا تایبەتی کرد بە پێغەمبەرەوە، دابەشی بکا بۆ بەرژەوەندی خۆی ..

ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبوداودو تیرمیذی‌و نەسائی لە عومەری کوڕی خەتتابەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: ماڵ‌و سامانی جولەکەی (بنو النضیر) لەو ماڵ‌و سامانەیە کە خودا گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرو بەبێ جەنگ دەست کەوت، موسوڵمانان ئەسپیان بۆ غارنەداو حوشتریان بۆ بارنەکردو شمشێرو تیرو کەوانیان تێدا بەکار نەهێنا، بۆیە خودا فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ کرد: کە بژێوی ساڵێکی لێ وەلانێ ئەوی تر ئەسپ‌و سیلاحی پێ بکڕێ بۆ جەنگ‌و بە ئارەزۆی خۆی دابەشی بکا، بەکێی دەدا بیدا.

﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: ئەی موسوڵمانان ئێوە بۆ دەسخستنی ئەو ماڵ‌و سامانە ئەسپتان هەلینگ نەداوەو حوشترتان وە غار نەهێناوە، وەلێ خودا بەتوانای خۆی پێغەمبەرەکەی بەسەر دوژمنانی دا زاڵ دەکا، وەکوو حەزرەتی موحەممەدی ﷺ زاڵ کرد بەسەر جولەکەی (بنو النضیر)داو بەبێ شەڕ ماڵ‌و سامانی داگیرکردن، بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێکدا باڵا دەستەو هەرچی بیەوێ ببێ، دێتەجێ.

**ئەمجار پەروەدگار حوکمی (فیئ) دیاریی دەکا: چونکە ئەو ماڵ‌و سامانەی لە دوژمن دەست موسوڵمانان دەکەوێ سێ جۆرە:**

١- غەنائیم: ئەوەیە بەشەڕو جەنگ دەس دەکەوێ، ئەوە دەکرێتە پێنج بەش‌و بەگوێرەی ئایەتی ﴿وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ ......﴾ (الانفال/٤١) دابەش دەکرێ.

٢- ماڵ‌و سامانی گوێزراوە: کەبەبێ شەڕو ئەسپ‌و حوشتر وەغارهێنان دەست دەکەوێ، ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ خۆی چۆنی خەرج دەکا بیکا وەکوو بەئایەتی: ﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ ......﴾ ئاماژەی بۆ کرد.

٣- ماڵو سامانی نەگوێزراوە وەکوو زەویو زار، ئـەوە دوای پێغەمبـەرﷺ بـۆ بەرژەوەندی گشتی سەرف دەکرێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الآغْنِيَاءِ مِنْكُمْ﴾ ئەو ماڵو سامانەی خـودا بـۆ پێغەمبـەری گەڕانـدەو بـەبێ شەڕو ئەسپو حوشتر بەکارهێنان، ئەوە بۆ خودایە بۆکێی بڕیار دەدا دەیدا، ئەمجار بـۆ پێغەمبـەری خودایـە هـەتا لـە ژیانـدا بـێ ، پاشـان لەبەرژەوەنـدی موسـوڵمانانـدا خـەرج دەکـرێ بـۆ خزمـەکانی پێغەمبـەرە لەبـەنو هاشـیمو بـەنو موطـەلیـب. بـۆ هەتیوو هەژارو ڕێبواری بێ خـەرجیو پارەیە. ئـەم دابەشـکردنەش بـەو شـێوە بـۆ ئەوەیە ماڵو سامان تایبەت نەبێ بە دەوڵەمەندەکانو هەر لەدەستی ئەواندا نەبێ.

**بەکورتی ( فیئ ) دەکرێتە پێنج بەش، بەشێك لەم پێنج بەشە بـەم شـێوە دەکرێتـە پێنج بەشو دابەش دەکرێ:**

١- بەشێك بۆ خوداو بـۆ پێغەمبـەری خودایـە تـا پێغەمبـەرﷺ لـەژیان دابـێ، پاش وەفاتی پێغەمبەرﷺ بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان خەرج دەکرێ.

٢- بەشێك بۆ خزمەکانی پێغەمبەرە (بنـو هاشـمو بـەنو موطـەلیـب) چونکە ئەمان زەکاتیان نادرێتێ.

٣- بەشێك بۆ هەتیوەکان.

٤- بەشێك بۆ هەژارەکان.

٥- بەشێك بۆ ڕێبوارێ کە پێویستی پێبێ.

چـوار بەشـەکەی تـر لەبەرژەوەندییـە گـشتیـیـەکـانی موسـوڵمانانـدا خـەرج دەکرێ.

هۆی ئەو تەقسیم کردنە بەو شێوەیە بۆ ئەوەی دەستاو دەستی مـاڵو سـامان هـەر بـۆ دەوڵەمەنـدەکان نـەبێ، هـەژارو بـێ نـەوایان لێـی بـێ بـەش نـەبن . ئـیتر دەوڵەمەندەکان زاڵ ببنو هەژارەکان بچەوسێننەوە.

﴿وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ ئەی موسولمانینە ئەوەی پێغەمبەر فەرمانتان پێ دەکا وەری بگرن و جێبەجێی بکەن، ئەوەی جلەو گیریتان لێ دەکا خۆی لێ بپارێزن و توخنی مەکەون. چونکە هەرچی فەرمانتان پێبکا بەکردنی، ئەوە خێرە بۆتان و ئەنجامی بدەن ئەوەی نەهیتان لێ دەکا شەڕو نەگبەتییە نزیکی مەکەون .

موسلیم و بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە فەرمودەیەکیان ریوایەتکردوە: کەپێغەمبەرﷺ فەرمووێەتی: (اذا أمرتکم بأمر فأتوا منه ما استطعتم، و ما نهیتکم عنه فاجتنبوه) ئەگەر فەرمانم پێکردن بە ئەنجامدانی کارێك ئەوە بەگوێرەی توانا ئەنجامی بدەن ئەوەی نەهیشم لێ کردن خۆتانی لێ بپارێزن.

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ لەخودا بترسن و پابەندی فەرمان و جلەو گیرییەکانی بن، بێگومان خودا سزای سەخت و دژواری هەیە بۆ ئەوانەی سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن و لێی یاخی دەبن!

دوای ئەوەی چۆنیەتی دابەشکردنی فەیئی بەیان کرد ئەمجار حاڵ و وەزعی ئەو هەژارانە دیاری دەکا: کە شیاوی ئەومن لە (فیئ) بەشیان بدرێ و دەفەرموێ:

﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنْ اللَّهِ وَرِضْوَاناً وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ واتە: ئەو چوار تاقمەی پێشوو (خزمەکانی پێغەمبەر ﷺ، هەتیوەکان، هەژارەکان، رێبوارانی بێخەرجی) ئەوانە هەژارەکانی موهاجیرەکان، ئەنصارەکان و تابعینن.

هەژارە موهاجیرەکان ئەوانەن: کافرەکانی مەککە ناچاریان کردن مەککە جێ بێڵن، لە پێناو رەزامەندیی خودادا دەستیان لە ماڵ و سامانی خۆیان هەڵگرت و زێدو لانەی خۆیان جێ هێشت بە هیوای بەدەستهێنانی رەحمەت و رەزامەندی خوداو رزق و رۆزیی لەدونیاداو پاداشتی باش لە قیامەتداو یارمەتیدانی ئایینی خوداو پشتگیری کردنی پێغەمبەرﷺ ..

﴿أُوْلَئِـكَ هُـمُ الـصَّادِقُونَ﴾ ئـەو كۆچـكەرە لـە خۆبوردوانـە ئـەو پـەڕی ڕاسـتگۆییيان نوانـدووە، لـە ڕاسـتگۆیی‌دا تواونـەوە، كردوەیـان نیـشانەی ئیمـانی ڕاستەقینەیانە، ئیمانیـان لـە دڵدایـەو هەڵوێـستو كردارەكانیـان نیـشانەی بـەهێزی ئیمانیانە. ئەوانە شایەتومانیان بـەزوبان گوتـووەو بـەكردەوە تەصدیقیان كـردوە، ڕاسـتگۆ بـوون لەگـەڵ خـودادا، لایـەنی ئـەویان هەڵبـژارد، ڕاسـتگۆ بـوون لەگـەڵ پێغەمبـەردا بەدڵسۆزی شوێنی كـەوتن، ڕاستگۆ بـوون لەگـەڵ حەقدا لـەوەدا: كـە نموونەیەكی حەقو ڕاستی بوون لەسەر زەوی. ئەمجار مـەدحی ئەنـصارەكان دەكـاو فەضلو جوانمەردیو خۆنەویستیو فەرمانبەرداریيان بۆ خوداو پێغەمبەری خـودا ڕون دەكاتەوە، ئەم كۆمەڵە موسوڵمانەش لە ڕەوشت بەرزیدا گەیـشتوونە ئاسـتێكو ئاسۆیەكیان بڕیوە ئەگەر بە فیعلی ڕوی نەدایە خەڵكی بەخـەونو خـەیاڵی حسێب دەكرد. دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيْمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَـيْهِمْ وَلا يَجِـدُونَ فِـي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُـسِهِمْ وَلَـوْ كَـانَ بِهِـمْ خَـصَاصَةٌ﴾ ئەوانـەی پـێش كۆچـكەرەكان نیـشتەجێی مەدینـە بـوونو ئیمـان بـەتاكو تـەنهایی خـوداو پێغەمبەرﷺ لە دڵیاندا ڕەگی داكوتاوە، كـە ئەنـصارەكانن، كۆچـكەرەكانیان خـۆش دەوێ، هەمئاهەنگیو هاریكاریيان دەكەن بە ماڵو دارایی خۆیان یارمەتییان دەدەن، هـیچ پێیـان نـاخۆش نیـە: كـە پێغەمبـەرﷺ فـەیئی (بنـو النـضیر)ی داوە بـە موهاجیرینەكانو بەشی ئەوانی نەداوە. بەڵكوو زۆریان پێ خۆشبوە، كە ئـەو مـاڵو سامانە لێی دراوە بە كۆچكەرەكانو بەشی وانی لێ نەدراوە، كۆچكەرەكانیان بەسـەر خۆیانـدا هەڵبـژارد بـۆ وەرگرتنـی ئـەو مـاڵو سـامانە، هەرچـەندە بـۆ خۆشـیان پێویستیان پێی بوو، كۆچكەرەكانیان پێش خۆیان خست.

﴿وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ كەسێك خودا لە بەخیلیو رژدی دڵو دەروونی بیپارێزێ، ئەوەی شەرع لەسەری پێویست كردوە بە گوێرەی توانا ئەنجامی بدا، ئەوانە بە مراز گەیشتونو رزگاریان بووە.

تیرمیذیو ئەبویەعلاو نیبنو مەردەویهی لەئەنەسی كوڕی مالیكەوە فەرمودەیەكیان بە مەرفوعی ریوایەت كردوە: دەڵێ تەپو تۆزی جیهاد لەپێناو ئاینی خوداو دوكەڵی دۆزەخ، لەناو بۆشایی هیچ بەندەیەكدا كۆنابێتەوە، ئیمانو رژدی، لەدڵی بەندەدا كۆنابێتەوە..

ئەحمەدو موسلیم لە جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتیان كردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆ بپارێزن لە ستەمكاریی، چونكە ستەم تاریكی رۆژی قیامەتە، خۆبپارێزن لە رژدییو چروكی، بێگومان رژدی بوو كەلە پێشینەكانی بەهیلاك برد، هەڵینان بۆ خوێن رشتنو حەڵاڵ دانان بە حەرام..

**بەكورتی ئەنصارەكان پێنج رەوشتی بەرزییان تێدا بوون:**

١- پێش (مهاجرین)ەكان نیشتەجێی مەدینە بوون، ئیمانو بیرو باوەڕی راستەقینە لە دڵیاندا جێگیر بووبوو.

٢- كۆچكەرەكانیان خۆش دەویست.

٣- تەماعكارو چاو چنۆك نەبوون.

٤- بەرژەوەندیی ئاتاجانیان پێش خۆیان خست، هەرچەندە بۆ خۆشیان موحتاج بووبن.

٥- سەخی سروشتو دڵفراوان بوون، تارمایی رژدیو چروكی پەی پێ نەبردبوون.

بۆیە قورئان بە رزگاربوو بەمراز گەیشتووی حسێب كردون.

ئەمجار پەروەدگار تاقمی سێیەم لەوانەی شیاوی ئەومن لەماڵی (فیئ) بەشیان بدرێ دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ

رَحِيمٌ﴾ ئەوانەی دوابەدوای چینی (مهاجرین)و ئەنصار هاتوون: کەپێیان دەگوترێ (تابعین) شوێن ڕێبازی موهاجیرینو ئەنصارەکان کەوتوون، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ﴾ (التوبة/١٠٠)

ئەو بەدوادا هاتوانە (التابعون) دەڵێن: خودایە؛ لەتاوانمان خۆش بی، هەروەها لەتاوانی برا رابوردووەکانمان خۆش ببە ئەوانەی بە ئیمانەوە دونیایان جێ هێشتووە، پێش ئێمە بەلیقای تۆ شادبوون، لە موهاجیرینو ئەنصار. خودایە! رقو کینەو غەڵو غەشو حەسودی دەرحەق بە موسوڵمانان لە دڵمان دەربهاوێ، خودایە! تۆ زۆر بەرەحمو خاوەن بەزەییت، دەیسا نزاکەمان لێ وەرگرە.

ئەم دەقە قورئانییانە سروشتی ئەم ئوممەتە موسوڵمانە بەو رووە گەشو ئاکارو رەفتار جوانییە نیشان دەدەن. یەکەم چینو دواچینی موسوڵمانان بەیەکەوە جۆش دەدا، هەمئاهەنگیو هاریکاریو خۆشەویستی نێوانیان رادەگەیەنێ، هەست بە پێوەندی خزمایەتی بێ سنوور دەکرێ لە نێوانیاندا هەنگاو بەسەر شوێنو زەمانو رەگەزو نژادا دەهاوێو هیچ ئیعتیبارێکیان بۆ دانانێو موسوڵمان یادی برای موسوڵمانی دەکاو دوایین بەسەر ڕێبازی پێشینەدا دەڕوا...

هەموویان یەك دڵو یەك زوبان شان بەشانی یەکتر خودا پەرستو خۆنەویست بەندایەتی پەروەدگاریان دەکەن. بەراستی نمونەیەکی هەرە بەرزی مرۆڤایەتیە، سینە سافو بێ غەش، دڵپاكو بێ کینە، بەپەرۆش بۆ یەکتریو دڵسۆزو راستاڵ لەگەڵ خۆیانو خودای خۆیاندا. ئەوەیە کاروانی ئیمان، ئەوەیە دوعاو پاڕانەوەی خاوەن ئیمان کاروانێکی بەفەڕو دوعایەکی پیرۆز!!

## دەست تێکەڵکردنی دووڕوو جولەکەو سزایان

۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا۟ لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا۟ لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِى صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ۖ ذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ

عَـٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَـٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٧﴾

لەوەپێش باسی جولەکەی (بنو النضیر)ی کرد، حوکمو بڕیاری چۆنیەتی خەرجکردنو دابەشکردنی ماڵو سامانی دەست بەسەرداگیراویانی ڕونکردنەوە، ئەمجار باسی دەست تێکەڵکردنی ناپیاوانەی دوڕووەکان لەگەڵ جولەکەکان دەکا، دوڕووەکان بەڕواڵەت لەناو ئەنصارەکاندا بوونو بە موسوڵمان دەژمێران، بەڵام بەنهێنی دۆستایەتی جولەکەو دوژمنانی ئیسلامیان دەکرد، کەوابێ لەراستی دا دوڕووەکان بوو بوونە دۆستو برای جولەکەکانو دوژمنی موسوڵمانەکان...

ئەم پەیوەندییە ناجوانمێرانەو چڵکاو خۆرییە، لە هەموو سەردەمو ڕۆژگارێکدا دوبارە دەبێتەوە، لە زۆر شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلانـدا ڕێ دەکەوێ تاقمێك خۆیان دەفرۆشنو دەبنە چڵکاو خۆری دوژمنو شان بەشانی دوژمنی سەر سەختی ئەو گەلو نەتەوە، هێرش دەبەنە سەر برای هاوسەنگەری خەباتی لەوەپێشیان، دەبنە سۆدرەی بەر لەشکرو پێش دوژمنی داگیرکەر دەکەون، یان بەڕواڵەت هەر لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان دا دەمێننەوە بەڵام لەژێرەوە پەیوەندی ناشەریفانە لەگەڵ دوژمن دەبەستنو دەبنە ئاڵقە لە گوێی دوژمنو بەتەوجیهاتی ئەو کاردەکەن.

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرى إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَداً أَبَداً﴾ ئایا ئەتۆ بەسەرسامیەوە نارِوانیو نابینی ئەو کۆمەڵە دووڕووە هەڵسو کەوتیان چۆنەو چی دەکەن؟ بەڕواڵەت لەگەڵ پێغەمبەرو لەریزی موسوڵمانان دان، لە دڵیشدا کافرو بێ بڕوان، کلکیان لەگەڵ جولەکەکانی (بنو النضیر) تێك باهەڵداوەو بوونە برا. ئەمجار پەیتاپەیتا بەبرا کافرەکانی ئەهلی کیتابیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین، واتە:

پەیوەندی بە جولەکەکانی (بنو النضیر)ەوە دەکەن کە بەقسەی پێغەمبەرﷺ لە قەڵاکانیان نەیەنەدەر، خۆیان قایم بکەن و بەرگری لەخۆیان بکەن، پێیان گوتن: ئێمە پشتگیریتان دەکەین، ئەگەر شەڕیان لەگەڵ کردن ئێمەش لەپاڵ ئێوەدا شەڕ لەگەڵ موسوڵمانەکان دەکەین، ئەگەر ئێوە لە وڵاتی خۆتان دەرکران ئێمەیش لەگەڵ ئێوە دەردەچین، هەرکەسێ بیەوێ لەم هەڵوێستەمان ژێوانمان بکاتەوە بەقسەی ناکەین. تەنانەت ئەگەر موحەممەدو هاوەڵانیشی داوامان لێ بکەن لەم هەڵوێستە پاشگەز ببینەوە بەقسەیان ناکەین. چەندێك ئەم کێشە درێژە بکێشێ و پێی بچێ ئێمە دەستتان لێ بەر نادەین.

﴿وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ خودا شایەتی دەدا کەئەو دووڕوانە درۆ دەکەن لە وادەکەیان داو هەرگیز بەڵێنی خۆیان نابەنە سەر.

﴿لَئِنْ أُخْرِجُوا لا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لا يَنْصُرُونَهُمْ وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الأَدْبَارَ ثُمَّ لا يُنْصَرُونَ﴾ سوێند بە خودا ئەگەر جولەکەی (بنو النضیر) لە وڵات و لانەی خۆیان دەربکرێن، مونافیقەکان لەگەڵیاندا دەرناچن و ماڵ و حاڵی خۆیان جێ ناهێڵن. ئەگەر شەڕیان لەگەڵدا بکرێ واتە: موسوڵمانان شەڕیان لەگەڵدا بکەن، مونافیقەکان ناچن بە هانایەوەو یارمەتییان نادەن. خۆ ئەگەر لە فەرزێکدا بچن بۆ یارمەتیدانیان، واتە بارودۆخێك بێتە پێشەوە ناچاربن بۆ یارمەتیدانیان، زوو پشت هەڵدەکەن و چنگ لەسەرشان هەڵدێن و ئاوڕنادەنەوە. ئیتر لەوەدوا بەبڕای بڕای دووڕوەکان یارمەتی جولەکەکان نادەن، بەڵکوو خودا ریسوایان دەکاو زەلیل و بێ دەستەڵات دەبن و دووڕوویی دادیان نادا.

لەوەدواش واقیعی حاڵ لەگەڵ ناوەڕۆکی هەواڵی قورئان یەکهاتنەوە، قورئان چۆنی فەرمووبوو واهاتەدی، جولەکەی (بنو النضیر) لەوڵات و لانەی خۆیان وەدەرنران، دووڕووەکان لەگەڵیان دەرنەچوون ، جولەکەی (بنو قریظة)و خەیبەر شەڕیان لەگەڵ کرا دووڕووەکان یارمەتییان نەدان، خودا

مـوژدەی دا بـە سـەرکەوتنی موسـوڵمانەکان بەسـەر هـەردوو تاقمـدا (جولەکـەو مونافیق)، وادەی خودا هاتە دیو نیوە دوورگەی عـەرەب لـە جولەکە پـاك بـووەوە. مەڵبەندی دەوڵەتی ئیسلامی جگە لەئاینی ئیسلام هیچ ئاینێکی تری تێدا نەما.

﴿لَأَنْتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِمْ مِنَ اللَّهِ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ﴾ ئێوە ئـەی موسوڵمانەکان سامو هەیبـەتتان لـەدڵو دەرونـی جولەکـەکان یـان دووڕووەکانـدا لـە سـامو هەیبـەتی خـودا زیـاترە، لـەئێوە پـتر دەترسـن تـا لـەخودا، ئـەوەش بـەهۆی ئەوەوەیە: ئەوانە گەلو نەتەوەیەکن ئەندازەی گەورەیی خودا نازانن، هەست بـەوە ناکەن خودا چەند خاوەن هێزو تواناو دەستەڵاتە، هەتا بە حەقیقەت لێـی بترسـن، ئەگەر عاقڵو زانا بونایە، دەیانزانی خودا شیاوی ئەوەیـە: کـە لەئـەو بترسـن نـەك لەئێوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژەی بـەوە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾ (النساء /٧٧)

ئەوانـە ترسـنۆكو ورە روخـاون، نـاتوانن لـە بەرامبـەر هێـزی موسـوڵمانان دا خۆرابگرن .

﴿لا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعاً إِلاَّ فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ﴾ جولەکـەو دووڕوەکـان شـەڕ لەگـەڵ ئێـوەی موسـوڵمان ناکـەن مەگـەر لـەناو چـەند گونـدو شاروچکەیەکدا نەبێ، یان لە پشت دیواری مەحکەمو تۆکمەی قەڵاو شوراوە نـەبێ. لەبەر ترسـنۆکیو نامـەردییان نـاتوانن بێنـە گۆڕەپـانی جەنگـەوەو روبـەڕوی ئێـوە بوەسـتن. بـەڵکوو ئەگـەر ناچاربوون، دەسـت بکەنـەوە ویـستیان بـەرگری لـەخۆیان بکـەن، خۆدەخەنـە نـاو گونـدو پـەنا دیـوارو شـورای قـەڵاکانیانو نـاو شـیوو دۆڵو ئەشـکەوت، (ئێـستا لـەناو دەبابـەو زرێ پۆشـدا خۆیـان قـایم دەکـەنو بـەرەنگاری منداڵی قۆچە قانی بەدەستی فەلەستینی دەبنەوە. دڵنیابـە ئەگـەر فەلەسـتینیەکان لـەژێر ئـاڵای ئیـسلامداو بـەگوێرەی ئـاینیی ئیـسلام شـەڕیان بکردایـە بـارودۆخ بەشێوەیەکی تر دەبوو).

﴿بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعاً وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَعْقِلُونَ﴾ دوژمنایه‌تی له‌نێوان خۆیان زۆر به‌هێزه، ئازارو زیانیان بۆیه‌کتر زۆر به‌تینه، رق‌و کینه‌یان له‌دڵدا بۆیه‌کتر له‌گڕو کوڵ دایه. تۆ که‌سه‌یریان ده‌که‌ی وادەزانی کۆك‌و ته‌بان، به‌رواڵه‌ت کۆمه‌ڵ‌و به‌واقیع په‌رته‌وازه، هه‌ریه‌که‌یان بیرو بۆچونێکی هه‌یه، مه‌به‌ست‌و ئارەزوو هیوایه‌تێکی جیا له‌وانی تری هه‌یه‌و ده‌یه‌وێ بێته جێ، ئه‌وه‌ش له‌به‌رئه‌وه‌یه نه‌ته‌وه‌یه‌کن رێ به‌حه‌ق نابه‌ن‌و گوێ به فه‌رمانی خودا ناده‌ن. نازانن؛ هۆکاری سه‌رکه‌وتن له ژیاندا یه‌کیه‌تی‌و ته‌بایی ناو ریزه‌کانی کۆمه‌ڵه. ئه‌گه‌ر عه‌قڵیان هه‌بوایه حه‌ق‌و راستیان ده‌دۆزییه‌وه‌و شوێنی ده‌که‌وتن، یه‌کیان ده‌گرت‌و په‌رته‌وازه نه‌ده‌بوون.

﴿كَمَثَلِ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ قَرِيباً ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ حاڵی ئه‌م جوله‌کانه‌ی (بنو النضير) وه‌کوو حاڵی ئه‌وانه وایه: که‌به‌م نزیکانه‌و له‌پێش ئه‌مانه‌وه بوون، وه‌کوو قورەیش له‌شه‌ڕی (به‌در)داو جوله‌که‌ی (بنو قینقاع) که پێغه‌مبه‌رﷺ له‌شاری مه‌دینه وه‌ده‌ری نان، ئه‌مان چییان به‌سه‌رهات له ده‌ردو مه‌ینه‌تی، به‌سه‌ر ئه‌وانیش هات، هه‌موویان به‌دبه‌ختی‌و سه‌رئه‌نجامی کوفرو بێدینی خۆیان له‌دونیادا چه‌شت‌و له‌قیامه‌تیشدا سزایه‌کی سه‌خت‌و دژوارو نه‌بڕاوه‌یان هه‌یه.

ئه‌مجار په‌روه‌ردگار نمونه‌یه‌کی تر بۆ حاڵی دووڕووه‌کان دێنێته‌وه‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ حاڵ‌و وه‌زعی ئه‌و دووڕووانه‌ش که واده‌و به‌ڵێنی به‌درۆ به جوله‌که‌کان ده‌ده‌ن‌و هه‌ڵیان ده‌نێن بۆ دژایه‌تیکردنی پێغه‌مبه‌رﷺ و موسوڵمانان، ده‌ق وه‌کوو حاڵی شه‌یتان وایه: که کوفرو بێدینی له‌به‌رچاوی ئاده‌میزاد شیرین ده‌کا، هه‌ڵی ده‌نێ‌و ده‌نه ده‌نه‌ی ده‌دا بۆ خراپه‌کاری‌و تاوانکردن، ده‌ڵێ تۆ ئه‌وه بکه من به‌رعوده ده‌بم رۆژی خۆی یارمه‌تیت ده‌ده‌م جا که ئاده‌میزاده‌که گوێڕایه‌ڵی

دەبێ‌و نوغرۆی کوفرو تاوان دەبێ، ئەمجار شەیتان خۆی لێ (تەبەڕڕا) دەکاو رۆژی قیامەت دەڵێ من لە عەزابی خودا دەترسم‌و ناوێرم یارمەتیت بدەم.

﴿فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدَيْنِ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ﴾ سەرەنجامی هەردوکیان (شەیتان: کە فەرمان دەکا بەکوفرو بێدینی‌و ئادەمیزادە لەخشتە براوەکە) بۆ دۆزەخە، رۆژی قیامەت فەرمانکەرو فەرمان پێکراو تور دەدرێنە ناو دۆزەخەوە بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە رزگار بوونیان نیە، ئەوەش سزای ستەمکارانە تێکرا بە جولەکەو دووڕووەکانیشەوە.

## فەرمان بە تەقواو خودا پەرستی

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾

لە ئایەتەکانی رابردودا حاڵ‌و وەزعی دووڕووەکان‌و جولەکەکانی بەیانکرد، ئەمجار روی خیطاب ئاڕاستەی خوداپەرستان دەکاو فەرمانیان پێ دەکا بە تەقواو خوداپەرستی، بەصیفەتی ئیمانداریی بانگیان لێ دەکا، ئوسلوبێك بەکار دێنێ جێبەجێ کردنی فەرمانەکە ئاسان بکا، فەرمانیان پێ دەکا بە پابەندبوون بە فەرمانی خوداو خۆپاراستن لە جڵەو گیرییەکانی، بەهەوڵدان‌و تێکۆشان لەدونیادا

بۆ قیامەت، خۆ ئامادەکردن بۆ بەختەوەریی ئەو دونیاو چونە ناو بەهەشت و بەمراز گەیشتنی گەورە.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو خودا بەتاک و تەنها دەناسن و پەیامی پێغەمبەرتان بەلاوە راستە، ئەوەی خودا فەرمانتان پێ دەکا بەگوێرەی توانا ئەنجامی بدەن و خۆ بپارێزن لەوەی جڵەوگیریتان لێ دەکا، لە سزاو تۆڵەی بترسن، با هەموو کەسێك بیر بکاتەوە چی بۆ قیامەت پێشکەش کردوە، هەمووتان موحاسەبەی خۆتان بکەن پێش ئەوەی موحاسەبە بکرێن، تەقوای خودا بکەن، بەدڵسۆزی بەندایەتی خۆتان ئەنجام بدەن، بێگومان خودا ئاگادارو زانایە بەکردەوەو حاڵ و وەزعتان، هیچی لێ گوم نابێ، پاداش و سزاتان دەداتەوە لەسەر گەورەو بچوك و زۆرو کەم، چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

﴿وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ أُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ وەکوو ئەوانە مەبن: کەفەرمانی خودایان پاشگوێ خست و ئەرکی سەرشانیان بەجێ نەهێناو ترسی خودایان نەبوو، خودایان لەبیرچووە ئیترخوداش خودی خۆیانی لەبیر خۆیان بردەوە، کردەوەیەکیان ئەنجام نەدا لە قیامەتدا سودی لێ ببینن و لەعەزابی دۆزەخ رزگاریان بێ، ئەوانە مافی خودایان بە فیڕۆداو سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو خۆیان بەهیلاك بردو رۆژی قیامەت ماڵوێران و خەسارەتمەندن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ (المنافقون/٩)

ئەمجار بەراوردکارییەك لەنێوان چاکەکاران و خراپەکاراندا دەکاو ئەوە روندەکاتەوە: کە ئەم دوو تاقمە وەکوو یەك نین و جوداوازییان عاسمان و رێسمانە، دەفەرموێ: ﴿لا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ هەرگیز یەکسان نین ئەوانەی شیاوی دۆزەخن و ئەوانەی شیاوی بەهەشتن، بەهیچ

شێوەیەك دۆزەخیو بەهەشتی نابن بەیەكو هاو تەرازونین. لە قیامەتدا بەهەشتیەكان بەمراز گەیشتوو بەختەوەرن، لە دۆزەخ رزگاریان بووەو بەبەهەشت شاد بوون!

ئایەتەكە ئەهلی دۆزەخو ئەهلی بەهەشت لێك جیادەكاتەوە، هیچ لێكچونو یەكسانێكیان لەنێواندا ناهێڵێ، ئەوە رادەگەیەنێ: كە ئەو دوو تاقمە بە سروشتو حاڵو وەزع، بە پەیڕەو پرۆگرامو بە رێڕەوو رەفتار، بەبیرو بۆچونو سەرنجام، یەك ناگرنەوەو بەهیچ شێوەیەك لەپلانو رێو رەسمو بیروبۆچوندا نابنەیەك. لە كۆتایی ئایەتەكەدا سەرنجامی بەهەشتیەكان دیاری دەكاو لە سەرەنجامی دۆزەخییەكان بێدەنگ دەبێ. چونكە ئاشكرایەو پیویست بە دیاری كردن ناكا.

## پلەو پایەی قورئانو گەورەیی پەروەردگار

﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ

ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٤﴾

لەوەپێش حاڵو وەزعی جولەکەکەو مونافیقەکانی بەیانکرد، ئەمجار فەرمانی بە موسوڵمانان کرد: کەتەقوای خودا بکەنو خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕۆژی قیامەت. پاشان پەروەدگار پلەو پایەی قورئان رادەگەیەنێو ئاماژە بەگەورەیی‌و عەظەمەتی ئەو کەسە دەکا: کە قورئانی نازڵ کردوەو خاوەنی ناوە جوانەکانە. دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُتَصَدِّعاً مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ واتە: بێگومان قورئان هێندە بەرزو پیرۆزە، هێندە فەصیحو بەلیغە، هێندە ئامۆژگاریو پەندو نەصیحەتی تێدایە، ئەگەر بماننارداتە بۆ سەر کێوێک لەکێوەکان، ئەو کێوە وەکوو ئادەمیزاد هەستو عەقڵو هۆشی هەبوایە، دەتبینی ئەو کێوە قایمو سەختە لەترسی خودا شەقو پەق دەبوو، دەکەوتە لەرزەو تێک دەرِوخا، ترسی عیقابو سزای لێ دەنیشت، ترسی ئەوەی دەبوو: کە نەتوانێ ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بداو نەتوانێ وەکوو پێویست رێز لەکەلامی پەروەدگار بگرێ.

﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ ئەو پەندو مەثەلانە بۆ ئادەمیزاد دەهێنینەوە، ئەو چیرۆکو سەرگروشتانەیان بۆ دەگێرینەوە، بەڵکوو بیربکەنەوەو لە پەندەکانی کەڵک وەرگرنو بەسەرگورشتەو ئامۆژگارییەکانی بەخۆیاندا بچنەوەو واز لە تاوانکاری بێننو شوێن پەیامی خودا بکەونو بەختەوەریی دونیاو قیامەت بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

مەبەست ئەوەیە: کافرەکان دڵرەقو دڵرِەشنو توند تەبیعەتن، سەرزەنشتیان دەکا لەسەرئەوە: کە گوێیان لە قورئان دەبێ خوشوعیان بۆ پەیدا نابێ، دڵیان نەرم

نابێ، کەچی کێو بەو رەقیو پتەوییەی ئەگەر هەستی هەبێو لەمەعنای قورئان بگا، لەتلەت دەبێو لەترسی خودا خۆ بەپێوە ناگرێ.

ئەمجار شکۆمەندیو بەرزی قورئان بەشێوەیەکی تر رادەگەیەنێ، ئەویش ئاماژەکردنە بەوە: کە قورئان لەلایەن خودایەکەوە نازڵ بووە: کە خاوەنی ناوە جوانەکانە دەفەرموێ:

﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ واتە خودا دابەزێنەری قورئانەو ئەو بەنیگا ناردویەتی بۆ پێغەمبەرﷺ خودا ئەو خودایەیە، هیچ خودانین جگە لەئەو، هیچ کەس پەروەدگار نیە ئەو نەبێ، هیچ کەس (واجب الوجود) نیە ئەو نەبێ. تاکو تەنهاو فەردو صەمەدە. زانای پەنامەکیو دیاریە، هەرچی لە بوونەوەردایە، هەر لەزەرە تا مەجەرە گەورەو بچوکو کەمو زۆر بە دیارو نادیاریەوە ئاگای لێیەتیو هیچی لێ گوم نابێ. خودایەکە خاوەن رەحمو بەزەییو میهرەبانە: لەدونیاو قیامەتدا، لە دونیادا بۆ هەموو کەسو لەقیامەتدا بۆ خودا پەرستان. دەریایی رەحمەتی بەرفراوانە چەندێکی لێ ببەخشێ کەم ناکا..

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (الأعراف/١٥٦) یان دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ (الأنعام /٥٤) لەدیدی موسوڵماناندا خودا بەندەکانی لەخۆی ناتەکێنێتەوە بەڵکوو چاودێرییان دەکا، نەگبەتی بۆ ناوێن دەیەوێ هیدایەتیان بدا، یارمەتیان دەدا بۆ بەگژدا چوونەوەی گومراییو شەڕو ئارەزۆ بازی!

﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ جارێکی تر صیفەتی وەحدانیەتی خودا دوبارە دەکاتەوە بۆ چەسپاندنو جێگیر بوون لە دڵەکاندا، خودایەکە کەس پەرستراو نیە ئەو نەبێ، بێ هاوەڵو بێ وێنەو میثالە، خاوەنی هەموو شتێکە،

هەموو بونەوەر ملكی خۆیەتی، بەویستی خۆی تەصەروفی تێدا دەكا، كەس نیە دەستی بەردەست بێنێو نەهێڵێ ئیرادەی بێتەجێ. زاتو صیفاتی پاكە لەهەموو عەیبو كەمو كورییەك هەرچی دەیكا لەجێی خۆیدایەو هیچ كارێكی نابەجێ نیە. هێمنیو ئارامی دەبەخشێ، هەموو مەخلوقات لەستەمی سەلامەتن، زوڵم لەكەس ناكا، كەس بەبێ تاوان سزانادا، بەخشندەی ئاسایشو ئیمانە، تەصدیقی پێغەمبەرانی دەكا بە موعجیزە، تەصدیقی ئیمانی ئیمانداران دەكا بەوەی كەوادەی پێداون لە پاداش. چاودێرو رەقیبە بەسەر بەندەكانیدا، ئاگای لەكردەوەكانیانە. وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اللَّهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ﴾ (یونس/٤٦)

عەزیزو بالآدەستە بەسەر هەموو شتێكدا، هەموو بونەوەر گەردنكەچو ژێر باریەتی. خاوەنی عەظەمەتو گەورەییە، لەهەموو كەمو كورییەك دوورە، هەر ئەو خاوەنی تەكەببورە، كەس نیە شیاوی ئەوەبێ هاوشانی خودا بكا لە صیفاتەكانیدا. لە فەرمودەی قودسیدا ریوایەت كراوە خودا فەرموویەتی: (العظمة ازاری، والكبریاء ردائی، فمن نازعنی واحدا منهما عذبته) عەظەمەتو كیبریاء دوو صیفەتی منن، هەركەسێ پێی وابێ مافی ئەوەی هەیە ئەو صیفەتانەی هەبێ سزای دەدەم.

خودا پاكو بەرزو پیرۆزە، لەو شتانەی كافرەكان دەیدەنە پاڵی، دوورە لەوەی هاوەڵی هەبێ، منداڵو خێزانی هەبێ، یان پێویستی بە مەخلوقاتی خۆی هەبێ.

﴿هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خودا خودایەكە بە دیهێنەرو ئەندازەكێشی مەخلوقاتە، هەرچی دروستی دەكا بە گوێرەی داخوازیو ویستی خۆیەتی، چۆنی بوێ ئاوا دروستی دەكاو دەیهێنێتە وجود، وێنەی هەموو مەخلوقاتی دەكێشێ لە

سەر شێوەی پێویستو بە گوێرەی حیکمەت، وەکوو لە ئایەتی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ (الانفطار /٨)

ناوی جوانو صیفاتی جوانی هەن، کەس هاوشانی ناکاو رایەی ناکەوێ هاوشانی بکا لەو ناوە جوانو صیفاتە جوانانەدا، چونکە عەزیزو بالآدەستە پاکە لەهەموو عەیبو لەککەو کەمو کوڕییەك. بۆیە هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە بە زوبانی حاڵ یان بەزوبانی گوتن، تەسبیحاتی زاتی پیرۆزی دەکەنو بە تاكو تەنهای دەناسن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ (الاسراء/٤٤)

لە سورەتی الاعراف ئایەتی ژمارە (١٨٠) جزمی نۆیەمی ئەم تەفسیرە لاپەڕە/١٦٣-١٦٤ دا ناوە جوانەکانمان نوسیون بە پێویستم نەزانی لێرە دوبارەیان بکەمەوە. هەربۆیەش لەسورەتی الاسراء ئایەتی /١١٠ دا کە باسی ناوە جوانەکانی خودا دەکا. سەر لەنوێ ناوە جوانەکانم نەنوسیەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی الممتحنة

ئەم سورەتە مەدەنییە، سیانزە ئایەتە، دوای سورەتی (الاحزاب) نازڵ بووە، ناوی نراوە (الممتحنة) چونکە باسی تاقیکردنەوەی ئەو ئافرەتانەی تێدایە: کە دوا پەیمانی (حدیبیة) دەهاتن موسوڵمان دەبوون، سەردەستەی ئەو ئافرەتانە (ئوممو کولثومی کچی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیەط) بوو، خێزانی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو، کوڕێکی لێ بوو ناوی (ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕڕەحمانە).

**پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشەوە لەدوو لاوەیە:**

١- لە سورەتی پێشودا باسی دۆستایەتی موسوڵمانان هەندێکیان بۆ هەندێکیانو باسی دۆستایەتی نێوان دووڕووەکانو جولەکەکانی کرد، لەم سورەتەشدا نەهی لە موسوڵمانان دەکا: کە دۆستایەتی کافرەکان بکەن بۆ ئەوەی نەچنە ریزی مونافیقەکانەوە.

٢- لە سورەتی حەشردا باسی پەیمانبەستنی نێوان موسوڵمانەکان لەگەڵ ئەهلی کیتابدا دەکا.

کەواتە هەردوو سورەتەکە باسی پەیمانو عەهدی موسوڵمانان دەکا لەگەڵ غەیری خۆیان. مەوضوعو باسی سەرەکی سورەتەکە وەکوو باقی سورەتەکانی مەدەنی رونکردنەوەی ئەحکامی تەشریعییە، ئەم سورەتە گرنگی دەدا بە ئەحکامی پەیمان لەگەڵ بەستراوان لەو موشریکانەی شەڕیان لەگەڵ موسوڵمانەکان نەکردوە، هەروا ئەحکامی ئەو ئافرەتانەی موسوڵمانن و لە مەککەوە کۆچ دەکەنو بە تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە لەگەڵیان.

## نەهی کردن لە دۆستایەتیکردنی کافرەکان

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَـٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ

أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا۟ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ ۚ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾

دەربارەی سەبەب نـزولی ئایەتی یەکەم، بوخاری‌و موسلیم‌و هی تریش لە عەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ من‌و زوبەیرو میقدادی کوڕی ئەسوەدی بانگ کردین فەرمووی: بڕۆن تادەگەنە باخی (خاخ) شوێنێکە لە نێوان مەدینەو مەککەدایە (١٢) میل لە مەدینەوە دوورە، لەوێ ئافرەتێکی لێیە لەناو کەژاوەدایە نامەیەکی لایە، ئافرەتەکە بگرن‌و نامەکەی لێ بستێنن‌و بۆم بێنن .

عەلی دەڵێ: ڕۆیشتین تا گەیشتینە باخەکە، کە چوین کەژاوەکە لەوێ بوو، ئافرەتەکەی تێدابوو وتمان: نامەیەکت لایە بماندەرێ، وتی: هیچ نامەم لانین، وتمان: نامەکەمان نەدەیە دەتپشکنین‌و پۆشاکەکەت لێ دادەکەنین ئیتر ناچار بوو نامەکەی لەناو مووی تەوقە سەری دەرهێنا، نامەکەیان هێنایەوە بۆ مەدینە، کەخوێندیانەوە .

لە حاطەبی کوڕی بەلتەعەوە نوسرابوو بۆ موشریکەکانی مەککە، هەواڵی ئەوەی پێ ڕاگەیاندون: کە پێغەمبەرﷺ نیازی ئەوەی هەیە پەلاماری مەککە بدا.

ئیتر پێغه‌مبه‌رﷺ حاطه‌بی بانگ کردو فه‌رمووی: بۆچی ئه‌مه‌ت کردوه؟ ئه‌ویش وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا! له‌گه‌ڵما له‌سه‌ره‌خۆبه، باعه‌رزت بکه‌م چی پاڵی پێوه‌نام بۆئه‌م کاره. من بۆ خۆم قوڕه‌یشی نیم، ماڵو منداڵه‌که‌م له‌ناو ئه‌وان دایه، کۆچکه‌ره‌کانی تر خزمو که‌س‌وکاریان له مه‌ککه‌دا هه‌یه، ماڵو منداڵیان ده‌پارێزرێ، من خزمو خوێشم له‌وێ نیه، ویستم به‌ناردنی ئه‌م نامه‌یه پیاوه‌تیه‌کم به‌سه‌ریانه‌وه هه‌بێو ماڵو منداڵه‌که‌م بپارێزن. دڵنیابه ئه‌و کاره‌م له‌به‌رئه‌وه نیه له دڵدا کافربم یان له‌ئایین هه‌ڵگه‌ڕابمه‌وه یان به کوفر رازی بم! له‌به‌ر ئه‌و هۆیانه هیچیان نیه. پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: راست ده‌کا.. ده‌رباره‌ی ئه‌وه ئه‌م سوره‌ته نازڵ بووه‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ﴾ ئه‌ی ئه‌و که‌سانه‌ی بڕواتان به خودا هێناوه‌و شوێن پێغه‌مبه‌رﷺ که‌وتوون بڕواتان به تاك‌و ته‌نهایی خوداو ڕاستی پێغه‌مبه‌رێتی موحه‌ممه‌د کردوه. دوژمنی من‌و دوژمنی خۆتان مه‌که‌نه دۆست‌و براده‌رو یارمه‌تیده‌ر، خۆشتان بوێن‌و هاریکاریان بکه‌ن! له‌ژێره‌وه په‌یوه‌ندییان پێوه مه‌که‌ن، به‌مجۆره هه‌واڵی نیازو هه‌ڵس‌وکه‌وتی پێغه‌مبه‌رﷺو موسوڵمانانیان پێ بگه‌یه‌نن!

نمونه‌ی ئه‌م ئایه‌ته ئایه‌تێکی تره که ده‌فه‌رموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ (المائدة/٥١) ئه‌م ئایه‌ته به ئاشکرا ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێ که که‌سێك به دڵ یارمه‌تی کافرو بێدین بدا له ئایین ده‌شۆڕێو کافرده‌بێ. هۆی ئه‌و نه‌هیه له دۆستایه‌تی کافره‌کان کوفرو هه‌ڵوێستی ناشرینیانه به‌رامبه‌ر پێغه‌مبه‌رﷺ و موسوڵمانان وه‌کوو ده‌فه‌رموێ:

﴿وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنْ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ بێگومان ئه‌وانه کافرن‌و بڕوایان به تاك‌و ته‌نهایی خوداو پێغه‌مبه‌رێتی موحه‌ممه‌د نیه، په‌یامی قورئان ره‌تده‌که‌نه‌وه، وێڕای ئه‌وه‌ش پێغه‌مبه‌رو

موسوڵمانانیان ناچار کردوه لەمەککە کۆچ بکەنو لەپێناو ئایینی خودادا ماڵو لانەی خۆیان جێ بێڵن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ﴾ (الحج/٤٠).

ئەمجار موسوڵمانان هەڵدەنێ لەسەر دۆستایەتی نەکردنو خۆش نەویستنی ئەهلی کوفر دەفەرموێ: ﴿إِنْ كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَاداً فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي﴾ واتە: ئەو کافرو موشریکانە مەکەن بە دۆستو برادەری خۆتان ئەگەر راست دەکەن ئێوە لەپێناو ئایینی مندا کۆچتان کردوە رەزامەندیی منتان مەبەستە، دوژمنی منو خۆتان خۆش نەوێ وەلحاڵ ئەو دوژمنانە لەبەرئەوەی ئیمانیان هێناوە ئێوەیان لەزێدو نیشتیمانی خۆتان دەرکردوە، ئێستا رقیان لە خۆتانو ئایینەکەشتانە، دەی کەوایە ئێوە بە چ عەقڵێك ﴿تُسِرُّونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ﴾ نامەی پەنامەکییان بۆ رەوانە دەکەنو لەژێرەوە پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵدادەبەستنو بەهۆی ئەو پەیوەندیو دۆستایەتییەوە ئەوان بەسەر پلانو نەخشەی پێغەمبەرو موسوڵماناندا ئاگادار دەکەن؟ وەلحاڵ من ئاگاداری هەموو پەنامەکیو ئاشکرایەکتانم لە هەموو کەس باشتر دەزانم چی لەدڵتاندایەو چی دەردەخەن!

﴿وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ هەرکەسێ دۆستایەتی ئەهلی کوفر بکاو خۆشی بوێنو بەسەر پلانو نهێنی موسوڵماناندا ئاگاداریان بکا، ئەوە رێگەی راستی گوم کردوە، لای داوە لەو شەقامە رێیەی دەیگەێنێتە بەهەشتو رەزامەندی خودای لێ دەستەبەر دەبێ. ئەی موسوڵمانینە یارمەتی کافرەکان مەدەن، هەلیان بۆ مەڕەخسێنن زەرمە لە موسوڵمانان بێنن.

﴿إِنْ يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ ئەگەر ئەوان توشتان بنو فرسەتتان لێ بێنن، هەڵسو کەوتی دوژمنانەتان لەگەڵدا دەکەن، رقو کینەی ناو دڵی خۆیانتان پێ دەڕێژنو چییان بۆ

بکرێ لە خراپەو ئەزیەتدانتان ئەنجامی دەدەن. بە زوبان جنێوو قسەی ناخۆشتان پێ دەڵێن. ئاواتە خوازی ئەوەن لە ئیسلام پاشگەز ببنەوەو بە خودا کافربنو شوێن پێغەمبەرﷺ نەکەون، ئەوان هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان ئێوە توشی خێرو خۆشی نەبن، دژایەتیان بۆ ئێوە لەناخەوەیەو ڕەگی داکوتاوە، بەنهێنیو بەئاشکرایە، دەی چۆن ئێوە دۆستایەتی کەسانی ئاوەها دەکەن؟

خۆ کەسێك لەدوای کوفر، ئیمان بچێژێو دوای گومڕایی بە نوری ئیمان هیدایەت بدرێو بە بیرو بۆچونی موسوڵمانانە بژیو هەستو شعوری بەو پەیامە پیرۆزە مشتومالْ کرابێو دڵی بەو بیرو باوەڕە ئارامی گرتبێ، پێی ناخۆشە بگەڕێتەوە بۆ کوفر وەکوو چۆن پێی ناخۆشە بیخەنە ناو ئاگرەوە بگرە زیاتریش، دەی ئەو دوژمنانەی خودا ئاواتە خوازی ئەوەن ئێوە بگەڕێنەوە بۆ دۆزەخی کوفر، لەکاتێکا ئێوە لێی ڕزگار بونو چونە بەهەشتی ئیمانەوە.. دەی ئێوەی خاوەن باوەڕ چۆن دۆستایەتیو برادەری ئەو کەسانە دەکەن؟

ئەمجار پەروەدگار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە پەیوەندی ئایینو باوەڕ لە پەیوەندی خزمایەتیو برادەریەتی بە هێزترو بەسود ترە، دەفەرموێ: ﴿لَنْ تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلا أَوْلادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ ڕۆژی قیامەت خزمو ماڵو منداڵتان فریاتان ناکەون ئەدی ئێوە چۆن لەپێناوی ئەواندا موالاتی کافرەکان دەکەنو دۆستایەتییان لەگەڵ دەبەستن؟ وەکوو ئەوەی ڕوی دا لە چیرۆکی حاطەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەدا. بەڵکوو ئەوەی فریای ئێوە دەکەوێ فەرمانبەرداری فەرمانی خوداو پێغەمبەرە لەدژایەتی کردنی ئەهلی کوفرو دۆستایەتی نەکردنیان، یەکیەتیو تەبایی ناو خۆتانە لەسەر کاری خێرو گوێڕایەڵی بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەرﷺ لەڕۆژی قیامەتدا خودا نێوانتان دەکاو ئیمانداران بۆ بەهەشت ڕەوانە دەکاو تاوانبارو کافرەکان تورِ دەداتە ناو دۆزەخەوە. خودا ئاگاداری کردارو نیازو ڕازتانە، دەزانێ چی دەکەنو دڵتان چی تێدایە. پاداشو سزاتان دەداتەوە چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە..

مەبەست ئەوەیە: خزم‌و کەس‌وکار فریاتان ناکەون ئەگەر خودا بیەوێ سزاتان بدا، قازانجیان بۆتان نابێ ئەگەر ئەوان بەسەر پێچکردنی فەرمانی خودا رازی بکەن، کەسێك لەسەر کوفری ماڵ‌و منداڵی بێ دەنگ بێ‌و لەگەڵیان تەبابێ بۆ ئەوەی رازییان بکا، ئەوە خەسارەتمەندە بەدبەخت‌و چارە رەشە، لای خودا خزمایەتی دادی نادا، با خزمی نزیکی پێغەمبەرێکیش بێ، تەرازوی چاکەو خراپە کردەوەیە، ئیمان‌و کردەوە بەرزی‌و نزمی بە ئادەمیزاد دەکا، خزمی فلانە کوڕی فلانە دادی نادا.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ﴾ (المؤمنون/١٠١) رۆژی قیامەت رۆژی نەفسی نەفسییە کەس وەسەر کەسی ناپرژێ، کەس ناتوانێ یارمەتی خۆشەویسترین کەسی خۆی بدا، بەڵکوو کە دەیانبینێ لەبەریان هەڵدێ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ، وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ (عبس/٣٤-٣٧) لەروانگەی ئەم ئایەتەوە زانایانی ئیسلام دەربارەی کوشتنی جاسوس کەوتوونە راجیاییەوە؛ ئیمامی مالیك‌و ئیمامی ئەوزاعی فەرموویانە ئەگەر موعاهەدو ئیمی جاسوسییان دژی موسوڵمانان کرد کوشتنیان دروستە، چونکە ئەوکاتە دەبنە پەیمانشکێن.. جەماوەری زانایان دەفەرموون: پەیمانی (معاهد) بە جاسوسی کردن هەڵناوەشێتەوە، بەلام دەربارەی ئیمی حەنبەلیەکان دەڵێن: پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، چونکە ئەهلی شەڕو موشریکەکان بەسەر نهێنی موسوڵماناندا ئاگادار دەکەن، شافیعیەکان دەڵێن: پەیمانی ئیمی بەجاسوسی کردن هەڵناوەشێتەوە، مەگەر لەکاتی پەیمان بەستنەکەیدا جاسوسی نەکردنی لەسەر بکرێتە مەرج. بەلام جاسوسی موسوڵمان واتە: کەسێك موسوڵمانبێ‌و جاسوسی بۆ دوژمن بکا زانا پایە بەرزەکانی مەذهەبی ئیمام مالیك دەفەرموون دەبێ بکوژرێ.

جەماوەری زانایان دەفەرموون بەڵکوو تەمبێ دەکرێ بەشێوەیەك لەشێوەکانی تەمبێ کردن.

هەردوو لایان لەرووداوی (حاطب)ە وە بەڵگەیان هەڵساندوە؛ ئەوانەی دەڵێن: دەکوژرێ بەڵگەیان ئەوەیە: پێغەمبەرﷺ رێگەی دا عومەری کوڕی خەتتاب (حاطب) بکوژێ، ئەگەر مانیع نەبوایە، بەڵام مانیع هەبوو چونکە (حاطب) یەکێك بوو لە جەنگاوەرانی بەدر، جەنگاوەرانی بەدریش خودا لێیان خۆشبووە. ئەوانەی دەڵێن: ناکوژرێ بەڵگەیان ئەوەیە: دەڵێن: پێغەمبەرﷺ (حاطب)ی نەکوشت چونکە موسوڵمان بوو.

## شوێنکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ

وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦﴾ ۞ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً ۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٌ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾

**دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی (٧) زانایانی تەفسیر فەرموویان: کە ئایەتی ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ ....... الآية﴾ نازڵ بوو موسوڵمانان بەتەواوەتی لەخزمە موشریکەکانیان دابڕانو دوژمنایەتی خۆیان بۆ دەربڕینو خۆیان لێ بێ بەری کردن، ئەمەش لەسەرشانی موسوڵمانەکان زۆر قورس بوو، ئاواتەخواز بوون خودا دەروێکیان لێ بکاتەوەو بتوانن جۆرە پەیوەندییەکیان بە خزمە موشریکەکانیانەوە بکەن ئیتر پەروەدگار ئایەتی ﴿عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً﴾ ی نازڵ کرد..**

**موژدەی ئەوەی پێدان: کەخودا سروشتی موشریکەکان دەگۆڕێو خۆشەویستی ئایینی ئیسلامیان لە دڵدا دەڕوێنێو نێوان ئێوەو ئەوان خۆش دەبێ. پاش ماوەیەکی کورت ئەم وادەیەی خودا هاتەجێ، زۆر لەو موشریکانە موسوڵمان بوونو تێکەڵاوی یەکتر بوونەوەو ژنو ژنخوازیو دۆستایەتیان لەنێوان پەیدابوو، خزمایەتیەکەیان دەمەزمرد کردەوە.**

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە لەوەپێش پەروەدگار نەهی کرد لە دۆستایەتیکردنی کافرەکانو سەرزەنشتی ئەوانەی کرد: کە دۆستایەتییان دەکەن ئەوەی ڕاگەیاند کە پەیوەندی ئایین لەهەموو پەیوەندییەك بەهێزترەو هەر ئەو بەپەیوەندی حسێبە. ئەمجار فەرمان بە موسوڵمانان دەکا: کەلاسایی ئیبراهیمو شوێنکەوتوانی بکەنەوە: کە خۆیان لە خزمو کەسو کارە**

کافرەکانیان دابڕیو خۆیان لێ بێ بەری کردن. وتیان: هەتا کافربن ئێمە لێتـان بـێ بەرین: کە ئیمانتان هێنا دوژمنایەتیەکەمان دەبێتە خزمایەتیو دۆستایەتی..

دەفەرموێ: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ﴾ ئـەی موسـوڵمانینە؛ ئێـوە لـە بیروبـاوەڕو هەڵوێـستو ڕەفتـاردا قـدوەو ڕەمزێکتـان هەیـە لـە ئیـبراهیمو شـوێنکەوتوانیدا ڕەنـگ دەداتـەوە. بێگومـان هەیـە بـۆ ئێـوەی موسـوڵمان لـە ئیـبراهیمو شـوێنکەوتوانیدا صـیفەتو هەڵوێـستێکی جـوان: کـە شـیاوی ئەوەیە: ئێوە پەیڕەوی بکەن، ئـەوەبوو ئیبراهیمـی خـەلیلو شـوێنکەوتوانی بە گەلو نەتەوەکەی خۆیانیان گوت: ئێمە لەئێوە بێ بـەرین لەهەمـوو ئـەو بـتو صـەنەمانەی جگـە لـەخودا دەیانپەرسـتن، ئێمـە دژی هـەموو ئـەو شتانەین، ئێـوە بڕواتـان پێیانـەو پەرستـشیان بـۆ دەکـەن، دژی بـیرو بـاوەڕو کـردەوەو ڕەفتـارو ناکارتـانین. بێگومـان ئـەو بتانـەی ئێـوە دەیانپەرسـتن نەدەتوانن سود بگەیەنن نەزیان.

﴿وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ ئەمـە هەڵوێستو بڕیاری ئێمەیە بەرامبەر بەئێوە، هەتا ئێوە کافربن ئێمـە هەڵوێـستمان بەرامبەر بەئێوە بەو جۆرە دەبێ. لێتـان گۆشـەگیر دەبـین تـا ئـەو کاتـەی بـڕوا بـە خـودای تـاکو تـەنها دەکـەنو واز لـە بتپەرسـتی دێـننو دەسـت دەکـەن بـە یەکتاپەرستیو پابەنـدی فـەرمانو حڵەو گیرییـەکانی دەبـن، هـەرکاتێ واتـان کـرد دژایەتیو ناحەزییەکەمان دەبێتە دۆستایەتیو خۆشەویستی!!

ئەی موسوڵمانینە؛ ئێوە لەهەموو شتێکدا شوێن ئیبراهیمـی خـەلیلو یـارانی بکەون، بیکەنە پێشەوای خۆتان: ﴿إِلاَّ قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ جگـە لـەو قـسەیەی ئیـبراهیم: کـە بـەباوکی گـوت: داوای لێخۆشبونت بۆ دەکەم، ناشتوانم عـەزابی خـودات لێ دوور بخەمـەوە، لـەم قـسەیەیدا

شوێنی مەکەون داوای لێخۆشبون بۆ موشرکەکان مەکەن، چونکە ئەو داواکردنەی ئیبراهیمی خەلیل لەخودا بۆ لێخۆشبون لەباوکی، وادەیەك بوو پێش وەخت بە باوکی دابوو، نەشی زانییوە: کە دوژمنی خودایەو بە کافری دەمرێ. کاتێك بۆی دەرکەوت دوژمنی خودایە پەخەی خۆی لێ هەڵتەکاند.

هەندێ لە موسوڵمانەکان داوای لێخۆشبونیان بۆ باوكو دایکی بتپەرستیان دەکردو دەیانگوت: حەزرەتی ئیبراهیم داوای لێخۆشبونی بۆ باوکی کردوە، ئێمەش چاو لەو دەکەینو لەخودا دەپاڕێینەوە لە باوكو دایکی بەکافری مردومان خۆش ببێ..

ئیتر پەروەدگار نەهی لێ کردن بە ئایەتی: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ، وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾ (التوبة/١١٣-١١٤).

حەزرەتی ئیبراهیم کە لەگەڵو نەتەوەکەی گۆشەگیر بوو هەموو پشتو پەنایەکی پەروەدگار بوو، وەکوو دەفەرموێ: ﴿رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ خودایە! ئێمە لە هەموو شتێکدا پشت بەتۆ دەبەستین، هەموو کارێکمان بە تۆ دەسپێرین، پەشیمانین لەهەموو تاوانێكو خۆمان خستەوە بەر قاپی رەحمەتی تۆ، سەرەنجامی ئێمە لە قیامەتدا بۆ لای تۆیە.

﴿رَبَّنَا لا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خودایە! مەمانکە بە فیتنەو جێگەی بەڵاو مەینەتی لەلایەن کافرەکانەوە، بەدەستی ستەمکارانەی ئەوان سزامان مەدە، زاڵیان مەکە بەسەرمانداو گیرۆدەمان بکەن بەسزاو نارەحەتیەك نەتوانین خۆی بۆ بگرین. تاوانمان داپۆشەو مەهێڵە کەس پێمان بزانێ، هەر خۆت بیزانەو بۆ خۆت چاو پۆشی لێ بکە! بێگومان ئەی خودایە! تۆ خاوەنی هێزو توانای لەبن نەهاتووی‌و بەسەر هەمووشتێکدا باڵا

دەستی، هەر کەسێ پەنا بەڤاپی تۆ بێنێ پارێزراوە، تۆ داناو حەکیمی لە کردارو گوفتارتدا، هەرچی دەیکەی لەجێی خۆیدایەو هەرچی دەیڵێی بەجێیە.

موجاهید دەفەرموێ: مانای ﴿رَبَّنَا لا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بەم جۆرەیە: خودایە بەدەستی کافرەکان سزامان مەدە، بۆ خۆشت لە سزای خۆت بمانپارێزە، نەوەکوو کافرەکان بڵێن: ئەگەر ئەوانە لەسەر حەق بونایە توشی ئەو سزایە نەدەبوون!

﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ بێگومان هەیە بۆ ئێوە لە هەڵوێستو کرداری ئیبراهیمو شوێنکەوتوانیدا، قودوەی جوانو رەوشتی بەرزو پەسند، ئەمەش بۆ کەسێك تەماعی خێرو چاکەی هەبێ، لە دونیاو قیامەتدا هیوای نەجاتبوونی قیامەتی هەبێ، هەرکەسێ پشت لە فەرمانی خودا هەڵبکاو دۆستایەتی دوژمنانی خودا بکاو خۆشی بوێن، ئەوە تەنیا زیان بە خۆی دەگەیەنێو بەس. خۆدا بێ ئاتاجە لەهەموو عالەم، هیچ ئیحتیاجی بەکەس نیە، سوپاسکراوە لەسەر گوفتارو کرداری هیچ خودانین جگە لەئەو، کەس پەروەدگار نیە ئەو نەبێ.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن تَكْفُرُواْ أَنتُمْ وَمَن فِي الآرْضِ جَمِيعاً فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ (ابراهيم/٨)

وشەی (حميد) دەگونجێ بەمانا (حاميد) بێ واتە: سوپاسی بەندەکانی دەکاو لەسەر کردەوەی کەم پاداشتی زۆریان دەداتێ. دەشگونجێ بەمانای (محمود) بێ واتە: شیاوی سوپاسەو هەموو خەڵك پێویستە سوپاسی بکەن.

﴿عَسَى اللَّهُ أَنْ يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُمْ مِنْهُمْ مَوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ بەهیوای ئەوەبن خودا خۆشەویستی بخاتە نێوان ئێوەو ئەوانەی

دوژمنایـەتییان دەکـەن، خـودا بەسـەر هـەموو شـتێك دا بەتوانایـە، خـودا تاوانبەخشو خاوەن بەزەیىو میهرەبانە .

وشەی (عسی) کە بەمانا رەجایە: کەلە خوداوە بوو، مانای تەحقیقە، تەئکید دەگەیـەنێ واتـە: بـە تەئکیـد ئـەو کـارە دەبـێ. موسـوڵمانان: کەئەمـەیان بیستوە حەتمەن دڵنیابوون لەوە: کە ئـەو رەجایـە دێتـەجێ. زۆریـشی پـێ نەچـوو مەککە رزگارکرا، قورەیشیەکان ئیمانیـان هێنـاو هـەموویان هاتنـە ژێـر ئـاڵای ئیـسلامەوەو رقو کینەی رابوردویان لەدڵدا نەماو هەموویان بونە بـراو خۆشەویـستی یـەکتریو یەکدڵو یەك گیان لەپێناو ئاییندا جیهادیان کردو تێکۆشـان، بـە تـەواوی لـەخۆیان بـوردنو گیـانو ماڵیـان لـەرێی خـودادا بەخـشیو بوونـە نموونـەی فیـداکاریو جوانمەردیو ئازایەتیو خۆنەویستیو خوداپەرستی!!

## پەیوەندی نێوان موسوڵمانانو کەسانی دیکە

﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نـزولی ئایـەتی ژمـارە (٨) ئەحمـەدو بوخـاریو موسـلیم لـە ئـەسمائی کـچی ئەبوبـەکرەوە ریوایـەت دەکـەن: کـەدەڵێ: دایکـم هـات بـۆ مەدینـەو

بتپەرست بوو، لەو سەردەمەدا قورەیش (معاهدة)یان لەگەڵ پێغەمبەردا بەستبوو، هاتمە خزمەت پێغەمبەرﷺ وتم: ئەی رەوانەکراوی خودا! دایکم هاتوە دەیەوێ بم بینێ، ئایا پەیوەندی پێوە بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، پێشوازی دایکت بکە، ئیتر پەروەدگار لەوبارەوە ئایەتی: ﴿لا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ﴾ی نازڵ کرد.

ئەحمەدو بەززارو حاکمو هی تریش لە عەبدوڵلای کوری زوبەیرەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: قوتەیلەی کچی (عبد العزاء) بتپەرست بوو، سەردانی کچەکەی خۆی کرد: کە ئەسمای کچی ئەبوبەکر بوو، هەندێ دیاریشی بۆ هێنابوو، ئەسما دیاریەکانی لێ وەرنەگرتو نەشی هێشت بچێتەماڵەوە، هەتا ناردی بۆلای عائیشە: کە لەم بارەوە پرسیاری بۆ لە پێغەمبەرﷺ بکا، کەپرسیاری کرد پێغەمبەرﷺ فەرمووی: با دیارییەکەی لێ وەربگرێو بیشیباتە ماڵەوە، ئیتر ئایەتی ﴿لا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ﴾ی نازڵ بوو.

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە :**

لەوەپێش نەهی کرد لەدۆستایەتی کردنی کافرەکان، موسوڵمانانی هەڵنان کەلاسایی ئیبراهیمو شوێنکەوتوانی بکەنەوە، هەواڵی ئەوەشی پێدان کەبەتەمابن ئەو موشریکانە واز لە بتپەرستی بێننو موسوڵمان بن، ئەمجار تاخودا ئەو رەجایە دێنێتە دی، رێگەی بە موسوڵمانان دا: کە دۆستایەتیو پەیوەندی لەگەڵ ئەو موشریکانەدا بکەن کەشەریان دژی موسوڵمانان نەکردووە، لەماڵو لانەی خۆیان دەریان نەکردون، رێگەی دان چاکەیان لەگەڵدا بکەن بەدادوەرانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن. فەرمووی:

﴿لا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ خودا مەنعی ئەوەتان لێ ناکا کە چاکەو پیاوەتی لەگەڵ ئەو کافرانەدا بکەن: کە بەئاشتی لەگەڵ ئێوەدا جوڵاونەوە،

شەڕیان لەگەڵ نەکردون، وەکوو ئافرەتو بێ دەستەلاتەکانیان. ج حەرەجی تێدا نیە: کەصیلەی رەحمیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن، یارمەتی هاوسێو میوانداریيان بکەن، ئێومیان لەماڵو حاڵی خۆتان دەرنەکردوە. هیچ حەرەجی تێدا نیە کە بە عەداڵەت لەگەڵیاندا مامەڵەبکەنو مافی خۆیان بدەنێ، وەفا بەوادەیان بکەن، کڕینو فرۆشتنیان لەگەڵدا بکەن!! بێگومان خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێو لێیان رازییەو ستەمکارانی خۆش ناوێ...

﴿إِنَّمَا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ﴾ خودا: کە نەهیتان لێ دەکا لەدۆستایەتیکردنی موشریکەکان ، نەهی لەدۆستایەتیکردنی ئەوانە دەکا: کەدوژمنایەتییان کردون ، لەپێناو ئایینەکەتاندا شەڕیان لەگەڵ کردون: کە بریتین لە ملهوڕەکانی قوڕەیشو ئەوانەی هاریکارییان کردون لە مەککەییەکانو هاوپەیمانانیان لەسەر ماڵو حاڵی خۆتان دەریان کردون، هاوکاری ئەوانەیان کردوە: کە ئێومیان دەرکرد. خودا نەهیتان لێ دەکا لەوەی ئەوانە بکەنە دۆستو برادەرو خۆشتان بوێن. کەسێك ئەوانە بکاتە دۆستو خۆشەویستیو هاریکارییان بکا، ئەوانە ستەم لە خۆیان دەکەن، خۆیان شیاوی عەزابی سەختی خودا کردوە.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾(المائدة/٥١) ئەمە یاسایەکی بەردەوامی پەیامی ئیسلامە، یاسای مامەڵەکردنی موسوڵمانانە لەگەڵ غەیری خۆیاندا باشترینو گونجاوترین یاسایەکە: کە لەگەڵ سروشتی ئەم ئایینەدا هەڵ دەکا. هەر ئەم یاسایەیە دەکرێتە بناغەی یاسای نێودەوڵەتیو چۆنیەتی مامەڵکردنی موسوڵمانانو دەوڵەتی ئیسلامی لەگەڵ جیهانی دەرەوەیاندا لەگەڵ کافرو موشریکەکان دا.

یاسایەکە ئاشتەوایی دەکاتە حاڵەتێکی بەردەوامو هەمیشەیی لەگەڵیان، مەگەر دەستدرێژی بکەنەسەر موسوڵمانانو شەڕیان دژ ڕابگەیەنن، یان ترسی خیانەتو هەڵوەشانەوەی عەهدو پەیمانیان لێ چاوەڕوان بکرێ، یان بەهێزەوە ببنە بەربەست لەبەردەم بڵاوبوونەوەی پەیامی ئیسلامداو نەهێڵن بانگخوازانی ئیسلام بە ئازادی بانگەوازی خۆیان بکەن.

## حوکمی ئەو ئافرەتانەی لە( دار الکفر)ەوە کۆچ دەکەن بۆ وڵاتی ئیسلام

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْ ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْ ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُواْ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ﴾

لـەوەپێش حـوکمی پەیوەنـدی نێـوان موسـوڵمانان و کۆمـەڵانی ناموسـوڵمان لەحاڵەتی ئاشتەواییدا رونکردەوە، ئەمجار لێرەدا حـوکمی گێڕانـەوەی ئـەو ئافرەتـە کۆچکارانە روندەکاتەوە کە لەوڵاتی کوفرەوە هیجرەت دەکەن بۆ نـاو موسـوڵمانان و مـارە کردنیـان پـاش پـەیمانی حودەیبیـە، گێڕانــەوەی مارەییەکـەیان بـۆ مێـردە بتپەرستەکانیان .

هەروەها حوکمی مارەکردنی ئافرەتی بتپەرست روندەکاتەوە. هەروەها باسـی قەرەبوو کردنەوەی ئەو پیاوە موسوڵمانانە دەکا کە ژنەکانیان پەیوەندی دەکەن بە موشـریکەکانەوە. دەبـێ مـارەیی ژنـە هـەڵاتوەکانیان لـە دەسـتکەوتی جـەنگ بـۆ قەرەبوو بکرێتەوە، لەهەموو ئەم حوکمانەشدا دەبێ موسوڵمانان بەژن و پیاویانەوە لەخودا بترسن و تەقوای خودایان لەدڵدا بێ. دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَـاءَكُمُ الْمُؤْمِنَـاتُ مُهَـاجِرَاتٍ فَـامْتَحِنُوهُنَّ﴾ ئـەی ئـەو کەسانەی بڕواتان بە تاک و تەنهایی خوداو راسـتی پێغەمبـەرێتی پێغەمبـەر هەیـە، هـەرکاتێ ئـافرەتی کۆچـکاری موسـوڵمان لـەوڵاتی کـوفرەوە هـات بـۆ نـاو نێـوە، بـەتاقییان بکەنـەوە، لێکۆڵینـەوەیان لەگەڵدا ئـەنجام بـدەن، بـۆ ئـەوەی بـزانن تـاچ ئەندازەیـەك رەغبـەتیان لـە ئایینـدا هەیـە، ئـایین پـاڵی پێـوە نـاون بـۆ کۆچـکردن پرسـیاریان لێ بکـەن ئـاخۆ هـۆی کـۆچ کردنەکـەیان چـیە؟ ئـەوەبوو پێغەمبـەرﷺ: کەرۆژی حودەیبییە پەیمانی ئاشتی لەگـەڵ موشـریکەکانی مەککە بەست، خـاڵێکی پەیمانەکە ئەوە بوو، هەر کەسێ لەمەککەوە کـۆچ بکـا بـۆ مەدینـە بیگێڕێتـەوە بـۆ مەککە بۆ ناو موشریکەکان.

جاکە ئافرەت بەمەبەستی موسوڵمان بوون کۆچیان کرد، پەروەدگار فـەرمانی بە پێغەمبەرﷺ کرد کە نەیانگێڕێتەوە، بەڵکوو لێکۆڵینـەوەیان لەگەڵدا بکـا ئـاخۆ چی پاڵی پێوە ناون بۆ کۆچکردن، ئەوەبوو سوێندیان دەخوارد: کەکۆچکردنەکەیان لەرقی مێردەکانیان نیە، لەبەرئەوە نیە حـەزیان لـەو جێگـەبێ و ئـەو شارەیان پـێ خۆش بێ، یان مەبەستێکی دونیـایی تریـان هـەبێ ، زۆریـان لـەمبارەوە لەگـەڵ شـی

دەگرایەوە. سوێندیان دەخوارد: کە تەنها خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری خودا هەڵی ناون بۆ کۆچکردن، تەنها لەبەرخاتری ئایین کۆچیان کردوە، جاکە بەم جۆرە سوێندیان دەخوارد، ئیتر پێغەمبەرﷺ مەسرەفو مارەییەکەیانی دەدایەوە بەمێردە موشریکەکانیانو ئافرەتەکانی نەدەگێڕانەوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلا تَرْجِعُوهُنَّ﴾ واتە: بە تاقیکردنەوەی ئەو ئافرەتانە شتێکی رواڵەتییە، وەلێ لە حەقیقەتو واقیعدا هەر خودا دەزانێ ئاخۆ ئەوانە ئیماندارن یان نا، خودا فەرمانتان پێ دەکا بەرواڵەت لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدابکەن، بۆ خۆی نهێنی ناو دڵیان دەزانێ، جا ئەگەر لەئاکامی تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوەدا بۆتان دەرکەوت ئەو ئافرەتانە موسوڵمانن‌و ئایین پاڵی پێوەناون بۆ کۆچکردن، ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆلای مێردە موشریکەکانیان.

﴿إِلَى الْكُفَّارِ لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ ئەو ئافرەتە موسوڵمانانە حەڵاڵ نین بۆ ئەو موشریکانە، هەر ئافرەتێك موسوڵمان بوو، یەکسەر دەبێ لە مێردەکەی جیابێتەوە، هەروەها موشریکەکانیش حەڵاڵ نین بۆ ئافرەتە موسوڵمانەکان هیچیان بۆ هیچیان حەڵاڵ نین‌و نابێ پێکەوەبن.

بەڵێ ئەم ئایەتە ئافرەتی موسوڵمانی لە پیاوی موشریك حەرام کرد، لەپێش نازڵبوونی ئەم ئایەتەدا دروست بووە ئافرەتی موسوڵمان شوبکا بە پیاوی موشریك. بۆیە (ئەبولعاص)ی کوڕی (الربیع) مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەرﷺ بوو، زەینەب موسوڵمان بوو ئەبولعاص بتپەرست بوو، رۆژی غەزای بەدر بەئەسیری کەوتە دەست موسوڵمانەکان، زەینەب ملوانکەکەی خۆی کەهی خەدیجەی دایکی بوو بەمیرات بۆی مابووەوە ناردی بۆ ئەوەی بکرێ بە فیدیەو مێردەکەی مەرەخەس ببێ. کە پێغەمبەرﷺ ملوانکەکەی بینی زۆری بەزەیی بە زەینەبدا هاتەوەو بە موسوڵمانەکانی فەرموو: ئەگەر بەباشتان زانی ئەبولعاص بۆ زەینەبی کچم بەرەڵلا بکەن، بیکەن.

دوایی پێغەمبەرﷺ مەرەخەسی کرد بەمەرجێ زەینەبی کچی پێغەمبەرﷺ: کەخێزانی بوو بینێرێتەوە بۆلای پێغەمبەرﷺ ئەویش کەرۆیشتەوە وەفای بەوادەکەی کرد، لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریثەدا زەینەبی ناردەوە بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەرﷺ زەینەب لەمەدینە دوای روداوی بەدر دوو ساڵ مایەوە، تامێردەکەی؛ (ئەبولعاص)ی کوڕی (الربیع) ساڵی هەشتەمی کۆچی موسوڵمان بوو.. ئیتر پێغەمبەرﷺ هەر بەنیکاحی پێشوو زەینەبی گێڕایەوە بۆ لای ئەبولعاص. مارەیی تازەی بۆ نەبڕییەوە..

ئیمام ئەحمەد لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ زەینەبی کچی گێڕایەوە بۆ ئەبولعاص، کۆچکردنی زەینەب پێش موسوڵمانبوونی ئەبولعاص بەشەش ساڵ بوو، نەشایەتی حازرکردو نەمارەیی تازەی بۆ بڕییەوە، هەندێك دەڵێن: کۆچکردنی زەینەب دووساڵ پێش موسوڵمان بوونی ئەبولعاص بووە.

عەبدی کوڕی حەمید، لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لەباپیریەوە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ کچەکەی خۆی گێڕایەوە بۆ (ئەبولعاص)ی کوڕی (الربیع) بەنیکاحو مارەیەکی تازە. یەزیدی کوڕی هارون دەڵێ: حەدیثی ئیبنو عەبباس ئیسنادەکەی باشترە، وەڵێ کار بە حەدیثی عەمری کوڕی شوعەیب دەکرێ. چونکە ئەوەی زوربەی زانایان لەسەری کۆکن ئەوەیە: هەرکاتێ ئافرەتەکە عیدەی تێپەڕیو مێردەکەی موسوڵمان نەبوو، فەسخی نیکاحی نێوانیان دەبێتەوە. بۆیە جەماوەری زانایان وەڵامی حەدیثەکەی ئیبنو عەبباسیان داوەتەوە، وتوویانە: وێ دەچێ زەینەب عیدەی لە ئەبولعاص تێپەڕ نەبووبێ. بۆیە پێغەمبەرﷺ بەبێ نیکاحی تازەو مارەیی تازە زەینەبی بۆ گێڕایەوە.

﴿وَآتُوهُمْ مَا أَنفَقُوا﴾ ئەو ئافرەتانەی کۆچ دەکەنو مێردە موشریکەکانیان جێ دێڵن، ئێوە خەرجیو مارەییەکانیان بدەنەوە مێردەکانیان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کە پەیمانی حودەیبیە لە خاڵی گێڕانەوەی کۆچکەراندا تایبەت بووە بە

پیاوانەوە ئافرەتی نەگرتۆتەوە، ﴿وَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ هیچ خراپەیەکتان لەسەرنیە ئەی موسوڵمانینە ئەگەر ئەو ئافرەتە کۆچکارانە مارەبکەن، بەمەرجێ عیدەیان بەسەربچێ و مارەیی خۆیان بدەنێ.

﴿وَلا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ ئەی موسوڵمانینە هەرگیز گوێ مەدەن بە نیکاح و مارەییەك لەناو کافرەکاندا بریار درابێ. واتە: ئەگەر پیاوەکە موسوڵمان بوو ژنەکەی بەکافری مایەوە، ئیتر پەیوەندی ژن و مێردایەتی نێوانیان دەپچڕێ و عیصمەتی ژن و مێردایەتی نێوانیان نامێنێ. پێش نازڵبوونی ئەم ئایەتە موشریکەکان ئافرەتی موسوڵمانیان مارە دەکرد. موسوڵمانیش ئافرەتی بتپەرستی مارە دەکرد. ئیتر بەم ئایەتە ئەو حوکمە هەڵگیرا، وەڵێ دروستە پیاوی موسوڵمان ئافرەتی جولەکە، یان مەسیحی مارە بکا. چونکە ئەوانە ئەهلی کیتابن.

لە فەرمودەیەکی صەحیح دا لە (المسور) و مەڕوانی کوڕی (الحكم)ەوە ریوایەت کراوە: کاتێ پێغەمبەرﷺ رۆژی حودەیبیە پەیمانی ئاشتی بەست، ئافرەتانی موسوڵمان لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، پەروەدگار ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ﴾ تا دەگاتە ﴿وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ نازڵ کرد. ئەو رۆژە عومەری کوڕی خەتتاب دوو ژنی تەڵاق دان، موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان یەکیانی مارەکردەوە و ئەوی تریان صەفوانی کوڕی ئومەییە مارەی کردەوە.

﴿وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا﴾ داوای مارەیی ژنەکانتان بکەن، ئەگەر لە ئایین پاشگەزبونەوە و پەیوەندییان بە کۆمەڵی کافرەکانەوە کرد، بتپەرستەکانیش بۆیان هەیە داوای مارەیی ئەو ژنانەیان بکەن: کە موسوڵمان دەبن و کۆچ دەکەن بۆ مەدینە.

بەم جۆرە ئەگەر ئافرەتێکی موسوڵمان لە ئیسلام پاشگەز بوایەوە و بگەڕایەوە بۆ ناو کافرەکان موسوڵمانەکان داوای مارەییەکەیان لە کافرەکان

دەکرد. ئەگەر ئافرەتێکی کافریش موسوڵمان بوایەو کۆچی بکردایە بۆ ناو موسوڵمانەکان دەبوایە مارەیەکەی بگێڕنەوە بۆ مێردە کافرەکەی.

﴿ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ئەوەی بۆتان باسکرا لە گێڕانەوەی مارەیی بۆ هەردوولا حوکمی خودایە، حوکمی پێ دەکا لەناوتاندا، خودا زاناو دانایە، هیچی لێ گوم نابێو هەرچی دەیکا حیکمەتی تێدایە، هەر حوکمێك دەردەکا لەجێی خۆی دایە.

﴿وَإِنْ فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُمْ مِثْلَ مَا أَنفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ ئەگەر یەكێك لەژنەکانی ئێوە لەئایین پاشگەزبووەوە خۆی قوتار کردو ڕۆیشت بۆ لای کافرەکان دوایی ئێوە لەشەڕدا بەسەر کافرەکاندا زاڵ بوونو دەستکەوتتان دەسکەوت، غەنیمەتو تالآنیتان لێ گرتن، ئەوە مەسرەفو مارەیی ژنە پاشگەزبووەکە بدەن بە مێردە موسوڵمانەکەی، ئەگەر کافرەکان مەسرەفو مارەیەکەیان نەگەڕاندەوە بۆ مێردەکەی. تەقوای خودا بکەن، شتێك مەکەن خۆتان وا لێ بکەن شیاوی عەزابی خودا بن. لەکاتی تەنفیذکردنی حوکمی خودادا ترسی خوداتان لە دڵو دەروون دا بێ، پێچو پەنا لە تەنفیذ کردنەکەدا مەکەن.

ئیبنو عەبباسو هی تریش فەرموویان ئەگەر ژنی پیاوێکی کۆچکار پاشگەز بووەوەو ڕۆیشتەوە بۆ ناو کافرەکان پێغەمبەرﷺ فەرمان دەکا بەوەی مەسرەفو مارەیی ئافرەتە پاشگەز بووەکە بدەنەوە بە مێردەکەی لە ماڵی غەنیمە، پێش ئەوەی بکرێتە پێنج بەش.

بەکورتی لەسەر کافرەکان پێویستە مارەیی ژنە پاشگەز بووەکە بگێڕنەوە، ئەگەر نەیانگێڕایەوە لە غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگ مەسرەف و مارەییەکەی بۆ قەرەبوو دەکرێتەوە.

## بەیعەتکردنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئافرەتە کۆچکارەکاندا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٢ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ ١٣ ﴾

ئایەتی ژمارە (١٢) ڕۆژی فەتحی مەککە نازڵ بووە، ئەوەبوو پێغەمبەرﷺ کە لەبەیعەتکردنی پیاوان بووەوە دەستی کرد بە بەیعەتکردنی ئافرەتان.

ئیمامی بوخاری لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عائیشە فەرمووی: پێغەمبەرﷺ ئەو ئافرەتانەی کۆچیان دەکرد بۆ مەدینە بەتاقی دەکردنەوە بە گوێرەی ئەم ئایەتە ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ﴾ تادەگاتە ﴿غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەمجار هەر ئافرەتێك ئەو مەرجانەی لە ئایەتەکەدا هاتوون قبوڵی بونایە، پێغەمبەرﷺ پێی دەفەرموو: ئەوا بەیعەتم لەگەڵدا کردی.

وەڵلاهـی پێغەمبــەر ﷺ لەبەیعەتکردنــدا دەســتی وەدەســتی هــیچ ئافرەتێــك نەکەوتووە. هـەر بـەدەم دەیفـەرموو: ئـەوە لەسـەر ئـەو عەهدو پەیمانـە بەیعـەتم لەگەڵ کردی.

لە صەحیحی (موسلیم)یـشدا لـە عائیـشەوە ئـەم ریوایەتـە هـاتووە. بـەتۆزێك جوداوازییەوە...

دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لا يُـشْرِكْنَ بِاللَّـهِ شَيْئاً﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر ئافرەتی خاوەن باوەڕ بەخوداو بە پێغەمبـەری خـودا هاتنە لات بۆ بەیعەتکردنو عەهدو پەیمانیان پـێ دای لەسـەر ئیـسلامو گوێڕایـەڵی بۆ فەرمانی خودا، بەیعەتیان لەگەڵدا بکە لەسەرئەوە کەئیتر هیچ شتێك نەکەنـە هاوەڵی خودا.

﴿وَلا يَسْرِقْنَ﴾ دزی نەکەن ﴿وَلا يَزْنِينَ﴾ زینا نەکەن. ﴿وَلا يَقْـتُلْنَ أَوْلادَهُـنَّ﴾ منداڵی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەن .

﴿وَلا يَـأْتِينَ بِبُهْتَـانٍ يَفْتَرِينَـهُ بَـيْنَ أَيْـدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِـنَّ﴾ منـداڵی فـڕێ دراو هەڵنەگرنەوەو بەمێردەکەی بڵێ ئەم منداڵەم بووەو لەتۆیە.

ئەمـەش دابو نـەریتێکی سـەردەمی جـاهیلی بـوو، ژن منـداڵی فـڕێ دراوی هەڵدەگرتەوەو بە مێردەکەی دەگوت لە داوێنی خۆم کەوتۆتە خوارەوەو لە تۆوە لە سکم کەوتووە.

﴿وَلا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُـنَّ اللَّـهَ إِنَّ اللَّـهَ غَفُـورٌ رَحِيـمٌ﴾ پەیمانیان لێ وەربگـرە لـەکردنی هـەموو چاکەیەکدا گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانت بـنو سەرپێچی نەکەن، هەرچی شەرع فـەرمانیان پـێ دەکا پابەنـدی بـن، شـینو شـەپۆڕ لەسـەر مـردو نـەگێڕن، یەخـەی خۆیـان دانـەدڕن، لەگـەڵ نامەحرەمـدا خـەڵوە نەکەن....... هتد

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَوَلَّوْا قَوْماً غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنْ الآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ﴾ ئەی ئەو كەسانەی ئیمانتان بە پەیامی ئیسلام هێناوە؛ گەلو نەتەوەیەك مەكەنە دۆستو خۆشەویستی خۆتان: كە خودا غەزەبی لێ گرتونو خۆشی ناوێنو لەرەحمەتی خۆی دووری خستوونەوە. نەچن (وەلائو بەراء) بۆ جولەكەو گاورو كافری تر دەربڕنو خۆشتان بوێن، ئەوانە لە پاداشتی قیامەت بێ بەش بوون، لەبەر كوفرو سەررەقی خۆیان وایان لێ هاتووە بڕوایان بە قیامەت نیەو لەهاتنی نائومێدبوون. وەكوو چۆن لە زیندوبوونەوەی مردوەكانیان نائومێد بوون. هەرچەندە بەڵگەو نیشانە زۆرو هەمەجۆرن لەسەر ئیمان بە خوداو رۆژی قیامەت.

ریوایەت كراوە هەندێ لە موسوڵمانە هەژارەكان هاتوچۆی جولەكەكانیان دەكرد بۆ ئەوەی لە باخو باخاتیاندا كاربكەن، ئەمجار لەم رێیەوە هەواڵی ناو موسوڵمانەكانیان بە جولەكەكان دەگەیاند، ئیتر بەو ئایەتە جڵەوگیریان لێ كرا، جا كە مەبەست بەو گەلو نەتەوەیەی خودا غەزەبی لێ گرتوون قەومی جولەكەبێ. ئەوكاتە مانای ئایەتەكە بەم جۆرە دەكەین:

ئەو جولەكانە حەزرەتی موحەممەدیان بەدرۆ خستەوە، دەشزانن پێغەمبەری خودایە، چۆن كوڕەكانی خۆیان دەناسن ئاوا پێغەمبەر دەناسن، بەڵام بەهۆی سەررەقیو بڕوانەكردنیان بە پێغەمبەر پاداشی قیامەتیان لەدەست داوە، لەپاداشی قیامەت نائومێد بوون، وەكوو چۆن كافرەكان لە زیندوبوونەوەی مردوەكانیان نائومێد بوون، یان وەكوو چۆن كافرەكان لەناو گۆڕدا سەرنجامی خۆیان دەزانن ئیتر لەپاداشی قیامەت نائومێد بوون.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الصف)

ئەم سورەتە مەدەنییەو لەدوا سورەتی (التغابن) نازڵ بووەو چواردە ئایەتە. ناونراوە بە سورەتی (الصف)، چونکە لە ئایەتی چوارەمی‌دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّـهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنيَانٌ مَّرْصُوصٌ﴾.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتەکانی پێشەوە لەدوو رووەوەیە:**

١- لەسورەتی پێشوودا نەهی لە موسوڵمانان کرد: کە دۆستایەتی کافرەکان بکەن، لەم سورەتەش دا فەرمان بە موسوڵمانان دەکا: کەیەك بگرنو لە بەرامبەر دوژمندا یەك دڵو یەك گیان هاریکاری یەکتر بکەن.

٢- لە سورەتی پێشوودا یاسای پەیوەندیی نێوان موسوڵمانانو نا موسوڵمانی رونکردەوە، لەکاتی ئاشتی‌دا. لەم سورەتەشدا موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ جیهادو بەرگریی لە ئیسلامو خۆبەخت کردن بە ماڵو گیان لە پێناو خودادا.

**مەوضوعو میحوەری باسی سورەتەکە دووشتی سەرەکین:**

١- چەسپاندنی ئەو راستیە لە دڵی موسوڵمانان دا: کە ئەم ئایینە بەرنامەی خودایە بۆ ئادەمیزادو لە شێوەی تەواوو بێ کەمو کورِی دایە. گونجاوو لەبارە: کە ئادەمیزاد پەیڕەوی بکاو هیچ ئایینو بەرنامەیەکی تر بەکەڵکی ئەوە نایە پەیڕەوی بکرێ، پوختەو کاکڵەی ئایینەکانی پێشووەو خوداویستویەتی بەم ئایینە خەتمی ریسالەی پێغەمبەران بهێنێو بەسەر هەموو ئایینەکاندا زاڵی بکا.

٢- جیهادو تێکۆشانە لە رێگەی خودادا، بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانی ئیسلامە. خۆ بەختکردنو ماڵ خەرجکردنە لەپێناو ئایینی خودادا، دەست نیشانکردنی پاداشی گەورەیە بۆ جەنگاوەرانی ئیسلام.

## بانگەوازی بۆ جەنگان لەڕێگەی خودادا شان بەشان و یەك دڵی و یەك گیانی

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (١-٢) تیرمیذی و حاکم و دارمی لە عەبدوڵلای کوڕی سەلامەوە ڕیوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: کۆمەڵێك بووین لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەناو خۆماندا وت و وێژمان دەکرد، وتمان: ئەگەر بمانزانیایە چ کردەوەیەك لای خودا خۆشەویستە بمانکردایە! ئیتر پەروەدگار ئایەتی ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْآرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ ی نازڵ کرد ئیتر پێغەمبەر ﷺ تاکۆتایی سورەتەکە، بەسەر ئێمەیدا خوێندەوە.

ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: چەند کەسێك لە موسوڵمانان پێش ئەوەی جیهاد پێویست بکرێ_ دەیانگوت: پێمان خۆشە خودا شارەزاییمان بکا بۆ باشترین کردەوە تا ئەنجامی بدەین، ئیتر پەروەدگار هەواڵی بە پێغەمبەرﷺدا: کە خۆشەویسترین کردەوە یەکتاپەرستی و جیهادە لە دژی دوژمنانی خوداو دانانە بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ جا: کە ئایەتی جیهاد

نازڵ بوو، هەندێ لە موسوڵمانان پێیان ناخۆش بوو، لەسەر شانیان گران بوو ئیتر پەروەدگار ئەو ئایەتەی نازڵ کردن.... دەفەرموێ:

﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بە گیاندارو بێ گیانەوە، تەسبیح و تەنزیهی خودا دەکەن، هەموو بونەوەر تەسبیحاتی خودا دەکا. ملکەچی خۆیانی بۆ رادەگەیەنن، خودا خاوەن هێزو دەستەڵاتی رەهایە، باڵادەستە بەسەر بەندەکانی دا، داناو لێزانە لە ئەحکام و کردارو گوفتاریدا، لە بەڕێوەبردن و هەڵسوڕانی بونەوەریدا، هەرچی دەیکا لەجێی خۆیدایە و هەموو کارێکی بەجێیە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە خودا کردوەو شوێن پێغەمبەرەکەی کەوتوون، لەبەرچی بەزوبان شتێك دەڵێن و بەکردەوە پێچەوانەی وتەکەی خۆتان رەفتار دەکەن. بۆچی خاوەنی قسەی خۆتان نین؟ بۆ وەفا بەوادەی خۆتان ناکەن؟

زانایانی سەلەف ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە لەسەرئەوەی: کە پێویستە موسوڵمان وادەی خۆی بەرێتە سەرو پابەندی بەڵێنی خۆی بێ. هەروەها حەدیثی صەحیحی پێغەمبەریان کردوە بەبەڵگە کە دەفەرموێ: (اية المنافق ثلاث: اذا وعد اخلف، و اذا حدث كذب، و اذا اوتمن خان ) نیشانەی دووڕوو سێ شتە: کە وادەی دا نەیباتە سەر، کەقسەی کرد درۆ بکا، کە سپاردەیان لادانا خیانەتی تێدابکا.

ئیمامی مالیك فەرمووێەتی: ئەگەر وادەدەر وادەپێدراوی خستە وەرطەوە پێویستە وادەکەی بەرێتە سەر، بۆ نموونە ئەگەر بە کابرای وت: بڕۆ ژن بخوازە من نیوەی مەسرەفەکەت بۆ دەدەم، ئەگەر کابرا ژنی خواست پێویستە وەفا بەوادەکەی خۆی بکا.

﴿كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ تاوانێکی گەلێك مەزنە لای خودا: کەوادەیەك بدەن و جێبەجێی نەکەن، قسەیەك بکەن و بەکردەوە پێچەوانەی

بجوولێنــەوە. چـونکە پاشــگەزبوونەوە لەقــسەو وادە نیــشانەی خۆویــستی و ئەنانییەتـە، بـەفیڕۆدانی کـات و بەرژەوەنـدی و ڕێـزی کەسـانی دیکەیـە، نەهێـشتنی بتمانەی نێوان تـاك و کۆمەڵە، بۆیـە (خـلاف الوعـد) ئەوەنـدە لای خـودا قێـزەوەن و ناشـرینە.. ئـەمجار لەبەرامبـەر ئەوانـەدا: کـە وادەی خۆیـان نابەنـە سـەرو زەممـی کـردن، مـەدحی ئەوانـە دەکـا: کـە چـاو نەترسـانە لەبەرامبـەر دوژمـن دەوەسـتن و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ﴾ بەراستی خودا ئەوانەی خۆش دەوێ: کە لەپێناو ئایینەکەیدا شەڕدەکەن و مەردانـە دەجـەنگن، وەکـوو دیـواری یـەکگرتوو بـە قوڕقوشـم داڕێـژراوو پتـەوو قـایم ڕێـز دەبەستن و بەرەو ڕووی دوژمن دەوەستن، هیچ هێزێك ناتوانێ لە سـەنگەرو پێگـەی خۆیان بیانجولێنێ.

ئەمـە ڕەهنومـایی پـەروەدگارە فـەرمانیان پـێ دەکـا کـە لەبەرامبـەر دوژمـن دا تونـدو تـۆڵ و جیـدیی و ورە بـەرزبن، بـە وردی و زیرەکانـە، ئـەرکی جیهـاد ئـەنجام بدەن، سستی و تەمبەڵی لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا نەکەن، لەناو یەکا یـەکانگیرو دڵسۆزو چاو نەترس بن، گوێڕایـەڵی فـەرمانی سـەرکردەو پابەنـد بـەپلانی جـەنگ بن، ئەمە سیاسـەتی ئیـسلامە لـە جەنگدا، بـەو جـۆرە نەفسەکان پـەروەردە دەکـاو کۆمەڵ پێکەوە دەنێ، کـردەوەو واقیـع لێـك دەبەسـتێ و لەیـەك کاتـدا هـەموو وزەو هێزەکان ئاڕاستە دەکا بۆ هەدەف و سەرکەوتن بەدەست دێنێ.

## ئاوڕدانەوەیێك لە چیرۆکی حەزرەتی موساو حەزرەتی عیسا لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ

قُلُوبَهُمْۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٦﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٩﴾

لەوەپێش موسوڵمانانی هەڵنان بۆ جیهادو سەرزەنشتی ئەوانەی کرد: کە لە جیهاد خۆ پاش دەدەن. ئەمجار سەرگوزشتەی حەزرەتی موسایان بۆ دەگێڕێتەوە لەگەڵ نەتەوەکەیدا، کاتێک حەزرەتی موسا داوای لێ کردن شەڕ لەگەڵ جەبابیرەکان دا بکەن، ئەوانیش لینگە لەرزەو لێوە لەرەیان پێ کەوتو داواکەی حەزرەتی موسایان رەتکردەوەو وتیان: تۆو خواکەت بچن شەڕ بکەن‌و ئێمە لێرە دادەنیشین. لەدوای ئەوە سەر گورشتەی حەزرەتی عیسایان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێک بە موعجیزەو بەڵگەی ئاشکراوە هاتە ناو نەتەوەکەی‌و بانگەوازی کردن بۆ ئیمان

هێنان‌و مژدەی هاتنی پێغەمبەرێکی پێدان: کە دوای خۆی ڕەوانە دەکرێ‌و ناوی (ئەحمەدە) نەتەوەکەی گوێڕایەڵی بانگەوازیەکەی نەبوون، سەرپێچیان کرد.

ئەمجار سەرزەنشتی ئەو یاخی بووانە دەکا: کە بەپیر بانگەوازی حەزرەتی موحەممەدەوە نەهاتوون، بەڵکوو بوختان هەڵدەبەستن‌و پێغەمبەریان بە ساحیرو موعجیزەکانی بە سیحر لە قەڵەم دەدەن. ئەم بوختان‌و درۆو دەلەسەشیان بۆ ئەوەیە ئایینی خودا بەتاڵ بکەنەوەو نوری قورئان بکوژێننەوە. بەڵام باسەری خۆیان لەبەرد بدەن، بێگومان خودا نووری خۆی تەواو دەکاو ئایینی خۆی بەسەر هەموو ئایینەکانی تردا باڵا دەست دەکا.......! دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِي وَقَدْ تَعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ﴾ ئەی موحەممەد ئەوە بۆ گەل‌و نەتەوەکەت باس بکە: کە موسای کوڕی عیمران بەنەتەوەی خۆی (بەنوئیسرائیل) گوت: ئەرێ قەومەکەم! ئەوە بۆچی سەرپێچیم دەکەن‌و گوێڕایەڵیم ناکەن؟ بۆ بە هەڵوێستی ناشرین‌و جوێن پێدان ئەزیەتم دەدەن؟ بۆچی شەریعەت‌و یاسای خودا جێبەجێ ناکەن؟ خۆ ئێوە دەزانن: من پێغەمبەرو فرستادەی خودام بۆ سەر ئێوە، پێغەمبەر ڕێزی لێ دەگیرێ‌و بە گەورە سەیر دەکرێ. هەمووتان موعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرێتی منتان بینی ئەدی بۆچی بڕوام پێ ناکەن، بۆ شوێنم ناکەون؟!

هێنانی ئەم سەرگورشتەیە ئاماژە بەوەدەکا: کە پێویستە موسوڵمانان چاو لە جولەکەکان نەکەن‌و ئەزییەتی پێغەمبەرﷺ نەدەن. وەکوو ئەوان ئەزیەتی موسایاندا.. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ڕاستەوخۆ ئەو فەرمانەیان پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهاً﴾ (الاحزاب/٦٩).

لەهەمان کاتدا هێنانی سەرگورشتە کە دڵدانەوەی پێغەمبەری تێدایە، بۆ ئەوەی قورسایی ئەزیەتدانی کافرەکانی لەسەر سوك ببێ‌و وانەزانێ: کە هەر ئەو

لەسەر بانگەوازی لەلایەن گەلەکەیەوە ئەزیەت دەدریّ، بەلّکوو ئەوەتا موساش لەلایەن گەلەکەیەوە ئەزیەتدراوە.

جا ﴿فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ کاتێك ئایینی حەقیان پاشگویّ خستو وازیان لیّ هێنا، شوێن پەیامی پێغەمبەریان نەکەوتنو ئەزیەتیاندا، لە تۆڵەی ئەوەدا خودا دڵی لەسەر گرتنە بەری رێگەی هیدایەت لادان، حەقو راستی لیّ گوم کردن، گومانو راڕایی خستە نێو دڵو دەرونیانەوە.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویّ: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ (الانعام/١١٠) خودا هەرگیز هیدایەتی گەلو نەتەوەی کافرنادا: ئەوانەی پێغەمبەرانی خۆیان بە درۆ خستونەوەو ئامادە باشی ئەوەیان تێدانیە نووری ئیمان وەربگرن.

﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾ ئەی پێغەمبەر هەواڵو سەرگورشتەی عیسا بۆ قەومەکەت بگێڕەوە کاتێك وتی: ئەی نەتەوەی ئیسرائیلی ئەمن پێغەمبەرو فرستادەی خودام بۆ سەر ئێوە، نامەی ئاسمانیم بۆ هاتووە: کە (ئینجیلە) پشتگیری نامەی تەورات دەکا، تەواوکەری تەوراتە، نازانم بۆچی سەرپێچی فەرمانەکانم دەکەنو دژم دەوەستن.......!؟

﴿وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ بێگومان تەورات موژدەی رەوانە کردنو پێغەمبەرایەتی منی بە ئێوە داوە، ئەمن ئەو پێغەمبەرەم: کە تەورات ئامازەی پیّ کردوم، منیش لەلایەن خۆمەوە موژدەتان دەدەمیّ بە هاتنی پێغەمبەرێك لەدوای من ناوی ئەحمەدە، پێغەمبەرێکی قورەیشی نژادو خاوەنی رەوشتی جوانو پەسەند، سەر خەتمی پێغەمبەرانەو دوا ئەو پێغەمبەری تر نینو نایەن.

بوخاری‌و موسلیم لە جوبەیری کوڕی موطعیمەوە ریوایەت دەکەن: دەڵێ: بە گوێی خۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: من چەند ناوێکم هەیە (موحەممەد، ئەحمەد، الماحي، الحاشر، العاقب).

لە ریوایەتێکی تری موسلیم دا ئەبو موسا دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ چەند ناوێکی خۆی بەیان کرد فەرموی: من (محمد)م (احمد)م (الحاشر)م (المقفى)و (نبى الرحمة و التوبة و الملحمة)م .

بەمجۆرە حەزرەتی عیسا مژدەی هاتنی پێغەمبەری ئاخر زەمانی داوە، کەچی ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ کاتێك ئەو پێغەمبەرەی موژدەی بە هاتنی دراوەو لە تەورات‌و ئینجیل دا ناونیشانی دیاری کراوە، هات‌و بانگەوازی خۆی بڵاوکردەوە، بەڵگەو موعجیزەی پێغەمبەرێتی خۆی نواندن، کافرو خودا نەناسان وتیان: ئەوەی هێناوتە سیحرو جادووی ئاشکراو عەیانە، بۆ خۆت جادوبازی، نامەکەشت سیحرە. یان ماناکە بەم جۆرەیە (کاتێ حەزرەتی عیسا هاتە سەر گەلەکەی بەموعجیزەو نیشانەی ئاشکراوە، وتیان: ئەمە سیحرو جادوێکی ئاشکراو عەیانە).

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَى إِلَى الإِسْلامِ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکار ترە؟ واتە: کەس لەو ستەمکارتر نیە: کە لەسەر خودا بوختان هەڵبەستێ، هاوەڵ‌و منداڵ‌و خێزانی بۆ دابنێ، لە حاڵێکا بانگ دەکرێ بۆ موسوڵمان بوون‌و بۆ یەکتاپەرستی‌و دڵسۆزی لەخودا پەرستی دا. هەرگیز خودا کافرو ستەمکاران هیدایەت نادا بۆ ڕێگەی ڕاست، چونکە ئەوانە ستەمیان لەخۆیان کردوەو ئامادە باشی ئیمان هێنانیان تێدانیە. بەسروشت کافرو بێ بڕوان.

﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ ئەو کافرو ستەمکارانە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان بانگەوازی ئیسلامی خەفە بکەن‌و نوری

هیدایەت بکوژێننەوە، لەمپەڕو کۆسپ دروست بکەن بۆ ئەوەی نەهێڵن ئیسلام بڵاوبێتەوە. بەدرۆو دەلەسە بەرەنگاری بکەن. ئەوانە لەگوێی گادا نوستوون، دەیانەوێ بەری تیشکی خۆر بە بێژینگ بگرن، دەیانەوێ بە فوو روناکی خۆر بکوژێننەوە، بێگومان ئەوانە خەیاڵیان خاوەو ئەو ئاواتەیان نایەتەدی، خودا ئایینی ئیسلام بەناو جیهاندا بڵاودەکاتەوەو بەسەر هەموو ئایینەکاندا باڵادەستی دەکا هەرچەندە کافرەکان پێیان ناخۆش بێ! ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ خودای مەزن خودایەکی وەهایە پێغەمبەری خۆی بە هیدایەتی کامڵ و ئایینی حەق و ئاشکراوە رەوانە کردوە؛ کەلە قورئانی پیرۆزو حەدیثی پێغەمبەردا رەنگ دەداتەوە، بۆئەوەی بەسەر هەموو ئایینەکاندا باڵادەست بێ و بەناو جیهاندا بڵاوبێتەوە. هەرچەندە موشریکەکان پێیان ناخۆش بێ. بەڵێ ویستی خودا هاتەدی و دێتەدی، ئایینی ئیسلام وەکوو ئایین ئاشکرابوو، هیچ ئایینێکی تر بەسروشت و بەحەقیقەت لەبەریا نەوەستاوە!!

ئایینە بتپەرست و دەستکردەکان ئەوە هەر هیچ نین. ئایینە ئاسمانییەکانیش ئەوە ئایینی ئیسلام خاتیمەو وێنەی کۆتاییەو تاکۆتایی رۆژگار بە کەڵکی پەیرەوی کردن دێ و لەگەڵ پێشکەوتنی ئادەمیزاد دەگونجێ.

بێگومان ئایینەکانی جولەکەو نەصارا گۆڕانکاریان تێدا کراو زیادو کەمیان بەسەردا هێنرا، وایان لێ هات بەکەڵکی ئەوە نایەن بکرێنە بەرنامەی ژیان و یاسای کۆمەڵگای ئادەمیزاد، تەنانەت ئەو ئایینانە ئەگەر تەحریفیش نەکرانایە، هەر بەکەڵکی ئەوە نەدەهاتن بکرێنە بەرنامەی ژیانی ئادەمیزاد بۆ هەتا هەتایە، چونکە لە تەقدیری پەروەدگاردا ئەو ئایینانە بۆ ماوەیەکی سنووردار نێردراون.

بەشێوەی واقیعیش وادەی پەروەدگار هاتەدی، رۆژگارێك بوو ئایینی ئیسلام لەروی هێزو حەقیقەت و یاساو فەرمانڕواییەوە بەسەر هەموو ئایینەکان دا باڵادەست بوو، لەماوەی سەدەیەکدا زوربەی زەوی ئاوەدانکراوەی کۆنتڕۆڵ کردو هاتە ژێر رکێفیەوە، ئەمجار بەشێوەی ئاشتی و لەرێگای بانگخوازییەوە ئیسلام

بەرەو ناوجەرگەی کیشوەری ئاسیاو ئەفەریقیا کشاو تێیاندا بلاو ببووەوە، تەنانەت ئەوانەی لە ڕێگەی دەعوەو بانگخوازییەوە موسولمان بوون پێنج هێندەی ئەوانەبوون: کە لەڕێگای شەڕو جەنگەوە موسولمان بوون.

ئیستاش ئایینی ئیسلام بەشێوەی سروشتی خۆی و بەبێ ئەوەی دەولەتێکی زلهێز بەلکوو کەم هێزیش پشتگیری بکا - بەردەوام بە کون و قوژبنی جیهاندا بلاودەبێتەوەو لە سنوورەکان تێپەڕدەکاو دلە تینوەکان ئاودەدا.

سالانە ئامارە تایبەتیەکان زۆربوونی موسولمانان لەناوجەرگەی ئەوروپاو رۆژئاوادا رادەگەیەنن و رابوونی ئیسلامی لەگەشەو پێشکەوتن دایە، ئەمە وێڕای ئەو هەموو لەمپەڕو کۆسپ و تەگەرانەی دەخرێنە بەردەم بانگخوازان و ئەو هێرشە ئیعلامی و نەفسیەی دەکرێتە سەر موسولمانان و ئەو گەمارۆ ئابورییە هەمە جۆرو خنکێنەرانەی دەورەی تاك و کۆی موسولمانانی داوە.

## بازرگانی بەسودو سەرکەوتوو

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿١٠﴾ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ

ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّۦنَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ ۖ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾

لەوەپێش پەروەدگار موسوڵمانانی هەڵنان بۆ جیهادو تێکۆشان لەرێگەی خودادا، ترساندنی لەوەی چاو لە نەتەوەی ئیسرائیل بکەن، کە گوێڕایەڵی ئامۆژگاری حەزرەتی موساو حەزرەتی عیسا نەبوون. ئەمجار لێرەدا پەروەدگار ئەوە رادەگەیەنێ: کە بازرگانی بەسودو بێ زیان، لە بڕوابە خوداو جیهادو تێکۆشان و خۆبەختکردن بە ماڵ و گیاندا رەنگ دەداتەوە. پاشان موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ یارمەتیدانی ئایینی خوداو پشتگیریکردنی پێغەمبەرﷺ وەکوو چۆن حەوارییەکانی حەزرەتی عیسا یارمەتی عیسایان دا.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە تاك و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرێتی موحەممەدﷺ هەیە؛ ئەرێ شارەزاییتان نەکەم بۆ بازرگانیەکی بە سود: کە قازانجی تێدا دەکەن و لە عەزابی دژواری دۆزەخ دەتانپارێزێ و لە ناخۆشی رۆژی قیامەت رزگارتان دەبێ؟! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾ (التوبة/١١١)

ئەمجار جۆری بازرگانیەکە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾ بازرگانیەکە بریتییە لەوە بەردەوام

بن لەسەر بڕوابوون بە خوداو بە پێغەمبەری خوداو بە دڵسۆزی ئەرکی سەرشانی خۆتان ئەنجام بدەن، لەڕێگەی خودادا جیهاد بکەن.

﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەوەی بۆمان باسکردی لە ئیمانو جیهاد کردن ئەوە باشترە بۆ ئێوە لە ماڵو گیانتانو لە بازرگانی هەموو دونیا، ئەگەر ئێوە لەخاوەن عەقڵو هەستو زانیاری بەسودن.

**هەڵبەتە جیهاد دوو جۆرە:**

١- جیهاد لەگەڵ نەفسو هەواو ئارەزۆدا.

٢- جیهاد لەگەڵ دوژمندا جەنگان لە دژیان لە گۆڕەپانی جەنگدا.

ئەی خاوەن باوەڕان! ئەگەر ئێوە بەو جۆرەی ئاماژەی پێ کرا هەڵسو کەوت بکەن ئەوەی فەرمانتان پێ کرا ئەنجامی بدەن. ﴿ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ تاوانەکانتان فەرامۆش دەکرێنو لەسەرتان ڕەش دەکرێنەوە، دەتانخەمە ناو باخەکانی بەهەشتەوە: کە بەژێر کۆشكو درەختەکانیاندا جۆو جۆبار دەکشێن، هەروەها خانوو مەسکەنی جوانو ڕازاوەو دڵگیرو دڵڕفێنتان پێ دەبەخشین. لەو باخانەدا: کە شوێنی مانەوەی هەتا هەتایینو مردنو نەخۆشییان تێدا نیە، لێیان وەڕز نابن، لێیان دەرناچن، ئەمەش بەمرازگەیشتنی گەورەو تەواوە.

﴿وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ﴾ نیعمەتێکی تر هەیە، حەزتان لێیە بۆتان دەستەبەر بکرێ، ئەویش سەرکەوتنە بەسەر دوژمنداو ڕزگار کردنی وڵاتانی دەوروبەرە، پێش هەمووشیان ڕزگار کردنی مەککەیە. واتە: ئەگەر لەڕێگەی خودادا جیهاد بکەنو دڵسۆزانە یارمەتی ئایینی خودا بدان، ئەوە خودا بەڵێنی سەرکەوتنتانە بەسەر دوژمندا. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ (محمد:٧).

﴿وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر؛ مـوژدە بـدە بەموسـوڵمانان بەسـەرکەوتنی نزیك لەدونیاداو بەبەهەشت لە قیامەتدا.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونوا أَنصَارَ اللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا هەیە! بەردەوام بـن لەسـەر ئـەو بـیرو بـاوەڕەی هەتانـەو یارمـەتی ئـایینی خـودا بـدەن و پـشتگیری شـەریعەت و پێغەمبـەری خـودا بکـەن، لـە هـەموو حـاڵ و وەزعێکتانـدا بـەکردارو بـەگوفتار بـەماڵ و بـەگیان ئـەو پـشتگیرییە فـەرامۆش مەکـەن، بـە پـیر بانگەوازی خوداو پێغەمبەری خوداوە بچن..

وەکـوو چـۆن حەوارییـەکانی عیـسا (هاوەڵـە دڵسۆزەکانی) کاتێـك عیـسا پێـی فـەرموون: کـێ پـشتگیریم دەکـاو یارمەتیدەرمـە بـۆ بڵاوکردنـەوەی ئـایین و پەیامەکەم؟ کێ هاوکاریم دەکا بۆ لە خـودا نزیکبونـەوە؟ حەوارییـەکان کـە دوانـزە کەس بوون، یەکەمجار ئیمانیان پێ هێنابوو، (هاوەڵ و دڵسۆزی بـوون) وتیـان: ئێمـە یارمەتـدەری ئـایینی خـوداین، ئێمـە پـشتگیریت دەکـەین و لـەپێناو ئاییـنـدا مـاڵ و گیانمـان بـەخت دەکـەین. ئـیتر حـەزرەتی عیـسا نـاردنی بـۆ وڵاتـی شـام بـۆ بانگەوازیکردنی بەنو ئیسرائیلی و یونانییەکان.

﴿قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ فَآمَنَتْ طَائِفَةٌ﴾ کاتێـك حـەزرەتی عیـسا﵇ پەیامی خۆی ڕاگەیانـدو بانگـەوازی بڵاوکـردەوەو هاوەڵـە دڵسۆزەکانی پـشتگیرییان کرد، کۆمەڵێك لەنەتەوەی ئیسرائیل هیدایەت ئامێزبون و ئیمانیان بە عیـسا هێنـاو بـە پێغەمبـەرو بەنـدەی خودایـان زانـی. کۆمـەڵێکیش گـومڕا بـون و لەسـەر کـوفرو بێـدینی خۆیـان مانـەوە، ئینکاری پێغەمبەرێتیەکـەیان کـردو بوختانیـان بـەدایکی کـرد، کۆمـەڵێکی تـر زێـدەڕۆییان کـردو لـە پلـەو پایـەیان بـەرز کـردەوە هـەتا گەیاندیانـە پلـەی خودایـەتی، هەنـدێکیان وتیـان: کـوڕی خودایـە، یـان هـەر خـودا

خۆیەتی، یان سێیەمی سێ خوداکانە (باوك، کوڕ، روحولقودس) ئیتر مەسیحیەکان بوون بە چەند تاقمو پێڕو پارتی جیاجیاو حاڵیان بەوە گەیشت کە گەیشت.

﴿مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَفَرَتْ طَائِفَةٌ فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَى عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ﴾ ئێمە یارمەتی خاوەن باوەڕەکانماندا؛ ئەوانەی عیسایان بەبەندەو پێغەمبەری خودا دەزانی بەسەر دوژمنەکانیاندا باڵا دەستمان کردن، بەڵگەو دەلیلیان بەهێز بوون، ئەم ئایەتە دوو مانا هەڵدەگرێ:

١- ئەوانەی بەڕاستی ئیمانیان بە عیسا هێنا خودا باڵا دەستی کردن بە سەر ئەو جولەکانەی ئیمانیان پێ نەهێنا.

٢- یان ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناو بەردەوام بوون لەسەر یەکتاپەرستی، بەبەڵگەو بورهان بەسەر ئەوانەدا باڵا دەست بوون: کە بیرو باوەڕی عیسا خودایی‌و سێ خوداییان هەبوو.. یان ئەو یەکتاپەرستی‌یەی ئەوان لەسەری بوون، خودا بە ئایینی ئیسلام باڵا دەستی کردن بەسەر هەموو ئایینەکان دا سەری خستن.

بەکورتی بەنوئیسرائیلی‌و مەسیحیەکان دەربارەی حەزرەتی عیسا دوای بەرز کردنەوەی بۆ ئاسمان کێشەیان تێکەوت. هەندێکیان ئیمانیان پێ هێناو هەندێکیان پێی کافر بوون. بوونە سێ تاقم:

تاقمێکیان وتیان: خودابوو بەرزبووەوە. تاقمێکیان وتیان: کوڕی خودا بوو بردیەوە بۆلای خۆی. تاقمێکیان وتیان: بەندەو پێغەمبەری خودا بوو بەرزی کردەوە بۆلای خۆی. ئەم تاقمە موسوڵمانن، هەر تاقمەو برێکیان شوێنکەوتوویان هەن. پاشان پەروەدگار پشتگیری ئەوانەی کرد کە بڕوایان وابوو عیسا بەندەو پێغەمبەری خودایە بەسەر تاقمەکانی تردا باڵا دەستی کردن. ئەمجار بەڕەوانە کردنی پێغەمبەری ئیسلام ئەو تاقمە سەرکەوتووەی بە تەواوی بەسەر تاقمە کافرەکاندا باڵا دەست کرد.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی الجمعة

ئەم سورەتە مەدەنییەو یانزە ئایەتە، دوا سورەتی (الصف) نازڵ بووە. ناونراوە سورەتی (الجمعة) چونکە لەئایەتی ژمارە (٩)دا فەرمان بە بەپیرەوە چوونی بانگەوازیی نوێژی هەینی تێدایەو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾.

**موناسەبەو پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشوو لەچەند رویەکەوەیە:**

١- لەسورەتی پێشوودا باسی وەزعو حاڵی حەزرەتی موسای کرد لەگەڵ نەتەوەکەی دا، ئەزیەتدانو بێ گوێی جولەکەکانی بەرامبەر بەحەزرەتی موسا راگەیاند. لەم سورەتەدا حاڵو وەزعی پێغەمبەرو موسوڵمانانی دیاری کرد، بۆ ئەوەی جوداوازی نێوان ئەو دووگەلە دەربکەوێ.

٢- لەسورەتی پێشوودا مژدەدانی حەزرەتی عیسای راگەیاند بەوە: کە لەدوا ئەو، پێغەمبەرێك دێ ناوی ئەحمەد دەبێ. لەم سورەتەدا باسی ئەو پێغەمبەرە دەکا: کە مژدەی لەبارەوە دراوە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ﴾.

٣- کوتایی سورەتی پێشووی بەباسی جیهاد هێناو ناوی نا (تیجارە) کۆتایی ئەم سورەتەش بەباسی جومعە دەهێنێو دەفەرمووی: ئەنجامدانی نوێژی جومعە لە تیجارەی دونیایی باشترە

٤- لەسورەتی پێشوودا پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە: کە لەبەرامبەر دوژمنو لەگۆڕەپانی جەنگدا بەریز بوەستنو یەکانگیر بن. ئیتر گونجاو بوو بەشوێن ئەو سورەتەدا سورەتی (الجمعة) بێ: کە نوێژەکەی بە جەماعەت نەبێ ناکرێ، دەبێ موسوڵمانان تێیدا بەریز بوەستن.

برێ لە مەوضوعو باسی ئەم سورەتە وەکوو سورەتە مەدەنییەکانی تر رون کردنەوەی حوکمە شەرعییەکانە: کەیەکێك لەوانە چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژی هەینی یە. بە شێوەیەکی گشتیش ئەوە لەدڵی کۆمەڵگای ئیسلامی سەردەمی مەدینەدا دەچەسپێنێ: کە لەکۆتایی دا ئەوان هەڵبژێراون بۆ هەڵگرتنی ئەرکی بیروباوەڕی یەکتاپەرستی، وە ئەم لەئەستۆ گرتنی ئەرکە پیرۆزەش فەضڵو رەحمەتی خودایە بۆیان، شیاوی ئەوەیە سەرنجی بدەنو سوپاسگوزاری بن، لەئاستی بەرپرسیاریەتی دابڕنو نەهێڵن خودا ئەو رێزلێنانەیان لێ وەرگرێتەوە. نەچن وەکوو جولەکە پەیمانی خۆیان بەرامبەر ئەمانەتی ئەستۆیان هەڵوەشێننەوەو لە پەیوەندی کردن بە ئەمانەتی ئاسمانەوە دابڕێنو بەحیسابی خۆیان حاملی تەوراتن بەڵام لەواقیع دا وەکوو گوێدرێژێك وەهان بارێ کتێبی لێ بارکرابێو ناشزانێ ناوەرۆکی ئەو کتێبانە چین !!

## رەوشتو تایبەتمەندی پێغەمبەرﷺ لەناو کۆمەڵگای عەرەبو نادەمیزاد بەگشتی

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ

﴿...بِهِمْۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ هەرچی هەیە لەئاسمانەکانو زەویدا تەسبیح بۆ زاتی خودا دەکا، دان بە هەبوونو تاکو تەنهاییدا دەنێن، ئەو خودایەی پاشاو خاوەنی هەموو بونەوەرە هەڵسوڕێنەرو فەرمانڕەوایە، هەرچی صیفاتی کەماڵو شکۆمەندییە هەیەتی، هیچ کەمو کوڕیو عەیبو خەوشێکی تێدا نیە. خاوەنی تواناو دەستەڵاتی رەهایە، هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا، کار دروستو حەکیمو دانایە لە هەموو شتێك دا، هەموو کارێکی بەجێیە.

﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمْ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ﴾ خودایەکی وەهایە لەناو گەلی عەرەبی نەخوێندەواردا: کە ئەو رۆژگارە زوربەی زۆریان خوێندنو نوسینیان نەزانیوە - پێغەمبەرێکی لە رەگەزی خۆیان تێدا رەوانە کردون، ئەویش نەخوێندەوارە، وێڕای ئەوەی نەخوێندەوارەو نازانێ بنووسێو بخوێنێتەوە ئایەتی قورئانی پیرۆزیان بەسەردا دەخوێنێتەوە، شارەزای رێبازی بەختەوەری دونیاو قیامەتیان دەکا، لە چڵکو ژەنگی کوفرو تاوان پاکیان دەکاتەوە، هەوڵ دەدا رەوشتی ناشرینی سەردەمی کوفرو بێدینیان لە ناودا نەمێنێ، قورئانو سوننەتیان فێردەکا، شەریعەتو حوکمی خودایان بۆ شی دەکاتەوە، دەیانخاتە سەر رێبازی راستو حەق، هەرچەندە ئەوان لەوەپێش گومڕابونو دەربارەی بیرو باوەڕو یاساو شەریعەت سەرلێ شێواو بوون. چونکە ئەوان لە رۆژگارێکی دێرینندا لەسەر ئایینی ئیبراهیم بوون، بەڵام دوایی گۆڕانکارییان تێدا کردو لەجیاتی یەکتا پەرستی ملیان لە بتپەرستی نا، بە

تەواوی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمیان لەبیرچۆوەو دابو نەریتێکیان داهێنا ناویان نا ئایینو خودا بە هیچی رازی نەبوو. هەروەکوو چۆن ئەهلی کیتاب نامەی تەوراتو ئینجیلیان گۆڕینو هیچیان بەسەر هیچەوە نەهێشت. بەتەواوی گومڕایی‌و سەر لێ شێواوی دونیای داگرت، کوفرو جەهالەت باڵی رەشی بەسەر جیهاندا کێشا بوو؛ ئالەم کاتەدا پەروەردگار حەزرەتی موحەممەدی کردە پێغەمبەری ئاخر زەمانو بۆسەر سەرجەم ئادەمیزادو جندۆکە رەوانەی کرد، قورئانی بۆ نازڵ کرد بۆ ئەوەی بکرێتە یاساو شەریعەتیانو کاری پێ بکەن، بەختەوەریی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر بێ.

تایبەتمەندکردنی عەرەبە نەخوێندەوارەکان، بەناو هێنان لێرەدا، لەم رووەوە: کە حەزرەتی موحەممەد(د.خ) رەوانە کراوە بۆ سەر ئەوان بەتایبەتی‌و بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بەگشتی، وەکو لەئایەتێکی تردا دەفەرمووی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ (الانبياء/١٠٧) یان دەفەرمووی: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً﴾ (الاعراف/١٥٨).

﴿وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەروەها ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە لە روانگەی قورئانی پیرۆزو فەرمودە بەرزەکانی خۆیەوە، نێراوە بۆ سەر گەلو نەتەوەی تریش: کەهێشتا پێیان نەگەیشتونو دوای رۆژگاری هاوەڵان دێن، وەکوو چینی تابیعینو چینەکانی ئادەمیزاد کە یەك بەدوو یەکدا دێن تارۆژی قیامەت. بێگومان خودا باڵادەستو خاوەن عیززەتو شکۆمەندییە، دەتوانێ گەلی موسوڵمانان جێگیر بکا لەسەر زەوی، هەرچی دەیکا لەجێی خۆی دایە، هیچ کارێکی بێ هودە نیە.

ئیمامی بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەرﷺ رۆنیشتبووین، سورەتی (الجمعة)ی بۆ سەر نازڵ بوو، بۆی خوێندینەوە، کاتێ گەییشتە ﴿وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾ هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە کێن؟ سێ جار ئەم پرسیارەیان ئاراستە کردەوە، (سەلمانی

فارسى)شمان تێدابوو، ئيتر پێغەمبەرﷺ دەستى خستە سەرشانى سەلمان‌و فەرمووى: ئەگەر ئيمان لەلاى ئەستێرەى ثورەييا بێ، پياوانێ لە ئەمانە دەستە بەرى دەكەن.

ئايەتەكە بەڵگەيە لەسەر ئەوە: كە پێغەمبەرايەتى حەزرەتى موحەممەد گشتى‌يەو بۆ هەموو عالەمە، چونكە پێغەمبەرﷺ رستەى ﴿وَآخَرِينَ مِنْهُمْ..﴾ ى بەگەلى فارس مانا كرد، هەر بۆيەشە نامەو فروستادەى خۆى ناردون بۆ لاى گەلى فارس‌و رۆم‌و گەل‌و نەتەوەى تريش بۆ ئەوەى ئيمانى پێ بهێنن.

ئيبنو ئەبى حاتەم لە سەهلى كورِى سەعدى (الساعدى) يەوە ريوايەت دەكا: دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووى: لەوەچەو نەژادى پياوو ئافرەتى ئوممەتى من لەوە بەولاوە كەسانێكى زۆر، بەبێ حيسابو لێكۆڵينەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە، ئەمجار ئايەتى ﴿وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا﴾ ى خوێندەوە.

ئەمجار ئەوە روندەكاتەو: كەئايينى ئيسلام‌و رەوانە كردنى حەزرەتى موحەممەد فەضل‌و رەحمەتى خودايە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ ئايينى ئيسلام‌و رەوانەكردنى پێغەمبەر فەضل‌و رەحمەتە لە خوداوە، پلەو پايەيەكە بەويستى خۆى دەيبەخشێ بەكەسانێك لە بەندەكانى كە خۆى خواستى لەسەربێ. خودا بۆخۆى خاوەنى فەضل‌و ئيحسانى گەورەيەو كەس هاوشانى نيە، منەت‌و فەضل‌و نيعمەتى لە دونيادا بۆ هەموو بەندەكانيەتى بەوە: كە قورئان‌و حيكمەتيان فێر دەكا، لە قيامەتيشدا بەدوو چەندانەو چەند چەندانە كردنەوەى پاداشتى كردەوەكانيانە.

بێگومان هەڵبژاردنى گەل‌و كۆمەڵێك يان تاكێك لەلايەن خوداوە بۆ لە ئەستۆ گرتنى ئەو پەيامى پەروەدگارە، هەڵبژاردنى بۆ ئەوەى ببێتە شوێنى ومرگرتنى نورو فەيضى رەحمەتى خودا، رێزو بەهرەو فەزڵێكە هيچ فەضل‌و رێزێك هاوشانى نيەو هەرچى لە پێناودا ببەخشرێ لە ماڵ‌و گيان‌و هێزو وزە بەكەم دادەنرێ.

## ڕەوشت و هەڵس وکەوتی گەلی جولەکە

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥﴾ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓا۟ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَـٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾

لەوەپێش باسی یەکتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی کرد، ئەوەی ڕاگەیاند: کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری ناردوە بۆ سەر گەل و نەتەوەیەکی نەخوێندەوار. جولەکەکان وتیان: ئەو پێغەمبەرە تایبەتە بە عەرەبەوەو بۆ سەر ئێمە ڕەوانە نەکراوە، ئیتر پەروەدگار بەرپەچی دانەوە بەوە: کە ئەوانە پابەندی تەورات نەبوون، ئەگەر بەگوێرەی تەورات هەڵس و کەوتیان بکردایەو ئەوەیان بەرچاو بگرتایە: کە تەورات مژدەی هاتنی پێغەمبەری داوە، سودیان لێ وەردەگرت و ئەم جۆرە قسە هەڵەق و مەلەقانەیان نەدەکرد، ئەم شوبهەو گومانانەیان نەدەخستنەوە.

نموونەی جولەکە لە سود نەبینینیان بە تەوراتو کارنەکردنیان بەپەیامەکەی، دەق نموونەی گوێدرێژێکە بارێکی قورسی کتێب لێ بارکراوەو جگە لەماندوبوون هیچی تری پێ نابڕێ.

ئەمجار شوبهەو گومانێکی تریشیان رەتدەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە راست دەکەن گەلی خۆشەویستو هەڵبژاردەی خودانو دڵنیان لەوە، دە داخوازی مردن بکەن بابەزویی بگەنە ئەو نازو نیعمەتەی خودا بۆ خۆشەویستانی خۆی دایناوە.

دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَاراً﴾ نمونەی ئەو جولەکانەی ئەرکی راگەیاندنی پەیامی تەوراتیان خرایە ئەستۆو ئەنجامیان نەدا، کاریان پێ نەکردو پاشگوێیان خست، وەکوو نموونەی گوێدرێژێك وەهایە بارێك کتێبی گەورە گەورەی لێ بارکراونو نازانێ چن، باری بەردوداری لێ باربکەی یان باری کتێب، لای ئەو چوونیەکە. چونکە فامی نیە. جولەکەکانیش هەرچەند عەقڵو فامیان هەیە، بەڵام چونکە سودیان لێ نەبینیو حەقیقەتیان نەپێکاو تێی نەگەیشتن، حاڵو وەزعیان لەو گوێدرێژە خراپترە، چونکە ئەوانە رێزی ئەو ئەمانەتە گەورەیەیان نەگرت: کە خودا خستبویە ئەستۆیان ، نە لە ناوەرۆکی حاڵی بوون، نەکاریان پێ کرد، بەڵکوو گۆڕانکارییان تێدا کردو شێواندیان، بۆیە خودا دەربارەیان لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ (الاعراف/١٧٩).

هەموو ئەوانەش: کە خۆیان بە موسوڵمان دەزانن‌و ئەمانەتی بیروباوەڕ لە ئەستۆیان دایەو وەکوو پێویست ئەرکی سەرشانیان ئەنجام نادەن، ناوی موسوڵمانیان لەخۆیان ناوەو کردەوەیان موسوڵمانانە نیە، بەتایبەتی ئەوانەی قورئان دەخوێنن‌و شارەزای زانستە ئیسلامیەکانن، وەلێ کار بە ناوەرۆکی قورئان‌و شەریعەتی ئیسلام ناکەن، ئەوانەش خودا -بەدورمان کا- وەکوو گوێدرێژ وان،

کەبارێ کتێبی لێ بار کراوەو نازانێ ناومرۆکیان چیە. ئەمرۆ بەداخەوە ئەو جۆرە بەناو موسوڵمانە زۆرن!!

﴿بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ ئای نموونەی کافرو بەدرۆخەرەوەکان چەند نموونەیەکی قێزەونو ناشرینە، چەند لێکچونێکی نەکلەوەتە. شوبهاندنی جولەکە بە گوێدرێژ!!! کەواتە ئەی موسوڵمانینە! ئێوە وەکوو ئەوان مەبن، چاو لەوان مەکەن، خودا تۆفیقی گەلو نەتەوەی کافرو ستەمکارنادا.

﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا إِنْ زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ مِنْ دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ بەوانە بڵێ: کە جولەکەن، ئەگەر ئێوە راست دەکەن پێتان وایە ئێوە خۆشەویستی خودانو بە تایبەتی هەڵبژاردەی خودانو ئێوە لەسەر هیدایەتنو موحەممەدو هاوەڵانی لەسەر رێگای نادروستن، دە ئێوە مردن بەئاوات بخوازن بۆ ئەوەی برۆن بۆ بەهەشتو بگەنە نازو نیعمەت، یان بڵێن خودایە کێ گومرایە بیمرێنە. کەسێك لێی رون بێ ئەهلی بەهەشتە پێی خۆشە لەم دونیا پڕ خەمو خەفەتە رزگاری بێ. ئەم جۆرە حیوارە پێی دەگوترێ: (مباهلة) واتە راوەستانی هەردوو لایەن بەرامبەر بەیەكو دوعا کردن لە یەکتری بەزیان لێ کەوتن. هەڵبەتە هەر کەسێ پێغەمبەر داوای موباهەلەی لێ کردبێ ترساوەو نەوێراوە موباهەلە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بکا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کەئەو جولەکەو مەسیحیانە لەناخی دڵیانەوە بڕوایان بەڕاستی پێغەمبەر هەبوە، بۆیە نەیانوێراوە بچنە روبەروبوونەوەیو موباهەلەکردنەوە.

ئیمام ئەحمەد فەرمودەیەکی لە عەکرەمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت کردوە، دەفەرموێ: رۆژێك ئەبو جەهلی نەفرین لێکراو وتی: ئەگەر موحەممەد لەناو کەعبەدا ببینم دەبێ قاچ بخەمە سەر گێزەرەی ملی! ئیبنو عەبباس دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بهاتایەو وای بکردایە، فریشتە بە ئاشکرا تێکیانەوە دەپێچاو دەیانپڕواند، ئەگەر جولەکە تەمەنای مردنیان بکردایە، یەکسەر

دەمــردن و چــاویان دەکــەوت بــە شــوێنی خۆیــان لــە دۆزەخ دا ، ئەوانــەیش: کــە پێغەمبەر داوای موباهەلەی لێ کردون ئەگەر لەگەڵیان بکردایە، کاتێك کە دەچوونە ماڵەوە کەسیان نەدەمان، نەژن و نەمنداڵ [١].

ئــەمجار پــەروەردگار حەقیقــەت و راستی ئــەو جولەکــە مادییانــە دەردەخــات، دەفەرموێ: ﴿وَلا يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَداً بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ ئەوانە ژیانیـان خۆش دەوێ و لەمردن دەترسن، هەرگیز تەمـەنناو داخـوازی مـردن ناکـەن، بـەهۆی ئەنجامدانی ئەو هەموو کردەوە ناشیرین و تاوانانەی ئەنجامیان داوە، خـودا زانیـاری تـەواوو بـەرفراوانی هەیـە، حـاڵ و وەزعـی کافرەکـان دەزانـێ، سـزای عادڵانـەیان دەداتەوە ﴿قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلاقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر، بـەو جولەکـە خۆویسـت و خۆپەرستانە بڵێ: ئەو مردنەی لەبەری رادەکەن و هێنـدەتان ژیـان لا خۆشەویسـتە نـاوێرن بـە(مباهلـة)ش خۆتـانی لەقەرەبـدەن، ئـەو مردنـە یەخـەتان دەگـرێ و لـە دەستی رزگارتان نابێ، بـۆ هـەر شـوێنێك رابکـەن پێشتان لێ دەگـرێ، دەبـێ پیاڵـەی ژەهـری مـەرگ بـچێژن. دوای مردنتـان دەگەرێنـەوە بـۆلای خـودای غـەیب زان و ئاگاداربە هەرچی لـە ئاسمانـەکان و زەوی دا هەیـە، جا ئـەو کاتـە هـەواڵتان دەداتـێ چیتان کـردوە بـە گوێرەی کردەوەکانتـان سـزاتان دەداتـەوە، نموونـەی ئـەم ئایەتـە ئایەتێکی ترە: کە دەفـەرموێ: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ (النساء/٧٨).

(١) بوخاری و تیرمیزی و نەسائی ریوایەتیان کردوە.

## نوێژی هەینی فەرزەو دوا ئەنجامدانی، کارکردن دروستە

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَـٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ۚ قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَـٰرَةِ ۚ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی(١١) ئەحمەدو هەردوو پیری فەرمودە (بوخاری‌و موسلیم‌و تیرمیزی) لە جابیرەوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ رۆژی هەینی وتاری دەدا، لە پڕێکا بوو بە دەنگە دەنگ‌و چڕو سەلاوات.. چیە؟ کاروانی بازرگانی لەشامەوە گەڕاوەتەوە، ئیتر نوێژکەرەکان نوێژی هەینیان جێ هێشت‌و بەرەو کاروان راچمین، دوانزە کەس نەبێ ئەوانەی تر هەموویان مزگەوتیان چۆڵ کرد!! ئیتر پەروەدگار ئایەتی ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْواً انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِماً﴾ ی نازڵ کرد.

لەوەپێش پەروەدگار ئەوەی رونکردەوە: کە هێندەیان ژیان خۆش دەوێ لەمردن هەڵدێن، ئەمجار لێرەدا دەیەوێ موسوڵمانان وا پەروەدە بکا: کە هەر کارێك

لەجیهاندا بکەن، وای ئەنجام بدەن سودی قیامەتیانی تێدابێ. نابێ بۆ ئەنجامدانی کاری دونیا لایەنی قیامەت پێشێل بکرێ.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان بە خودا هێناوەو شوێن پەیامی پێغەمبەری خودا کەوتوون، هەرکاتێك بانگدەر بانگی دووەمیدا بۆ ئەنجامدانی نوێژی رۆژی هەینیو وتار خوێن چووە سەر مینبەرو دانیشت، ئێوە دەست لە کارەکانتان هەڵبگرنو بڕۆن بۆ بەجێهێنانی نوێژی جومعە، بۆ زیکرو طاعەتی خودا، دەست بە دەستنوێژو پۆشاکی خاوێنەوە، بەدڵو دەروونی پاكو بێگەردەوە، بڕۆن بۆ مزگەوتو گوێ لەوتاری خەطیب بگرنو نوێژی هەینی ئەنجام بدەن. پابەندی فەرمانو جڵەو گیرییەکانی خودابن، ئەو هەوڵو تێکۆشانو چون بۆ مزگەوتو ئەنجامدانی نوێژی هەینییە، زۆر باشترە لە کارو کردەوەی تری دونیایی، ئەگەر ئێوە لە ئەهلی زانستو زانیاریو تێگەیشتنن.

نوێژی هەینی نوێژی بەکۆمەڵە، دەبێ بە جەماعەت بکرێ، نوێژێکە مەرجە حەفتانە موسوڵمانان لەشوێنی تایبەتیو بە شێوەی تایبەتی ئەنجام بدەن ، گوێ لەوتاری خەطیب بگرن، نوێژی هەینی عیبادەتێکی ریزبەندو مونەظەمە ، بە گوێرەی یاسایەکی ئیسلامی ئەنجام دەدرێ. رۆژی هەینی پشووی موسوڵمانانە، رۆژی شەممە پشووی جولەکەیەو رۆژی یەك شەممە پشووی مەسیحیەکانە. کە دەفەرموێ: ﴿فَاسْعَوْا﴾ مەبەست ئەوەنیە بەراکردن بچی بۆ نوێژی جومعە، بەڵکوو مەبەست گرنگی پێدانە، خۆئامادەکردنە بۆ ئەنجامدانی!

ئیمام ئەحمەد لە ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە دەڵێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (من اغتسل يوم الجمعة ومس طيب اهله ان كان عنده ولبس احسن ثياب، ثم خرج ياتي المسجد، فيركع ان بدا له ولم يؤذ احدا، ثم انصت اذا خرج امامه حتى يصلي ، كانت كفارة لمابينها و بين الجمعة الاخرى) .

بوخاری‌و موسلیم له صەحیحەکانیاندا لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (اذا سمعتم الاقامة فامشوا الى الصلاة وعليكم السكينه والوقار، ولاتسرعوا، فما ادركتم فصلوا، وما فاتكم فأتموا) هەڵبەتە وتاری رۆژی هەینی کەناڵێکی گرنگی ئیعلامی ئیسلامییە. پێویستە وتار خوێن مافی خۆی بداتێ، بە گوێرەی رۆژو روداو، لە روانگەی ئیسلامەوە، کێشەو روداوەکان شی بکاتەوە. لایەنی رۆشنبیری‌و ئاستی تێگەیشتنی گوێگرەکان بەرچاو بگرێ.

﴿فَإِذَا قُضِيَتْ الصَّلاةُ فَانتَشِرُوا فِي الأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ کە نوێژی جومعە ئەنجام دراو تەواو بوو، ئیتر رێگەتان هەیە هەرکەسە بۆلای ئیش‌و کاری خۆی بچێ هەوڵی ئەنجامدانی کاری خۆی بدا، هەوڵی وەدەستهێنانی رزق‌و رۆژی خۆتان بدەن، لەکاتی کارکردن‌و مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتندا یادی خوداتان لەبیر نەچێ، شوکرو سوپاسی بکەن، ترسی ئەوەتان لەدڵدا بێ‌و لارولوێری لەکارو بازرگانی‌یەکانتاندا مەکەن، ذیکری خودا بکەن هەوڵ بدەن رەزامەندیی خودا بەدەست بێنن، بەڵکوو سەرفرازی هەردوو جیهان بن‌و بەختەوەری دونیاو قیامەتتان دەست بکەوێ.

ئەمجار پەروەدگار سەرزەنشتی ئەوانە دەکا: کەنوێژی جومعەیان جێ هێشت‌و بەهەڵەداوان بەرەو کاروانی تازەگەڕاوە بەکالاوە رۆیشتن. دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْواً انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِماً قُلْ مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ اللَّهْوِ وَمِنْ التِّجَارَةِ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ ئەو نوێژکەرە موسوڵمانانە لە مزگەوتداو لەکاتی ئەنجامدانی نوێژی هەینی‌دا ، لەوکاتەدا: کە گوێیان بۆ وتاری تۆ گرتووە ئەی پێغەمبەر: کە دەبینین وا قافڵەیەکی حوشتر بار لە وڵاتێکی ترەوە گەڕاوەتەوە، یان گوێیان لەتەپڵ‌و دەفی زەماوەندی بوک گواستنەوە یان هەر زەماوەندێکی تر دەبێ، صەفی جەماعەت جێ دێڵن‌و مزگەوت چۆڵ دەکەن، دەچن بۆ لای قافڵەکە یان بۆ سەیری

زەماوەندەکە، تۆ لەسەر دوانگە وتار دەدەی، ئەوان جێت دێڵن ، کارێکی خراپ دەکەن و هەڵوێستێکی ناشیرین دەنوێنن!

ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئەوەی لای خودایە لە پاداشتی گەورەو مەزن لە قیامەتدا زۆر باشترە لەو بازرگانیو مامەڵەیەی مزگەوتی لەکاتی ئاوادا بۆ بەجێ دێڵن، چۆن ئێوە رێگەتان بەخۆتان دا پێغەمبەر بە پێوەو لەکاتی وتار خوێندنەوەی رۆژی هەینیدا جێ بێڵن و مزگەوت چۆڵ بکەن، ئەو فەضل و رەحمەتە لەکیس خۆتان بدەن، بۆچی؟ بۆ کالای دونیایی، بۆ سەیری زەماوەند؟! ئێوە داوای رزق و رۆزیی لەخودا بکەن، لەکاتی خۆیدا هەوڵی بۆ بدەن، نەك نوێژی جومعەی بۆ بەجێ بێڵن. بێگومان خودا رزق و رۆزیدەرە، هەرکەسێ پشت بە خودا ببەستێ، لەکاتی خۆیدا هەوڵی کارو کاسبی بدا خودا سەرکەوتووی دەکا، کەس نائومێد ناکا.

ریوایەت کراوە عیراکی کوڕی مالیك: کە نوێژی هەینی دەکرد دەگەڕایەوە، لە دەرگای مزگەوت رادەوەستاو دەیگوت: خودایە من بەپیر بانگەوازیەکەتەوە هاتم، نوێژە فەرضەکەم بەجێ هێنا، چۆنت فەرمان پێکردم وا دەچمەوە سەر ئیش و کارم، خودایە لە فەضل و گەورەیی خۆت رزق و رۆزیم بدەرێ، بێگومان خودا باشترین رزق و رۆزیدەرە.

لە جابیرەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: ئێمە لەتەك پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد، لەوکاتەدا کاروانێك گەڕایەوە حوشتربار خۆراکی هێنابوو، ئیتر نوێژکەرەکان بۆی راچەنین، دوانزە کەس مایەوە لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دا ئەبوبەکرو عومەر لەو دوانزە کەسە بوون.

**تێبینی: ئەو حوکمانەی لەم ئایەتانە وەردەگیرێن:**

١- نوێژی هەینی فەرزەو خۆئامادەکردن و چون بۆ ئەنجامدانی لە مزگەوتدا فەرزە. هەڵبەتە نوێژی جومعە لەسەر ئەوانە واجبە: کە موکەلەفن، کەوابێ نەخۆش و سەفەریی و کۆیلەو ئافرەت و کوێرو پیری کەنەفت و پۆلکاو لەسەریان

واجب نیه. چونکه پێغەمبەرﷺ له فەرمودەیەکدا: کە دارەقوطنی لە جابیرەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فعلیه الجمعة یوم الجمعة الا مریض او مسافر او امرأة او صبي او مملوك، فمن استغنی بلهو او تجارة استغنی الله عنه والله غني حمید).

٢- مالیکیەکانو هی تریش فەرموویانە: هەرکەسێ نوێژی جومعەی بۆ بکرێو بیانووی نەبێ وەکوو نەخۆشی یان زیادبوونی نەخۆشیەکە، یان ترسی ئەوەی هەبوو ئەگەر بچێ بۆ نوێژی جومعە لەلایەن فەرمانڕەواو کاربەدەستەوە بە ناحەق زیانی ماڵی یان زیانی بەدەنی لێ بکەوێ، هەروەها بارانو قوڕ بە بیانوو دەژمێردرێن.

٣- کەسێك جومعەی لەسەر پێویست دەبێ: کە نزیك بێو گوێی لە بانگ بێ، ئەگەر کەسێك ماڵی هێندە دوور بوو گوێی لە بانگی نوێژی هەینی نەبوو، ئەوە خیطابی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي..﴾ نایگرێتەوە.

٤- نوێژی هەینی فەرزی عەینەو لەسەر هەموو موسوڵمانێکی موکەلەف واجبە. ئەمەڕای جەماوەری زانایانە، چونکە پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ﴾ پێغەمبەریش فەرموویەتی: دەبێ ئەو کەسانە واز لە نەکردنی نوێژی هەینی بێنن، یان خودا دڵیان مۆر دەکاو دەچنە پێڕی بێ ئاگایانەوە. لە فەرمودەیەکی تریدا دەفەرموێ: (من ترك الجمعه ثلاث مرات متتابعات ، طبع الله علی قلبه) کەسێك سێ جومعە بەبێ عوزر بە شوێن یەکدا تەرك بکا خودا دڵی مۆر دەکا.

٥- خۆشتنی ڕۆژی جومعە (غسل الجمعه) سوننەتە فەرز نیە. لەصەحیحەین دا لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: (اذا جاء احدکم الجمعة فلیغتسل) ئەم ئەمرە بۆ وجوب نیە، چونکە لە صەحیحی موسلیم دا فەرمودەیەك هەیە، ئەبوهورەیرە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من توضأ

یوم الجمعة فأحسن الوضوء ثم راح الی الجمعة فأستمع وانصت غفرالله له مابین الجمعة الی الجمعة و زیادة ثلاث أیام ، و من مس الحصی فقد لغا) دەی ئەم فەرمودەیە بەرونی ئەوە دەگەیەنێ: کەخۆشتنی رۆژی هەینی واجب نیە. سوننەتە بۆ ئەو کەسەی دەچێ بۆ نوێژی جومعە جوانترینو خاوێن ترین پۆشاك بپۆشێ، هەروا خۆ بۆنخۆشکردنیش سوننەتە.

٦- ئەگەر وا رێکەوت رۆژی جومعە رێکەوتی رۆژی جەژنی کرد، ئەوە دەبێ هەردو نوێژەکە بکرێن. بەڵام ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێ: ئەگەر نوێژی جەژنو نوێژی هەینی کەوتنە یەك رۆژەوە بەکردنی نوێژی جەژن نوێژی جومعە لادەچێ، چونکە ئەبو داودو ئیبنو ماجە لەئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: (اجتمع فی یومکم هذا عیدان فمن شاء اجزاه من الجمعة وانا مجمعون) لەم رۆژەدا دوو جەژن کۆبوەتەوە، کەسێك نوێژی جەژنی کرد، بری نوێژی جومعە دەکەوێ، ئێمە هەردوکیان کۆ دەکەینەوە.

ئیمامی عوسمان رەزای خودای لێ بێ، لە رۆژێکی ئاوادا واتە: رۆژی جەژنو جومعە بوو. رێگەی دا خەڵکی دەوروبەری مەدینە نەیەنەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژی جومعە.

**دەربارەی ژمارەی ئامادە بوانی نوێژی جومعە سیانزە رەئی هەیە لەو رایانە :**

أ- ئەبو حەنیفەو موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی دەڵێن: جگە لە ئیمام نابێ لەسێ کەس کەمتربن، جائەو سێ کەسە سەفەرین نەخۆشن چ قەیدی نیە.

ب- مالیکییەکان دەڵێن: دەبێ دوانزە کەس بن ئامادەی وتارو نوێژەکە بنو دانیشتوی ئەو شوێنەش بنو لە سەرەتاوە تا کۆتایی بمێننەوە.

ت- شافیعیو حەنبەلی یەژن: دەبێ چل کەس بنو دانیشتوی ئەو گوندو شارە بن: کە جومعەی تێدا دەکرێ. موکەلەف بن ئازاد بن. بەڵگەیان ئەوەیە: دەڵێن پێغەمبەرﷺ لەمەدینە هەرگیز بەکەمتر لەچل کەس جومعەی نەکردوە.

٧- لەکاتی ئەنجامدانی نوێژی جومعەدا کارو کاسبیو مامەڵە کردن یاساغە بۆ ئەوانەی نوێژی جومعەیان لەسەرە. بەڵام ئەگەر کڕینو فرۆشتن کرا ئەوە بەلای شافعیو حەنەفیەوە مامەڵەکە دادەبەسترێو بەیعەکە فاسید نیە. بەلای ئیمام ئەحمەدەوە سەوداکە فاسیدەو دانامەزرێ.

زانایان لەڕستەی ﴿وَتَرَكُوكَ قَائِماً﴾ ئەوەیان وەرگرتووە: کە وتاربێژ لەکاتی وتارداندا دەبێ بەپێوەبێ؛ ئەمە کۆڕای جەماوەری لەسەرە، لە حەدیثی پێغەمبەرﷺ دا ئەوە چەسپاوە: کە هەرگیز پێغەمبەرﷺ بەراوەستانەوە نەبووبێ، وتاری نوێژی هەینی نەداوە، هەروەها خولەفاکانیشی دواوەفاتی خۆی، بەراوەستانەوە وتاریان خوێندۆتەوە. بەڵام لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا کەسانێك هاتنە سەر حوکم ئەو گرنگییەیان نەدا بەخوطبەی جومعە، بەدانیشتنەوە خوطبەی جومعەیان دەخوێندەوە، یەکەم کەس کەوتاری ڕۆژی هەینی بەدانیشتنەوە خوێندەوە (معاویە) بوو.

ڕاوەستان لەکاتی وتار خوێندنەوەی ڕۆژی هەینی بەلای ئەبو حەنیفەوە سوننەتە، ئەگەر بە دانیشتنەوە وتاری خوێندەوە دروستە. وەلێ باش نیە، چونکە پێچەوانەی ئەو حاڵەیە کەلە پێغەمبەرو خولەفاکانی ڕاشیدینەوە بینراوە. بەلای مالیکەکانەوە ڕاوەستان بۆ وتار خوێندنەوە واجبە مەرج نیە، بەلای شافیعیو حەنبەلیەوە مەرجەو بەبێ هاتنە دی ئەو مەرجە دروست نیە.

٨- ئەگەر کەسێك چووە ژووری مزگەوتەوە لەو کاتەدا خەطیب وتاری دەدا ، با دانەنیشێ، دوورکات نوێژ بکا؛ ئاماژە بەو فەرمودەیەی موسلیم لە جابیرەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (اذا جاء احدکم یوم الجمعة والامام یخطب فلیرکع رکعتین ولیتجوز فیهما).

٩- پێویستە نوێژکەرەکان لەکاتی خوطبە خوێندنەوەدا هەموویان بێ دەنگ بن، چ ئەوانەی گوێیان لە وتارەکەیەو چ ئەوانەی گوێیان لێ نیە. کەسێك لەو کاتەدا قسە بکا بە لەغو حیسابە، بەڵام نوێژەکەی پێ بەتاڵ نابێتەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی المنافقون

ئەم سورەتە مەدەنییەو (١١) یانزە ئایەتە، ئەم ناوە تایبەتییەی لێ نراوە، چونکە لەیەکەم ئایەتیدا باسی (منافقون) دەکا. هیچ سورەتێکی مەدەنی نیە باسی نیفاقو مونافقینی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ تێدا نەبێ، وەلێ ئەم سورەتە بۆ باسی دوورووەکانو ئەو رووداوانەی لێیان رودراوەو ئەو قسانەی لێیان بیستراوە قۆرغ کراوە. ئەخلاقو درۆو دەلەسەو چاوو راویان بەیان دەکا. رقو کینەی ناو دڵیان لە موسوڵمانان دەردەخا، ترسنۆکیو خوێڕییەتییان ئاشکرا دەکا.

جمو جوڵی دووڕوویی لەو رۆژەوە دەست پێ دەکا: کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە مەدینەو دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراند، هەتا سەرو بەندی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺ درێژەی کێشا. بەڵام هیچ کاتێك بنەبڕ نەبووەو بە درێژایی مێژوو ئەو دیاردەیە لەشێوەو شێوازی جیاجیادا بەیناو بەین سەری هەڵداوە. هەرکاتێ موسوڵمانان بەهێز بووبن، ئەو دیاردەیە بەزەقی سەری هەڵداوەتەوە.

هەتا موسوڵمانان لە مەککەدا بوون ئەوەندەیان هێزو توانا نەبوو خەڵك لێیان بترسێ، یان هیوایەکیان پێ بنو ماستاویان بۆ بکەن، سەرانی قورەیشیش بەئاشکرا دژی پێغەمبەرﷺ وەستابوونو بە ئاشکرا ئەزیەتی موسڵمانانیان دەداو بەهەموو هێزو توانایانەوە بەرەنگاری بانگەوازیی ئیسلامیان دەکرد، هەتا موسڵمانان ناچار کران یەکەم جار کۆچ بۆ حەبەشە بکەنو لەژێر کاریگەری تەعزیبو سزادا یان

بەهەڵخەڵەتاندنو چاووڕاو هەندێ کەس توشی فیتنەی لە دین وەرگەڕان بوون. هەندێکیش سوربوون لەسەر بیروباوەڕی حەقو لەو پێناوەدا گیانیان لەدەستدا.

بەڵام کە پێغەمبەر کۆچی کرد بۆ مەدینەو دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراندو پشتگیری هۆزی ئەوسو خەزرەجی بەدەست هێناو وای لێ هات مەدینە سەرتاپای بووە (دار الاسلام) عەرەبەکانی ئەوێ سەرتاپا موسوڵمان بوون. بارودۆخی بانگەوازی ئیسلامی پێی نایە قۆناغێکی ترەوە. هەڵبەتە ئەم حاڵەتە لەسەر دڵو دەرونی ئەوانەی بەنەزانی یان لەبەر حەسوودی موسوڵمان نەبوو بوون زۆر قورس بوو، نەیانتوانی دان بە خۆیاندا بگرنو بێ دەنگ بن .

بۆیە ئەو دڵو دەرون نەخۆشانە کەوتنە جم جۆڵو دەستیان کرد بەدژایەتی پێغەمبەرﷺو موسوڵمانان، بەڵام دژایەتیەکی خوێڕییانەو لە بەرگو پۆشاکی دووڕوویی دا، بەڕواڵەت خۆیان بە موسوڵمان نیشان دەداو لە دڵدا کافرو بێ بڕوا، هەرچەندە ئەوان لەهیچ حالێکدا دانیان بە کوفرو دووڕوویی خۆیاندا نەدەنا، وەلێ دووڕوویی‌و کوفرو هەڵوێستی ناشیرینو فرتو فێڵەکانیان لە پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانی شاراوە نەبوون، هەروەکوو هەندێ جار لەکاتی تەنگانەو ئەزەماتدا هەڵوێستی وایان دەنواند: کە پەردەی لەسەر کوفرو دووڕوییەکەیان هەڵدەماڵی‌و فەضح دەبوون.

قورئانیش لێکدان لێکدان راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ فرتو فێڵەکانیانی دەخستە ڕو، پێغەمبەرو موسوڵمانانی شارەزای فرتو فێڵو خیانەتو خیانەتکارییەکانیان دەکرد. هەموو کاتێکیش هەبوونی دارو دەستەی ئاوا لەناو کۆمەڵگادا خەتەرێکی گەورە بوونو ئێستاش خەتەری سامناکن. وەکوو خەم خۆرکە وانو زیانیان لە زیانی دوژمن ئاشکراو زۆرترە.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوەی لەچەند روییەکەوەیە:**

١ - لەسورەتی پێشوودا باسی موسوڵمانانی کرد، لەم سورەتەش دا باسی مونافیقەکان دەکا.

٢ - سورەتی پێشوو باسی ئەوانە دەکا: پێغەمبەرێتی موحەمەد بەدرۆ دەخەنەوەو بەدڵو بە زوبان دژایەتی دەکەن: کەبریتی بوون لەجولەکەکان. لەم سورەتەشدا باسی ئەوانە دەکا کەبەدڵ بڕوایان بە پێغەمبەرێتیەکەی نیە. ئەوانەیش دووڕووەکانن.

## ڕەوشتی ناشیرینو نەگلەوەتی دووڕووەکان

﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا۟ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ

يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾ ﴾

ئەم سورەتە بەباسی هەڵس وکەوتی ناشیرینی دووڕووەکان دەست پێ دەکا، لە دڵدا کافرو بێ دینن، بەڕواڵەتیش دێنە لای پێغەمبەرو سوێند دەخۆن کە: تۆ پێغەمبەری خودای. سوێندەکانیان دەکەنە مەتاڵ و خۆیانی لە بەردا دەشارنەوە. فرت و فێڵ لە موسوڵمانان دەکەن، دەفەرموێ:

﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! کە دووڕووەکان دێنە لات و ئامادەی کۆڕو مەجلیست دەبن بەڕاڵەت خۆیان بە موسوڵمان نیشان دەدەن و دەڵێن شایەتی دەدەین کە: تۆ پێغەمبەری خودای، بەدڵ و بەزوبان ئەم شایەتیە دەدەین. خودا دەزانێ کە: تۆ پێغەمبەری خودای، ئەوەی کە دەیڵێن: موطابیقی واقیعە، ئەتۆ پێغەمبەری خودای بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد. بەڵام خودا شایەتی دەدا کە دووڕووەکان درۆ دەکەن، ئەوەی دەیڵێن: لە دڵیانەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بۆ خۆیان بڕوایان بەو شایەتیە نیە، ئەوەی بەزوبان دەیەژن بەدڵیان نیە. کەوابوو ئەوانە بەنیسبەت بیرو باوەڕیانەوە درۆزنن و نەدەبوو ئەو قسە سەر زارەکییەیان ناوبنێن شایەتی. چونکە شایەتی کاتێ شایەتییە دڵ و زوبان یەک بن.

﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوانە سوێندی خۆیان کردوە بە قەڵغان و مەتاڵ بۆ پارێزگاری گیانیان لە کوشتن و دیل کردن، پارێزگاری ماڵ و سامانیان لە داگیرکردن بۆ ئەوەی ئەحکامی کافرو ئەهلی کیتابیان بەسەردا ئەنجام نەدرێ کەسێك نەیانناسی پێیان هەڵبخەڵەتێ و وابزانن موسوڵمانن و چاویان لێ بکەن، لەم ڕووەوە زیان بەکەسانی دیکە بگەیەنن. لەکرداری

چاكو چون بۆ جیهاد ژێوانیان بكەنەوە، شكو دڵە ڕاوكێیان تێدا دروست بكەن. بەڕاستی خراپ بیروباوەڕێكیان هەیەو هەڵوێستی ناشیرین دەنوێنن، كردەوە كانیان خراپو ناپەسەندن.

﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لا يَفْقَهُونَ﴾ ئەو درۆو دەلەسەكردنو كرداره بەدەیان بەهۆی ئەوەوەیە: بەڕواڵەت ئیمانیان هێناوە، لە ڕاستیو واقیعدا كافرن، لە دڵدا بڕوایان بەوەنیە كە: بەزمان دەیڵێن. ئیتر خودا دڵی مۆر كردونو لەحەق ناگەن، نوری ئیمان ناچێتە ناو دڵیانەوەو ڕێگای ڕاست نادۆزنەوە، هەست بەو بەڵگانە ناكەن كە ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەچەسپێنن.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾ كاتێ چاوت پێیان دەكەوێ، جوانی پۆشاكو لەشو لاریان، شانو شەوكەتو ڕوخساریان تۆ دەخاتە سەر سوڕمانەوە، خۆ ئەگەر بكەونە قسەو گفتوگۆ گوێچكە بۆ قسەیان ڕادەگری، شیرینی قسەو دەمو لەفظیان سەرنجت ڕادەكێشێ. وەلێ لە واقیعدا وەكوو موره دارێكی كلۆر وان كە: پاڵی درابێ بەدیوارێكەوە، واتە: جەستەیەكی بۆشو بێ گیانو زانیارین. لە هیچ ناگەنو هیچ نازانن.

وەكوو ڕیوایەت كراوە: سەركردەی دووڕووەكان؛ عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی پیاوێكی فەصیحو زمانپاراوو شۆخو شەنگو بەشانو شەوكەوت بوو، بەڵام خۆیو هاوەڵەكانی گێلو نەفامو بێ هەست وشعور بوون. ئەوانە وێنەن بێ ئەوەی مانایان هەبێ.

﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ ئەوانە هەر دەنگێك ببیسن بەدەنگی دوژمنی دەزانن. بێ هێزو بێ وەرەن ترسنۆكو خوێڕین، لەناخو دەروونندا ڕوخاوو دۆڕاون، هەست بە تێكشكان دەكەن، ئەوانە

دوژمنــی سەرســەختن، وریــای فــرتو فێــڵ وپیلانیــان بــە، مەهێڵــە ئاگــاداری نهێنیـیەکانتان بن. چونکە ئەوانە جاسووسی دوژمنەکانتانن، تابووری پێنچن‌و خم خورکـەی نـاو کۆمـەڵن. خـودا نـەفرینی لێ کـردونو لـە ڕەحمـەتی خـۆی دووری خستونەوە، خودا بیانکوژێو بەفتارەیان بەرێو لەناویان ببا، چۆن لە ڕێگای حـەق لادەدەنو رودەکەنـە کـوفرو بێـدینی، هیدایـەت وەرنـاگرنو بـاوەش بـۆ گـومرایی دەگرنەوە.

## نیشانەی درۆزنـیو دڵ پیسی دووڕووەکان

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْاْ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ

مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّۚ وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٨﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٥) بوخاری وموسلیم ریوایەتێکی دورو درێـژیان هێناوە، پوختەکەی ئەمەیە: پێغەمبەر ﷺ غـەزای (بنـی المصطلق)ی ئەنجامدا، لە نزیك ئاوێك کەپێی دەگوترێ: (موره یسیع) کوڕێکی کۆچەری و یەکێك لە پارمەتیدەران (الانصار) لەسەر ئاودانی ولاغ لێیان بوو بەهەرا، ئەویان هاواری کرد ئەی (مهاجرین) فریام بکەون، ئەمیان هاواری ئەنصارەکانی کرد، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول گوێی لەم هەراو هۆریایە بوو، خۆی پێ نەگیرا، وتی: بۆچی کۆچەریەکان وایان لێ هات چاومان لێ بزبکەنەوە؟؟ (مەثەلەی کابرامان لێ قەوماوە دەڵێ سەگی خۆت قەڵەو بکە با بتخوا)!! شەرتبێ ئەگەر گەییشتینەوە مەدینە دەبێ بەهێز بێ هێز دەربکا. هەرگیز ناهێڵم لە مەدینەدا دانیشن!!

زەیدی کوڕی ئەرقەم گوێی لەم ناماقوڵییانەی عەبدوڵلا بوو، بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە، عومەری کوڕی خەتتاب لەوێ بوو وتی: پێغەمبەری خودا بابیکوژم! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نابێ، ئەگەر بیکوژم دەڵێن: محەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێ!

پێغەمبەرﷺ بە مەبەستی ئەوەی ئەم رووداوە تەشەنە نەکاو خەڵکەکە لێی نەکۆڵنەوە، فەرمانی دا سوپا باربکا، هەر چەندە وەختی بار کردن نەبوو، دوایی پێغەمبەرﷺ بانگی عەبدوڵلای کردو ئەو قسەیەی بەڕوودادایەوە، عەبدوڵلا پاکانەی بۆ خۆی کرد: کەشتی وای نەگوتووە. پێغەمبەریش عوزرەکەی لێ قبوڵ کرد. زەید دەڵێ: ئیتر خەڵکەکە لۆمەیان کردم، زۆر دڵ ناخۆش بووم بەوە: کە بە درۆزن و فیتنەجۆ دەرچووم.

ئیتر سورەتی (المنافقون) نازڵ بوو تەصدیقی منو تەکزیبی عەبدوڵڵای کرد. بە عەبدوڵڵایان گوت: ئایاتی توندو تیژ دەربارەت نازڵ بوون. بڕۆ بۆ لای پێغەمبەرﷺ با دوعای لێخۆشبونت بۆبکا، ئەویش سەری خۆی باداو گاڵتەی بە پێشنیارەکە کرد، ئیتر ئەم ئایەتانە هاتنە خوار. دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُمْ مُسْتَكْبِرُونَ﴾ ئەگەر بەو مونافیقانە بگوترێ: بەسەرۆکایەتی عەبدوڵڵای کوڕی سەلول، بچن بۆ لای پێغەمبەرﷺ داوای لێخۆشبوونتان بۆ لە خودا بکا، بە فیزێکەوە ڕوو وەردەگێڕنو گاڵتەیان پێ دێو هیچ ڕەغبەتێکیان لە لێخۆشبوونی خودا نیە. دەبینی ئەوانە پشت لە پێغەمبەر هەڵدەکەنو خۆیان زۆر لەوە بە گەورەتر دەزانن: داوای لێخۆشبون بکەن، کولەبی دەڵێ: کە ئایەتەکانی قورئان نازڵبوونو پەردەی لەسەر دووڕووەکان هەڵدایەوە، کۆمەڵێك لە خزمو کەسو کارە موسوڵمانەکانیان چون بۆلای دووڕووەکان وتیان: ماڵوێران بە هۆی دووڕوییەوە حەیاتان چوو؛ خۆتان کردە پەندو مەخسەرە، بچن بۆلای پێغەمبەرﷺ لە دووڕوویی پەشیمان ببنەوەو داوای لێ بکەن بابۆتان لە خودا بپارێتەوە، نەچونو گرنگیان بە داواکاری خزمەکانیان نەدا.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی لە ڕێگەی چون بۆ غەزای ئوحود بە خۆیی و چەند کەسێکەوە گەڕایەوە، موسوڵمانان ڕقیان لێ هەڵگرتو تانەو تەشەریان لێ دەدا، خزمە نزیکەکانی پێیان گوت: خۆزگە بچویتایە بۆلای پێغەمبەرﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردیتایە!؟ وتی: نەدەچم بۆ لای و نەداوای لێخۆشبونی ئەوم دەوێ. ئیتر ئەو ئایەتانە نازڵبوون.

زوربەی ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: بۆیە داوایان لێ کردوە بچێ بۆ لای پێغەمبەرﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆبکا، چونکە وتبووی: (دەبێ بەهێز بێ هێز دەربکا) هەروەها خزمو ناسیاوی خۆی ڕاسپاردبوو: کە یارمەتی ماددی پێغەمبەرو

موسوڵمانە هەژارو کۆچکارەکان نەکەن، بۆ ئەوەی لێی بتەکنەوەو دەوری چۆڵ بکەن. جا ئامۆژگارییان کردبوو: کە بچێ بۆ لای پێغەمبەرﷺ داوای لێخۆشبونی بۆ بکا، لە وەڵامدا بەسەر بادانێکەوە گوتبووی: (ئەوە چیتان گوت؟) واتە: گاڵتەی بە داواکانیان هاتبوو، ئەوەیە کە قورئان ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ:

﴿لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ﴾ ئەمجار پەروەدگار ئەوە بەیان دەکا: کە داوای لێخۆشبون دادی ئەوان نادا. دەفەرموێ:

﴿سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ یەکسانە لەسەر ئەو دووڕوانە، داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەی یان بۆیان نەکەی، هیچ سودێکیان پێ ناگا، چونکە ئەوان سوورن لەسەر نیفاقو بەردەوامن لەسەر کوفر، بەدڵ بڕوایان بە پەیامی ئیسلام نیە! هەتا ئەوان لەسەر ئەو حاڵو وەزعەیان بن، هەرگیز خودا لێیان خۆش نابێ. بێگومان خودا هیدایەتی گەلو نەتەوەیەك نادا: کە لە سنوور دەرچوبنو نوغرۆی زەلکاوی تاوان بوبن.

﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا﴾ ئەو دووڕوانە کە بە ئەنصارەکان دەڵێن: یارمەتی هاوەڵە کۆچکارەکانی موحەممەد مەدەن با برسیو موحتاج بن، بەڵکوو دەورەی چۆڵ بکەنو کەسی پێوە نەمێنێو بڵاوەی لێ بکەن!! ئیتر پەروەدگار رەددی دانەوە، فەرمووی:

﴿وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لا يَفْقَهُونَ﴾ گەنجینەکانی رزقو رۆزی ئاسمانەکانو زەوی هەموو هی خودان، ئەو رزقو رۆزیی کۆچکارەکان دەدا، کلیلی دەرگای رزقو رۆزی ئەرزو ئاسمان بە دەست خودایە، بەویستی خۆی دەیدا بەبەندەکانی، بۆ یەکێك زۆرو بۆ یەکێك کەم، یەکێك دەوڵەمەند دەکاو یەکێك هەژار، وەلێ ئەو دوو رووانە نەفامن نازانن: خودا موسوڵمانان دەوڵەمەند ناکا!

﴿يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الآعَزُّ مِنْهَا الآذَلَّ﴾ ئەو دووڕوانە ئەوانەن کەلەسەر زوبانی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی سەرۆکیان دەڵێن: ئەگەر لەم سەفەرە گەڕاینەوە بۆ مەدینە، دەبێ بە هێزو خاوەن دەستەڵات - مەبەستیان خۆیانە- بێ هێزو بێ دەستەڵاتەکان - مەبەستیان پێغەمبەرﷺو هاوەڵانیەتی - دەربکەن، ئیتر ناهێڵین موحەممەدو هاوەڵانی لە مەدینەدا بمێننەوە. ئەوان بێ هێزو ئێمە خاوەن توانا، چیدی لێیان قبوڵ ناکەین. عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی گەڕایەوە بۆ مەدینە، هێندەی پێ نەچوو کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەرﷺ داوای لێخۆشبونی بۆ کردو کراسی خۆی بۆ لەبەرکرد. ئیتر ئەو ئایەتە نازڵ بوو!

ئەمجار خودا بەرپەچی مونافیقەکان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ هێزو دەستەڵاتو باڵا دەستی هەر بۆ خودایەو بۆ ئەوانەیە خودا ڕێزو شکۆمەندییان دەداتێ لە پێغەمبەرانو لە بەندە ڕاستاڵەکانی. بۆ کەسی ترنیە، وەڵێ دووڕووەکان ئەو واقیعە نازانن، هێندە نەفامو گێلن، هێندە سەر لێ شێواوو کەودەنن، نازانن کە هەموو هێزو دەستەڵاتو تواناو وزە هی خودایە. ئەوانە چین هەتا خۆیان بە خاوەن هێزو دەستەڵات حسێب بکەن؟!!

ریوایەتکراوە: کاتێ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی گەڕایەوە بۆ مەدینە. عەبدوڵلای کوڕی کە موسوڵمانێکی باش بوو، دەرگای شاری مەدینەی لێ گرتو گوتی: ئەوە تۆی گوتوتە: ئەگەر گەڕاینەوە دەستەڵاتدارمان بێ دەستەڵات دەردەکا. سوێندم بە خودا دەبێ ئێستا تێت بگەیەنم تۆ دەستەڵاتداری یان پێغەمبەری خودا؟ سوێندم بە خودا ئاسمانی مەدینەت ناکەوێتە سەرو ناهێڵم پێ لەخاکی مەدینە بنێی هەتا

نەڵێی پێغەمبەری خودا شکۆمەندو ڕێزدارە من زەلیلو بێ هێزم. ڕێگای لێ گرتو نەیهێشت بچێتە ناو شاری مەدینەوە. هەتا کۆمەڵێ چونە خزمەت پێغەمبەرو ئەو واقیعەیان بۆ باس کرد، ئەویش فەرمووی: بچن بە عەبدوڵلا بڵێن: با ڕێگەی عەبدوڵلای باوکی بکا بچێتەوە شوێنی خۆی. ئەویش ڕێگەی دا.

## ترساندنی موسوڵمانەکان لەوە لاسایی ڕەوشتی دووڕووەکان بکەنەوە، فەرمانیشیان پێ دەکا کە لەڕێگەی خێرو چاکەدا ماڵ ببەخشن

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَـٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾ ﴾

لەوەپێش ڕەوشتی دووڕووەکانی ڕوونکردەوە، سەرزەنشتی کردن، ئەمجار موسوڵمانان لەوە ئاگادار دەکاتەوەو دەیانترسێنێ: کە خوی دووڕووەکان بگرن، پاشان فەرمانیان پێ دەکا: کە برێ لەماڵو سامانیان لە بواری خێرو چاکسازیدا ببەخشن، دوای نەخەن تاکاتێک مردن یەخەیان دەگرێو پەشیمان دەبنەوەو پەشیمانیش بێ سوودە. دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلا

أَوْلادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە تاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ هەیە با ماڵو سامانو سەروکاری کردنی هەروا منداڵو بەخێوکردنیان ئێوە بێ ئاگا نەکا لە زیکرو یادی خوداو لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانتان بەرامبەر پەروەدگار.

﴿وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ کەسێك بەهۆی ماڵو سامانو خێزانو منداڵو بەڕێوەبردنیانەوە لەیادی خودا بێ ئاگابێو فریا بەندایەتی کردن نەکەوێ نەیپرژێ بەباشی خودا پەرستی بکا، ئەوە لە خەسارەتمەندانە، لەوانەیە رۆژی قیامەت خۆیانو ماڵو سامانو منداڵیان لەدەست داوە، چونکە شتی ماوەو هەمیشەییتان بەفەوتاو فرشتووە.

﴿وَأَنْفِقُوا مِنْ مَا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان! بڕێ لەو ماڵو سامانەی پێمان داون لە ڕێگەی خێرو چاکسازیدا ببەخشن، بەمەش سوپاسگوزاری نیعمەتی خودا بکەنو رەحم بە هەژاراو بێنەوایان بکەن، بەرژەوەندی گشتی بەرچاو بگرن، پێش ئەوەی هۆیەکانی مردنتان لێ نزیك بێتەوەو بکەونە حاڵەتێکەوە مردن دەورتان بداو بکەونە گیانەڵاوەوە، جا ئەوکاتە هەریەکەتان بڵێ: خودایە کەمێك مۆڵەتم بدەو مردنم دوا بخە بۆ ماوەیەکی کورت ، بەڵکوو بتوانم ماڵو سامانم ببەخشمو ببمە پیاوی چاكو راستاڵ.

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو کەسێکی کەمتەرخەمە دەربارەی خودا پەرستیو ماڵ بەخشینو چاکردن لەکاتی گیانەڵادا پەشیمان دەبێتەوەو داوای مۆڵەت دان دەکا بابۆ ماوەیەکی کورتیش بێ. بەڵام بێ سودەو ئاواتی نایەتەجێ.

تیرمیزیو ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (کەسێك ماڵو توانای حەجی هەبوو نەیکرد، زەکاتی

لەسەر بوو نەیدا، لەکاتی مردنیدا داوای مۆڵەتدان و دواخستنی مردن دەکا) پیاوێك وتی: ئەی ئیبنو عەبباس پیاوی چاکبە! هەر کافر داوای گەڕانەوە بۆ دونیاو دواخستنی مردنی دەکا!!

ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئایاتی قورئان دێنمەوە بۆ راستی قسەکەم ئیتر ئایەتی: ﴿وَأَنْفِقُوا مِنْ مَا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ی خوێندەوە.

﴿وَلَنْ يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْساً إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ هەر کەسێ ئەجەلی هات و ئەو تەمەنەی خودا بۆی دیاری کردوە تەواو بوو، ئیتر خودا تاقە چرکەیەك تەمەنی درێژ ناکاتەوە، هیچ شتێك لە کردەوەکانی ئێوە لەخودا شاراوە نیە، پاداش و سزاتان دەداتەوە، چاکە بەچاکە و خراپە بە خراپە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی التغابن

ئەم سورەتە مەدەنییەو هەژدە ئایەتە لەدوای سورەتی (التحريم) هاتۆتە خوار. هەندێکیش پێیان وایە مەککییە، ناوی نراوە (التغابن) چونکە لە ئایەتی ژمارە نۆدا، قیامەت بیر ئادەمیزاد دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ﴾.

ئوسلوبی سورەتەکە دەشوبهێتە ئوسلوبی سورەتە مەککییەکان، گرنگی بە بنەماکانی عەقیدە دەدا، ئەوە رادەگەیەنێ کە هەموو بونەوەر تەسبیحات و تەمجیدی خودا دەکا. یەکتاپەرستی و راستی پێغەمبەرایەتی و زیندوبوونەوە دووپات دەکاتەوە، بێگومان هەموو ئایینە ئاسمانییەکان لەبارەی بنەماکانی عەقیدەوە یەکسانن، هەموویان ئەو راستیە دووپات دەکەنەوە. قورئان بەرونی

ئەوەمان بۆ بەیان دەکاو لەپێغەمبەران‌و پەیامەکانیانەوە ئەو راستییانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کەوابێ هەر کاتێك لە تەورات‌و ئینجیلی دەست لێدراوو شێوێندراودا ، یان لەناو کتێب‌و نوسراوی ئەوانەدا: کە بەراوردکاری نێوان ئایینەکان دەنووسن‌و بڕوایان بە قورئان‌و ناوەرۆکی نیە، شتێکمان بینی پێچەوانەی ئەو راستییە بوو. کە قورئان ئاماژەی پێ دەکا دەربارەی یەکیەتی بنەماکانی عەقیدە لە ئایینەکان دا. بێ سێ‌و دوو بیخەرە لاوەو بزانە هەڵبەستراوو درۆو دەلەسەیە. شیاوی خوێندنەوەو سەرنج دانیش نیە.

سەرەتا سورەتەکە بەبەیانکردنی بڕێ لە صیفەتە جوانەکانی خودا دەست پێ دەکا. ئەمجار ئادەمیزاد دەترسێنێ لەو عەزاب‌و نیکالەی بەسەر گەلە پێشینەکان هات بە هۆی بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرانیان‌و ئینکاریکردنیان بۆ زیندوبوونەوە. دوایی بانگەوازی ئادەمیزاد دەکا بۆ ئیمان هێنان بە خوداو بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو ئەو قورئانەی خودا بە نیگا بۆی ناردوە، دەیانترسێنێ لە رۆژێك کە کافر تێیدا پەشیمان دەبنەوە چونکە ئیمانیان نەهێناوە، موسوڵمان پەشیمانن: چونکە کەمتەرخەمییان کردوە. لەو رۆژەدا موسوڵمانان بۆ بەهەشت بەڕێ دەکرێن‌و کافرەکان تۆڕ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە. لە کۆتایی سورەتەکەدا فەرمان دەکا بە تەقواو خودا پەرستی‌و ماڵ‌و گیانبەخشین لە رێگەی خودادا، دەیانترسێنێ لە بەخیلی‌و چروکی‌و ئەوە رادەگەیەنێ: کە پاداشی چاکە کاران‌و بەخشندەکان رۆژی دوو چەندانەو چەند چەندانەیە.

## سورەتی (التغابن)

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۖ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾ ﴾

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بە گیاندار و بێ گیانەوە تەسبیحات و تەنزیهی خودا دەکا، لە هەموو عەیب و خەوشێك لە گشت کەم و کوڕی و نەنگییەك بە دووری دەگرن، هەموویان بە زمانی حاڵ یان زمانی مەقاڵ بەندایەتی خۆیان بۆ خودا رادەگەیەنن. هەموویان نیشانەی ئەوەن خودا پاك و مونەززەهە لە نوقصانی لە زات و لە صیفاتیدا. خاوەنیەتی و موڵك و سەڵتەنەت هەر بۆ خودایە و سوپاس و ستایش لەسەر نیعمەت هەر شیاوی ئەوە، خودا بەسەر هەموو شتێکدا باڵا دەست و خاوەن توانایە هیچ شتێکی لێ یاخی نابێ.

ئەمجار برێ لە دیاردەی دەستەڵاتی خۆی باس دەکا و دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنْكُمْ كَافِرٌ وَمِنْكُمْ مُؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ پەروەدگار خودایەکی

وەهایـە ئێـوەی لـە نـەبوون بـەدیهێناوەو بـەو شـێوە جـوانو رێـكو پێكـە شـێوەو روخـساری کێـشاون. سـەرنجام واتـان لێ هـاتووە بڕێکتـان لـە سروشـت لای داوەو بەویـستی خۆتـان کـوفرو بێـدینیتان هەڵبـژاردووە، بڕێکیـشتان لەسـەر فیطـرەت ماونەوەو ئیمانتان هەڵبژاردوە، بەختەوەری دونیاو قیامەتتان بۆ خۆتان دەستەبەر کردوە، خودا لەرۆژی بـەرێدا زانیویـەتی ئێـوە لـە ژیانتانـدا لـە کوفرو ئیمـان چـی هەڵدەبژێرنو سەرەنجامتـان بەچی دەگا. بـۆ خـۆی ئاگاداری کردەوەکانتانـەو سـزاو پاداشتان دەداتەوە.

ئـەبو یـەعلاو طەبـەرانیو بەیهـەقی لـە ئەسـوەدی کـوڕی سـەریعەوە ریوایـەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: (کـل مولـود یولـد علـى الفطـرة حتـى یعـرب عنــه لـسانه فـأبواه یهودانــه أو ینـصرانه أو یمجـسانه) هـەموو زارۆکێـك لەسـەر فیطرەتو خودا پەرستی لـەدایك دەبـێ، کـەزمانی دەپـرژێو عـەقڵو هۆشـی پەیـدا دەکا، باوكو دایکی سروشتی دەگۆڕنو لەرێگەی حەق لای دەدەن، جـا یـان دەیکەنـە جولەکە یان گاور یان ئاگر پەرست، یان هەر بیرو باوەڕێکی تـری ناپەسـند: ﴿خَلَـقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَـوَّرَكُمْ فَأَحْـسَنَ صُـوَرَكُمْ وَإِلَيْـهِ الْمَـصِيرُ﴾ ئاسمانـەکانو زەوی بــەرێكو پێکــیو بــە حیکمــەت ئــامێز بــەدی هێنــاون، وای خولقانــدون بەرژەوەندی ئادەمیزادیان تێدابێ بۆ دینو دونیا.

ئێـوەی ئادەمیزادیـشی لـە جـوانترین شـێوەو روخـساردا وێنـە کێـشاوە، غـەزالی دەفەرموێ: (لیس فی الإمكان أحسن مما كان) مومکین نیە جوانتر لەو شێوەی هەیە شێوەیەکی تر بهێنرێتە دی.

قورئـانی پـیرۆز لەچـەند ئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـە جوانیو روخسار شـیرینی ئادەمیزاد دەکا، دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَـا غَـرَّكَ بِرَبِّـكَ الْكَرِيمِ، الَّـذِي خَلَقَـكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ (الانفطار/٦-٨) یان دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ

خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ (التين/٤) لە رۆژی قیامەتدا هەمووتان بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، سزاو پاداشتان دەداتەوە خراپە بە خراپەو چاکە بە چاکە.

﴿يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ ئاگادارە بەسەر هەموو ئەو مەخلوقاتانەی لەناو ئاسمانەکان‌و زەویدایە، لە هیچیان بێ ئاگانیە، حاڵی هەموویان دەزانێ، تەنانەت شاراوەو نهێنیەکانی ئێوەش دەزانێ، ئاگادارە بەسەر ئەوەی ئاشکرای دەکەن‌و ئەوی دەیشارنەوە، خودا زاناو ئاگادارە بەسەر بیرو باوەڕو خەتەراتی ناو دڵەکان. واتە: زاناو ئاگادارە بە قسەی دڵەکان!

## موشریکەکان ئینکاری خودایەتی خوداو پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ و زیندوبوونەوە دەکەن

﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٥) ذَلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (٦) زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٧) ﴾

لەوەپێش بەڵگەی لەسەر هەبوونی خوداو دەستەڵاتی ڕەهای هێنایەوە، لێرەدا کافرەکانی مەککەی لە کوفرو بێدینی ترساند، هەڕەشەی لێ کردن لەسەر ئەوەی

بڕوایان به پێغه‌مبه‌رێتی حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د نه‌کردو زیندوبوونه‌وه‌یان به‌لاوه درۆ بوو. ده‌فه‌رموێ:

﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَبْلُ فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئه‌ی موشریکه‌کانی مه‌ککه! ئایا سه‌رگوزشته‌ی کافرو بێ باوه‌ڕه‌کانی رابوردوتان پێ نه‌گه‌یوه؟ سه‌ره‌نجامی یاخیبوونی قه‌ومی نوح‌و عادو ثه‌مودتان بۆ به‌یان نه‌کراوه؟ ئه‌و عه‌زاب‌و به‌لایانه‌ی به‌سه‌ریان هات به هۆی سه‌رپێچیکردنی فه‌رمانی پێغه‌مبه‌ره‌کانیانه‌وه به ئێوه نه‌گه‌یشتووه؟ ئه‌وه بوو: پێغه‌مبه‌ره‌کانیان بانگیان کردن بۆ یه‌کتاپه‌رستی‌و عیباده‌تکردن بۆ خوداو وازهێنانیان له بتپه‌رستی، به‌لام به گوێیان نه‌کردن‌و سه‌رپێچیان نواند، ئیتر ئاکامی سه‌رپێچیکردن‌و یاخیبوونی خۆیان توش هاته‌وه، عه‌زابی ریشه کێش‌و کۆ کوژ، یه‌خه‌ی گرتن‌و له‌ناوچون، له قیامه‌تیشدا عه‌زابی دۆزه‌خ چاوه‌ڕێیانه!!

﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُ كَانَتْ تَأْتِيهِمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوْا وَاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ ئه‌و عه‌زابه سه‌خت‌و دژواره‌یان له دونیاو قیامه‌ت دا به هۆی ئه‌وه‌وه بوو، پێغه‌مبه‌ران ده‌هاتنه سه‌ریان به‌به‌ڵگه‌ی ئاشکراو موعجیزاتی گه‌وره‌وه بانگه‌وازییان ده‌کردن، هه‌ڕه‌شه‌یان لێ ده‌کردن ته‌ماعیان به‌رده‌نان، که‌چی هه‌موو گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌کان هه‌ر یه‌که‌یان به پێغه‌مبه‌ری خۆی ده‌گوت: ئه‌تۆ پێغه‌مبه‌رنیت! چۆن ده‌گونجێ ئاده‌میزادێکی وه‌کوو خۆمان ببێته پێغه‌مبه‌رو ره‌هنومابیمان بکا؟ که‌ی شتی وابوه‌و که‌ی ده‌بێ!؟

ئیتر بڕوایان به پێغه‌مبه‌ره‌کان نه‌کردو په‌یامه‌کانیان ره‌تکردنه‌وه، پشتیان لێ هه‌ڵکردن‌و حه‌ق‌و راستیان پاشگوێ خست، هیچ له په‌یام‌و بانگه‌وازیی پێغه‌مبه‌ره‌کان ورد نه‌بوونه‌وه، خودا لێیان بێ ئاتاج بوو ج پێویستی به هه‌بوونی خۆیان‌و عیباده‌ته‌که‌یان نه‌بوو، سه‌رجه‌م له‌ناوی بردن‌و قه‌لاچۆی کردن.

ئـەمجار ئـەوە روندەكاتـەوە: كـە موشـريكو بـێ بڕواكـان پێیـان وایـە زیندوبوونـەوەی قیامـەت نیـەو دەفـەرموێ: ﴿زَعَـمَ الَّـذِينَ كَفَـرُوا أَنْ لَـنْ يُبْعَثُـوا﴾ بتپەرسـتەكان پێیـان وایـە: زیندوبوونـەوەو حیـسابو لێكۆڵینـەوە نایەتـە دیو قیامەت رانـابێ. ﴿قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِـكَ عَلَـى اللَّـهِ يَـسِيرٌ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بەو موشریكە سەر رەقانە بڵێو هەواڵیان بدەرێ: كە بەتەئكیـد ئێـوە زینـدو دەكرێنـەوە، رۆژی قیامـەت لـەگۆڕەكانتان رادەبـنو دێنـە دەرەوە، ئـەمجار بـە تەئكیـد هـەواڵتان دەدرێتـێ بـەكردەوەكانی دونیاتـان، هـیچ كردەوەیەكتان لەخودا گوم نابێ. كردەوەی بچوكو گەورەتان، كەمو زۆرو ئاشكراو نهێنیتـان دەخرێتـەوە بەرچـاوتانو لێكۆڵینـەوەتان لەگـەڵ دەكـرێو بـەگوێرەی كردەوەكانتان سزاو پاداشتان دەدرێتەوە، ئەنجامدانی ئـەم كارانـە بـۆ خـودا كـارێكی ئاسانو بێ ئەركەو چ ماندوبونێكی ناوێ. ئەمە سێیەم جارە: كە پەروەدگار سوێند بـەزاتی خـۆی دەخـواو جـەخت لەسـەر هـاتنی قیامـەت دەكاتـەوە. لـە سـورەتی (یـونس)دا دەفـەرموێ: ﴿وَيَـسْتَنْبِئُونَكَ أَحَـقٌّ هُـوَ قُـلْ إِي وَرَبِّـي إِنَّـهُ لَحَـقٌّ وَمَـا أَنـتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾ (ئایەتی /٥٣) لە سورەتی (سبأ)یشدا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّـذِينَ كَفَـرُوا لَـا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾ (ئایەتی/٣).

## هەڵنانی ئادەمیزاد بۆ ئیمانهێنانو ترساندنیان لەتەنگو چەڵەمەی قیامەت

﴿ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلۡنَاۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٨﴾ يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلتَّغَابُنِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ

تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٠﴾ ﴾

لەوەپێش بەڵگەی لەسەر ئولوهییەت و پێغەمبەرایەتی هێنایەوە، هەروەها رەددی ئەوانەی دایەوە: کە ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن. ئەمجار لێرەدا فەرمان دەکا بەئیمانهێنان بەخوداو بەپێغەمبەرو بەردەوام بوون لەسەر بیروباوەڕو خودا پەرستی لەسەر ئیمان بەزیندوبوونەوەو حیساب و لێکۆڵینەوە دەفەرموێ:

﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ دەی کەهەموو شتێك لای خوداناسان بێ، زیندوکردنەوەی مردوان بۆ خودا چ ئەرك و گرانیەکی تێدا نەبێ، هەرچی بیەوێ بیکا بەئاسانی بیکاو کەس نەتوانێ ببێتە لەمپەڕو کۆسپ و تەگەرە، کەوابێ ئیمان بێنن بە خودای تاك و تەنهاو خاوەنی دەستەڵات و توانا، بڕوا بە پێغەمبەرەکەی بکەن کەحەزرەتی موحەممەدە، بڕوا بەقورئانەکەی بکەن: هەر کەسێ شوێن ئەو پەیامە بکەوێ لەتاریکی گومڕایی رزگاری دەبێ و رێگای بەختەوەری دونیاو قیامەت دەگرێتەبەرو بەمراز گەیشتووە!! شوێن ئەو قورئانە بکەون: کە نورو روناکییە بۆ دڵەکان و هیدایەتدەرە. بەنیگا نازڵمان کردوە بۆ سەر دڵی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی بە ئادەمیزادی رابگەیەنێ، خودا زانایە بە هەموو شتێك و هیچی لێ گوم نابێ، ئاگاداری هەموو کردارو گوفتارێکیانەو سزاو پاداشتیان لەسەر ئەو کردارو گوفتارانە دەداتەوە. هیچ کردەوەیەکتان پاشگوێ ناخرێ.

﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ﴾ ئەی ئادەمیزادینە؛ بیری ئەو ڕۆژە بکەنەوە: کە خودا هەموو ئەهلی مەحشەر هەر لەسەرەتای دونیاوە تاکۆتایی لە دەشتێکی کاکی بەکاکیدا کۆدەکاتەوە بۆ حیساب و لێکۆڵینەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە خودا هەموو ئادەمیزادێك و کردەوەکانی یەکدیگیر دەکاتەوە، هەموو پێغەمبەرێك و گەلەکەی بەیەك دەگەیەنێتەوە .

ئا ئەو ڕۆژە ڕۆژی پەشیمان بوونەوەیە، ڕۆژێکە هەموو کەس هەست بە خەسارەتمەندی دەکا، کافر دەزانێ خەسارەتمەندە چونکە ئیمانی نەهێناوە، موسوڵمان هەست بە کەمتەرخەمی دەکا چونکە چاکەو خوداپەرستی کەم کردوە، دەیتوانی زیادی بکاو تەمبەڵ بووە. هەموو کەس دەستی خۆی دەشکێنێتەوەو پەشیمانی دەردەبڕێ، کافرەکان پەشیمانن، کە بۆچی لەجیاتی هیدایەت گومڕاییان هەڵبژاردوە، موسوڵمانان پەشیمانن: کەبۆچی زیاتریان خودا پەرستی نەکردووەو پاداشی باشتریان بەدەست بێنایە.

﴿وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحاً يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ کەسێك بەڕاستی ئیمان بە خودابێنێ و بەتاك و تەنهای بناسێ، بڕوا بە پێغەمبەرو پەیامەکەی بکاو شوێنی بکەوێ، بڕوای بە زیندوبوونەوەی قیامەت هەبێ و تێشوو بۆ ئەو ڕۆژە حازربکا، خەریکی کردەوەی چاك بێ، ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر بە خوداو بەندەکانی جێبەجێ بکا، خۆی بپارێزێ لە خراپە کاریو تاوان، ئەوە خودا تاوانی لەوەپێشی دەسڕێتەوە دەیخاتە ناو باخ و باخاتی بەهەشتی ڕازاوەوە؛ کە بە ژێر باڵەخانەو درەختەکانیدا جۆو جۆبار دەکێشن و ئەوەندەی تر جوانی و ڕازاوەیی بەدیمەنەکە دەبەخشن، ئەو بەهەشتیانە لەناو ئەو باخ و باخاتانەدا بۆ هەتاهەتایە دەمێننەوە، لێی وەڕز نابن و لێی دەرناچن.

ئــەو تــاوان ســڕینەوەو لێخۆشــبون‌و بەهەشــت پــێ خەڵاتکردنــە بــەمراز گەیشتنێکی گەورەو مەزنە، هیچ بە مراز گەیشتنێکی تری ناگاتێ چونکە باشترین دەسکەوتی بەدەست هێناوە!!

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾

ئەوانەی کافرو بێدینن‌و ئینکاری تاك‌و تەنهایی خودا دەکەن، بڕوایان بە هەبوونی صیفاتی جەلال‌و جەمالی خودانیە، قورئـان بـە درۆ دەخەنـەوە کـەبۆ پێغەمبـەرﷺ نێردراوە، کە بڕێك لـە ئایەتـەکانی ئـەو قورئانـە باسـی زینـدو بوونەوەیـە، ئەوانـە ئەهلی دۆزەخن‌و بۆ هەتاهەتایە لێی دەرناچن، خراپ شوێنێکە تێی دەچن‌و تێیدا دەمێننەوە.

## هەموو شتێك بە گوێرەی قەزاو قەدەری خودایە

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ ﴾

لەوەپێش ئـادەمیزادی کردنـە دووبـەش؛ موسـوڵمان‌و کـافر، فـەرمانی پێکـردن ئیمان بهێنن‌و کـردەوەی چـاك بکـەن، نـەهی لێ کـردن لـە کـوفرو بێـدینی. ئـەمجار ئەوەرون دەکاتەوە: کەهەرچی توشی ئادەمیزاد دەبێ لە خێـرو لەشـەڕ ، بـەگوێرەی

قەزاو قەدەری خودایەو بەگوێرە ئەو یاساو رەسایەیە: کە خودا بۆ بونەوەری داناوە. پاشان فەرمان بە موسوڵمانان دەکا گەردنکەچی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودابن‌و پشت بەخودا ببەستن لە هەمووکارو بارێکیاندا. دەفەرموێ: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ إِلاّ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ هەرچی توشی ئادەمیزاد دەبێ لەخێرو لەشەڕ بەگوێرەی قەزاو قەدەری خودایە، لە رۆژی ئەزەلدا بۆی مەزندە کردون، پێویستە ئادەمیزاد لە ژیانی دونیای دا هەوڵی ئەوەبدا کردەوەی چاك بکا، بۆ ئەوەی خێرو خۆشی دونیاو قیامەت بۆخۆی کێش بکا، زیان‌و خەراپە لەخۆی دوور بخاتەوە، لە هەموو شتێکیشدا پشت بە خودا ببەستێ، چونکە بەدەست هێنانی ئاکامەکان بەدەست خودایە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ (الحديد/٢٢).

﴿وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ کەسێك بڕوای بە تاك‌و تەنهایی خودا هەبێ‌و بزانێ: هەر بەڵایەك روی تێ دەکا بە قەزاو قەدەری خودایەو صەبری لەسەر بگرێ‌و داوای پاداش لەخودا بکاو گەردنکەچی قەزاو قەدەری خودابێ، ئەوە خودا دڵی نورانی دەکاو لەکاتی بەڵاو ناخۆشییەکە سەبووری دەداو قورسایی موصیبەتەکەی لەسەر شان سوك دەکا. پەروەدگار زانیاری بەرفراوان‌و بێ سنوورە، هیچی لێ گوم نابێ‌و زانایە بەدڵەکان‌و دەزانێ چییان تێدا شاراوەتەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (ومن یؤمن بالله یهد قلبه) واتە: دڵی هیدایەت دەدا بۆ یەقین‌و دەزانێ هەرچی تووشی بووە نەدەبوو بیبوێرێ، ئەوی تووشی نەبوە نەدەبوو توشی ببێ.لەحەدیثی صحیح‌و (متفق علیه)دا هاتووە: کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (عجبا للمؤمن، لایقضی الله قضاء الا کان خیرا له، ان اصابته سراء شکر فکان خیرا ولیس ذلك لاحد الا للمؤمن) ئیشی موسوڵمان سەیرو سەرنج راکێشە، هەرچی خودا بۆی ببڕێتەوە دەبێتە خێر بۆی. ئەگەر بەڵای بەسەر هات

ئارام دەگرێ، دەبێتە خێر بۆی.. ئەگەر خۆشی تووش بوو سوپاسگوزارە دەبێتە خێربۆی، ئەم بەهرەیە تەنها بۆ موسوڵمانەو بەس!

﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾ ئەی موسوڵمانینە بەردەوام بن لەسەر خوداپەرستیو گوێڕایەڵی فەرمانەکانیو پابەندی ئامۆژگاریو فەرمانی پێغەمبەری خودابن، هەرچی پێتان دەفەرموێ: لە خوداوەیەو لە خۆیەوە پێتان ناگەیەنێ. هەرچی خوداو پێغەمبەری خودا جڵەو گیریتان لێ دەکەن توخنی مەکەون، جا ئەگەر پشتان لە گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەر کرد، ئەرکی سەرشانی خۆتان جێبەجێ نەکرد، ئەوە تاوانتان لەسەر خۆتانەو هۆبالی خۆتان بە ئەستۆی خۆتانە، پێغەمبەرﷺ هیچ خراپیەك روی تێناکا، چونکە ئەرکی ئەو راگەیاندنەو بەس. ئیمامی زوهری دەفەرموێ: خودا فەرمان دەکاو پێغەمبەرﷺ دەیگەیەنێو ئێمەش گەردنکەچی دەبین.

﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ﴾ پەروەردگار خودایەکی تاكو تەنهایەو فەردو صەمەدە، بە تاكو تەنهای بناسنو بە دڵسۆزی بەندایەتی بکەن، هیچ شتێك مەکەنە هاوشانی، هەموو کارێکتان بە پشتیوانی ئەو ئەنجام بدەن، پشت بەکەسی تر مەبەستن. هەر ئەو هاواری دەکرێتێ، هەر ئەو خاوەنی رەحمەتو بەخششە، هێزو توانای حەقیقی هەر لای خودایە.

## خۆپاراستن لە فیتنەی ماڵو منداڵ، پێویستە تەقوای خودا بکەنو ماڵ ببەخشن

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ

وَتَصْفَحُواْ وَتَغْفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ وَٱسْمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقْرِضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾

دوای فەرمانکردنی بە خودا پەرستیو گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ ئەمجار موسوڵمانان لەوە ئاگادار دەکاتەوە: کە وریا بن ماڵو منداڵ نەبنە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم چوونیان بۆ غەزاو تێکۆشان، وایان لێ نەیە ماڵو منداڵیان پشتیان سارد بکەنەوە لە ئەنجامدانی ئەرکە ئاینیەکان. دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلادِكُمْ عَدُوّاً لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بە تاکو تەنهایی خودا هەیەو پێغەمبەرەکەی بە حەق دەناسن: بزانن بڕێ هاوسەرو منداڵتان دوژمنتانن، بەرژەوەندی قیامەتتان لەکیس دەدەن، لەکاری خێرو پەسند دەستتان دەگرن، ناهێڵن ئەرکە ئایینییەکانتان ئەنجام بدەن، کامەرانی قیامەتتان لەکیس دەدەن. وریایان بنو بترسن لەوەی: کەخۆشەویستی

ئەوان لە جیهادو خوداپەرستی پشتتان سارد بکەنەوەو نەتوانن وەکوو پێویست ئەرکی سەرشانی خۆتان ئەنجام بدەن.

ریوایەت کراوە سەبەب نزولی ئەم ئایەتە، ئەوە بووە چەند پیاوێك لە مەککە ئیمانیان هێنابوو ویستیان کۆچ بکەن بۆ مەدینە، ژنو منداڵیان رێگیرییان لێ کردن، بۆیە خودا ئاگاداری کردنەوەو ترساندنی لەوەی: کە گوێڕایەڵی ژنو منداڵیان بنو پشتیان لە ئەرکە ئایینیەکەیان ساردبێتەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: رۆژگارێك دادێ بەسەر ئوممەتی من دا، پیاو بەدەست ژنو منداڵی لەناو دەچێ، ئەرکی قورسی دەخەنە سەرشانو ناتوانێ ئەنجامیان بدا، ناچار روو لەخراپە کاری دەکاو دەکەوێتە هەڵەوەو لەناو دەچێ.

ئەمجار دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەگەر ئێوە چاو پۆشی لە هەڵەو تاوانی هاوسەرو منداڵەکانتان بکەن، لۆمەو سەرزەنشتیان نەکەن، پەردە بەسەر تاوانەکانیاندا بدەنو چاوەڕوانی بکەن تابەخۆیاندا دەچنەوەو عوزرتان بۆ دێننەوە، ئەوە خودا لێخۆشبوو لێبوردوە، خاوەنی رەحمو بەزەییە بۆ بەندەکانی.

﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللَّهُ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ماڵو منداڵتان بەلاو بە تاقیکردنەوەیە بۆ ئێوە، جاری وا هەیە، دەبنە هۆی ئەوەی لەپێناو بەرژەوەندی ئەواندا، تووشی حەرام خواردن بن، مافی خودا بە رێكو پێکی ئەنجام نەدەن، تووشی تاوانو کاری ناشرین بن، کەسێك بەندایەتی بۆ خودا پێش هەموو شتێك بخاو لەپێناو خۆشەویستی ماڵو منداڵ خودا لە خۆی نەڕەنجێنێ. ئەوە پاداشی گەورەو مەزن لای خودایە. دەی کەوابێ وریابن ئەو پاداشە لەکیس خۆتان مەدەن.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( ان لكل امة فتنة. وان فتنة امتى المال) هەموو گەلو نەتەوەیەك فیتنەو تاقیكردنەوەی هەیە، تاقیكردنەوەی ئومەتی من لەماڵو سامان دایە.

ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (الولد ثمرة القلوب، وانهم مجبنة مبخلة محزنة) منداڵ میوەی دڵەكانە، ماڵو منداڵ هۆی ترسنۆكیو خەمو خەفەتن...

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْراً لِّأَنفُسِكُمْ﴾ ئەی خاوەن باوەڕان لەخودا بترسن، پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەكانی بن، بە گوێرەی توانا خودا پەرستی بكەنو ئەركی سەرشانی خۆتان ئەنجام بدەن.

لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا فەرمودەیەك هەیە، ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەرەوە ریوایەتی كردوە دەفەرموێ: (هەركاتێ فەرمانێكم پێ كردن بەگوێرەی توانا خودا پەرستی بكەنو ئەركی سەرشانی خۆتان ئەنجام بدەن، كەنەهیم لێ كردن لەكردنی شتێك بەتەواوی وازی لێ بێنن) گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانە بكەن؛ كەئاڕاستەتان دەكرێن، پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بن، لەماڵو سامانی خۆتان ببەخشن لەبواری خێرو چاكەدا، چرۆكی لەماڵبەخشیندا مەكەن، چونكە ماڵ بەخشین لە پێناوی بەرژەوەندی گەلو وڵات دا خێرو بەختەوەرییە بۆ خۆتان، ئەوە بۆ ئێوە باشترە لەماڵو منداڵتان، ئەوە باشترە بۆ ئێوە لەدنیاو قیامەتدا. خۆ ئەگەر وانەكەن، توشی شەڕو نەگبەتی دەبن، لە دونیاو قیامەتدا خێرو خۆشی نابینن.

﴿وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ كەسێك خودا لەدەردی چرۆكیو رژدی بیپارێزێ، دەستو دڵ فراوان بێ، ماڵو سامانی خۆی لەپێناو رەزامەندی خوداو بەرزی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا ببەخشێ، ئەوانە بەمراز گەیشتونو ئاواتیان

هاتۆتـه دی. ﴿إِنْ تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾ ئەگەر ئێوە برێك لە ماڵو سامانتان لە بواری خێردا ببەخشن، بە دڵسۆزیو نیازی پاکەوە لەماڵی خۆتان ببەخشن، مەبەستتان ڕەزامەندی خودا بێ. ئەوە خودا پاداشتی دوچەندانەو چەند چەندانە دەداتـەوە، خـودا لـە پاداشـی ماڵبەخـشینی کەمـدا زۆر دەبەخـشێ. جـاری وادەبـێ دوو چـەندانەو دەچـەندانەو زیـاتر تـا حەوتصەد چەندانە پاداش دەداتـەوە. بـەڵکوو زیـاتریش، چاوپۆشـی لەتاوانـەکانتان دەکا، هەڵەو خراپەکاریتان پەردەپۆش دەکا. خودا هێندە بەرەحمە. کەسێك تـاوان دەکا خێرا عەزابی نادا بەڵکوو مۆڵەتی دەدا بۆئەوەی پەشیمان بێتـەوەو تۆبـە بکـا. خودا چاکەی کەس پاشگوێ ناخا، حەلیمو لەسـەرەخۆیە. ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خودا زانیاری پەنامەکی هەیە، هەرچی نهێنـیو ئاشکرا هەیـە لای خـودا یەکـسانە هـەموو شـتێك وەکـوو یـەك دەزانـێ. باڵادەسـتو خـاوەن توانایـە هەرچی بیـەوێ بیکـا دەیکـاو هیـچی لێ یـاخی نابـێ. خـاوەنی حیکمـەتو داناییـە، هەموو شتێك لەشوێنی خۆی ئەنجام دەدا. کار دروستو کاربەجێیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی الطلاق

ئـەم سـورەتە مەدەنییـەو دوانـزە ئایەتـە، دوای سـورەتی (الإنـسان) نـازڵ بـووە، نـاوی نـراوە سـورەتی (الطـلاق) چـونکە ئـەحکامی تـەڵاقی تێـدا ڕون کراوەتـەوەو سەرەتا بە ئایەتی ﴿يا أيها النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ دەست پێ دەکـا، سەرە بـاسو نـاوەڕۆکی سـورەتەکە بریتیـە لـە ڕونکردنـەوەی حوکمـە شـەرعیەکان: کەپەیوەندن بە ڕێکخستنی حاڵو وەزعی خێزان، لەکاتی پێکەوە ژیـانو کـاتی لێـك جیابوونەوە.

ئایینی ئیسلام دژایەتی داخوازییە سروشتییەکان ناکاو ڤیزیان لێ ناکاتەوە، بەڵکوو ئەو سروشتو فیطرەت رێك دەخاو مشتوماڵی دەکا، لە ئاستی ئاژەڵی بەرزی دەکاتەوەو پەروەردەی دەروونیو کۆمەڵایەتی دەکا. وا لە ئادەمیزاد دەکا پەیوەندیە جینسیەکانی لەسەر بناغەی هەستو شعوری مرۆڤانە رێك بخا، وادەکا بەیەك گەیشتنی ژنو مێرد بریتی بێ لەبەیەك گەیشتنی دوو نەفسو دوو دڵ دوو گیان. یان بڵێین بەیەك گەیشتنی دوو مرۆڤ: کە ژیانی هاوبەشو هیوای هاوبەشو ئازاری هاوبەشو داهاتووی هاوبەش بەیەکیانەوە دەبەستێتەوەو لە وەدیهێنانی وەچەی چاوەڕوانکراویاندا دەبنە گیانێك لە دوو لاشەدا: کە هەردووکیان لەلانەی هاوبەشیاندا جگەر گۆشەکەیان پەروەردە دەکەنو وەکوو سۆمای چاویان پارێزگاری لێ دەکەن، هەموو ماندوبوونو شەونخونییەکیان لەلا گوڵبارانە بە مەرجێ رۆڵەکەیان لەخۆشی دابێ.

ئایینی ئیسلام (ژن هێنانو شوکردن) بەهۆکاری پاکیو پاکبونەوە دادەنێ، بانگەوازی گەلی موسوڵمان دەکا: کەکوڕیان ژن بێنێو کچیان شوبکا، داوایان لێ دەکا نەبوونی ماڵو سامان نەکەنە لەمپەڕو کۆسپ لە بەردەم ژن هێنانو شوکردندا. لەو بارەوە قورئان دەفەرموێ: ﴿إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (النور/٣٢).

لەبەرنامەی ئیسلامدا ژن هێنانو شوکردن بە تاعەتو خوداپەرستی دەژمێردرێ ، هۆی پاكو خاوێنی کۆمەڵو پاراستنیەتی لە رەهێڵ بوونو تێداچون، ئەوە لەدڵی پەیڕەوکارانیدا دەروێنێ: کە پیاوی بێ خێزانو ژنی بێ مێردی، با ماوەیەکی کەمیش بێ دەبێتە هۆی نارەزامەندی خودا.. هەربۆیە ئیمامی عەلی کە فاطیمەی خێزانی بەرەحمەت چوو، خێرا ژنی هێنایەوە: کەپێیان گوت بۆوا بە خێرایی ژنت هێنایەوە؟ فەرمووی: ترسام بە بێوە پیاوی بمرم، بە پێوە پیاوی

رووبه‌ڕووی په‌روه‌دگارم ببمه‌وه.... كه‌وابێ لای موسوڵمان ژن هێنان‌و شوكردن تاعه‌ت‌و خودا په‌رستییه‌و به‌نده له‌ خودا نزیك ده‌كاته‌وه.

## حوكمی ته‌ڵاق‌و عیده‌ی ئافره‌ت‌و به‌روبوومی ته‌قواو پشت به‌ستن به‌خودا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا (١) فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا (٢) وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ

حَسْبُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾

دەربارەی سەبەب نزوولی ئایەتی ژمارە (١) بوخاریو موسلیمو ئەبوداودو تیرمیذیو نەسائیو دارەقەطنی لە ئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکەن: کە خێزانەکەی خۆی تەڵاقدا لەکاتێکدا کە لەعادەی مانگانەی خۆیدابوو، حەزرەتی عومەر ئەمەی بۆ پێغەمبەرﷺ باس کرد، پێغەمبەرﷺ تورە بوو، پاشان فەرمووی: باریجعەی بکاتەوەو بیهێڵێتەوە تاپاك دەبێتەوە، ئەمجار بچێتەوە عادەی مانگانەی خۆیەوەو پاك بێتەوە، ئەمجار ئەگەر ویستی باتەلاقی بدا پێش ئەوەی بچێتە لای. ئەمە ئەو عیددەیەیە: کە خودا فەرمانی پێ کردوە.

دەفەرموێ: ﴿يا أيها النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویستو هەموو ئەوانەی شوێن پەیامی ئیسلام کەوتوون، هەرکاتێ ویستان ژن تەڵاق بدەنو سوربوون لەسەر ئەوکارە، ئەوە کاتێك تەڵاقیان بدەن: کەبەرەو روی عادەی مانگانەی خۆیان دەچن، واتە: لە کاتێکدا تەڵاقیان بدەن: کە لە پاکیدابنو لەعادەی مانگانەی خۆیان دەرچوبنو لەو پاکییەدا لەگەڵیان جوت نەبووبن.

ئایەتەکە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: کەژن تەڵاقدان لەکاتی عادەی مانگانەیدا حەرامە.

**شەرعزانان تەڵاق دەکەنە سێ جۆر:**

أ- تەڵاقی سوننی..

ب- تەڵاقی بیدعی.

ج- تەلاقی وا نەسوننی بێ نەبیدعی بێ.

تەلاقی سوننی ئەوەیە: ئافرەتەکە لەحاڵەتی پاکیدابێو مێردەکەی نەچوبێتە لای. یان ژنەکە سکی هەبێو سکەکەی دیاری دابێ.

تەلاقی بیدعی ئەوەیە: لەکاتی عادەی مانگانەی ژنەکەدا تەلاقی بدا، یان لەپاکیدابێو بەلام چوبێتە لای.

تەلاقی نە سوننیو نەبیدعی ئەوەیە: ئافرەتەکە منداڵ بێ یان لەعادەی مانگانەی وەستابێتەوە، یان هێشتا نەیگواستبێتەوە.

﴿وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ﴾ عیددەی ژنە تەلاقدراوەکان رابگرن ژمارەی رۆژو کاتی عیددەکەیان ئاگاداربن، بۆ ئەوەی پێش تەواوبوونی عیددەکەیان شوو نەکەنەوە، خۆ ئەگەر خواستی هێنانەوە ژێر نیکاحی ژنەکانتان بوو بامافی ریجعەتان لەکیس نەچێ. کۆنترۆڵ کردنی عیددە پێویستە، چونکە کۆمەڵێك ئەحکامی شەرعی لەسەر دادەمەزرێن، وەکوو شوکردنەوەی ئافرەتەکە. یان ریجعەکردنەوەی لەلایەن مێردەکەیەوە، هەروەها بژێوو شوێنی حەوانەوە بۆ ئافرەتەکەو سەکناتگرتنی ئافرەتەکە لەماوەی عیددەکەیدا لەماڵی خۆیدا.

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ﴾ تەقوای خودای خۆتان بکەنو سەرپێچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی مەکەن، زیان بەژنە تەلاقدراوەکانتان مەگەیەنن بەم جۆرە عیددەکەیان لێ درێژ بکەنەوەو شوکردنەوەیان دوا بکەوێ.

﴿لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ﴾ ژنە تەلاقدراوەکان لە خانووی خۆیان: کەعیدەی تێدا بەسەر دەبەن _ دەرمەکەن هەموو ئافرەتێك؛ کە تەلاق دەدرێ مافی بژێوو شوێنی حەوانەوەی لەسەر مێردە تەلاقدەرەکەیەتی، پیاوەکە بۆی نیە ئافرەتەکە دەربکا تا عیدەی تەواو دەبێ، هەروا بۆ ئافرەتەکەش دروست نیە لەو

خانووە بچێتە دەرەوە، ئەگەر ئافرەتی عیدەدار لەماڵەکەی چووە دەرەوە چونە دەرەوەکەی حەرامە.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەرئەوە: کە شوێنی حەوانەوە بۆ ژنی تەڵاقدراوو عیدەدار (واجب)ە هەتا عیدەکەی بەسەر دەچێ، قورئان بۆیە خانووەکەی وەپاڵ ئافرەتەکە داوە بۆ زێدە تەئکید لەسەر نەچوونە دەرەوە.

بەلای ئەبو حەنیفەوە مانەوەی ئافرەتەکە لە خانووەکەدا مافێکی شەرعیەو پیاوەکە ناتوانێ پێشێلی بکا، نە پیاوەکە دەتوانێ ئافرەتەکە دەربکا، نەژنەکە بۆی هەیە بچێتە دەرەوە.

شافیعی دەفەرموێ: مانەوەی ئافرەتەکە لە خانووەکەدا مافی تایبەتی ژن و پیاوەکەیە، ئەگەر رێککەوتن کە ژنەکە عیدەکەی لەماڵێکی تردا بەسەر بەرێ دروستە، ئەوەی: کە ئەمرۆ لە زۆربەی جیهانی ئیسلامی دا پەیرەو دەکرێ ئەوەیە: ئافرەتەکە لەو خانووەدا نامێنێتەوە: کە تیایدا تەڵاق دراوە.

﴿إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ واتە: لەو خانووەی خۆیان دەریان مەکەن مەگەر تاوانێکی گەورە ئەنجام بدەن، بەم جۆرە داوێن پیسی بکەن، یان بێ گوێی و داب و نەریتی ئافرەتی عیدەدار بەسەر نەبەن. یان شەڕو هەراو جنێوو فەضیحەت بەدەرو جیران بفرۆشێ. ئەو کاتە پیاوەکە دەتوانێ دەری بکا .

﴿وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ ئەو حوکمانەی بۆتان باسکرا سنورو حوکمی خودان، پێشێلیان مەکەن، کەسێك ئەو سنورانە ببەزێنێ، ئەوە ستەمی لەخودی خۆی کردووە، خۆی خستوەتە بەرەی دژایەتی کردنی خوداو ئیعلانی سەرپێچی فەرمانی خودای کردوە. ﴿لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾ ئەتۆ نازانی ئەی ئەو کەسەی ژن تەڵاق دەدەی - ئێمە بۆچی فەرمانمان کردوە بەوەی ئافرەتی تەڵاقدراو لە ماڵ و حاڵی خۆیدا بمێنێتەوە تا عیدەی بەسەر

دەچێ، چونکە لەوانەیە پیاوەکە ژێوان بێتەوە لە تەڵاقدانەکەو ریجعەی بکاتەوە، وێدەچێ ئەگەر ئافرەتەکە لەماڵی خۆیدا بمێنێتەوە ئولفەت و خۆشەویستی لە نێوانیاندا پەیدا ببێتەوە، ئەو کاتە رێگا بۆ ریجعە کردنەوە ئاسانترە.

زوربەی کاتیش وادەبێ، تەڵاق لە ئاکامی رق هەڵسان و تورەبوون پەیدادەبێ، پاشان ئەو هۆکارانە وردە وردە دەپوکێنەوەو دەمارگیرییەکە نامێنێ و پیاوەکە عەقڵ و هۆشی دێتەوە بەرخۆ. هەست دەکا بێ خێزانی چەند ئەستەمەو رەوشتە جوانەکانی خێزانەکەی دێتەوە بەرچاو بەتەواوی پەشیمان دەبێتەوە.

پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکیدا: کە موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەتی کردووە دەفەرموێ: (لا يفرك مؤمن مؤمنة أن سخط منها خلقا رضي خلقا) وا دەبێ ژنەکە سکی هەیەو ئەو سکە دەبێتە هۆکاری ئەوە پیاوەکە نەیەوێ بەتەواوی دەست بەرداری ژنەکەی ببێ. ئەگەر هەندێ رەوشتی خێزانەکەیشی بەدڵ نەبێ لەبەر هۆکاری دی چاوپۆشی لێ بکاو سەرلەنوێ لانەی ژن و مێردایەتی خۆیان پێکەوە بنێنەوە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾ (النساء/١٩).

﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ هەرکاتێك ماوەی عیدەکە نزیك بە تەواو بوون بووەوەو لە ئاخرو ئۆخری دابوو، ئەو کاتە مێردەکە دوو رێگای لەبەردەمدا هەیە، یان بەرێك و پێکی ئافرەتەکە ریجعە بکاتەوەو ژیانی ئاسایی لەگەڵدا دەست پێ بکاتەوە، یان بە گوێرەی شەرع لێی جیابێتەوەو مافی خۆی بداتێ و وازی لێ بێنێ بە شێوەی سروشتی عیدەکەی بەسەر بچێ. واتە: تانەو تەشەری لێ نەدا، سەرزەنشتی نەکاو مافی پێشێل نەکا.

﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ دوو پیاوی عادڵ بکەنە شایەت چ بۆ حاڵەتی ریجعەکردنەوە، یان بۆ حاڵەتی لێك جیابوونەوە. بۆ ئەوەی

بەربەستی کێشەو نیزاعی چاوەڕوان کراو بکەن، ئەگەر لەوەدوا کێشەیەك دروست بوو، شایەتەکان کێشەکە یەکالا بکەنەوە. ئێوەش ئەی شایەتەکان نکوڵی لە شایەتدانەکە مەکەنو بەدڵسۆزی لەبەر خاتری خودا شایەتی خۆتان بدەن. لایەنگری هیچ لایەکیان مەکەن.

شایەت گرتن لەسەر ریجعە یان لێك جیابونەوە سونەتە، فەرمانەکە بۆ (نەدب)ەو وجوب ناگەیەنێ. بەڵگەش لەسەرئەوە: کە فەرمانەکە بۆ نەدبە نەك وجوب، کۆڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەیە: کە شایەت لەکاتی تەڵاقداندا واجب نیە هەروەها لەکاتی ریجعە کردنەوەدا. بەڵام شایەتی دانەکە پێویستە لەلای قازیو بۆ دەرخستنی حەقو راستی. ﴿ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەوەی پێتان راگەیەندرا لەبارەی شایەتیگرتن لەسەر ریجعە کردنەوەو لێك جیابونەوە، هەروا شایەتیدانی شایەتەکان لەبەرخاتری خودا، ئەنجامدانی تەڵاق بەشێوەی سوننیو حیساب راگرتنی ماوەی عیدەو دابین کردنی بژێوو شوێنی حەوانەوە بۆ ئافرەتەکە لە ماوەی عیدەکەیدا. ئەوە ئەحکامو ئامۆژگارییەکە رێنومایی کەسێکی پێ دەکرێ: کە ئیمانی بە خوداو رۆژی قیامەت هەبێو لە خودا بترسێو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بێ. ﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً، وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبُ﴾ کەسێك تەقوای خودای هەبێو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بێ، سنورەکانی نەبەزێنێ، لەهەموو تەنگو چەڵەمەیەکدا وەهانای دێو دەرووی رەحمەتی لێ دەکاتەوە. لە رێگای واوە رزقو رۆزی بۆ دەنێرێ؛ کە هەر بەخەیاڵیدا نەهاتبێو حیسابی بۆ نەکرابێ.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوە: کە تەقواو خوداپەرستی کلیلی دەرگای رەحمەتە، دەروی رزگار بوونە لە تەنگانەو مەینەتی لە کاروباری دونیاو قیامەتدا، هەروەها لە سەرەمەرگدا. هەروا هۆکاری دابینکردنی رزقو رۆزی حەڵاڵە.

﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْراً﴾
کەسێك بڕوای بەخودابێ‌و لەهەموو شتێکدا پشت بە خودا ببەستێ‌و هەموو کاروبارێکی بەو بسپێرێ‌و هۆکارە رواڵەتیەکانیش بەرچاو بگرێ، واتە: هەوڵ بداو پشتیوانیشی بەخودابێ، خودای بەسەو کاری گرانی بۆ ئاسان دەکا لە تەنگانەو ناخۆشی رزگاری دەکا.

چونکە پەروەدگار توانای رەهای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هیچی لێ یاخی نابێ، ئاتاجی بەکەس نیەو بێ باکە، هەرچی بیەوێ بێتەجێ دەبێ بێتەجێ. بێگومان پەروەدگار بۆ هەموو شتێك پێش هاتنەدی مەزنەدەی هەیەو کاتو ئەندازەی بۆ دیاری کردوە، تەنگانە ماوەی خۆی هەیەو ناخۆشی ماوەی خۆی هەیە، جا ئەگەر رزق‌و رۆزی‌و تەمەن‌و خۆشی‌و ناخۆشی‌و هەموو شتێك بەدەست خودابێ، ئیتر کەسێك عەقڵ‌و هۆشی هەبێ دەبێ بێ سێ‌و دوو خۆی تەسلیم بە قەزاو قەدەری خودا بکا.

## عیددەی ئافرەتی وەستاوە لەعادەی مانگانەو ئافرەتی مێرد منداڵ

﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ﴿٥﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەدگار فەرمانی کرد بەوەی: کە تەڵاقدانی ئافرەت دەبێ لەوەختی ئاسایی خۆیدابێ، واتە: لە پاکیدا بێو مێردەکەی نەچوبێتە لای هەروا ئەحکامی تەڵاقو ڕیجعەکردنەوەی ئەو ئافرەتانەی کە عادەی مانگانەی خۆیان هەیە ڕونکردەوە. ئەمجار لێرەدا ئەندازەی عیددەی ئافرەتی لە عادە وەستاوەو ئافرەتی پچوك دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنْ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنْ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ﴾ واتە: عیدەی ئەو ئافرەتانەی کە لە عادەی مانگانەی خۆیان وەستاونەوەو گەیشتونەتە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵو بەرەو ژوور، عیدەکەیان سێ مانگە، واتە: لەجیاتی سێ پاکی بۆ ئافرەتی خاوەن عادە، بۆ ئەوان سێ مانگە، ئەگەر کەوتنە گومانەوە ئاخۆ عیدەکەیان چۆن دەبێ. هەروا عیدەی ئافرەتی مێرد منداڵیش: کە لەبەر منداڵی هێشتا نەکەوتبێتە عادەی مانگانەوە هەر سێ مانگە.

﴿وَأُوْلاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ عیددەی ژنی سکپڕ بە دانانی سکەکەیانە، ئەگەر دوای تەڵاقدانەکە منداڵەکەی لێ بومەوە، یەکسەر عیدەکەی تەواو دەبێ، تەنانەت ئەگەر ماوەکە ساتە وەختێکیش بێ. ئاماژە بەو حەدیثە کە ئەحمەدو (أصحاب الكتب الستة) لەمیسوەری کوڕی مەخرەمەوە ڕیوایەتیان کردوە دەڵێ: سوبەیعەی کچی حاریثی ئەسلەمی مێردەکەی - کە ناوی سەعدی کوڕی خەولە بوو- مرد، لەوکاتەدا سوبەیعە سکپڕ بوو، چەند ڕۆژێکی پێ چوو منداڵەکەی لێ بومەوە: کە خوێنی پاش منداڵ بوونی لێ وەستایەوە خوازبێنی کرا، ئەویش داوای ئیزنی لەپێغەمبەرﷺ کرد: کە مارە بکرێ، پێغەمبەرﷺ ئیزنی داو مارەکرا.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە دەڵێ: ئەبو سەنابیل چووە لای سوبەیعەو وتی: چیە دەبینم خۆت گۆڕیوە؟ وادیارە تەمای شوکردنەوەت هەیە، سوێند بە خودا ئەتۆ نابێ شوبکەیەوە هەتا چوار مانگو دەرۆژ بەسەرتا نەڕوا . سوبەیعە دەڵێ: کە

ئـەوەی پـێ گـوتم، خێـرا پۆشـاکەکەمم کـۆکردەوەو هاتمـە لای پێغەمبـەرﷺ لـەو بارەوە پرسیارم لێ کرد، فتوای بـۆ دام بـەوە: کـە لەوکاتـەوە منداڵەکـەم بـووە بۆم هەیە شوبکـەمەوە، فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ شوبکەیەوە شوبکەرەوە.

﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْراً﴾ کەسێك لـە خـودا بترسـێو پابەنـدی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بێ، خودا لـەدونیاو لـە قیامەتـدا کـاری بـۆ ئاسان دەکاو لەهەموو تەنگانەو ناخۆشـیـەکدا بەهانایـەوە دێو کۆسـپو تەگـەرەی بـۆ تـەخت دەکا.

﴿ذَلِكَ أَمْرُ اللَّهِ أَنزَلَهُ إِلَيْكُمْ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْراً﴾ هـەموو ئـەو حوکمانـەی بۆمـان باسـکردن دەربـارەی تـەڵاقو عیـدەو شـوێنی حەوانـەوەی ئافرەتی تەڵاقـدراو، فـەرمانی خـوداو ئاراستەی بەنـدەکانی کـردونو لـە قورئانـدا نازڵی کردون، کەسێك لە خودا بترسـێو ئەرکەکانی سەرشـانی جێبـەجێ بکـاو خـۆ بپارێزێ لەتاوان، خودا گوناهەکانی لە نامەی ئەعمالیدا دەسڕێتەوەو چـاو پۆشـی لێ دەکا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ (هود/١١٤).

## باسی شوێنی حەوانەوەو بژێو بۆ ئافرەتی عیدەدارو کرێی شیردانو دایەنی

﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ

وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾

لەوەپێش باسی عیدەی ئافرەتی لە عادە وەستاوەو ئافرەتی منداڵو ئافرەتی حامیلەی کرد، ئەمجار باسی ئەو شتانە دەکا: کە پێویستە بۆ ئافرەتی تەڵاقدراو دابین بکرێ، هەروا کرێی شیردانو دایەنی بۆ منداڵەکانی، ئەگەر هەیبوون. دەفەرموێ:

﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ ئەو ژنە تەڵاقدراوانە دابنێن لە خانوو ماڵێکدا: کە هاوشانی خۆتان بێ، واتە: شوێنی حەوانەوەو ماڵو حاڵێکی وایان بۆ دابین بکەن: کە لەگەڵ حاڵو وەزعی ئێوەدا بگونجێو لە تواناتاندا هەبێ، تەنانەت ئەگەر لە بەشێکی خانووی خۆشتاندا دایان بنێن، زیانیان پێ مەگەیەنن بە گوێرەی توانا بژیوو شوێنی حەوانەوەیان بۆ دابین بکەن. وایان لێ مەکەن ناچاری ئەوەببن ئەو مەسکەنە جێبێڵن، یان واز لەبژێوەکەیان بێنن، بەڵکوو بە شێوەیەکی رێکو پێکو بەدڵفراوانییەوە ئەو پێویستاتانەیان بۆ دابین بکەن. بابەئاسایی عیدەی خۆیان بەسەر بەرن.

﴿وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ ئەگەر ئافرەتە تەڵاقدراوەکە سکی هەبوو پێویستە پیاوەکە بژێوی بۆ دابین بکا تا سکەکەی دادەنێ.

لێرەدا شەرعزانان کەوتونەتە را جیایەوە:

١- حەنەفیەکان پێیان وایە: بژێوو شوێنی حەوانەوە بۆ هەموو ئافرەتێکی تەڵاقدراو پێویستە با حامیلەش نەبێ. جا تەڵاقەکەی بائینەبێ یان ریجعەبێ.

٢- مالیکیەکان‌و شافیعیەکان دەڵێن: ئافرەتی سێ بەسێ تەڵاقدراو شوێنی حەوانەوەی بۆ دابین دەکرێ‌و بژێوی ناکەوێ مەگەر حامیلەبێ.

٣- ئیمام ئەحمەدو ئەبو ثەورو ئیسحاق دەفەرموون: ئافرەتی سێ بەسێ تەڵاقدراو نەشوێنی حەوانەوەی لەسەر پیاوەکەیە، نە بژێوی. چونکە موسلیم‌و ئەحمەد فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە دەڵێن: فاتیمەی کچی قەیس مێردەکەی سێ بەسێ تەڵاقیدا ، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: (لانفقة لك ولا سكنى) نەمافی بژێویت هەیە نە شوێنی حەوانەوە.

﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُمْ بِمَعْرُوفٍ﴾ ئەگەر ژنە تەڵاقدراوەکان دوای دەست لێك بەردان منداڵەکانیان بۆ بەخێو دەکردن‌و شیریان پێ دەدان ئەوە کرێی دایەنی‌و شیر پێدانەکەیان بدەنێ بە گوێرەی (أجر المثل) ئەگەر رازی بن، لە نێوان خۆتاندا ئەی دایك‌و باوکی منداڵ موشاوەرە بکەن‌و دەربارەی منداڵەکە رێك بکەون، هەرچەندە خۆیان دەستیان لێك بەردابێ، بەشێوەی تەڵاق لێك جیابوبنەوە، بەڵام دەبێ بەرژەوەندی منداڵەکەیان بەرچاو بگرن‌و بەشێوەیەکی گونجاو منداڵەکەیان پەروەردە بکەن، دایکەکە لێ ببڕێ بۆ بەخێوکردنی‌و باوکەکەش بژێوو کرێی دایەنی بۆ دابین بکا.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة/٢٣٣) ئایەتەکە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: کە کرێی شیر پێدانی منال‌و بەخێوکردن لەسەر باوکەکەیە، لەخۆگرتن‌و بەخێوکردنی منداڵ لەسەر دایکە: تا ئەو بیکا، نادرێ بەکەسی تر.

﴿وَإِنْ تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَـهُ أُخْـرَى﴾ ئەگەر ئـەو کرێیـەی دایکە تەلاقدراوەکە داوای دەکرد زۆربوو، باوکەکە نەیدەتوانی دابینی بکا، دایکەکە لەو کرێیە نەدەهاتە خوارو باوکەش بۆی هەڵنەدەسوڕا، ئەوە با باوکەکە دایەنێکی تری بـۆ بگـرێ و ئـەو بۆی بەخێو بکا.

﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّـهُ﴾ بـا بـاوك یـان سەرپەرشـتیاری منداڵەکـە بـە گـوێرەی دەوڵەمەنـدی خـۆی، کرێـی شـیرپێدان و بـەخێوکردن خـەرج بکـا بـۆ دایەنەکـە، کەسـێکیش هـەژارو دەسـت کـورت بـوو نەیدەتوانی کرێی ئاسایی بۆ دایکەکە دابین بکا، با چەند دەتوانێ بدا ئەوەندە بـدا، بە گوێرەی دارایی خۆی خەرجی بۆ بکا. چونکە ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّـهُ نَفْـساً إِلاَّ وُسْـعَهَا﴾ (البقرة/٢٨٦) چی بۆ هەڵدەسوڕێ ئەوەی داوا لێ دەکرێ.

﴿لا يُكَلِّـفُ اللَّـهُ نَفْـساً إِلاَّ مَـا آتَاهَـا﴾ پـەروەدگار ئـەرك ناخاتـە سـەر هـیچ ئادەمیزادێك مەگەر بە ئەندازەی ئەو ماڵ و داراییـەی پێـی دراوە. هـەرگیز هـەژارو نەدارا داوای ئەوەی لێ ناکرێ وەکوو ساماندار خەرجی بۆ دایەنەکە دابین بکا.

﴿سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْراً﴾ پـەروەدگار وا دەکـا دوای دەسـتکورتی و هـەژاری دەوڵەمەنـدو سـاماندارتان بکـا، ئەمـە وادەی خودایـەو وادەی خـوداش حەقـەو دێتەجێ. هیچ کـەس تاسـەر لەبەرگێکدا نـابێ. خـودا بەویـستی خـۆی رزق و رۆژی دەدا بەکەسانێك بیەوێ بیانداتێ! وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿فَـإِنَّ مَـعَ الْعُـسْرِ يُـسْراً، إِنَّ مَـعَ الْعُـسْرِ يُـسْراً﴾ (الـشرح/٥-٦).

## هەڕەشە لەسەرپێچیکەرانو وادەی بەختەوەری بە خاوەن باوەڕانو فەمانبەرداران

﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾ ﴾

لەوەپێش ئەحکامی تەڵاقو عیدەی ئافرەتی تەڵاقدراوی بەیان کرد، ئەمجار هەڕەشە لەوانە دەکا: کە سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەنو پێغەمبەرانی بە درۆ

دەخەنەوە، دەیانترسێنێ لە عەزابێکی هاوچەشنی ئەو عەزابەی کەلە پێشینەکانی پێ لەناو براوە، پاشان ئاماژە بەدەستەڵاتی بێ سنووری خودا دەکاو ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ پابەندبوون بە فەرمانو جڵەگیرییەکانی خودا. دەفەرموێ:

﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِ فَحَاسَبْنَاهَا حِسَاباً شَدِيداً وَعَذَّبْنَاهَا عَذَاباً نُكْراً﴾ زۆر لە دانیشتوانی شارو شارۆچکەکان سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو پێغەمبەرانی خودایان بە درۆ خستونەوە، پشتیان لە فەرمانی خودا هەڵکردوە، شوێن پێغەمبەرانی نەکەوتوون، ئیتر لە پاساوی کردەوەکانیاندا حیسابمان لەگەڵ کردن دانیشتوانەکانمان بە عەزابی بە شیدەت سزادا، لە دونیادا توشی برسێتیو نەخۆشیو شەڕو ئاژاوەمان کردن، لە قیامەتیش ئاگری دۆزەخ چاوەڕێیانە.

﴿فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْراً﴾ چەشتیان تۆڵەی تاوانی خۆیان، سزای کوفرو بێدینی خۆیان پەخەی گرتنو رزگاریان نەبوو، سەرەنجامیان خەسارەتمەندیو هیلاکەتو چەرمەسەرییە لەدونیادا، لە قیامەتیشدا عەزابی دۆزەخ، ئیتر خۆیان لەکیس چوو ماڵو منداڵیان فەوتا، لە هەموو لایەکەوە تێداچون.

﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَاباً شَدِيداً﴾ پەروەدگار سزای توندی کوشندەی بۆ ئامادەکردون: کە بریتیە لە عەزابی دۆزەخ. ئەمەش لە تۆڵەی کوفرو سەررەقیو یاخی بوونیان.

ئەمجار موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ ئەوەی پەند لەو هەڕەشانە وەربگرن، دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾ ئەی خاوەن عەقڵو هۆشەکان؛ بترسن لە عەزابی خودا، پەند لەگەڵو نەتەوە پێشینەکان وەربگرن ، وامەکەن بەدەردی ئەوان بچن. ئەوەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئێوەش بێ.

﴿الَّذِينَ آمَنُوا قَدْ أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْراً ، رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِ اللَّهِ مُبَيِّنَاتٍ لِيُخْرِجَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ واتە: تەقوای خودا بکەن ئەی خاوەن عەقڵەکانی گەلی ئیسلام؛ ئەوانەی بڕوایان بە تاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی هەیە، گەردنکەچی فەرمانی خودا بوونو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەی (حەزرەتی موحەممەد) کەوتوون، بێگومان خودا شەریعەتو یاسایەکی هەمیشەیی بۆ نازڵ کردون: کە بریتییە لەقورئان، پێغەمبەرێکی بەرێزی بەو قورئانەوە بۆ ناردون، ئەو پێغەمبەرە بە راستگۆییو دڵسۆزی پەیامی خوداتان پێ رادەگەیەنێ، نامەی خوداتان بەسەردا دەخوێنێتەوە: کە ئایەتەکانی ئاشکراو رونن، بەرنامەی ژیانن، کەتەلۆکی بونەوەرن، هەرچی ئادەمیزاد پێویستیانە بۆ بەڕێوەچوونی ژیانیان تێیدا رون کراوەتەوە، بۆ ئەوەی خودا بەهۆی ئەو قورئانەو پێغەمبەرەوە ئادەمیزادەکان لە تاریکی گومڕایی رزگار بکا، بۆ روناکی ئیمان. ئەو ئادمیزادانەی باوەڕیان بە خوداو بە پێغەمبەری خوداﷺ هەیە.

ئەمجار پاداشتی خوداپەرستان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحاً يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً قَدْ أَحْسَنَ اللَّهُ لَهُ رِزْقاً﴾ کەسێك ئیمانی بە تاكو تەنهایی خودا هەبێو کردەوەی باش بکا، واتە بەدڵ ئیمانی تەواوی هەبێو بە زوبان ئەو ئیمانە دەربڕێو راستی ئیمانەکەی لە کردەوەکانیدا رەنگ بداتەوە، ئەوە خودا دەیخاتە ناو باخو باخاتی بەهەشتەوە: کە بەژێر باڵەخانەو درەختەکانیدا جۆگاو جۆبار دەکشێنو هێندەی تر جوانی بە دیمەنەکە دەبەخشن. بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، لێی وەڕزنابنو لێی دەرناچن، خودا رزقو رۆژی بۆ خوداپەرستان لە بەهەشتدا زۆرو زەبەند کردوە، هەرگیز نابڕێتەوەو تێك ناچێو کەم ناکا.

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ﴾ پەروەدگار خودایەکی وەهایە لە نەبووەوە حەوت ئاسمانی بە دیهێناون، لە زەویش حەوتی بەدیهێناوە وەکوو حەوت ئاسمانەکان فەرمانو قەزاو قەدەری خودا، نیگاو سروشتی بۆ پێغەمبەرانی لە ئاسمانەکانەوە بۆ سەر زەوی دادەبەزێنێ.

پەروەدگار لە زۆر ئایەتی قورئاندا باسی حەوت ئاسمانی کردوە، لەم ئایەتەش دا ئەوەی راگەیاند کە حەوت زەویشی دروست کردون.

لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا ناوی حەوت زەوی هاتووە، لە صەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرمودەیەك هەیە دەفەرموێ: (من ظلم قيد شبر من الارض طوقه من سبع أرضين) لە بوخاری دا هاتووە: (خسف به الى سبع أرضين).

دوعایەکی پێغەمبەرﷺ هەیە بوخاریو هی تریش ریوایەتیان کردوە: تێیدا هاتووە: (اللهم رب السموات السبع وما اظللن، ورب الارضين و ما أقللن) ئیبنو مەسعود ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ما السموات السبع و مافيهن وما بينهن و الأرضون السبع و ما فيهن في الكرسي إلا كحلقة ملقاة بأرض فلات).

ئەم ئایەتو فەرمودانە دەقن لەوەدا: کە حەوت ئاسمانو لە بەرامبەریاندا حەوت زەوی دروستکراون، ئەمجار ئەو ئاسمانانە چۆنو چینو ئەم زەوییانە چۆنو چین؟ لەراستی دا ئێمە ج زانیارییەکمان نیە دەربارەی حەقیقەتی ئاسمانەکانو دوری مەساحەیان. هەروا دەربارەی حەوت زەوییەکانیش هیچ نازانین، پێدەچێ دایکە زەویمان یەکێك بێ لەو زەوییانە.. وێدەچێ مانای (ومن الارض مثلهن) ئەوەبێ. ئەم زەوییەی ئێمە لەسەری دەژین لە رەگەزو ماددەی ئاسمانەکان بێ.

ئاسمانی دونیا واتە: ئاسمانی نزیك لە ئێمە جوان كراوە بەئەستێرەكان، هەموو ئەو ئەستێرەو مانگو خۆرو مەریخو زوحەلو زوهرەو موشتەریو عەطاردو باقی ئەستێرەكانی تر وان لە ئاسمانی یەكەمدا، وێڕای جیاوازیو قەبارەو دوورییان لەیەكتر، بڕێ لەو ئەستێرانە سەر بەخۆرن واتە: كۆمەڵەی خۆرین. بەدەوری دا دەسوڕێنەوە، ئەمجار وێدەچێ خۆرو كۆمەڵەكەی بەدەوری ئەستێرەیەكی تردا بسوڕێنەوە، وەلێ لەبەر دووری لەبەر چاوی ئێمە خۆی بە پچوك بنوێنێ. بۆ نموونە دەگوترێ: ئەستێرەی شیعرا ملیونێ جار لەخۆر زەبەلاحترە!!

﴿لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً﴾

پەروەدگار ئاسمانەكانو زەوی دروستكردونو فەرمانو قەزاو قەدەری خۆی تێیاندا ئەنجام دەدا، بۆ ئەوەی ئێوە بزانن. كە خودا خاوەنی دەستەڵاتی رەهایەو بەزانیاری خۆی هەموو شتێكی داپۆشیوەو هیچ شتێك لەژێر كۆنترۆڵی زانیاری خودا دەرناچێ. كەوابێ نەبە ئاشكراو نە بەنهێنی نافەرمانی خودا مەكەن، خۆتان لە تۆڵەو سزای بپارێزن چونكە خودا زانایە بە كردەوەكانتانو سزاو پاداشتان بە گوێرەیان دەداتەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی التحريم

ئەم سورەتە مەدەنییەو دوانزە ئایەتە، ناونراوە بە سورەتی تەحریم چونکە باسی ئەوەی لەخۆ گرتووە: کە پێغەمبەرﷺ شتێکی لەسەر خۆی حەرام کردوەو سورەتەکە بە رەخنە گرتن لە پێغەمبەرﷺ دەست پێ دەکا، لەسەر ئەو شت لەخۆ حەرامکردنە.

سورەتەکە برێ ئەحکامی تایبەتی دەربارەی خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ لەخۆ گرتووە. بۆ ئەوەی ئەو دایکە موسوڵمانانە ببنە نموونە بۆ ئافرەتانی موسوڵمانو چاویان لێ بکەن!

سورەتەکە بە رەخنەگرتنێکی نەرمو نیان لە پێغەمبەرﷺ دەست پێ دەکا: لەسەرئەوە خواردنێکی حەڵاڵ: کە هەنگوین بوو لەخۆی یاساغ کردبوو.

ئەمجار سەرزەنشتی هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ دەکا، چونکە نهێنییەکی پێغەمبەریان نەپاراستو بڵاویان کردەوە. ئەوەبوو پێغەمبەرﷺ نهێنییەکی بە حەفصەی خێزانی گوت، ئەویش بۆ عائیشەی گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ بەمە زۆر تورەبوو، تەنانەت خەریك بوو خێزانەکانی تەڵاق بداو هەڕەشەی لێ کردن: کەلەوانەیە خودا بەباشتر لەوان خێزانی بداتێ. هەر بەو بۆنەوە تەقوا دەخاتەوە بیری خانەوادەی موسوڵمانانو داوایان لێ دەکا خۆ لەئاگر بپارێزنو دژی کافران جیهادو تێکۆشان ئەنجام بدەن.

ئەمجار لە کۆتایی سورەتەکەدا دوو نموونەی بەرچاو دەهێنێتەوە نموونەیەك بۆ کافرەکانو نموونەیەك بۆ موسوڵمانەکان، نموونەی یەکەم: ژنی حەزرەتی نوحو ژنی لوط، بۆ خۆیان کافرو مێردەکانیان پێغەمبەر.

نموونەی دووەم: ژنی فیرعەون، بۆ خۆی موسوڵمانو خوداپەرستو مێردەکەی کافرو سەررەقو ملهوڕ. هەروا نمونەیەکی تر: کە بریتی بوو لە حەزرەتی مریەم هاوسەری کەس نەبوو، بۆ خۆی ئازادو سەربەستو خودا پەرست. هێنانەوەی ئەم نموونانە ئاماژەیە بۆئەوە: کە پێویستە ئادەمیزاد بڕوای بە خۆی بێو پشت بە خودا ببەستێ، دڵنیابێ لەوەی کەهەر کردەوەی خۆت فریات دەکەوێ، ئەگەر کردەوەت خراپ بێ حەسەبو نەسەب هیچیان پێ ناکرێو لە عەزابی خودا رزگارت ناکەن!

## هەندێ حاڵەتی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١﴾ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٣﴾ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن

يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٍ مُّؤۡمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبۡكَارًا ﴿٥﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە(۱-۲) بوخاریو موسلیم لە صەحیحەکانیانا لە خاتوو عائیشەوە ریوایەت دەکەن: دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ حەزی لە حەڵواو هەنگوین بوو، کە لە نوێژی عەصر تەواو دەبوو دەچووە ماڵی خێزانەکانی، وا دەبوو لای زەینەبی خێزانی دەمایەوە هەنگوینی دەخواردەوە، عائیشە دەڵێ: لەگەڵ حەفصەدا رێك کەوتین: پێغەمبەرﷺ بێتە ماڵی هەرکاممان پێی بڵێین بۆنی مەغافیرت لێ دێ. گیای مەغافیرت خواردوە؟ ئەو رۆژە پێغەمبەرﷺ چووە ماڵی حەفصە، حەفصە پێی گوت بۆنی مەغافیرت لێ دێ.. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ناوەڵڵا بەڵکوو لای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینم خواردۆتەوە، شەرت بێ جارێکی تر دەمی لێ نەدەم. ئەوە سوێندم خوارد، ئەم هەواڵە بەکەس مەڵێ.

طەبەرانی لە ئیبنو عبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لای سەودەی خێزانی هەنگوینی خواردەوە پاشان چووە ماڵی عائیشە، پێی گوت بۆنت لێ دێ، پاشان چووە ماڵی حەفصە ئەویش هەمان قسەی پێ گوت. پێغەمبەرﷺ فەرمووی لەوانەیە بەهۆی خواردنەوەی ئەو هەنگوینەوەبێ کە لای سەودەی خێزانم خواردمەوە وەڵڵاهی ئیتر نایخۆمەوە...

ئیبنو لعەرەبی دەڵێ: راستییەکەی ئەوەیە: پێغەمبەرﷺ هەنگوینی لە خۆی حەرام کرد، هەنگوینی لای زەینەب خواردەوە، حەفصەو عائیشە گەلەکۆمەکێیان لێ کرد، پێغەمبەریش سوێندی خوارد کەئیتر هەنگوین نەخواتەوە، بەڵام سوێند خواردنەکەی بە نهێنی بوو.. ئیتر ئایەتەکە دەربارەی ئەو رووداوە نازڵ بوو.

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاةَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، ئەوە بۆچی شتێك لە خۆت یاساغ دەکەی؛ کە خودا بۆی حەڵاڵ کردوی، دەتەوێ بەو حەڵاڵ لەخۆ یاساغکردنە خێزانەکانت رازی بکەی، پەروەدگار لێخۆشبوو لێبوردوە لەسەر ئەوشتەی حەڵاڵەو لەخۆت یاساغکردوەو هەروا لەو شتانەی (خلاف الأولی)ن و بۆ کەسانی دیکە حەڵاڵن بۆ تۆ بە تاوان دەژمێردرێ. خاوەن رەحمو بەزەییە سزات نادا.

هەڵبەتە ئەمە رەخنەو عیتابێکی نەرمو نیانە پەروەدگار ئاراستەی پێغەمبەری کرد، لەسەرئەوە: کە خواردنێکی حەڵاڵو زوڵاڵی لەخۆی یاساغ کرد، ئەم خواردن لەخۆ یاساغکردنە ناونراوە گوناه هەرچەندە بۆ غەیری پێغەمبەرﷺ حەڵاڵ بووە، چونکە رێزی پێغەمبەرﷺ جوداوازەو بە نیسبەت ئەوەوە (خلاف الأولی) بە تاوان دەژمێردرێو بەر ئەو قاعیدە دەکەوێ؛ کە دەڵێت: (حسنات الأبرار سیئات المقربین).

بەلای ئەبو حەنیفەوە یاساغکردنی حەڵاڵ بە سوێند دەژمێردرێ، ئەگەر یەکێك خواردەمەنیەکی لە خۆی یاساغکرد، وەکوو ئەوە وایە سوێندی خواردبێ! کە ئەو خواردەمەنیە ناخوا، ئەگەر ژنێکی لە خۆی حەرامکرد، ئەوە وەکوو سوێند وایە ئەگەر نیەتی هیچی لە دڵدانەبوو، ئەگەر نیەتی تەڵاقی هێنا تەڵاقە، ئەگەر نیەتی ظیهاری هەبوو ظیهارە، تەنانەت ئەگەر نیەتی ژمارەی تەڵاقیشی هێنا ئەو ژمارە حیسابە.

شافیعی ئەو حەڵاڵ لەخۆ حەرامکردنە بە سوێند ناژمێرێ، بەڵام ئەگەر یاساغکراوەکە ئافرەت بوو ئەوە بە هۆکاری کەفارەتی حیساب دەکا. ئەگەر نیەتی تەڵاقی هێنا تەڵاقەکە ریجعیە، ئەگەر سوێندی خوارد: کە هیچ شتێك نەخوا دوایی سوێندەکەی لەخۆی خست دەبێ کەفارەت بدا.

﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ خودا کردنـەوەی گرێـی سـوێندەکانی ئێـوەی بڕیـارداوە، بـەوە کـەفارەتی سـوێندەکانتان بدەن: کە بریتییە لە خواردەمەنی دەهەزار لەخواردەمەنی مام ناوەندی خۆتان یان پۆشاکیان، یان ئازاد کردنی کۆیلەیەك، ئەگەر نەبوو سێ ڕۆژ بەرۆژوبێ. پەروەدگار خـوداو مەوەلامانـە، ئـەو زانایـە بـە هـەموو شـتێكو هـەموو کـارێکی بەجێیـە کاردروستو خاوەن حیکمەتە.

بڕیـاردانی حـەلاڵو حـەرام تایبەتـە بـە خـوداوە، هـەر ئـەو دەتـوانێ دەسـت نیشانیان بکا، کەسی تر بۆی نیە شتێك کە خودا حەلاڵی کردبێ، حەرامی بکا. خۆ ئەگـەر کەسـێك بڕیـارێکی لـەو جـۆرەی دا شـتێکی حـەلاڵی حـەرام کـرد یـان بەپێچەوانەوە، ئەوە هیچ لە مەوزعەکە ناگۆڕێ، نەحەلاڵ حەرام دەبێو نـە حـەرام حەلاڵ دەبێ. خودا سەرپەرشتیاری کارەکانی ئێوەیەو یارمەتیدەرتانە، دەزانـێ چـی لە بەرژەوەندی ئێوەیەو رزگاریتان لەچی دایە. حەکیمو دانایە لە کردارو گوفتـارو نەخشەو پلانـیدا.

لێـرەدا پرسـیارێك دێتـە پێـشەوە! ئایـا پێغەمبـەرﷺ کـەفارەتی پاسـاوی سوێندەکەی دا؟ زانایانی ئیسلام لەم بارەوە را جیاییان هەیە: ـ

حەسـەنی بەصـری دەڵـێ: کـەفارەتی نـەداوە، چـونکە پێغەمبـەرﷺ حیـسابی جودایەو خودا لە هەموو تاوانێکی خۆش بووە، ئەو حوکمەی لە ئایەتەکەدا بـەیان کراوە بۆ فێرکردنو رامکردنی موسوڵمانانە، وەڵێ ئەم رایە جێگای سەرنجە، چونکە ئەحکامی شەرعی گشتینو بەلگەیەك نیە لێـرەدا تەخـصیص بگەیـەنێ. هـەر بۆیـە موقاتیـل دەڵـێ: پێغەمبـەرﷺ بەندەیـەکی ئـازاد کـردوە لـە کـەفارەتی ئـەو حـەلاڵ لەخۆ یاساغکردنەدا.

شـافیعیو مالیـك دەفـەرموون: ئـەوە بـە سـوێند نـاژمێردرێ، وەلێ ئەگـەر یاسـاغکراوەکە خێزانـی بـوو بـە تـەحریم کردنەکـە نیـەتی تـەلاقی هێنـابوو، تەلاقەکەی بە شێوەی ریجعە دەکەوێ.

ئیمام مالیك لە رایەکی تریدا دەفەرموێ: تەلاقـەو سێ تەلاقـەی پـێ دەکـەوێ. ئەبوبەکرو عائیشەو ئەوزاعی پەژن سوێندەو کەفارەتی گەرەکە.

﴿وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثاً فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَنْ بَعْضٍ﴾ بیر لەوەبکەوە: کاتێ پێغەمبەرﷺ بە سرتەو نهێنی بڕیارێکی خۆی بۆ حەفصە باس کرد: کە بریتی بوو لـە یاساغکردنی هـەنگوین یـان (ماریـة قبطیة) لە خۆی، بەلام ئەمە بۆ عائیشەو غەیری ئەو باس مەکە جا: کـە حـەفصە ئەم نهێنی‌یەی تێ نەوەستاو بەهی تری گوت. خودا پێغەمبەری لـەوە ئاگادار کـرد: کـە حـەفصە پارێزگـاری نهێنیەکـەی نـەکردوە، هەنـدێکی لـەو نیگایـە بـۆ حـەفصە باسکردو هەندێکی پشتگوێ خست.

﴿فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنْبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِي الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ﴾ کاتێـك پێغەمبـەر بـە حەفـصەی وت: کـە تـۆ ئـەم قـسەیەت بـۆ عائیـشە گێڕاوەتـەوە، ئـیتر حەفـصە بـە پێغەمبەری گوت: کێ ئەم باسەی بۆ گێڕاویتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودای زاناو ئاگادار ئەوەی پێ راگەیاندم، خودا ئاگاداری هەموو نهێنی‌یـەکەو هەرچی لـە ئاسمانەکانو زەوی‌دا هەیە لە خودا شاراوە نیە. ئاگای لە هەموو بونەوەرە، لـە هـەر کونو قوژبنێکی‌دا سرتەیەك بکرێ خودا ئاگای لێیەتی ..

ئەمجار پەروەدگار حەفصەو عائیشە هەڵدەنێ بـۆ تۆبـەکردنو پەشـیمانبونەوە لەو هەڵوێستەیان دەفەرموێ:

﴿إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَـا﴾ ئەگـەر تۆبـە بکـەنو بگەڕێنـەوە بـۆلای خوداو لەو هەڵوێستەتان پەشیمان ببنـەوە، لـەوە بـەولاوە نهێنـی خۆتـان بپارێزنو

شتێك خوداو پێغه‌مبه‌ر پێیان خۆش بێ خۆشتان بوێ‌و شتێك ئه‌وان ناخۆشیان بوێ ناخۆشتان بوێ. تۆبه‌تان لێ وه‌ربگیرێ ئه‌وه بۆ ئێوه باشه، بێگومان دڵتان له‌حه‌ق لایدابوو، ئه‌وه‌ی پێویست بوو ئه‌نجامتان نه‌دابوو که: بریتی بوو له ڕێزگرتن له پێغه‌مبه‌رو پاراستنی نهێنی.

خیطابه‌که بۆ حه‌فصه‌و عائیشه‌یه، چونکه ئیمام ئه‌حمه‌د له موسنه‌ده‌که‌یدا له ئیبنو عه‌بباسه‌وه ریوایه‌ت ده‌کا ده‌فه‌رموێ: ماوه‌ی ساڵێك چاوه‌ڕوانی هه‌ل بووم بۆ ئه‌وه پرسیار له عومه‌ر بکه‌م ده‌رباره‌ی مانای ئه‌م دوو ئایه‌ته. هه‌لم بۆ نه‌ڕه‌خسا، هه‌تا حه‌زره‌تی عومه‌ر چوو بۆ حه‌ج‌و منیش له‌ته‌کیا بووم، حه‌جمان کردو گه‌ڕاینه‌وه، له ڕێگه لای دایه په‌نایه‌که‌وه بۆ ده‌ست به ئاو گه‌یاندن، پاشان هاته‌وه ده‌ستنوێژ بگرێ، منیش ئاوم له ده‌ستی ده‌کرد بۆ ده‌ستنوێژ گرتن‌و ده‌ستنوێژی گرت وتم: ئه‌ی فه‌رمانڕه‌وای موسوڵمانان! ئه‌رێ مه‌به‌ست به‌و دوو خێزانه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ کامانه‌ن: که‌خودا ده‌ربار‌ه‌یان ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾؟ عومه‌ر فه‌رمووی: ئه‌ی ئیبنو عه‌بباس! تۆ سه‌یری بۆچی نازانی مه‌به‌ست به‌و دوو خێزانه عائیشه‌و حه‌فصه‌یه.

﴿وَإِنْ تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ﴾ ئه‌گه‌ر هه‌ر یارمه‌تی یه‌کتری بده‌ن‌و له‌سه‌ر حاڵی پێشووتان به‌رده‌وام بن، ئه‌وه پێغه‌مبه‌ر باکی لێتان نیه، چونکه دڵنیابن خودا سه‌رپه‌رپشتیارو پشتگیرییه‌تی‌و کۆمه‌کی پێ ده‌کا، هه‌روا جوبرائیل‌و موسوڵمانه صاڵح‌و راستاڵه‌کان‌و فریشته‌کانیش یارمه‌تیده‌رو پارێزه‌رنی. هه‌موویان پشتگیری لێ ده‌که‌ن، ئیتر چ باکی له‌ئێوه نیه.

ئه‌م پشتگیریکردن‌و پارێزگاریکردنه خوداییه‌ی بۆ پێغه‌مبه‌ر ده‌سته‌به‌ر بووه بۆ هیچ پێغه‌مبه‌رو ئاده‌میزادێکی تر نه‌بوه. به‌راستی ته‌عظیم‌و ڕێزگرتنێکی سه‌یروسه‌مه‌ره‌یه بۆ پێغه‌مبه‌ر که له‌رزگار بوون له فرت‌و فێڵی ئافره‌ت‌و

پوچاندنەوەی بیرو بۆچونی موشریكو دووڕوەكانو پارێزگاری كردنی لە پیلانی دوژمنانیو زیان پێگەیاندنیدا ڕەنگی داوەتەوە.

﴿عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَاراً﴾ پەروەدگار دەستەڵاتو توانای ڕەهای هەیە، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئێوە تەڵاق بدا، خودا دەتوانێ خێزانی باشتر لە ئێوەی بۆ فەراهەم بێنێ، هاوسەری وەها پابەندبن بە ئەركە ئایینییەكانو بیروباوەڕە پتەوو یەكتاپەرستو خاوەن بڕوا، بە خوداو بە فریشتەو بەنامەو بە پێغەمبەرانی، گوێڕایەڵ بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا، تۆبەكارو پەشیمانبونەوە لەتاوان. بەردەوام لەسەر خودا پەرستیو ملكەچ بۆ قەزاو قەدەری خودا، ڕۆژوەوانو ڕەوشت جوانو هەندێكیان بێوەژنو هەندێكیان كچ!

ئایەتەكە هەڕەشەو ترساندنی لەڕادەبەدەری تێدایە بۆ خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەزیتدانی پێغەمبەر، چونكە بەنیسبەت ئافرەتەوە لەوە ناخۆشتر نیە خۆی تەلاق بدرێو مێردەكەی ژنێكی تر مارە بكا، ئەمكارە بەنیسبەت ئافرەتەوە گورچكبڕە، خەو زڕێنە، ڕوخێنەری لانەی خۆشیو كامەرانییەتی، هەر ژنێك ئەوەی بەسەر بێ ئیتر هەستو شعوری بریندار دەبێو دەشكێو خۆی ناگرێتەوە.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم كورتەیەك دەربارەی فرەژنی پێغەمبەر بدوێین، چونكە ناحەزانی ئیسلام لەوبارەوە زۆریان گوتووەو زۆر دەڵێن: بەناڕەوا هێرش دەكەنە سەر ئیسلامو فرەژنی بەگشتیو فرەژنی پێغەمبەر ﷺ بەتایبەتی. پێش هەموو شتێك پێویستە ئەوە بزانین: كە فرەژنی پێغەمبەر ﷺ لایەنی ڕامیاریو كۆمەڵایەتی تێدا بەرچاو گیراوە، لەمارە كردنی هەرخێزانێكیدا كۆمەڵێك هۆكاری سیاسیو كۆمەڵایەتیو بەرژەوەندی ئیسلامی تێدا بەرجەستە بووە، مەبەست لایەنی جنسی نەبوە.

یەکەم ئافرەتێک مارەی کردوە خەدیجەی کچی خوومیلیدە، ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد بۆ خۆی تەمەنی بیستو پێنج ساڵو خەدیجە تەمەنی چل ساڵ یان زیاتر بووە. سێ ساڵ پێش کۆچکردن بۆ مەدینە خەدیجە بەڕەحمەت چوو، تا ئەم خێزانی بوو، پێغەمبەر ﷺ ژنی تری نەهێنا. ئەو کاتەی خەدیجە لە دونیا دەرچوو پێغەمبەر ﷺ تەمەنی لە ژوور پەنجا ساڵیەوە بوو.

دوای خەدیجە سەودەی کچی زەمعەی مارەکرد، ئەویش ئافرەتێکی جەحێڵ وجوان نەبوو، بێوەژنێکی کۆست کەوتوو بوو، مێردەکەی لە کۆچکەرانی حەبەشە بوو، ناوی سەکرانی کوڕی عەمری کوڕی عبدالشمس بوو: کە لە دونیا دەرچوو پێغەمبەر ﷺ سەودەی خێزانی مارەکردەوە.

ئەمجار عائیشەی مارەکردو دوای کۆچکردن بۆ مەدینە گواستیەوە، تەنها عائیشە بەکچی بووەتە هاوسەریو خۆشەویستترین خێزانی بووە.

ئەمجار حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتابی مارەکرد، ئەویش بێوەژن بوو، دوای کۆچکردن بە دوو ساڵو چەند مانگێك بووەتە هاوسەری.

پاشان زەینەبی کچی خوزەیمەی هێنا ئەویش بێوەژن بوو، مێردەکەی ناوی عوبەیدەی کوڕی (الحارث)ی کوڕی (عبد المطلب) بوو، ڕۆژی غەزای بەدر کوژرا، هەندێك گوتویانە مێردە کۆنەکەی ناوی عەبدوڵڵای کوڕی (الجحش) بوو ڕۆژی ئوحود شەهید کراوە.

ئەمجار (ئوممو سەلەمە)ی مارەکرد ئەویش بێوەژن بوو، لە پێشدا خێزانی ئەبو سەلەمە بوو، لە غەزای ئوحودا بریندار بوو لە ئاکامی ئەو برینداربوونەدا مرد.

ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئوممو سەلەمەی خێزانی مارەکردەوە. منداڵەکانی پەروەردە کردن.

پاشان زەینەبی کچی جەحشی مارەکرد، ئەمەش دوای ئەوەی لەزەیدی کوڕی حاریثەی مارەکردو پێکەوە هەڵیان نەکردو زەید تەڵاقیدا.

ئەمجار جوویرییەی مارەکرد کە کچی (الحارث)ی سەرۆك هۆزی (بني المصطلق) بوو، کە غەنائیم بەشکرا بەر ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس کەوت ئەویش موکاتەبەی لەگەڵدا کرد. بۆ پارمەتیدان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من جوومیرییەی کچی حاریثی کوڕی ئەبو ضیرارم سەرەك هۆزی گەلەکەی خۆمان، توشی بەڵای کۆیلایەتی بوومو دەزانی، بەر بەشی ثابیتی کوڕی قەیس کەوتووم، موکاتەبەم لەگەڵدا کردوە، هاتوم یارمەتیم بدەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەتەوێ یارمەتی باشترت بدەم؟ جوومیرییە وتی چۆن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پارەی موکاتەبەکەت بۆ دەدەمو مارەت دەکەم، وتی: زۆرم پێ خۆشەو ڕازیم.

ئەمجار ئوموحەبیبەی کچی ئەبو سوفیانی مارەکرد. ئەمیش یەکێك بوو لە ئافرەتە کۆچکەرەکان بۆ وڵاتی حەبەشە، مێردەکەی لە ئایینی ئیسلام هەڵگەڕایەوەو بوو بەنەصرانی، وازی لە ئوموحەبیبە هێنا، پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی کردو نەجاشی مارەییەکەیدا، لەوێوەهات بۆ مەدینە.

لە دوای غەزای خەیبەریش (صفیە)ی کچی حویەی کوڕی ئەخطەب کە سەرۆك هۆزی (بني النضير) بوو مارە کرد، ئەم ئافرەتە لە پێشدا خێزانی کەنانەی کوڕی ئەبولحەقیق بوو کە یەکێك بوو لە پیاوە ناودارەکانی جولەکە.

پاشان مەیمونەی کچی (الحارث)ی کوڕی حەزمنی مارە کرد، لەپێشدا خێزانی ئەبو ڕەهەمی کوڕی (عبد الغرى) بوو، پوری خالیدی کوڕی وەلیدو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بوو، ئەم ئافرەتە دوا ئافرەت بوو کە پێغەمبەر ﷺ مارەی بکا.

بەم جۆرە دەبینی لە مارەکردنی هەر خێزانێکیدا مەبەستێکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی لە دواوە هەبووە، خێزانەکانی جگە لە زەینەبی کچی جەحش و جوویریەی کچی (الحارث) و عائیشە ئەوانەی تر هەموویان ناشرین و پیرو کۆست کەوتوو بوون.

## خۆپاراستن لە دۆزەخ و پەشیمانبونەوە لەتاوان و جیهاد لەگەڵ کافراندا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَعۡتَذِرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ

ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٩﴾

لەوەپێش فەرمانی بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کرد کە: تۆبە بکەن لەو هەڵەو تاوانانەی ئەنجامیان داوە، ترساندنی لە سەرپێچیکردن، ئامۆژگاری کردن، ئەدەبی دادان، هەڕەشەی تەلاقدانی لێ کردن.

ئەمجار لێرەدا فەرمان بە موسوڵمانان دەکا کە: خۆیانو خێزانو منداڵیان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، بەوە واز لە تاوان بێننو کردەوەی چاك بکەن. فەرمانیان پێ دەکا بە تۆبەکردنی نەصوحانەو خۆپاککردنەوە لە تاوانو جیهاد کردن دژی کافرو بێ بڕوایان بە هەموو جۆرەکانیەوە دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، بڕواتان بە تاكوتەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ هەیە؛ خۆتان ڕێكوپێك بکەن، بە تاعەتو خوداپەرستیو بەندایەتیکردنی دڵسۆزانە خۆتانو خێزانو منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادو بەردە، بتپەرستەکانو بتەکانیانن.

فەرمان بە ماڵو منداڵتان بکەن بە تاعەتو خوداپەرستی، ئەدەبیان دادەن، جڵەوگیریان لێ بکەن، لە تاوانو سەرپێچیکردنی فەرمانی خودا، بۆ ئەوەی ئێوەو ئەوان نەبنە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخ. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ (طه/١٣٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ﴾ (الشعراء/٢١٤).

لەعەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ریوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مروا أبناءكم بالصلاة لسبع واضربوهم عليها لعشر، وفرقوا بينهم في المضاجع) ئەم

فەرمودەیە بە چەند شێوەیەکی تریش ریوایەت کراوە وەلێ هەموو ریوایەتەکان مانایان یەکە..

(الضحاك)و موقاتیل دەفەرموون: لەسەر هەموو موسوڵمانێك پێویستە ماڵو خێزانو منداڵو خزمو کەسوکاری فێری ئەوشتانە بکا کە خودا لەسەری پێویست کردون، هەروەها ئەو شتانەی نەهی لێ کردون.

ئیبنو جەریر فەرموویەتی: لەسەر ئێمەی موسوڵمان پێویستە، منداڵەکانمان فێری ئایین بکەین، هەروا فێری ئەدەبو رەوشتی جوانیان بکەین.

﴿عَلَيْهَا مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ بەسەر ئاگری دۆزەخەوە هەن چەند فریشتەیەکی دڵرەق، بەزەیییان بەکەسدا نایە، سەرپەرشتی دۆزەخو سزادانی تاوانباران دەکەن، دیمەنیان ترسناكو پێکهاتەیان سەر سوڕهێنەرە، خودا خوڵقاندونی بۆ سزادانی تاوانباران، ژمارەیان نۆزدە فریشتەیە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوەدەکاو دەفەرموێ: ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ (المدثر/٣٠).

ئەو فریشتانە بە تەواوی فەرمانبەردارنو تۆزقاڵێك نافەرمانی خودا ناکەن، هەرچی فەرمانیان پێ دەکرێ بێ سێو دوو لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەنو چرکەیەك پاشو پێشی ناخەن.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ كَفَرُوا لا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ رۆژی قیامەت کە: تاوانباران دەخرێنە ناو دۆزەخەوە پێیان دەگوترێ: ئەی ئەوانەی لە دونیادا بڕواتان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا نەبوو، ئێوە پێتان وانەبوو زیندو بوونەوە هەیەو قیامەت ڕا دەبێ، ئەمڕۆ پاساو مەهێننەوە، مل لە عوزرو بیانوو هێنانەوە مەنێن، چونکە عوزرتان لێ وەرناگیرێ، هەرچی بڵێن بێهودەیە. تۆزقاڵێك ستەمتان لێ ناکرێ، بەگوێرەی کردەوەکانتان سزاتان دەدرێو چیتان چاندوە ئەوە

دەدورنـەوە.. دونیـا شـوێنی سـزاو پـاداش وەرگرتنەوەیـە. هەرچـی بەسـەرتان بـێ سوچی خۆتانە، خۆتان بە خۆتان کردوە. جا چونکە عوزر هێنانەوەو تۆبەکردن لە قیامەتدا بێ سودە موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ ئەوەی لە جیهاندا تۆبە بکەن‌و بـۆلای خودا بگەڕێنەوە. دەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحاً عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الآنْهَارُ يَوْمَ لا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ﴾ ئـەی ئـەو کەسـانەی بڕواتـان بـە تـاك‌و تـەنهایی خـودا هێنـاوەو پێغەمبەرەکـەی بەڕاست دەزانن‌و شوێنی کەوتوون، بگەڕێنەوە بۆلای خوداو تۆبەی نەصوح بکەن‌و واز لـەتاوان بهێـنن، بڕیـار بـدەن کـە: جـارێکی تـر ناگەڕێنـەوە سـەر تـاوان، بـەدڵ پەشیمان ببنەوەو بەزمان تۆبەو ئیستیغفار بکەن‌و بـەکردەوە واز لـە ئەنجامـدانی تاوان بێنن. بـەڵکوو خـودا تـاوانی رابردوتـان بـسڕێتەوە. بـەڕەحم‌و بـەزەیی خـۆی لێتان خۆش ببێ. رۆژی قیامەت بتانخاتە ناو بەهەشتی ڕازاوەو پان‌و بەرینەوە کە: بەژێر کۆشك‌و درەختی باخەکانی‌دا جۆگاو جۆبـار دەکشێن‌و هێنـدەی تـر جوانی‌و ڕازاوەیی بەشوێنی حەوانەوەتان دەبەخشێ.

ئەم فەضل‌و بەخششە گەورەیە لـەرۆژێکدایـە کـە خـودا عـەزابی پێغەمبـەرو موسـوڵمانان نـادا، زەلیـل‌و ڕیـسوایان ناکـا. بـەڵکوو ڕێزیـان لێ دەگـرێ، فـەضـل‌و رەحمەتی خۆی دەڕژێنێ بەسەریاندا.

﴿نُورُهُمْ يَسْعَى بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ نوورو روناکی موسوڵمانان لەو رۆژەدا رێگایان بۆ روناك دەکاتـەوە، لەپێشیانەوە لەلای راستیانەوە رەهنومایيان دەکا. موسـوڵمانان لەوکاتـەدا کـە خـودا نووری دوورووەکان دەکوژێنێتەوە، لەخوا دەپارێنەوەو دەڵێن: خودایە! نووری ئێمە مەکوژێنەوە، مەمانخەرە تاریکی‌یەوە، ئەونورو روناکییەمان بۆ بێڵەوە تـا لـە پـردی سیراط دەپەڕینەوە، تاوانمان داپۆشەو لە هەڵەو خراپەکاریمان خۆش ببە، بەعەزاب

دان فەزح و ڕیسوامان مەکە، بێگومان تۆ ئەی خوای گەورەو تاک و تەنها؛ بەسەر هەموو شتێکدا خاوەنی دەسەڵاتی رەهاو باڵادەستی. هەرچی بتەوێ دەتوانی بێ ماندو بوون ئەنجامی بدەی. کە برێك لەو شتانە تەواو کردن و مانەوەی نووری ئێمەیەو لێخۆشبون لەتاوان و هێنانەدی ئاواتەکانی ئێمەیە، دەسا خودایە؛ بۆ خاتری شکۆمەندی خۆت دوعامان گیرا بکە.

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدْ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەی پێغەمبەر! بە شمشێر لەگەڵ کافرو بێ بڕوایان بجەنگە. لەگەڵ دووڕووەکانیشدا بە بەڵگەو بورهانی ئاشکرا بکەوەرە موناقەشەو دەمە دەمێوە، تەنگیان پێ هەڵچنەو وایان لێ بکە ناچاربن مل بدەن بۆ بانگەوازییەکەت، بە توندو تیژی لەگەڵیان بجوڵێوە، نەرم و نیانیان لەگەڵدا مەنوێنە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە شمشێر دژی کافرەکان جەنگاو زەبری گورچکبڕی لێدان، لەگەڵ مونافیقەکانیشدا ئەوپەڕی سیاسەت و موناقەشەی لەگەڵدا کردن، وا ڕێکەوتووە بۆ زێدە ڕیسواکردن و فشار خستنە سەریان لە مزگەوت دەری کردون یەکە یەکە ناوی هێناون وپێی فەرموون: بڕۆنەدەرەوە. ئەمە سزای دونیایانە، لە قیامەتیشدا شوێنی حەوانەوەیان ئاو ئاگری دۆزەخە، بەڕاستی دۆزەخ خراپ شوێنێکە کە تێیدا دەحەوێنەوە.

**تێبینی:**

زانایانی ئیسلام فەرموویانە ئەو تاوانانەی تۆبەیان لێ دەکرێ، یان مافی ئادەمییە یان مافی خودایە، یان مافی ئادەمی و مافی خودای تێدایە.

ئەگەر تاوانەکە مافی خودای تێدا پێشێل کرابوو وەکوو فەوتاندنی نوێژ (مەثەلا!) ئەوە تۆبەکە دروست نابێ هەتا لەگەڵ پەشیمانبونەوەکەدا فەرزەکەش قەزا نەکەیەوە. هەروا ئەگەر ڕۆژوی خواردبوو یان زەکاتی نەدابوو.

ئەگەر تاوانەکە لەوانە بوو کە: قیصاص و تۆڵەی تێدابێ و حەقی ئادەمیشی تێدا پێشێل کرابوو، وەکوو بوختان، ئەوە دەبێ بوختان پێکراو عەفووی بکاو بۆخۆشی پەشیمان بێتەوە لە کردەوەکەی و بڕیاربدا کەجارێکی تر بڕای بڕە شتی وا ناکاتەوە.

ئەگەر حەدو قیصاصەکە مافی ئادەمی تێدا نەبوو، وەکوو مەیخواردنەوە، ئەوە ئەگەر بەڕاستی پەشیمانبووەوەو تۆبەی نەصوحی کرد کیفایەتە.

ئەگەر تاوانەکە ستەمکردن لە ئادەمیزاد بوو، واتە: مافی ئادەمیزادی تێدا پێشێل کرابوو، ئەوە تۆبەکەی وەرناگیرێ هەتا مافی ئادەمیزادەکە ڕەت نەکاتەوەو قەرەبووی ستەمەکەی بۆ نەکاتەوە. خۆ ئەگەر نەیتوانی قەرەبووی بکاتەوە، دەبێ لە ناخی دڵیدا بڕیار بدا کە: بەزوترین کات ئەو مافە ڕەت دەکاتەوە.

ئەگەر تاوانەکەی وابوو زیانی بە موسوڵمانێك گەیاندبوو، دەبێ لەگەڵ تۆبەکردنەکەیدا زیانەکەش لابەرێ، ئەمجار داوای لێ بوردنی لێ بکا، ئەگەر عەفوی کرد تاوانەکەی لەسەر لادەچێ.

## چەند نمونەیەك لە ئافرەتی موسوڵمان و ئافرەتی کافر

﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾﴾

لەوەپێش پەروەدگار ئادەمیزادی هەڵنان بۆ تۆبەکردنو واز هێنان لە تاوان، بۆ جیهادو تێکۆشان لە ڕێگەی خودادا. ئەمجار دوو نمونەی ناوازەمان بۆ دێنێتەوە، یەکیان ئافرەتی کافرو بێ بڕوا، ئەوی تریان ئافرەتی موسوڵمانو خوداناس!

دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنْ اللَّهِ شَيْئاً وَقِيلَ ادْخُلا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ﴾ پەروەدگار نمونەیەکی هێناوەتەوە بۆ ئەوانەی کافرن کە: بریتییە لە هاوسەری نوحو هاوسەری لوط، ئەم دوو ئافرەتە کافرو بێ بڕوا بوون، لە ژێر نیکاحی دوو بەندەی راستاڵی ئێمەدا بوون، هاوسەرو خێزانیان بوون، شەوو رۆژ پەیوەندی هاوسەرییان بە یەکەوە هەبوو، کەچی ئەم دوو ژنە خیانەتیان لە مێردەکانیان کرد، بەمجۆرە لایەنگری کافرەکانیان دەکرد، نهێنییەکانی حەزرەتی نوحو حەزرەتی (لوط)یان بۆ کافرەکان ئاشکرا دەکرد، لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا بە شێوەی دووڕوویی دەجوڵانەوە، ئیمانیان پێ نەهێنان بڕوایان بە پەیامەکەیان نەکرد، لە پاشان خودا قاری لێ گرتنو حەزرەتی نووحو حەزرەتی لوط هیچ سودێکیان بۆیان نەبوو، نەیانتوانی عەزابی خودایان لێ دوور بخەنەوە، یان تۆزێ

عەزابەكەيان لەسەر سوك بكەن، نەخەير ئەوان هاوسەرى بوونيان بۆ پێغەمبەرى خودا دادى نەدان و چ كەڵكيان بۆيان نەبوو، بەهەر دوو ئافرەتەكان گوترا (واتە: پێيان دەگوترێ) لەكاتى توڕدانيان بۆ ناو دۆزەخ، دەبرۆنە ناو ئاگرى دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەدا كە بڕيار دراوە برۆنە ناوى. ئێوە لە پێڕى كافرو بێ بڕوايان بوون و ئەو ئاگرە سزاى كافرو تاوانبارانە.

ئەم ئايەتە بە شێوەيەكى ناڕاستەوخۆ هەڕەشەيە لە خاتو حەفصەو خاتو عائيشە، لەسەر ئەو هەڵوێستەيان كە گەلەكۆمەكييان لە پێغەمبەرﷺ كرد، دەيانترسێنێ لەوە ئەگەر نافەرمانى خودا بكەن پلەو پايەى هاوسەرييان بۆ پێغەمبەر ﷺ كەسەردارى پێغەمبەرانەو باشترين ئادەميزادە داديان نادا، پێيان رادەگەيەنێ كە: بە هاسەرييەتى پێغەمبەر نەنازن لە خۆيان بايى نەبن. چونكە هاوسەرێتييان بۆ پێغەمبەر ﷺ فريايان ناكەوێ ئەگەر كردەوەى خۆيان چاك نەبن و تۆبەى نەصوح نەكەن.

ئەمجار پەروەدگار نمونەيەكى تر دەهێنێتەوە بۆ ئەوانەى موسوڵمانن كە: بريتيە لە دوو ئافرەت بە پێچەوانەى دوو ئافرەتەكانى پێشەوە. ئەمانە خۆيان موسوڵمان و خوداپەرستن يەكێكيان هاوسەرەكەى ملهوڕو ستەمكارو كافرە، ئەويتريان ئافرەتێكە لەناو گەل و نەتەوەيەكى لە خودا ياخى و بێباوەڕدايە. وەڵێ تێكەڵاو بوونيان بە كافرو خودا نەناسان كار ناكاتە سەر بيرو باوەڕيان و ئيمانيان لە دەست نادەن. دەفەرموێ:

﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنْ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ پەروەدگار نمونەيەكى تر بەپەندو مەثەل دەهێنێتەوە بۆ موسوڵمانان، ئەويش بريتييە لەحاڵ و هەڵس و كەوتى خێزانى فيرعەون؛ ئاسييەى كچى موزاحيم، ئيمانى بە حەزرەتى موسا هێنا، ئەوەبوو كە: هەواڵى موعجيزەى عەصاكەى موساى بيست يەكسەر ئيمانى پێ

هێنا. ئیتر فیرعەون بەوە زۆر ڕقی هەڵساو کەوتە ئەشکەنجەدانی، زۆری هەوڵ لەگەڵ دا پەشیمان بێتەوە، بەڵام بێ سود بوو! ئەومبوو ئەم ئافرەتە خودا ناسە هەرچەند لە ژێر نیکاحی ستەمکارترین و کافرترین کەسدا بوو بەڵام چونکە ئیمانی بەهێزبوو هێرشی کوفرو ئیلحاد، تەعزیب و سزادان کاریان تێ نەکرد، بەڵکوو ئیمانی بەهێزتربوو. ئەمەش ئەو کاتە بوو کە: لە خودا پاڕایەوە وتی: خودایە! لە بەهەشتدا کۆشکێکم بۆ دروست بکەو لە فیرعەون و کردەوەکانی ڕزگارم بکە، لە گەل و نەتەوەی ستەمکارو بێ بڕوا پارێزگاریم بکە کارم تێ نەکەن.

بەڵێ فیرعەون کە ستەمکارترین و کافرترین ئەهلی سەر زەوی بوو، کوفرو بێ دینیەکەی نەیتوانی کاربکاتە سەر خاتو ئاسیەو بیرباوەڕی لەق نەبوو، بەڵکوو ئەو ئافرەتە خوداناسە شێرە ژنە، سور بوو لەسەر بیرباوەڕی خۆیو لەئاکامدا بە بەهەشت شادبوو.. بەڕاستی ئافرەتێکی نمونە بوو، موغریاتی ناوکۆشکی پاشایەتیو نازو نیعمەتی هەمە جۆرو زۆرو زەبەندەی ماڵی فیرعەون، ئەمجارە تەعزیب و سزادانی جۆراو جۆر تۆزقاڵێك کاری لە بیروباوەڕی ئەو خانمە نەکرد.

﴿وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِنْ رُوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنْ الْقَانِتِينَ﴾ پەروەدگار نمونەیەکی تر بۆ موسوڵمانان دێنێتەوە، ئەویش بریتییە لە مەریەمی کچی عیمران (دایکی عیسا) پەروەردگار ڕێزی دونیاو قیامەتی پێ بەخشی، لەسەردەمی خۆیدا ڕێزی لەهەموو ئافرەتانی جیهان زیاتر بوو، گەورەو سەروەری ئافرەتانی ڕۆژگاری خۆی بووە، هەرچەندە لەناو کۆمەڵگایەکی کافرو سەر ڕەق دا بوو، داوێنی حۆی پاراست، نموونەی داوێنپاکیو ئافرەتی سالار بوو، پەروەردگار فەرمانی بە جوبرەئیل کرد فوی پێدا بکا کە: (روح الأمين) فوی پیا کرد سکی بوو بە عیسا. واتە بەفەرمانی خودا حەزرەتی عیسا لەناوسکی مەریەمدا خولقا.

مەریەم تەصدیقی شەریعەتی خودای کرد باوەڕی بەو چەند وشەیە کرد کەلەلایەن جوبرەئیلەوە بیستی، کە بریتی بوو لەوەی کە جوبرائیل پێی گوت: ﴿إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ...﴾ (مريم/١٩) هەروەها بڕوای بەو پەڕاوانەش کرد کە: نازڵ کران بۆسەر حەزرەتی ئیدریس ئەو نامە ئاسمانیانەش کە: خودا نازڵی کردون بۆسەر پێغەمبەران. هەروەها بڕوای بەو هەواڵانە هەبوو کەبریتی بوو لەموژدەی عیسا پێ خەڵاتکردنو ڕێزپێ دانو تۆمار کردنی لەپێڕی (مقربين). ئەم ئافرەتە لە خانەوادەیەکی خودا پەرستو تاعەتکار بوو.

ئیمام ئەحمەد لە ئیبنو عەباسەوە ریوایەت دەکا: دەفەرمووی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أفضل نساء أهل الجنة: خديجة بنت خويلد و فاطمة بنت محمد، ومريم ابنة عمران، وأسية بنت مزاحم امراة فرعون﴾ ئاوهێنانی هاوسەری فیرعەون (ئاسیە)ی کچی موزاحیم لەتەك حەزرەتی مەریەمدا نیشانەی پلە بەرزیو ڕێزداری ئاسیەیە، ئەو دووئافرەتە هەردووکیان نمونەی ئافرەتی داوێنپاکی ڕەوشت بەرزو خودا پەرست بوون، پەروەردگار بەنموونە دەیانهێنێتەوە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەروا دەیانکاتە نموونە بۆ هەموو ئافرتێکی موسوڵمان لەهەموو چینەکانی ئادەمیزاد یەك لەدوای یەك.

**بە پشتیوانی خودا ڕۆژی ٢٠٠٢/١٢/١١ لەپاکنووسی ئەم جزمە بوومەوە، خودا یاربێ دووجزمەکەی تریش تەواو دەبن.**

**مەلا محمود گەلاڵی**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الملك) تبارك

(سورة تبارك) یان (سورة الملك). سی ئایەتەو دوای سورەتی (الطور) نازڵ بووە، لەسورەتە مەککەییەکانە.

ناونراوە سورەتی (الملك) چونکە بە تەعظیمو تەقدیسی خودا دەستی پێ کردووە. ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە موڵكو سەڵتەنەتی هەموو بوونەوەر بەدەست خودایەو دەسەڵاتی ڕەهای هەیە. بە ویستی خۆی لە بوونەوەردا. ئاڵوگۆڕ دەکاو چۆنی بوێ ئاوا هەڵیان دەسوڕێنێ. ژیان دەبەخشێو دەمرێنێ، هەندێ کەس باڵا دەست دەکاو هەندێ زەلیل، هەندێ دەوڵەمەند دەکاو هەندێ هەژار، دەبەخشێو دەگرێتەوە.

ئەم سورەتە پێشی دەوترێ (الواقیة)و (المنجیة) چونکە خوێنەری لەعەزابی قەبر دەپارێزێو شەفاعەتی بۆ دەکا، ئیبنو عەباس ناوی سورەتی (المجادلة)ی لێ ناوە، چونکە لە گۆڕدا داکۆکی لە خوێنەرەکەی دەکا.

سورەتی (الملك) وەکوو باقی سورەتە مەککیەکانی تر گرنگی دەدا بەبنەمای عەقیدە: کە بریتییە لە (هەبونی خوداو تاكو تەنهایی زاتی پاکیو دەسەڵاتی ڕەهای، هەروەها ڕابوونی ڕۆژی قیامەتو زیندووبونەوە).

سەرەتا باسی تەمجیدو گەورەیی خودا دەکا، تاكو تەنیایی لە مڵكو سەڵتەنەتیدا، باڵادەستی بەسەر کەونو کائیناتدا، ئەمجا بەڵگە لەسەر هەبوونو دەسەڵاتی خودا دێنێتەوە بەوەی کە حەوت ئاسمانەکانی بەدی هێناونو ئاسمانی دونیای بەئەستێرە ڕازاندۆتەوە، ئەو ئەستێرانەی ڕام کردون بۆ ڕاوەدونانی شەیاتینی. ..

هەندێك لەدیاردەکانی دەسەڵاتی خودا ئامادەکردنی دۆزەخە بۆ تاوانباران، ئامادە کردنی بەهەشتە بۆ خواپەرستان، هەروەها بڕێکی تر لەنموونەی

دەسەڵاتو زانیاری رەهای، ئاگادارییەتی بەسەر هەموو نهێنیو ئاشکرایەکدا، دروستکردنی ئادەمیزادو رزقو رۆزی پێدانیەتی. هەروا ڕاگرتنی ئاسمانە لەوەی بڕوخێ بەسەر زەویدا، هەروەها پارێزگاری ئادەمیزاد دەکا لەوەی زەوی قوتیان بدا.

بەکورتی ئەم سورەتە لە تەوەری سەلماندنی هەبوونی خوداو تاکو تەنهایی پەروەردگار لەزاتو صیفاتیدا دەسوڕێتەوە، ئاماژە بۆ زانیاریو دەسەڵاتی بێ سنوری خودا دەکا، باسی ڕابوونی قیامەتو زیندوبوونەوەی ئادەمیزاد دەکا، لە عەزابو تەنگو چەڵەمەی قیامەت دەیانترسێنێ، باسی نازو نیعمەتی جۆراوجۆری خۆی دەکا بەسەر بەندەکانیدا.

ئایەتی سەرەتای سورەتەکە کلیلو دەروازەیەکە لێیەوە دەچینە ناویەوە، ئەو ئایەتە کورتە هەموو مانای سورەتەکەی لەخۆ گرتووە، هەرچی حەقائیقو وەقائیعێك کە لەسورەتەکەدا باس کراوە، لەو ئایەتە کورتەدا ئاماژەی پێ کراوە.

خوێنەری هێژا سەرنجی ئایەتی یەکەمی سورەتەکە بدەو لێی وردبەرەوە ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بۆت دەردەکەوێ: کە لەحەقیقەتی موڵكو سەڵتەنەتەوەو لەحەقیقەتی دەسەڵاتەوە هەموو دیمەنەکانی ئاماژەپێکراوی ناو سورەتەکە بەرجەستەبوون، لە موڵكو قودرەتی خوداوە مردنو ژیان سەریان هەڵداوە، دروستکردنی ئاسمانەکانو جوانکردنیان بەئەستێرەو بەکارهێنانی ئەستێرە بۆ ڕاوەدونانی شەیاتینی دیاردەو نەتیجەی ئەو دوو سیفەتە جەلالییەی پەروەردگارن.

هەروەها ئامادەکردنی دۆزەخ بەهەموو شێوەو چەندییەتو چۆنیەتییەوە، هەروەها ئاگاداریی خودا بەسەر هەموو نهێنیو ئاشکرایەکدا، ڕامکردنی زەوی بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بتوانن لەسەری هەڵبکەن، ڕاگرتنی باڵندە بەحەواوە، ڕژاندنی رزقو رۆزی بەسەر زیندەوەراندا، بەخشینی ئامێری بیستنو بینینو ئامێری تێگەیشتن، بڵاوکردنەوەی ئادەمیزاد بەناو زەویدا، پاشان مراندنو

زیندوکردنەوەیان، زانیاری دەربارەی قیامەت و کاتی هاتنی، عەزابدانی کافرەکان و رژاندنی ئەو ئاوەی مایەی ژیانی زیندەوەرانە لەسەر زەوی.. ئەمانەو گەلێ شتی تر کە لەسورەتەکەدا ئاماژەیان پێ کراوە برێکن لەدیاردەو موڵك و دەسەلاتی خودا.

بەکورتی هەموو حەقائیقەکانی ناو سورەتەکەو سەرباسەکانی، هەموو دیمەن و رەنگدانەوەیەکیان، لەڕوانگەی مانای یەکەم ئایەتی سورەتەکەوە سەرچاوەی گرتووە شەرح و راڤەی ئەو دوو سێ رستەو وشانەن.

## برێ لەبەڵگەو نیشانەی دەسەلاتی خودا

﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَـٰنِ مِن تَفَـٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَـٰبِيحَ وَجَعَلْنَـٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾﴾

﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ پاكو مونەززەهە لەهەموو عەیبو خەوشێك ئەو خودایەی موڵكو سەڵتەنەتی هەموو بوونەوەری بەدەستە، بەویستی خۆی بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ، ئاڵو گۆڕی تێدا دەكا. دەسەڵاتو توانای رەهای هەیە، هیچی لێ یاخی نابێ، هەندێ كەس عەزیزو هەندێ زەلیل دەكا، هەندێ بەرز دەكاو هەندێ نزم، هەندێ دەوڵەمەند دەكاو هەندێ نەدارا، ژیان دەبەخشێ بەئەمو ئەو دەمرێنێ، كەس نیە حوكمو بڕیاری هەڵوەشێنێتەوە، یان بتوانێ كۆسپو تەگەرە بخاتە بەردەم ویستەكانی، هەموو كارێكی لەحیكمەتو داناییەوە هەڵدەقوڵێو هەموو بڕیارێكی بەجێیەو بەسەر هەموو شتێكدا باڵادەستو فەرمانڕەوایە.

﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ خودایەكی وەهایە مردنو ژیانی بەدیهێناوە، لەئەزەلدا نەخشەی كێشاونو مەزەندەی گرتوون.

مردن: مردنی پێش ژیانی دونیاو مردنی دواژیانیش دەگرێتەوە. ژیانیش شامیلە بۆ ژیانی دونیاو ژیانی قیامەتیش، هەردوو جۆرە مردنەكەو هەردوك جۆرە ژیانەكە دروستكراوی خودان، خۆی لەئەزەلدا ماوەی مردنو ژیانی هەموو زیندەوەرێكی دەست نیشان كردوە.

خودایەكی وەهایە ئادەمیزادی دروستكردوە عەقڵو هۆشی پێ بەخشیوە، بۆ ئەوەی مانای ئەركو پێداویستی سەرشانیان بزاننو ئەنجامی بدەن، بۆ ئەوەی دەربكەوێ كێتان كردەوەی جوانو پەسەند ئەنجام دەداو پاداشتی لەسەر وەربگرنەوە، بۆ ئەوەی ئەوەی لەزانیاریی خودادا چەسپاوە لەئەزەلدا بێتە وجود، بیاناسێنێ: كێیان طاعەتی زیاترەو دڵسۆزترە بۆ خوداو كردەوەی باشترە. خودا باڵا دەستو خاوەن دەسەڵاتە هیچی لێ یاخی نابێو هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ. لێخۆشبوونی زۆرەو تاوانپۆشە، تۆبە قبوڵ دەكا لەوانەی لەتاوانەكانیان پەشیمان دەبنەوە واتە: پەروەردگار وێڕای باڵادەستیو دەسەڵاتی رەهای خاوەنی رەحمو

بەزەییەو لێخۆشبوونی بێ شمارە. . وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾(الحجر/٤٩).

ئایەتەکە بەڕونی ئەوە دەگەیەنێ: کە مردن ئەمرێکی وجوودیەو دروستکراوە، بەپێچەوانەی ئەوانەوە کە دەڵێن: مردن ئەمرێکی عەدەمییە.. .

مردن بریتییە لە دابڕانی گیان لەجەستەو لێ جیابوونەوەی. ژیانیش بریتییە لەپەیوەست بوونی گیان بەجەستەوە. دروستکردنی ژیان بریتییە لەبەدیهێنانی رۆح لەو شتانەدا کە ئامادەباشی ئەوەیان تێدایە گیان پەیوەندییان پێوەبکا.. .

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعْ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە حەوت تەبەقەی ئاسمانەکانی بەدیهێناون، چین لەسەر چین، هەموو ئاسمانێك لە ئاسمانێکی تر جودایە، بۆشاییەکی زۆریان لەنێوان دایە، هەر خودا دەزانێ نێوانیان چەندەو چۆنە.

ئەی بێنەر! ئەتۆ لەدروستکراوانی خودادا هیچ ناڕێکو پێکیەك نابینی، دەجارێکی تر چاو بگێڕەوە بەدروستکراوانی خودا دا ئایا هیچ درزو قەڵشاوییەك دەبینی؟ نەخێر چەندێك چاوبگێڕی هیچ درزو کونو کەلەبەرو ناڕێكو پێکیەك نابینی.

ئەمەش نیشانەی گەورەیی و بەتوانایی بەدیهێنەرەکەیانە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە خودای بەدیهێنەر خاوەنی زانیاری رەهاو توانای بێ سنوورە، هەموو کردەوەیەکی بێ عەیبو لەککەیە، کاردروستو کاربەجێیە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى﴾(الرعد/٢).

جا کە تۆ لەسەرنجدانو چاوگێڕانی جاری پێشووتدا هیچ لەکەو عەیبێکت نەبینی، کۆڵ مەدە بەڵکوو ﴿ثُمَّ ارْجِعْ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئاً وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ پاشان سەرنج بدەرەوە، هەمیسان ورد بەرەوە، جار لەدوای جار

سەرنجدانەکەت دووبارەو سێ بارە بکەرەوە، چاوت دەگەڕێتەوە بۆ لات بەماندوویی‌و سەرشۆڕی، هیچی لەو شتانە دەست ناکەوێ کە بۆی گەڕاوە، هیچ عەیب‌و کەم‌و کوڕییەك لەدیمەنی ئاسمان نابینێ، هەر ماندوبوون‌و پەککەوتەیی بۆ دەمێنێتەوە، بەکورتی هیچ کەس‌و بەهیچ جۆرێك چەندێك سەرنج بدات‌و لەئاسمان‌وردبێتەوە، نارێك‌و پێکی نابینێ، کەواتە باملکەچبی‌و گوێڕایەڵی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی خودای زاناو داناو باڵادەست بێ.

﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ﴾ بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان بە ئەستێرە رازاندۆتەوە، ئاسمانی نزیك لەئێوەمان بەئەستێرەی جۆراو جۆر ئارایشت داوە.

بێگومان دیمەنی ئەستێرەکان لەئاسماندا جوان‌و قەشەنگە، جوانیەکەیان سەرنج راکێشە هەردەمەو جۆرە جوانیەك دەنوێنن، بەگوێرەی کاتەکان جوانیەکەیان دەگۆڕێ، دەمی بەیانی جیاوازە لەگەڵ سەرەتای شەودا، شەوی مانگەشەو جوداوازە لەگەڵ شەوی تاریکدا، شەوی هەساو جوداوازە لەگەڵ شەوی هەورو هەڵا، بەڵکوو سات بەسات دیمەنەکەیان دەگۆڕێ، هەموو کاتەکانیش جوان‌و رازاوەن، ئەستێرەی واهەیە بەتاقەومیە، ئەستێرەی واهەیە لێك نزیکن‌و دوو دوو دەڵێی دوو چاوی کەژاڵن دەدرەوشێنەوە، هی واهەیە کۆن دەڵێی هێشوە تری زلکەن.

هەتا سەیری ئاسمان بکەی‌و لەو ئەستێرانە وردبیتەوە جوانییان لێدەتکێ‌و فەرەح بەخشن، تێکڕای ئەستێرەکان بەکۆو بڵاویان، دەڵێی لەکۆڕی رابواردن‌و فیستیڤاڵی ئاسمانی‌دا شەو بەخەبەرن‌و جوانی بەیەکتر دەبەخشن‌و پێکەوە ئاخاوتنیانە. دوودوو سێ سێ گفت‌وگۆ دەکەن‌و سەرگوزەشتەو نەزیلان بۆ یەکتری دەگێڕنەوە.

وێڕای جوانی‌و رازاندنەوەیان بۆ ئاسمان، گەڵێ سودی تریشیان هەیە، وەکوو ئەوە تیرە ئەستێرەیان لێ دەبێتەوەو راوەدوی شەیاتینیەکان دەنێ، هەرکات

شەیاتینی بیانەوێ نزیك ببنەوە لەئاسمانو هەواڵی (ملأ الأعلى) بدزن، بەتیر ئەستێرە رەجم دەكرێن، ئێمە لەرۆژی قیامەتدا عەزابی كوشندەمان بۆ ئەوانە ئامادەكردوە، پاش ئەوەی لەدونیادا بەتیر ئەستێرە دەیانسوتێنین لە قیامەتیشدا دەیانخەینە ناو ئاگری دۆزەخەوە، چونكە خۆیان گومڕانو كەسانی دیكە گومڕا دەكەن.

سودێكی تری ئەستێرەكان ئەوەیە، ئادەمیزاد لەناو دەریاو ساراو بیاباندا، رێڕەوی خۆیانی پێ دەدۆزنەوە. وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَلامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾(النحل/١٦) لەسورەتی (الصافات) دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ، وَحِفْظاً مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ، لايسمّعون لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ، دُحُوراً وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ، إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾(الصافات/٦-١٠).

## سزادانی كافرو یاخی بوان

﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۖ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی بەیانکرد کە شەیاتینییەکان وێڕای ئەوەی بەتیر ئەستێرە لە دونیادا دەیانسووتێنێ، لە قیامەتیشدا سزای سەختی بۆ داناون، ئەمجار هەڕەشەی عەزابی دۆزەخی ئاڕاستەی هەموو کافرو بێ بڕوایەك دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئامادەمان کردوە بۆ هەموو ئەوانەی ئینکاری هەبوون و تاك و تەنهایی خودا دەکەن، پێغەمبەرانی بەدرۆدەخەنەوە لە ئادەمیزادو جندۆکە عەزابی دۆزەخ، بەڕاستی خراپ شوێنێکە بۆی دەچن و تێیدا دەحەوێنەوە.

ئەمجار چوار دیاردەو رەوشتی ئاگری دۆزەخ دیاری دەکاو دەفەرموێ:

١و٢- ﴿إِذَا أُلْقُوا فِيهَا سَمِعُوا لَهَا شَهِيقاً وَهِيَ تَفُورُ﴾ هەرکاتێ بێ باوەڕان توڕدەدرێنە ناو دۆزەخەوە دۆزەخ دەنگێکی ناخۆشی لێ دەبیسترێ دەڵێی لوشکە لوشك و پرمەو سەرەتای زەڕینی گوێدرێژە: کە ئاڵف و ئالیکیان لێ نزیك دەکەنەوە، چەند ئەو وڵاخانە لەکاتی برسییەتیدا تامەزرۆی ئاڵفو ئالیکن، دۆزەخیش ئەوەندە بۆ تاوانباران تامەزرۆیە؛ یان دەنگێکی ناخۆشی رقاوی لێ دێ و لەرقاندا خۆی دەخواتەوەو لرفەی دێ، هەمیشە وەکوو مەنجەڵ دەکوڵێ!!

دیمەنەکە تابڵێی سەرنج ڕاکێشە، دۆزەخ وانیشان دەدا شتێکی زیندووەو لەداخا پیش دەخواتەوە، پرمەو لوشکەی دێ لەناو خۆیا وەکوو مەنجەڵ دەکوڵێ و ناخی پڕە لەرق و کینە بۆ بێ باوەڕان، لەداخا خەریکە لەتلەت بێ، وێدەچێ تەعبیرەکە مەجازی بێ و نیشاندانی دیمەنی رقاویی دۆزەخ بێ و مەبەست ئامادەکردنی سزای سەخت بێ بۆ بێ باوەڕان، وێشدەچێ تەعبیرەکە حەقیقەت بێ، چونکە بەگوێرەی قورئان هەموو شتێك جۆرە گیان و جۆرە هەست و شعورێکی هەیە تایبەت بەخۆیەوە، هەموو مەخلوقاتێك خودای خۆی دەناسێ و تەسبیح و تەمجیدی دەکاو بەندایەتی پەروەردگاری دەکا، هەڵدەسڵەمێتەوە کە دەبینێ ئادەمیزاد بڕوا

بەهەبوونی بەدیهێنەری ناکا، رقی هەڵدەستێ: کەپێچەوانەی سروشت هەڵس و کەوت دەکاو خودای خۆی ناناسێ.

بەگوێرەی دەقی قورئان بونەوەر هەمووی تەسبیح و تەمجیدی خودا دەکا! ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ (الإسراء/١٤). دەی ئەگەر لەناو بونەوەری پان و پۆڕدا زێدە لەو هەموو حەشاماتە بەدیارو نادیاریەوە، کۆمەڵە ئادەمیزادێك لەکۆمەڵ تەرەبێن و هاوکاری بوونەوەر نەکەن لەخودا ناسیدا، دیارە ئەو مەخلوقاتانە رقیان لەو ئادەمیزادانە هەڵدەسێ و لەرقاندا لەوانەیە لەتو پەت بن. ئەی ئەوە نیە قورئان لەشوێنێکی تردا ئەم راستییە رادەگەیەنێ و دەفەرموێ: ﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدّاً ، أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَداً﴾(مريم/٩٠-٩١).

٣- دۆزەخ هێندە رق و کینەی بۆ ئەو کافرانە لەناخدا کەڵەکە بووە ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنْ الْغَيْظِ﴾ نزیکە دۆزەخ لەرق و کینەو داخ لەدڵی خۆی لەکافرەکان لێك بێتەوەو شەق و پەق بێ.

٤- ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ؟﴾ هەرکاتێك کۆمەڵێك لەکافرەکان توڕبدرێنە دۆزەخەوە کاربەدەستان و زەبانییەکانی دۆزەخ پرسیاری گاڵتە ئامێزو سەرزەنشت شێوازیان لێ دەکەن و پێیان دەڵێن: ئەرێ لەژیانی دونیاتاندا پێغەمبەر نەهاتە سەرتان و لەم رۆژە نەیترساندن؟ پێی نەگوتن زینوبوونەوە هەیەو سزاو پاداشی کردەوەکانتان وەردەگرنەوە؟ کافرەکان وەڵام دەدەنەوەو راستی دەدرکێنن. ﴿قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ فِي ضَلالٍ كَبِيرٍ﴾ دەڵێن: بێگومان پێغەمبەری خودا هاتە ناومان و ئامۆژگاری کردین و لەعەزابی ئەم رۆژەی ترساندین، ئێمە بڕوامان پێ نەکردو بەدرۆمان خستەوە وتمان: خودا هیچ پەیامی نازڵ نەکردووە هیچ ئادەمیزادێکی نەکردۆتە پێغەمبەرو فروستادەی خۆی، تۆ کەلافی پێغەمبەریتی لێ دەدەی

درۆدەکەی‌و هیچ نیگاو سروشێکت لەبارەی غەیب‌و رابوونی قیامەت‌و زیندوبوونەوەی دوارۆژو شەریعەت‌و یاسای ئاسمانیت بۆ نەهاتووە، ئێوە ئەی کۆمەڵی پێغەمبەران ئێوە لەم دەعوایەتاندا کە دەڵێن: ئێمە رەوانەکراوی پەروەردگارین بەهەڵە چون‌و لەحەق‌و راستی لاتان داوە، گومڕاو سەرلێ شێواون.

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾(الزمر/٧١).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر دادپەروەری خودا، هیچ کەس‌و کۆمەڵێك عەزاب نادا تا ئیقامەی حوججەیان لەسەر نەکاو پێغەمبەریان بۆ نەنێرێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الأسراء/١٥).

ئەمجار کافرەکان دان بەتاوانباری خۆیاندا دەنێن‌و ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ دەڵێن: ئێمە سەرزەنشی خۆمان دەکەین‌و پەشیمانین لە هەڵوێست‌و کردەوەمان، ئەگەر ئێمە ئامۆژگاری پێغەمبەرانمان ببیستایەو گوێڕایەڵی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانیان بوینایە، عەقڵ‌و هۆشمان ببوایە ئامادەباشی هیدایەت وەرگرتنمان تێدا بوایە، لەئەهلی دۆزەخ نەدەبووین، لەدونیا کافر نەدەبووین‌و بەگومڕایی ژیانمان بەسەر نەدەبردو ئێستاش نەدەبووینە سوتەمەنی دۆزەخ‌و ئەم جەحەندەمە نەدەبووە شوێن‌و جێگامان. ﴿فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقاً لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ دان دەنێن بەتاوانەکانیانداو خۆیان بەشیاوی ئەوە دەزانن عەزابی دۆزەخ بچێژن، دەسا دووری لە خودا، لەرەحمەتی خودا بۆ ئەوانە بێ: کە ئەهلی دۆزەخن.. ئای هاوار بۆ کەسانێ خودا دوعای شەڕیان لێ بکا، وای بۆ کەسانێ خودا لێیان نارازی بێ‌و لەرەحمەت‌و بەزەیی خۆی دووریان بخاتەوە.

هەڵبەتە خودا ستەم لەبەندەکانی ناکا، ئادەمیزاد بۆ خۆی ستەم لەخۆی دەکا. خودا پێغەمبەرانی ناردون بانگەوازی ئادەمیزادیان کردوە بۆ بڕواهێنان، بەڵگەو

نیشانەی جۆراو جۆری لە بونەوەردا داناوە، عەقڵ و هۆشی پێداون بۆ ئەوەی بەراورد بکەن و بیربکەنەوە، هەرچی خودا داوای دەکا لەبەندەکانی دەتوانرێ ئەنجام بدرێ، ئەرکێکی وانیە لەتوانادا نەبێ ئەنجام بدرێ، خودا شتێك داوا ناکا لەبەندەکانی نەتوانن رەدامی بێنن و لە وزەیاندا نەبێ. ئەو ئەرکانەی خستویەتیە سەرشانی بەندەکانی راست و گونجاون لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاددا، دەی کەسێ وێڕای ئەوە ئیمان نەهێنی و ملکەچی شەریعەت و یاسای خودا نەبێ، دیارە مێشك بۆش و کەللە پوچە، بێ نرخ و نەفام و کەودەنە... شیاوی ئەوەیە لەدۆزەخدا ببێتە سوتەمەنی و بۆ هەتا هەتایە سزای سەخت بچێژێ.

## وادەدان بە خوداپەرستان بە لێخۆش بوون و هەڕەشەکردن لەکافرەکان

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿١٢﴾ وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾﴾

دوای هەڕەشەکردن لە کافرەکان، پەروەردگار وادەی لێخۆشبون دەدا بەخوداناسان و ئەوە رادەگەیەنێ: کە پاداشی باشیان دەداتی و دەیانخاتە بەهەشتی

رازاوەوە. ئەمجار دەگەڕێتەوە سەر هەڕەشەکردن لە کافرەکانو ئەومیان بەگوێدا دەدا، کە ئاگاداری هەموو نهێنیو ئاشکرایەکەو هیچی لێ گوم نابێ دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ بێگومان ئەوانەی لەسزای خودای خۆیان دەترسنو نەشیان دیوە، بڕوایان بەتاكو تەنهایی خودا هێناوەو بەندایەتی دەکەن لەترسی عەزابی، بەنهێنیو بەئاشکرا ترسی خودایان لەدڵدایە، ڕیبابازیی ناکەن، کەسیش ئاگای لێ نەبێ، لەترسی خودا تاوان ئەنجام نادەن، کەتاعەت دەکەن بۆ خودای دەکەن کە تاوان ناکەن لەترسی خودایە ئەوانە لێخۆشبوونی خودایان هەیەو تاوانیان چاوپۆشی لێ دەکرێ، پاداشی باشی بەهەشتیان دەدرێتێ.

لەفەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (سبعة يظلهم الله في ظل عرشه، يوم لاظل الا ظله. . . ) حەوت کەس، حەوت تاقم ڕۆژی قیامەت خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرش کە هیچ سێبەرێکی تر نیە لەو ڕۆژەدا، یەکێ لەو حەوت کەسە ( رجل دعته امرأة ذات منصب و جمال، فقال اني أخاف الله) پیاوێك لەشوێنێکی چۆڵو هۆڵ، ئافرەتێکی خاوەن جێگاو ڕێگا، داوای دەست لەگەڵ تێکەڵکردنی لێ بکا، ئەویش داواکەی ڕەت بکاتەوەو بڵێ: من ترسی خودام هەیەو شتیوا ناکەم.. .

﴿وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ ئەی بەندەکانم یەکسانە ئێوە قسەکانتان بەنهێنی بکەن یان بەئاشکرا، خودا ئاگادارەو دەزانێ چی دەڵێنو نیازو مەبەستتان چیە، نەك هەرئەوە بەڵکوو خودا ئاگای لەخەتەراتی دڵەو هیچی لێ گوم نابێ، بەکورتی گوفتارو کرداری ئێوە بەهەر شێوەیەك بێتەدی خودا ئاگای لێیانەو پێیان دەزانێ. کەوابێ ئێوە خۆتان لەتاوان بپارێزن بەنهێنیو بەئاشکرا چونکە بەهەموو جۆرێك خودا ئاگای لێیە.

﴿أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ مەگەر خوا نازانێ كێی دروست كردووەو چۆنی دروست كردووە، لە كاتێكدا زۆر وردبینو بە ئاگایە؟ كەوابوو لە خوا بترسن، پیلان بۆ موسوڵمانان مەگێڕن نە بەنهێنیو نە بەئاشكرا.

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ بێگومان خودا ئەو خودایەیە؛ كە زەوی بۆ رام كردونو بەئاسانی دەتوانن لەسەری هەڵبكەنو گونجاوبێ بۆ تێدا ژیان، كێوی تێدا چەقاندون بۆ ئەوەی لەنگەر بگرێ، سەرچاوەو كانیاوی تێدا هەڵقوڵاندون، رێگاوبانی تێدا كردونەوەو ئامادەی كردوە بۆ سود لێ وەرگرتنو تێدا ژیان، كشتوكاڵی تێدا بەدیهێناوە، بەروبوم بەدی دەهێنێ..

دەی ئێوەش پێیدا بگەڕێنو كونو كەلەبەری بپشكنن، هەوڵی بەدەستهێنانی رزقو رۆزیی تێدا بدەن، هاتوچۆی بازرگانیو گەشتو گوزار ئەنجام بدەن، هەرچی دەستتان بكەوێ لە خوداوەیەو بەیارمەتیدانی ئەو دەستەبەر دەبێ، لە رزق و رۆزی پەروەردگار بخۆنو شوكرو سوپاسی بكەن، لەسەر ئەوە ئەو رزقو رۆزییەی بۆ بەدیهێناونو واشی لێ كردوە سودی لێ وەربگرن، دەسەڵاتی ئەوەی پێداون خێرو بێری ناو زەوی بۆ خۆتان دەستەبەر بكەن. دەی هەموو كاتێ خوداتان لەبیربێو لەیادی مەكەن، دڵسۆزانە بەندایەتی بۆ بكەن، سەرەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەوە. ئەو زیندوتان دەكاتەوەو لەگۆڕەكانتان راستتان دەكاتەوە، كەوابێ خۆتان بپارێزن لەكوفرو تاوان بەئاشكراو بەنهێنی بەهیچ كلۆجێك نافەرمانی خودا مەكەن !!

**هەڕەشە لە بێبڕوایانو پەند وەرگرتن لە بەسەرهاتی گەلە پێشینەکان**

﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾﴾

لەوەپێش بەڵگەی لەسەر زانیاری رەهاو دەسەڵاتی بێ سنوری خودا هێنایەوە، بۆ ترساندنی کافرو بێ بڕوایان، ئەمجار بەڵگەی تری هێنایەوە بەمەبەستی هەڕەشە کردن لێیانو دەفەرموێ:

﴿أَأَمِنتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخسِفَ بِكُمْ الآرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ ئایا دڵنیایانو ناترسن لەوەی کە بە فەرمانی خودا زەوی قوتتان بداو بەناخیدا بڕۆنە خوارێ ! وەکوو چۆن قارونی بەناو سکی خۆیدا بردە خوار! ئەو زەوییەی کە ئێستا لەروانگەی رەحمەتی خۆیەوە بۆ ئێوەی رام کردووەو دەتوانن کونو قوژبنی بپشکنن، ناترسن لەوەی کە لە ناکاوێك بەفەرمانی خودا بکەوێتە جونبوشو تەکان دانو هاتوچۆی نائاسایی بەجۆرێك نەتوانن خۆتانی لەسەربگرن؟!

مەبەست بەم جۆرە پرسیارانە هەڕەشەکردنەو هەواڵدانە بەوە: کە خودا دەتوانێ تەعزیبی بێ بڕوایان بدا بەجۆرەها عەزاب، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَاباً مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾(الأنعام/٦٥). وەلێ لەروانگەی رەحمەتی بێ پایانی خۆیەوە پەروەردگار

چاوپۆشی لەتاوانی بەندەکانی دەکاو دەسبەجێ سزایان ناداو دوایان دەخا بۆ رۆژی قیامەت، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ وَلَكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيراً﴾(فاطر/٤٥). ئیتر رۆژی قیامەت هەموو کەس بەگوێرەی کردەوەکانی خۆی سزاو پاداشتی دەدرێتەوە کەس تۆزقالێك ستەمی لێ ناکرێ.

﴿أَمْ أَمِنتُم مَّنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِباً فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ!﴾ ئایا ئێوە: کە بڕواتان نیەو نافەرمانی خودا دەکەن، دڵنیان لەو خودایەی لەئاسمانە (وەکوو دەڵێن)، ئەمینن لەدەسەڵاتو قەهرو غەزەبی: کەبەردە بارانتان بکاو رەشەبای بەهێز بنێرێتە سەرتان‌و لەناوتان بەرێ، وەکوو چۆن لەو جۆرە عەزابەی ناردە سەر گەلی لوطو ئەصحابولفیل؟!

جا کە عەزابی لەو جۆرە یەخەی گرتن ئەو کاتە دەزانن سزای من بۆ تاوانباران چۆنەو چەند توندو تیژە وەلێ ئەو دەمە زانینی چۆنیەتی عەزاب هیچ سودتان پێ ناگەیەنێ کەس نیە بتوانێ پشتگیریتان بکا وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ الْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِباً ثُمَّ لاَ تَجِدُواْ لَكُمْ وَكِيلاً﴾(الأسراء/٦٨).

ئەمجار سزادان‌و لەناوچونی گەلەپێشینەکان باس دەکا، بۆ ئەوەی کافرەکان بترسێنێ لەهەمان سەرەنجام، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان.. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ ئەو کافرانەی لەپێش رۆژگاری ئەماندا لەژیا دا بوون‌و پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوەو ستەم‌و ستەمکارییان نواند، خودا بەعەزابی توندو تیژ لەناوی بردن، سەیری سەرەنجامی گەلی عادو ثەمود بکەن، چۆن عەزابی خودا دەوری گرتن‌و لەناوی بردن، بیری لێ بکەنەوە چ عەزابێکیان چەشت؟

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلاَّ الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾ ئەوە بۆچی ئەوانە ناڕوانن بۆ باڵندەكان لەژوریانەوە، دەمێ باڵیان لێك دەدەن و كاتێكیش ڕاست باڵەكانیان ڕادەگرن، جگە لەخودا كەس نیە بتوانێ ئەو باڵندانە بەحەواوە بهێڵێتەوە، خودا بەدەسەڵاتی خۆی كەش و هەوایەكی خولقاندوە، ئەو باڵندەیە لەهەوادا بفڕێ و خۆی ڕاگیربكا، یاساو نیزامێكی بۆ فەراهەم هێناون، بتوانن خۆیان بەحەواوە بگرن و نەكەونە خوار بێگومان خودا زاناو بینایە بەكاروباری هەموو شتێك، ئاگاداری وردو درشتی بوونەوەرە، هیچی لێ گوم نیە. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْاْ إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاء مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلاَّ اللّهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾(النحل/٧٩).

## سەرزەنشتكردنی موشریكەكان و سەلماندنی دەسەڵاتی خودا

﴿ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا

ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٢٦﴾ فَلَمَّا رَأَوۡهُ زُلۡفَةٗ سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾

لەوەپێش بەڵگەی لەسەر دەسەڵاتی رەهای پەروەردگار هێنایەوە: کە برێك لەدیاردەی ئەو دەسەڵاتە راگیرکردنی باڵندەکانە لەحەوادا ئەمجار سەرزەنشتی موشریکەکان دەکا لەسەر بێ باوەڕیو بتپەرستییان، رەددی بیروباوەڕیان دەداتەوە، ئەوە رادەگەیەنێ: کە کەماڵی قودرەتو باڵادەستی هەر هی خودایەو، خۆی رزقو رۆژی دەرە، هەر خۆی ئادەمیزادی دروستکردوەو ئامێری بیستنو دیتنی پێ بەخشیوە، عەقڵو هۆشو دڵو دەرونی بۆ فەراهەم هێناوە، هەر خۆی دەزانێ کەی قیامەت رادەبێ.

دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ هَذَا الَّذِي هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ الرَّحْمَنِ إِنِ الْكَافِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ﴾ ئایا کێیە ئەو سەربازو یارمەتیدەرە: کە کۆمەکی ئێوە دەکاو لەسزای خودا دەتانپارێزێ، کێیە بتوانێ ئەگەر خودا عەزابی بۆ ئێوە نارد بەرگریتان لێ بکا؟ لەراستیدا جگە لەخودا کەس نیە سەرپەرشتیارو یارمەتیدەرو پارێزەر. کەوابێ کافرەکان لەخشتە براونو شەیتان فێڵی لێ کردون، هەڵی خەڵەتاندون بەوە کەوادەی پێداون خودا عەزابیان بۆ نانێرێ بۆ خۆی بەرعودەی تاوانەکانیان دەبێ... ﴿أَمَّنْ هَذَا الَّذِي يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُ بَل لَّجُّوا فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ﴾ کێیە ئەو کەسەی ئەگەر خودا رزقو رۆژی خۆی لێ گرتنەوە ئەو بتوانێ رزقو رۆژییان بۆ فەراهەم بێنێ؟ واتە: کەس نیە بتوانێ ببەخشیو بگرێتەوەو رزقو رۆژیی بدا، یارمەتیدەربێ جگە لەخودا، هەر خودایە دەتوانێ ئەو کارانە ئەنجام بداو تاكو تەنهاو بێ شەریكو بێ هاوەڵە، ئەوان ئەو راستیە دەزانن، لێیان رونە ئەو بتانەی

پەرستشیان بۆ دەکەن هیچیان پێ ناکرێ، دەزانن هەر خودا رزق و رۆژی دەرە، کەچی عیبادەت بۆ غەیری خودا دەکەن، بەڵکوو ئەوان بەردەوامن لەسەر لوتبەرزی و سەرڕەقی خۆیان، پشتیان لەحەق و راستی کردوە، رێبازی گومڕایی خۆیان گرتووە، بەهیچ شتێك پەند وەرناگرن و تەمبێ خواردو نابن، بەدبەخت و چارەڕەشی دونیاو قیامەتن. ﴿أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبّاً عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيّاً عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ ئایا ئێوە بەراوردی حاڵ و وەزعی موسوڵمان و کافرتان کردوە، دەزانن نموونەیان چیە؟ نموونەی کافر وەکوو کەسێك وایە بەگاگۆڵکێ بڕواو هەربکەوێ و هەڵسێتەوەو چنگە کرەی بێ. نموونەی موسوڵمانیش وەکوو ئەوە وایە بەشێوەی ئاسایی و راست و رەوان بڕواو چاوی لەبەردەمی خۆی بێ و بێ پێچ و پەنا رێڕەوی خۆی دەرك بكا.

دەی باشە ئایا کەسێك بەگاگۆڵکێ بڕوا بەرێوەو هەر بڕواو بەسەر رودا بکەوێ و رێگاکەی چاڵ و چوێڵ و سەخت و دژواربێ، ئایا ئەو کەسە باشتر رێگا دەردەکا یان کەسێك بەرێك و پێکی و بەشێوەی ئاسایی خۆی بڕواو رێگای راست و رەوان بێ و رێڕەوو بەردەمی خۆی ببینێ و کەندو لەندی لەپێش نەبن. گومانی تێدا نییە ئەمیان باشتر رێ دەردەکا لەدونیاو قیامەتدا بەختەوەرو سەرفرازە، چونکە لەدونیادا بەگوێرەی بەرنامەی خودا هەڵسوکەوت دەکاو رێبازی هیدایەتی گرتووە. لە قیامەتیش دا بەرێگایەکی راست و رەواندا بەرەو بەهەشت دەنێردرێ.

﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمْ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو بتپەرستانە بڵێ: خودا ئەو خودایەیە ئێوەی لەنەبوو دروستکردوە، گوێچکەی بۆ دروستکردون بۆ ئەوەی ئامۆژگاری پێ ببیسن، چاوی بۆ دروستکردون تا دەستڕەنگینی پەروەردگار ببینن، عەقڵ و هۆشی پێداون بۆ وردبوونەوەو تێفکرین لەدروستکراوانی خوداو دەرك کردنی حەقیقەت.

وەڵێ ئێوە زۆر بەکەمی ئەم هەست و ئامێرانە لەشوێنی خۆیاندا بەکاردێنن، کەم سوپاسی خودا دەکەن، ئێوە ئەو ئامێرو هێزانە لەو بوارانەدا بەکارناهێنن کە

بۆی دروستکراون، سوپاسگوزاری راستەقینە ئەوەیە ئەو ئەندامانەی جەستەت لە شتێکدا بەکار بێنی: کە بۆی دروستکراوە، نەك بەسەر زارەکی سوپاسگوزاربیو بەکردەوە تاوان ئەنجام بدەی، ئەگەر ئێوە ئەو ئەندامانە لەپێناو بەدەستهێنانی رەزامەندیی خودادا بەکارنەهێنن، مانای وایە سوپاسی نیعمەتەکانیتان نەکردوە.

﴿قُلْ هُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بە بتپەرستەکان بڵێ: بێگومان خودا ئێوەی دروستکردوەو بەناو زەویدا بڵاوی کردونەوە، کردونی بەچەند گەلو نەتەوەیەك، بەچەند زاراوەو زوبانی جیاجیا ئاخاوتن دەکەن، رەنگو روخسارتان جیاجیایە سەرەنجام دوای ئەو بڵاوبوونەوەو پەرتەوازەییەتان، بۆ لای خودا دەگەڕێنەوەو لەسارای مەحشەردا گرد دەبنەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە. دەی با ئادەمیزاد ئەو راستیە بزانن: کە ئەوان بەناو زەویدا بڵاوکراونەوە، مەبەستو سەرەنجامێك هەیە ئەوان بەرەو روی دەچن، ئەویش کۆکردنەوەتانە لەدەشتی مەحشەردا بۆ حیسابو لێکۆڵینەوەو وەرگرتنەوەی پاداشو سزا لەسەر کردەوەکانیان.

ئەمجار باسی شكو گومانی موشریکەکان دەکا دەربارەی رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە، دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ؟﴾ بتپەرستەکان بەشێوەی گاڵتەو گەمەری بە پێغەمبەرو موسوڵمانەکان دەڵێن: ئەوە ئەو قیامەتەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەن کەی رادەبێ؟ ئەو حەشرو نەشرو عەزابو دۆزەخە کەی دەبێو چۆن یەخەمان دەگرن؟ ئەگەر راست دەکەن قیامەت رادەبێو حەشرو نەشرو حیسابو لێکۆڵینەوە هەن، دەپێمان بڵێن: کەی دەبنو بۆمان رون بکەنەوە؟

﴿قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: زانیاری دەربارەی قیامەتو کاتی رابوونی هەر لای خودایە، کەس کاتی رابوونی قیامەت

نازانیٚ، وەڵێ فەرمانی پیٚ کردوم: کە هەواڵتان بدەمیٚ قیامەت هەردیٚو رادەبیٚ، خۆتانی بۆ ئامادەبکەن‌و لیٚی بترسن، من ترسیٚنەرم بۆتان، دەتانترسیٚنم لە سەرەنجامی کوفرو بیٚدینی، من تەنها راگەیاندنم لەسەرەو پەیامی پەروەردگارم پیٚ راگەیاندن.

ئەمجار پەروەردگار حاڵ‌و وەزعی کافرەکان لەکاتی بینینی عەزابدا بەیان دەکاو دەفەرمویٚ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَقِيلَ هَذَا الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تَدَّعُونَ﴾ کاتیٚك ئەو عەزابە وادە پیٚدراوەیان بینی‌و نزیك کەوتەوە لیٚیان‌و بینییان قیامەت رابووە، روخسارو دەم‌و چاوی کافرو بیٚ بڕوایان تاڵ‌و گرژ دەبیٚ، سام‌و ترس‌و غەم‌و پەژارە دایان دەگریٚ‌و رەنگیان هەڵدەبزرکیٚ‌و رەش دادەگیرسیٚ، بەتوانجەوە پیٚیان دەگوتریٚ: ئەمە ئەو عەزابەیە ئیٚوە لەدونیادا پەلەتان لەهاتنی دەکردو دەتانگوت: دەکوا ئەگەر راستە بابیٚ. ئەوەبوو بە پیٚغەمبەریان دەگوت: ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (الأحقاف/٢٢).

## دوعاکردنی کافرەکانی مەککە لە پیٚغەمبەرو موسوڵمانەکان

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴿٣٠﴾ ﴾

ریوایەتکراوە کافرەکان دوعایان لە پێغەمبەرو هاوەڵەکانی دەکرد بۆ ئەوەی لەناو بچن، ئاواتەخوازی ئەوە بوون توشی چورتەمو بەڵایەك ببنو سەریان تێدا بچێ. پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکا کە وەڵامیان بداتەوە دەفەرموێ:

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ اللَّهُ وَمَنْ مَعِيَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَنْ يُجِيرُ الْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی موحەممەد بەو کافرو بتپەرستانە بڵێ: ئەوانەی ئینکاری هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی دەکەن، هاوەڵی بۆ دادەنێن، ئینکاری نیعمەتەکانی دەکەن لەشێوەی سەرزەنشتو لۆمەکردندا پێیان بڵێ: چ سودێك بەئێوە دەگا ئەگەر خودا من بمرێنێ، یان تەمەنم درێژ بکاو مەرگم دوابخا؟ منو هاوەڵانم لەناوبەرێ یان مەرگمان دوابخا ئێوە چ قازانجێکتان پێ دەبڕێ، وای دابنێن خودا ئێمەی مراند، ئایا کێ ئێوە لەسزای خودا رزگار دەکا؟ بتەکانتان یان غەیری بتەکانتان فریاتان دەکەون؟ بێگومان جگە لەخودا کەس نیە فریادرەس بێ. دەی کەوایە ئێوە بۆ رێبازێك ناگرنەبەر رزگاربوونی تێدابێ، بۆچی ئیمان ناهێننو دان بەتاكو تەنهایی خودادا نانێن.

﴿قُلْ هُوَ الرَّحْمَنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: ئەوەی ئێمە پەرستشی بۆ دەکەینو بە خودای خۆمانی دەزانینو هیچ شتێك ناکەینە هاوەڵو شەریکی، لە هەموو کارێکماندا پشت بەئەو دەبەستین، هەموو کارێکمان هەواڵەی ئەو دەکەین، لەوە بەولاوە دەردەکەوێ کێ لەگومراییدایەو رێبازی هەڵەی گرتۆتەبەر، لێتان مەعلوم دەبێ ئێمە یان ئێوە کاممان راست دەکەینو سەرەنجامی باشو بەختەوەریی لەدونیاو قیامەتدا بۆ کێمانە، ئێوە پشتتان بەماڵو سامانو خزمو کەسو کارو هۆزو عەشرەت بەستووە، پێتان وایە ئەوانە لەعەزابی خودا دەتانپارێزن لەمەشدا ئەوپەڕی هەڵەن.

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْراً فَمَنْ يَأْتِيكُمْ بِمَاءٍ مَعِينٍ﴾ ئەی پێغەمبەر؛ پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر ئەو ئاوەی سەرچاوەی ژیانتانەو خودا لەکانیاو و بیرو چۆم و جۆباردا بۆی ڕەخساندون و بۆ هەموو شتێك سودی لێ وەردەگرن، ئەگەر ئەو ئاوە بەزەویدا ڕۆچوو بەجۆرێك نەتوانن بەهیچ شێوەیەك سەری خەنەوە بۆ سەر زەوی و سودی لێ وەربگرن، ئایا کێ هەیە بتوانێ ئاوی ڕەوان و شیرینتان بۆ دەستەبەر بکا؟؟

بێگومان کەس نیە جگە لەخودا بتوانێ ئاوی پێویستتان بۆ دابین بکا، جگە لەخودا کەس ناتوانێ باران ببارێنێ، ئاو لەزەوی هەڵقوڵێنێ، ئەوە لەفەضڵ و گەورەیی خوداوەیە: کە ئاوی بۆ ئێوە دابین کردوە، کانیاوو سەرچاوەی ئاوی شیرینی بۆ بەدیهێناون و لەهەموو بوارێکی ژیانتاندا سودی لێ وەردەگرن..

دەی کەوایە بۆچی خودا ناناسن و بەندایەتی بۆ ناکەن و گوێڕایەڵی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی ناکەن؟!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی القلم

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (القلم) چونکە لەسەرەتای سورەتەکەدا پەروەردگار سوێند بە قەڵەم دەخوا دەفەرموێ: ﴿ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ﴾ چونکە قەڵەم گرنگییەکی تایبەتی هەیە، سودو قازانجی قەڵەم لە ژمارە نایەن، زۆربەی موفەسسیرین پێیان وایە: مەبەست بەقەڵەم جینسی قەڵەمە، واتە سوێند بەهەموو پێنوسێك: کە لەئاسمان و زەویدا پێی دەنووسرێ.

ئەم سورەتە مەککیە جگە لەئایەتەکانی (١٧) تا(٣٣) هەروا ئایەتەکانی (٤٨) تا (٥٠) ئەمانە مەدەنین ژمارەی ئایەتەکانی (٥٢) ئایەتە.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشوویەوە لەدوو لایەنەوەیە :**

١- لەکۆتایی سورەتی (الملك)دا هەڕەشەی لە بتپەرستەکان کرد، بەوەی ئاوی سەر زەوی نغرۆ بکاو هێندەی بەزەویدا بەرێتە خوارێ کە نەتوانرێ سودی لێ وەربگیرێ لەم سورەتەشدا بەڵگەیەك دەهێنێتەوە لەسەر ئەو تواناو دەسەڵاتە رەهایەی خودا، کە دیاردەیەکی ئەوەیە لەشەوێك لەشەواندا بەروبوومی باخێکی بەناگرێکی ئاسمانی سوتاند: خاوەنەکانی لەشیرین خەودا بوون، کە بەیانی لەخەو هەڵسان ئاسەواریشی نەمابوو.

٢- لەسورەتی (الملك)دا بەڵگەی لەسەر دەسەڵاتی خوداو زانیاریی بێ سنووری هێنایەوە، هاتنی قیامەتو زیندوبوونەوەی سەلماند، هەڕەشەی لە موشریکەکان کرد بەسزای بەئێش لەدونیاو قیامەتدا..

ئەمجار لەسەرەتای ئەم سورەتەدا پەروەردگار پێغەمبەر ﷺ تەبرییە دەکا لەهەموو ئەو بوختانو قسە پڕوپوچانەی کە موشریکەکان پاڵ پێغەمبەریان دەدا، دەمێك دەیانگوت: ساحیرە، شاعیرە، شێتە.. بۆیە پەروەردگار ئەو رەوشتانەی لێ دوور دەخاتەوەو ئەخلاقو رەوشتی جوانی بۆ دەچەسپێنێو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾.

لە خاتو عائیشە پرسیارکراوە لەبارەی رەوشتی پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا وتی: (كان خُلُقُهُ القرآن) ئەمجار بە کابرای پرسیارکاری گوت: ئەوە تۆ قورئان ناخوێنیتەوە؟ ئەمجار لەسورەتی (المؤمنون) دە ئایەتی یەکەمی بۆ خوێندنەوە بۆ ئەوەی بەکورتی رەوشتی پێغەمبەری بۆ رون بکاتەوە؛

دەربارەی ئایەتی دووەمیش ئیبنولونزیر لە ئیبنو جورەیجەوە روایەتی کردوە دەڵێ: موشریکەکان بە پێغەمبەریان دەگوت: شێتە، ئیتر ئایەتی ﴿مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ﴾ نازڵ بوو.

## سورەتی (القلم)

﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ٥ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ٦ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٧﴾

دەفەرموێ: ﴿ن﴾ وشەی (ن) لە حروفی (مقطعة) یە وەکوو (ص، ق. . .)و باقی حروفە (مقطعة) کانی تر.

﴿وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ، مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ﴾ سوێند بەقەڵەم: کە پێی دەنوسرێ، واتە سوێند بەهەموو قەڵەمێك لەئاسمانو زەویدا کە ئامێری نووسینە. فریشتەکان پێی دەنووسن، ئادەمیزادان پێی دەنووسن، ئەتۆ ئەی موحەممەد؛ بەهۆی نیعمەتی خوداوە: کە پێی بەخشیوی و کردویتی بەفروستادەی خۆی و نیگاو سروش بۆ تۆ دەنێرێ و لەسەر رەوشتی جوان پەروەردەی کردوی، شێت و وێت نیت، موشریکەکانی مەککە: کە ئەو جۆرە رەوشتە ناشیرینانەت پاڵ دەدەن درۆ دەکەن و لەروانگەی حەسودی و دوژمنایەتیان بۆ تۆ ئەو بوختانانەت بۆ هەڵدەبەستن.

سوێند خواردن بەقەڵەم و نووسین ئاماژەیە بۆ گەورەیی ئەو دوو نیعمەتە: کە دوای نیعمەتی ئاخاوتن و بەیانکردن گەورەترین نیعمەتن بەسەر ئادەمیزادەوە، قەڵەم و نووسین هۆی رۆشنبیری و بڵاوبوونەوەی زانست و زانیارین لەناو کۆمەڵ و گەل و نەتەوەکاندا، بەڵگەن لەسەر پێشکەوتن و شارستانیەت.

سوێندخوارن بەقەڵەمو نووسین ئاماژەیە بۆ بەنرخیو گرنگیو بایەخ پێدانیان، بۆ ئەوەی ئەو گەلە دواکەوتووە نەخوێندەوارە راچڵەکێنێو لەخەوی بێداری وەئاگایان بێنێ، هەڵسن بەو ئەرکە مێژووییەی خودا بۆی بڕیارداون، ئەو بیروباوەڕە بڵاوبکەنەوە: کە مەنهەجو پرۆگرامی ئادەمیزادە لەسەر زەوی ئەمجار ببنە رابەری ئادەمیزادو بەرەو بەختەوەری بیان بەن.

ئاشکراشە قەڵەمو نووسین لایەنێکی سەرەکین بۆ ئەنجام دانی ئەو ئەرکە گرنگە ئەوەی کە جەخت لەسەر ئەم راستیە دەکاتەوە ئەوەیە: کە سەرەتای نیگاو سروش بەرستەی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ . . . ﴾ دەستی پێ کردووە قەدەری خوداوەهابوو: کە ئەو خیطابە ئاڕاستەی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار بکرێ، پێغەمبەرﷺ نەخوێندەوارەو سەرەتای نیگاو سروشی بەفەرمان پێکردن بە خوێندنو نووسین دەستی پێ کردوە، ئەمجار لەم سورەتەدا ئەو سەرنجەی جەخت کردۆتەوەو فەرمووی: سوێند بەقەڵەمو بەنووسین.

ئیبنو عەساکیر لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: لە پێغەمبەرمﷺ ژنەوت دەیفەرموو: (إن أول ماخلقه الله القلم، ثم خلق النون وهو الدواة ثم قال: اكتب ما هو كائن من عمل أو أثر أو رزق أو أجل فكتب ما هو كائن وما كان الى يوم القيامة، ثم ختم على القلم فلم يتكلم الى يوم القيامة).

ئەمجار سوێند لەسەر خوراوەکە تەواو دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكَ لَآجْراً غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾ بۆ تۆ هەیە ئەی پێغەمبەر! پاداشی گەورەو بەنرخ لەسەر ئەنجامدانی ئەو ئەرکە پیرۆزەی ها لەسەرشانت کە گەیاندنی پەیامی خودایە، چەشتنی ئەزیەتو ناڕەحەتیە لەو پێناوەدا، ئەو پاداشو بەهرەیەی پێت بەخشراوەو پێت دەبەخشرێ بڕانەوەی نیەو ئادەمیزادیش منەتت بەسەردا ناکەن، چونکە لەخوداوەیە.

﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! خاوەنی رەوشتی بەرزی، ئەو ئەخلاقەی خودا لەقورئاندا فەرمانی پێ کردوی پابەندی بووی خاوەنی صەبرو

خۆگری و دڵفراوانیت، بەرامبەر هەڵوێستی ناشیرینی نەتەوەکەت پشوو درێژی و خۆڕاگری ئەدەبی کامڵت تێدایە، خاوەنی ڕەوشتی لێبووردەیی و ئازایەتی و مەردایەتی و سەخاوەتی.. هەرچی ڕەوشتی جوان هەیە تێتا ڕەنگ دەداتەوە، خودا ئەدەبی داداوی و جوانت وەرگرتووە.

پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی دەفەرموێ: (إن الله بعثني لأتمم مكارم الأخلاق) پەروەردگار منی ڕەوانە کردوە بۆ ئەوەی ڕەوشتی جوان پەیڕەو بکەم و بڵاوی بکەمەوە، ڕەوشتی جوان وەربگرم و فێری ئادەمیزادانی بکەم.. لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (أدبني ربي فأحسن تأديبي) خودا ئەدەبی داداوم و جوانی فێرکردوم، بەرێك و پێکی پەروەردەی کردم.

لە صەحیحی موسلیم و بوخاریدا فەرمودەیەك لە ئەنەسەوە ریوایەتکراوە، دەڵێ: دە ساڵی تەواو خزمەتی پێغەمبەرم کرد، ڕۆژێك لەڕۆژان نەیفەرموو: داخ لەدەست تۆ، نەیفەرموو دەربارەی شتێك کردبێتم بۆچی کردت؟ شتێکم نەکردبێ بفەرموێ بۆچی نەتکرد؟

ئەحمەد لە عائیشەوە ریوایەت دەکا، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ قەت لەخزمەتکارو خێزانی خۆی نەداوە، بەدەستی خۆی لەکەسی نەداوە مەگەر لەجیهادو شەڕ لەگەڵ کافراندا! هەرکاتێکیش سەرپشك کرابێ لەنێوان دوو شتدا لایەنە سوك و ئاسانەکەی هەڵبژاردوە، تا گەیشتۆتە ڕادەی ئەوە بەتاوان بژمێردرێ، کە گەیشتبێتە ڕادەی تاوان، ئەوە لەهەموو کەس پتر لێی دوور بووە، قەت تۆڵەی بۆ بەرژەوەندیی خۆی نەستاندۆتەوە، مەگەر ئەو شتە پیرۆزیی ئاینی تێدا پێشێل کرابێ، ئەو کاتە لەبەر خاتری خودا تۆڵەی ستاندۆتەوە.

﴿فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ، بِأَيِّكُمُ الْمَفْتُونُ﴾ لەوە بەولاوە تۆ ئەی موحەممەد دەزانی و کافرەکانیش دەزانن، کامتان شێت و وێتە، کامتان گومڕاو سەرلێ شێواوە، ڕۆژی قیامەت دەردەکەوێ کێتان عەقڵ و هۆشی لەدەست داوە، کێ خەسارەتمەندو ڕەنج بەخەسارە؟!

هەڵبەتە ئەوان مەبەستیان ئەوەنەبوو کە: پێغەمبەر ﷺ شێتی عەقڵ لە دەست چوو بێ، بەڵکوو مەبەستیان ئەوەبوو کە: جندۆکە هاوکاری دەکەن و ئەو کەلامە بەلیغ و ڕەوانەی فێردەکەن، وەکوو چۆن پێیان وابوو هەموو شاعیرێك شەیتانێکی هەیەو فێری قسەی جوانی دەکا.

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ خودای تۆ دەزانێ لەراستیدا کێ گومڕایە؟ کێ ڕێبازی راستی لێ گوم بووە، تۆ یان ئەوانەی گومڕایی پاڵ تۆ دەدەن. ئەو دەزانێ کێ هیدایەتدراوەو ڕێبازی بەختەوەری گرتۆتەبەر، بەکورتی گومڕاو و سەرلێ شێواو ئەوانن نەك تۆ. چونکە پێچەوانەی بەرژەوەندیی دونیاو قیامەتی خۆیان هەڵسوکەوت دەکەن.

**تێبینی:**

ڕەوشتی جوان مەلەکەیەکی نەفسانییە، هەرکەسێك ئەو مەلەکەی تێدابێ، دەتوانێ بەئاسانی کردارو رەفتاری جوان بکا، بێ کولفەت و جەخت لەخۆ کردن ئاکاری جوانی لێ دەوەشێتەوە. تیرمیزی لە ئەبو زەڕەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەهەر شوێنێك بووی تەقوای خودا بکە، لە خودا بترسە، بەشوێن خراپەدا چاکە ئەنجام بدە دەیشواتەوە، بەڕەوشتی جوانەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئادەمیزاد بکە.

لە ئەبو دەرداوە ریوایەتکراوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژی قیامەت هیچ شتێك بەئەندازەی ڕەوشتی جوان لەتەرازودا قورس نیە، بێگومان خودا ئادەمیزادی ڕەوشت ناشیرین و قسە ترپنی خۆش ناوێن.

ئەبو هورەیرە دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا چ کردەوەیەك زیاتر بەهۆیەوە ئادەمیزاد دەچنە بەهەشتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تقوی الله وحسن الخلق).

## رەوشتە ناشیرینەکانی بتپەرستەکان

﴿فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَـٰتُنَا قَالَ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾﴾

لەوەپێش ئەوەی بەیانکرد کە: پێغەمبەر خاوەنی رەوشتی جوان و بەرزە، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ کە: بتپەرستەکان رەوشتی ناشیرین و ئاکاری قێزەونیان هەیە، پێغەمبەرو موسوڵمانان هەڵدەنێ کە بەجیددی دژایەتیان بکەن و مەبدەئیانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن، دەفەرموێ:

﴿فَلا تُطِعْ الْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر بەردەوام بە لەدژایەتی کردنت بۆ ئەو کافرو بتپەرستانەی پەیامەکەت رەت دەکەنەوە هەڵوێستت رەق و توند بێ، نەرم ونیانی لەگەڵ سەرانی کوفرو بتپەرستاندا مەنوێنە، سازش لەسەر عەقیدە مەکە، تۆزقاڵێك لەبواری بیروباوەڕدا تەنازولیان بۆ مەکە، نەکەی بەتەمای ئەوە بی ئەوان تۆزێك لەهەڵوێستی خۆیان بێنە خوار، ئەتۆش لەبواری عەقیدەو بیروباوەڕدا کەمێك تەنازولیان بۆ بکەی.

ریوایەتکراوە کە: بتپەرستەکان داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە: ماوەیەك عیبادەتی خودا بکاو ماوەیەکیش عیبادەتی خوداکانی ئەوان بکا، لەبەرامبەری ئەوەش ئەوان ماوەیەك عیبادەتی خودا بکەن و ماوەیەکیش خوداکانی خۆیان

بپەرستن، بتپەرستەکان ئامادە بوون‌واز لەزۆر هەڵوێستی خۆیان بێنن لەبەرامبەر تەنازولکردنێکی کەم لەلایەن پێغەمبەرەوە.

چونکە لەواقیعدا ئەوان خاوەنی بیروباوەڕی حەق‌و راست نین، هەر بەڕواڵەت‌و لاسایی کردنەوە بتپەرستی دەکەن مەبدەئی نین بۆیە ﴿وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ﴾ ئاواتەخوازی ئەوەن ئەتۆ تۆزێك بۆیان نەرم بی، تا ئەوانیش نەرمی بنوێنن. بەم جۆرە ئەتۆ دەستێك لەبتەکانیان بدەی‌و کەمێك بەندایەتیان بۆ بکەی، ئەوانیش دان بەهەبوونی خودای تۆدا بنێن.

واتە: ئەوانە وادەزانن ئایین موساوەمەی تێدا دەکری‌و سەنگ‌و سوکی تێدا ئەنجام دەدرێ، وەکوو چۆن لەمامەڵەو بازرگانی‌دا موساوەمە دەکرێ. نەخێر ئەوان بەهەڵە چون، جوداوازی نێوان تیجارەت‌و عەقیدە زۆر فراوان‌و گەورەیە، خاوەنی عەقیدە دەبێ مەبدەئی بێ، سازش لەسەر عەقیدە نەکا، تەنازولکردن لەشتی بچکۆڵە لە عەقیدەدا وەکوو تەنازولکردن لەشتی گەورە وەهایە.

بەڵکوو لەعەقیدەدا بچوك‌و گەورە نیە، چونکە عەقیدە یەك حەقیقەتە پارچەپارچە ناکری‌و نابێ خاوەن باوەڕ لەسەر حیسابی بیروباوەڕ سازش بۆ هەندێ کەس بکاو تەنازول لەهەندێ بیروباوەڕی خۆی بکا.

نابێ‌و ناگونجێ ئیسلام‌و کوفر لەنیوەی رێگادا بەیەك بگەن، بەڵکوو هەر بەیەك ناگەن‌و پێکەوە کۆنابنەوە. ئیسلام‌و کوفر ناچنە قوتوی هیچ عەتارێکەوە، ئیسلام‌و کوفر هێندە لێك دوورن هیچ شتێك نیە بتوانێ لێکیان نزیك بکاتەوە. هیچ پردێك نیە بتوانێ پێکیانەوە ببەستێتەوەو یەکیان بخا.

ئەگەر مێژووی بانگەوازی ئیسلامی سەیر بکەین لەسەردەمی مەککی‌دا دەزانین بتپەرستەکان چەندە موراهەنەی پێغەمبەریان دەکردو چەندە ئامادەباشی موساوەمە بوون لەگەڵی‌دا، بەڵام پێغەمبەرﷺ تۆزقاڵێك لە هەڵوێستی خۆی دانەدەبەزی‌و سازشی لەگەڵ نەدەکردن...!

ئەوان ئامادەبوون گوێڕایەڵی پێغەمبەربنو ئیمانی پێ بێنن بەس ئەوەندە پێغەمبەر ﷺ واز لەرەخنەگرتنی بتەکانیان بێنێ. ئامادەبوون بەکەمترین تەنازولی پێغەمبەر بۆیان، زۆرترین تەنازول بکەن، هەر ئەوەندە لەپێش چاوی عەرەبەکانی دەوروبەریاندا حەیایان نەچێ. ئامادەبوون ساڵێك شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەون بەمەرجێ پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بچوایە بۆ ناو کەعبەو دەستێکی بەسەر بتەکانیان دا بێنایە.. وەلێ هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە مەبدەئیانە بوو، تۆزقاڵێك سازشی بۆ نەکردن، نەکەمو نەزۆر داخوازییەکەی ئەوانی جێبەجێ نەکرد!

ئەمە لەکاتێکدا سەرەتای بانگەوازی ئیسلامی بوو، هاوەڵانی کەمو بێ هێز بوون لەهەموو لایەکەوە زەختیان لەسەر بوو دەچەوسێندرانەوە، ئەزیەت دەدران، دەرفێندران، جۆرەها ئیهانەو سوکایەتی بەخۆیو هاوەڵانی دەکرا. کەچی وازی لە بانگەوازیی نەهێناو لەسەر حەقگۆیی خۆی بەردەوام بوو..

تەنانەت قورەیشییەکان ئامادەبوون بیکەنە پاشای خۆیان ئەوەندەی ماڵو سامان بدەنێ ببێتە دەوڵەمەندترین کەسی مەککە، ئامادەبوون هەموو نازو نیعمەتێکی ژیانو پلەو پایەو مەنصەبو فەرمانڕەوایی بۆ دابین بکەن، بەمەرجێ واز لە بانگەوازی خۆی بێنێ، یان بەلانی کەمەوە غەیبەتی بتەکانیان نەکا، چونە لای ئەبوطالبی مامیو ئەویشیان لێ ڕاسپارد بەو هیوایە قسەی ئەو کاری تێ بکاو بڕێ لە داخوازییەکانیان بێنێتە دی، ئەبوطالب بانگی پێغەمبەری کردو وتی: برازای خۆشەویستم! هۆزو عەشرەتەکەت هاتوونەتە لامو زۆر گازەندەو گلەییان لێت هەیە، زۆر نارەحەتو تەنگەتاون بە هەڵوێستو بانگەوازییەکەت، پیاوی چاکبە منیشو خۆشت توشی دەردەسەریو نارەحەتی مەکە، ئەرکێك مەخە سەرشانم کە نەتوانم ئەنجامی بدەم، پێغەمبەرﷺ وای زانی ئیتر ئەبوطالب پشتگیری لێ ناکاو ڕێگا بۆ قورەیش بەرەڵڵا دەکا چی لێ بکەن لێی بکەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ هیچ سازشی نەکردو فەرموی: (یا عم والله لو وضعوا الشمس عن

يميني والقمر عن يساري على أن. أترك هذا الأمر ما تركته، حتى يظهره الله أو أهلك فيه ماتركته) ئەی مامی خۆم، سوێندم بە خودا ئەگەر هێندەم دەسەڵات بدەنێ خۆر لەلای شانی ڕاستمەوە بێ‌و مانگ لەلای شانی چەپمەوە بێ، لەبەرامبەر ئەوەدا واز لەم پەیامە بێنم، وەڵڵاهی وازی لێ ناهێنم تا خودا سەرم دەخا یان لەپێناویدا تێدا دەچم، ئیتر ئەبو طالب کە زانی وایە وتی: ڕۆڵە بەئارەزووی خۆت بکە، چیت دەوێ بیڵێی بیڵێ، من دەستت لێ بەرنادەم.. .

ئەمە نموونەیەك بوو لەهەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لەناسکترین کاتو ساتی بانگەوازیدا.

ئەوەتا لەوکاتەدا کە پێی وایە ئەبو طالبی مامیشی دەستی لێ بەرداوەو لایەنگری قورەیشییەکان دەکا، ئەو لەهەڵوێستی خۆی نایەتە خوارو هیچ حیسابێك بۆ گەلە کۆمەکی قورەیشییەکان ناکاو سوورە لەسەر بانگەوازیی خۆی‌و ڕاگەیاندنی پەیامەکەی!

﴿وَلا تُطِعْ كُلَّ حَلاَّفٍ مَهِينٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ گوێڕایەڵی هیچ کەس مەبە، لەوانەی زۆر سوێندی بەدرۆ دەخۆن‌و نەفس نزم‌و دەنی سروشتن، ڕاوبۆچوونیان سەرسەری بازانەیە، لەخودا غافڵ‌و گومڕان.

﴿هَمَّازٍ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ﴾ ڕەخنە بازو تانەدەرە، بەرەوڕوو قسەی ناشیرین بەخەڵك دەڵێ، فیتنەجۆو ئاشوبگێڕە، هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدایە ئاژاوە لەناو خەڵکیدا بەرپابێ.

﴿مَنَّاعٍ لِلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ ڕژدو دەست قوچاوە، هیچ خێروبێرێکی لەدەست نابێتەوە، نە بە ماڵ‌و نە بە دەست‌و زمان بە هیچ شتێك یارمەتی کەس نادا. ستەمکارو سنوور بەزێنە، پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی خودا نیە.

﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ﴾ وێـڕای ئـەو هـەموو ڕەوشتە ناشیرین و نامەردانـەی ڕوترش و تونـد تەبیعەتـە، سـەرەڕای ئـەوەش حـەرامزادەو بـێ ئەصل و فەصلە. لـە شەڕەنگێزی و خراپەکاریـدا بەناوبانگە.

﴿أَنْ كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ﴾ ئایا هـەر لەبـەر ئـەوەی خـودا هەنـدێ مـاڵ و چـەند کـوڕێکی پێـداوە، کـافرو یاخییـە بـڕوای بـەتاك و تـەنهایی خـودا نیـەو پێغەمبـەر بەدرۆدەخاتەوە؟ لەپاداشتی نیعمەتەکانی خودادا ئەو کافرو بێدینـە؟ بـا دڵنیـا بـێ ئەو کوفرو ئینکاری و سپڵەیی یەی دادی نادا.

زانایانی تەفسیر دەفـەرمون: ئـەم ئایەتانـە دەربـارەی وەلیـدی کـوڕی موغـەیرە نازڵ بوون.

زومەخـشەری دەفـەرموێ: ﴿أَنْ كَانَ ذَا مَالٍ. . . .﴾ پەیوەسـتە بـە ﴿وَلَا تُطِعْ﴾ەوە واتە: لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو ڕەوشتە ناشیرینانەی، ئـەتۆ گوێڕایـەڵی قسەکانی مەبـە.. هـەر لەبـەر ئـەوە کـە: خـاوەنی سامان و منداڵـەو بـەش و بـارێکی لەدونیا هەیە.

﴿إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ کـاتێ ئایـاتی قورئـانی بەسـەردا بخوێندرێتـەوە، دەڵـێ: ئـەوە چـیرۆکە کـۆنی پێـشینانە، پێـی وایـە: ئـەو قورئانـە لەچیرۆك و ئەفسانەی پێشینان وەرگیراوەو لە خوداوە نەهاتووە.

﴿سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ﴾ لەوە بەولاوە سەری لوتی داخ دەکەین، ئـەوەبوو ئـەم وادەیـەی خودا هاتەدی و لـە شـەڕی بـەدردا شمشێرێکی لەسـەری لوتـی دراو سـەری لوتی قرتاند. بێگـومان ئەمـە موعجیزەیـەکی مـێژوویی قورئـانە، دەبـوایە وەلید بیتوانیایە نەهێڵێ لوتی لەککەدار ببێ. بـەڵام بـڕیـاری خـودا بـوو، کێ دەتـوانێ خۆ لـەبـڕیاری خودا ڕزگار بکا.

لەشەڕی بەدردا سەری لوتی قرتاو تا مرد ئەو نیشانەی پێوە بوو، هەندێ لەموفەسیرین پێیان وایە: مانای ئایەتەکە ئەوەیە: ڕۆژی قیامەت سەری لوتی داخ دەکری و لەناو خەڵکیدا دیار دەبێ.

## چیرۆکی خاوەنەکانی باخەکە

﴿ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی راگەیاند کە: وەلیدی کوڕی موغەیرە یان یەکێکی تر لەبەر ئەوەی خاوەنی سامان و کوڕو منداڵە، سوور بوو لەسەر کوفرو بێدینی و یاخی بوون لە خودا لەجیاتی ئەوەی کە سوپاسگوزار بێ، کەچی سپڵەو پێ نەزان بوو، ئەمجار لەم ئایەتەدا ئەوە رون دەکاتەوە، کە پەروەردگار ماڵ و سامان و کەسوکارو منداڵ دەدا بەیەکێك بۆ تاقیکردنەوەو ئیمتیحانە بۆ ئەوەی دەربکەوێ ئاخۆ ئەو بابایە شوکری خودا دەکا یان کوفرانی نیعمەتی دەکا..

نموونەی وەلیدی کوڕی موغەیرەو قوڕەیشییەکان وەکوو ئەو کۆمەڵە میراتگرە وان کە: باخێکیان بەمیرات بۆ بەجێ مابوو، باخێکی پۆشناخ و خاوەن بەروبوومی زۆرو هەمەجۆر، داوایان لێ کرابوو شوکرانە زەمێربن و مافی هەژاران لەبەروبوومەکەی بدەن، کاتێك ئەو خاوەنانە سپڵەییان کردو هەژارانیان بێ بەش کرد، خودا هەمووی لێ بڕین و نەباخی بەپێوە هێشتەوە نەبەروبوومی بۆ هێشتنەوە.

ریوایەتکراوە پیاوێکی خوداناس لەهۆزی سەقیف باخێکی ئاوەدان و بەرداری هەبوو لەنزیك شاری صەنعا، هەموو ساڵێك لەکاتی چنین و رنیندا، بەشی هەژارانی لێ دەردەکرد، کە خاوەنەکەی لەدونیا دەرچوو، باخەکە کەوتە دەست کوڕەکانی و بەمیراتیان گرت. لەناوخۆیاندا بڕیاریاندا بەشی هەژارانی لێ نەدەن وتیان: خۆمان خاوەن ماڵ و خێزانی زۆرو ورگ دڕاوین، ناتوانین وەکوو باوکمان بەشێکی لێ ببەخشین. ئیتر خودا باخەکەی سوتاند.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ وَلَا يَسْتَثْنُونَ﴾ ئێمە کافرەکانی قوڕەیشمان بەتاقیکردنەوە، بەبرسییەتی و کەمبارانی و بانگەوازیکردنی پێغەمبەر بۆیان، وەکوو چۆن خاوەنانی ئەو باخە ناودارەی: (کە لای قوڕەیشییەکان دەنگوباسی زانراو بوو) بەتاقیکردەوە..

کاتێك سوێندیان خواردو تەئکیدیان کردەوە لەبەیانی زوودا بەروبوومی باخەکەیا دەچنن و دەڕنن، ئەم سوێندەیان خواردو هیچ بیریان لە خودا نەکردەوە،

نەیانگوت: (إنشاء. الله) یان سوێندیان خوارد کە: ئیتر بەشی هەژارانی لێ نەدەن. بڕیاریاندا بەیانی زوو باخەکەیان بچنن و نەهێڵن هەژاران پێیان بزانن، بێن و داوایان لێ بکەن و بەشی خۆیان لێ وەربگرن، ئەوان دڵنیا بوون لەوەی کە بەیانی هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکیان نایەتە پێش و بەئاسانی ویستەکەیان دێتەدی بۆیە هیچ ئینشائەڵڵایان نەکرد.

هەندێ موفەسیرین ڕستەی ﴿لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ وَلَا يَسْتَثْنُونَ﴾ یان وامانا کردوە دەڵێن: سوێندیان خوارد کە: هەموو بەروبوومی باخەکە بۆ خۆیان بچنن و بڕنن، هیچی لێ چەرت نەکەن بۆ هەژاران، ئەو ئەندازەیەی کاتی خۆی باوکیان دەیدا بەهەژاران ئەوەش بۆ خۆیان بەرن.

ریوایەتکراوە ئەم باخە لەیەمەن بووە دوو فەرسەخ لەشاری صەنعاوە دوور بووە، هی پیاوێکی صالح و خوداپەرست بووە، هەموو ساڵێ بەرێکوپێکی بەشی هەژارانی لێ دەدا، کە کابرا مرد، کوڕەکانی وتیان: ئەگەر ئێمە وەکوو باوکمان بکەین هیچمان بۆ نامێنێتەوە، ئێمە هەموومان خاوەنی خێزان و منداڵین. تەگبیریان کردو بڕیاریان دا: کە دەمەو بەیانی زوو بەدزی هەژاران باخەکەیان بچنن و بەشی هەژارانی لێ نەدەن.

ئیتر خودا لەتۆڵەی ڕژدی و چروکیاندا باخەکەی سوتاندن و هیچی بۆ نەهێشتنەوە، بەکورتی ئێمە قورەیشییەکانمان بەتاقی کردنەوە بەو نازو نیعمەتەی بەسەرماندا ڕشتون، بەو ئاسایش و ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داون، بۆئەوەی دەربکەوێ هەڵسوکەوتیان چۆنەو چۆن نیە، ئایا سوپاسگوزاری خودا دەبن لەسەر نیعمەتەکانی و مافی هەژارانی لێ دەدەن؟ بەخۆیاندا دەچنەوەو ئیمان دێنن و شوێن پەیامی پێغەمبەر دەکەون کە: خودا ڕەوانەی کرد بۆ هیدایەتی ئادەمیزاد، یان کوفرانی نیعمەتەکان دەکەن و ئینکاری حەقی خودا دەکەن بەسەریانەوە، ئیتر خودا موبتەلایان دەکا بەعەزابی سەختی خۆی و ئەو نازو نیعمەتانەیان لێ دەگرێتەوە، وەکوو خاوەن باخەکەی لای صەنعامان بەتاقی کردەوە، کاتێ بڕیاریاندا مافی

هەژاران لەبەروبوومی باخەکەیان دەرنەکەن. ئیتر خودا لەتۆڵەی ئەوەدا باخەکەی ویران کردن.

ئەوەبوو ئەوان بەو نیازو بڕیارە نامرۆڤانەوە نووستن و بێ ئاگابوون لەقەزاو قەدەری خودا دەربارەی باخەکەیان، ﴿فَطَافَ عَلَيْهَا طَائِفٌ مِنْ رَبِّكَ وَهُمْ نَائِمُونَ، فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ﴾ دەردو ئافاتێك لەلایەن خودای تۆوە دای بەسەر باخەکەدا، ئاگرێکی خودایی بەشەو لەباخەکەیانی‌دا کردی بەکۆی زوخاڵ، باخی بەردارو پۆشناخ بوو بە پارچە زەوییەکی ویرانەو سوتەمەڕۆ، ئاداری بەسەر پاداریەوە نەما. ئەم کارەساتە بەسەر باخەکەدا هات و خاوەنەکانی لەشیرینی خەودا بوون و ئاگایان لەو بەسەرهاتە نەبوو.

ئیبنو ئەبوحاتەم لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆتان بپارێزن لەتاوان، چونکە زۆر جار بەندە تاوان دەکاو خودا ڕزقی لێ دەگرێتەوە، ئەمجار ئایەتی ﴿فَطَافَ عَلَيْهَا طَائِفٌ مِنْ رَبِّكَ. . . . الآية﴾ی خوێندەوە.

بەهەرحاڵ خاوەنانی باخەکە شەوەکی زوو لەخەو هەڵسان و سوور بوون لەسەر بەئەنجام گەیاندنی بڕیارەکەی ڕۆژی پێشوویان، یەکتریان بەخەبەر هێناو بەهەڵەداوان بۆ ڕنین و چنینی باخەکەیان ڕۆیشتن، ﴿فَتَنَادَوا مُصْبِحِينَ، أَنْ اغْدُوا عَلَى حَرْثِكُمْ إِنْ كُنتُمْ صَارِمِينَ﴾ هەندێکیان بانگیان لەهەندێکیان کرد، فەرمانیان بەیەکتری کرد کە: لەبەرە بەیاندا بکەونە ڕێ بۆ لای باخەکە، ئەگەر دەیانەوێ بەروبوومی باخەکەیان زوو بەدزی هەژارەکان لێ بکەنەوە.

﴿فَانطَلَقُوا وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ، أَنْ لا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُمْ مِسْكِينٌ﴾ بەڵێ لەبەرە بەیانداو زوو بەهەڵەداوان و بەدزییەوە بەرەو باخ و بەهەشتەکەیان ڕۆیشتن، قسەو راوێژیان بەسرتەسرت دەکرد، بەئەسپایی بەبن گوێی یەکتریاندا دەچرپاند کە: دەنگە دەنگ نەکەن بۆ ئەوەی کەس پێیان نەزانی و نەهێڵن هەژاران بێنە ناو

باخەکەوە داوای بەش و باریکیان لیٚ بکەن کە لەوەپیٚش باوکیان بۆی بڕیبوونەوەو ساڵانە دەیدانیٚ.

﴿وَغَدَوْا عَلَى حَرْدٍ قَادِرِينَ﴾ شەوەکی زوو ڕۆیشتن و بەدڵنیاییەوە پیٚیان وابوو: دەتوانن بەروبوومی باخەکە بڕنن و عەزم و جەزمیان وابوو کە: بەشی هەژاران نەدەن. بەڵام خۆیان بیٚ بەش بوون، کوردی وتەنی: (ئەوەی لای بەندە خەیاڵە لای خودا بەتاڵە) خەسارەتمەند خۆیان و مایە پوچ خۆیان بوون، ئای لەو دیمەنەی کە لەو بەیانیەدا بینییان، کە چاو بڕوا ناکا، بەخەیاڵیش شتی وایان بەسەر دڵدا نەهاتووە، باخ و باخاتیٚك دویٚنیٚ ئاوەدان و پۆشناخ و بەر بەدارەوە، بۆتە پارچە زەوییەکی ویٚران و سوتەمەڕۆ، ئاداری بەسەر پاداریەوە نەماوە، هەرچی کەڵەك و شوراو پەرژین و جۆگاو جۆبارو نیشانەی هەیە بەسەر یەکدا روخاوەو تیٚك ترشاوە. تەنانەت کەوتنە گومانەوە کە: ئەوە باخەکەیان بیٚ، بۆیە..

﴿فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوا إِنَّا لَضَالُّونَ﴾ کە گەیشتنە لای باخەکەیان بینیان بوەتە سوتەمەڕۆ، کەوتنە مقۆ مقۆ، وتیان: ئەریٚ ئەمە باخەکەی ئیٚمەیە یان ڕیٚگەمان لیٚ گوم بووە؟ ئەمجار کەتیٚفکرین و بۆیان دەرکەوت کە: ئەمە باخەکەی خۆیانە وای بەسەر هاتووەو خوداویٚرانی کردوەو هیچ سودیٚکی لیٚ نابیندریٚ، وتیان :

﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾ بەڵکوو لەڕاستیدا ئیٚمە لەبەروبوومی باخەکەمان بیٚ بەش بووین، چونکە عەزممان جەزم بوو لەسەر ئەوەی بەشی هەژارانی لیٚ نەدەین، خودا خۆمانی لیٚ بیٚ بەش کرد، خۆزگە وامان نەکردایەو وەکوو باوکمان بەشی هەژارانمان لیٚ دەربکردایە،. خۆشمان لیٚی بەهرەمەند بوینایە. ئیٚستا پەشیمانین بەڵام پەشیمانی چ سود؟!

﴿قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ﴾ زیٚرترین و باشترینیان وتی: ئەوە من پیٚم نەگوتن بۆچی شوکرو سوپاسی خودا ناکەن لەسەر نیعمەتەکانی؟ داوای لیٚخۆشبوون لەخودا بکەن لەسەر ئەو بڕیارەی کە داوتانە کە بەشی هەژاران ببڕن،

چەندم پێ گوتن ئەو نیازەی ئێوە شتێکی هەڵەیەو کاری کردن نیە؟ ئەوەتا ئەوە ئاکامەکەیەتی. ئیتر هەموویان دانیان بەتاوانی خۆیاندا ناو خودایان بیرکەوتەوە.

﴿قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ وتیان: پاك و مونەززەهی بۆ خودایە، ئەو حاڵەتەی بەسەر باخەکەمانیدا هێناوە دادوەریو حیکمەتە، هیچ ستەمی نەکردوە، ئێمە ستەمکار بووین بەوە کە: بڕیارماندا بەشی هەژارەکان ببڕین. وەڵێ کاتێك ژێوان بوونەوە کە ژێوان بوونەوە سودی نەبوو.

ئەمجار دەمیان تێك ژەنیو ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَلاوَمُونَ﴾ دەستیان کرد بەسەرزەنشت کردنی یەکتری، هەر یەکەیان خەتاکەیان دەخستە سەر ئەوی تریانو دەیگوت: ئەتۆ بیرۆکەی ئەوەت داهێنا کە بەشی هەژارەکان نەدەین، ئەویان وەڵامی دەدایەوەو تاوانەکەی دەخستە سەرشانی ئەوی تریان، هیچ چاریان نەما جگە لەوەی دان بەتاوانەکەیاندا بنێنو دوعای ئەمان لەخۆیان بکەن.

﴿قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا طَاغِينَ﴾ وتیان: ئای بەدبەختو چارەڕەش خۆمان، ئێمە خۆمان تاوانمان کردو فەرمانی خودامان پشت گوێ خستو مافی هەژارەکانمان بڕی بۆیە توشی ئەم حاڵە هاتینو باخەکەمان ئەوەی بەسەر هات!

﴿عَسَى رَبُّنَا أَنْ يُبْدِلَنَا خَيْراً مِنْهَا إِنَّا إِلَى رَبِّنَا رَاغِبُونَ﴾ هیواداریین پەروەردگار چاوپۆشیمان لێ بکاو باخەکەمان بەباشتر بۆ بژمێریو باخێکی چاکترمان بداتێ. ئێمە لەبڕیارەکەمان پەشیمانینو تۆبەو سەد تۆبە جارێکی تر ئێمە هەڵوێستی وانانوێنین.

﴿كَذَلِكَ الْعَذَابُ وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ ئەو جۆرە عەزابەی خاوەنانی باخەکەمان پێ بەتاقی کردەوەو تۆڵەی بڕیارە ستەمکارییەکەمان لێ ستاندن هەروەها ئەو عەزابەی توشی دانیشتوانی مەککەمان کرد لەقاتو قڕیو بێ بارانیو نائارامیو شەڕو هەرا لەنێوان خۆیانداو لەگەڵ خێڵو نەتەوەی تردا ئەوە عەزابی دونیایان بوو، سزای سەرپێچیکردنیان بوو بۆ فەرمانی خودا،

بەخیلیو چروکیان بوو لەسەر ئەو نیعمەتانەی خودا بەسەریدا ڕشتبوون، سزای بێ بەشکردنی هەژاران بوو لەماڵو سامانیان، بێگومان عەزابی قیامەت زۆر بەئازارو ئێش ترە.

ئەگەر موشریکەکان ئەوەیان بزانیایە بەخۆیاندا دەچونەوە، ئیمانیان دەهێناو شوێن پەیامی پێغەمبەر دەکەوتنو وازیان لەکوفرو گومڕایی دەهێنا، بەڵام ئەوان نەفامو کەودەنن ئەو ڕاستیە نازانن، بێ ئاگاو گێلو گەلحۆن، دورن لەحەقو ڕاستی.. ئەگینا خۆیان دەپاراست لەهەموو کردەوەیەك کە سەر بکێشێ بۆ سزای سەختی خودا.

پەروەردگار ئەو چیرۆکەی گێڕایەوە بۆ ئەوەی بتپەرستەکانی قورەیشو هەموو کافرو بێ بڕوایەك بەئاگا بێنێتەوەو بزانن کە: دابو نەریتی خودا لەبوونەوەردا نەگۆڕە دەربارەی ڕابردوو ئێستاو داهاتوو. هەرکەسێ لەفەرمانی خودا دەربچێ با چاوەڕوانی عەزابی سەختی خودا بکا لە دونیاو قیامەتدا.

لەهەمان کاتدا بڕواداران ئاگادار دەکا لەوەی کە ئەو ماڵو سامانو نازو نیعمەتەی خودا ڕشتویە بەسەر بێ بڕوایاندا هەمووی بۆ تاقیکردنەوەو ئیمتیحانە.

## پاداشی خوداپەرستان و وەك یەكنەچوونی گوێڕایەڵ و یاخی بووان

﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾

لەوەپێش كافرو بێ بڕوایانی ترساندو هەڕەشەی لێ كردن بەعەزابی دونیاو عەزابی بەشیدەتی قیامەت. ئەمجار لێرەدا باسی حاڵ و وەزعی خوداپەرستان دەكاو ئەوە روون دەكاتەوە كە باخ و بەهەشتی ڕازاوەی بۆ داناون، پاشان ڕەددی ئەو كافرانە دەداتەوە كە: پێیان وایە ڕۆژی قیامەت موسوڵمان و ناموسوڵمان بەیەك چاو سەیر دەكرێن و یەك حیسابیان لۆ دەكرێ.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ بێگومان ئامادە كراوە بۆ هەموو خوداپەرستێك و لەخوداترسێك بەهەشتی ڕازاوەو شوێنی لەززەت و خۆشی كە هەرگیزاو هەرگیز ئەو خۆشیەی نابڕێتەوەو لێی وەڕز نابن.

موقاتیل دەڵێ: کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو قورەیشییەکان وتیان: ئێمە لەدونیادا خودا ڕێزی لێ ناوینو نازو نیعمەتی پێداوین، ئێمە لەموسوڵمانەکان بەختەوەرترین، حەتمەن لەقیامەتیشدا لەوان زیاتر ڕێزمان دەبێ، خۆ ئەگەر هیچکە نەبێ یەکسان دەبین. ئیتر پەروەردگار بەم ئایەتەی دوایی ڕەددی دانەوە. فەرمووی:

﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ ؟﴾ ئێمە چۆن یەکسانی دەخەینە نێوان کافرو موسوڵمانەوە؟ چۆن کەسێك خوداپەرستو لەخوداترس بێ وەکوو تاوانبارو یاخی بوو حیسابی بۆ دەکرێ. نەخێر هەرگیز کەسێك گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بێ یەکسان نابێ لەگەڵ کابرایەکی یاخی بوو، هیچ بەڵگەیەکی عەقڵو نەقڵی نیە ئەوە بچەسپێنێ کە کافرو موسوڵمان ڕۆژی قیامەتوەکوو یەك مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ. هەرکەسێ شتی وا بڵێ داوای بێ بەڵگە دەڵێ.

﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ ئێوە بەچ عەقڵێك ئەو گومانە دەبەنو ئەو حوکمە دەدەن، ئەو حوکمە نارەوایە، بۆچی پێتان وایە پاداشدانەوەو سزادانەوە بەدەست ئێوەیە؟ بێگومان سادەترین بۆچونی عەقڵو ڕاو بۆچون، ئەو جۆرە حوکمە ڕەت دەکەنەوە.

﴿أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ، إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا يَتَخَيَّرُونَ﴾ یان ئایا بەدەست ئێوەوە نامەیەکی ئاسمانی هەیە سەیری بکەنو بیخوێننەوەو لەبەری بکەن، ئەوەی تێدابێ کە دەیڵێن: گوایە خوداپەرستو کافر وەکوو یەك وان؟ ئایا نامەیەکی ئاسمانی واتان بۆ هاتووە کە: بڕیارێکی لەو جۆرەی تێدابێ موسوڵمانو کافر وەکوو یەك پاداشتیان هەبێ؟! بڕیارێکی لەو جۆرەی لەخۆگرتبێ کە ئێوە هەڵی دەبژێرن؟ ئایا نامەیەکی واتان بۆ هاتووە ئەوەی تێدابێ کە: لەقیامەتدا ئێوە چتان بوێ دەتان درێتێ؟! بێگومان شتی واتان لانیەو بۆتان نەهاتووە..

﴿أَمْ لَكُمْ أَيْمَانٌ عَلَيْنَا بَالِغَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ﴾ یان ئایا ئێوە لەلایەن خوداوە عەهدو پەیمانێکی جەخت لەسەر کراوو تۆکمەتان پێدراوە تا رۆژی قیامەت هەرچی ئێوە بریاری لەسەر بدەن ئێمە بۆتان دابین بکەین؟ ج وادەیەکی لەو جۆرەتان پێدراوە کە: هەرچی بتانەوێ بتاندرێتێ؟! بێگومان نەخێر وادەو بەڵێنی لەو جۆرەتان نەدراوەتێ.

ئەمجار روی خیطاب ئاراستەی پێغەمبەرﷺ دەکاو کافرەکان لەو میانە وەدەردەنێ‌و فەرمان بە پێغەمبەرﷺ دەکا کە لایان لێ ببرێتەوە و بەتوانجەوە پرسیاریان لێ بکا دەفەرموێ: ﴿سَلْهُم أَيُّهُمْ بِذَلِكَ زَعِيمٌ﴾ ئەی پێغەمبەر بەلاقرتێوە بەشێوەی سەرزەنشت‌و سەرکوتانەوەوە پێیان بڵێ: کامەیان بەرعودەی ئەوەبوو کە: هەر بریارێ بدەن‌و چییان پێ خۆش بێ خودا بۆیان جێبەجێ دەکا؟ کێ زامنیانە کە لە قیامەتدا وەکوو موسوڵمانەکان پاداشتیان دەدرێتەوە؟! کەواتە هیچیان بەدەستەوە نیە مەگەر ئەوە نەبێ کە شوێنی چەند کەسێك کەوتبن کە هاوڕاو بۆچونیان بن‌و ئەوان جگە لە خودا ئەو ئاواتەیان بهێنێتەدی. بۆیە پەروەردگار ئەم لایەشیان لێ دەبرێتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ فَلْيَأْتُوا بِشُرَكَائِهِمْ إِنْ كَانُوا صَادِقِينَ﴾ یا هاوبەشەکانیان بێنن، با ئەو بت‌و صەنەمانە بێنن کە: پێیان وایە هاوشانی خودان. ئەگەر راست دەکەن لەو قسەو هەواڵانەی رایان دەگەیەنن !!

بەکورتی ئەو کافرو بێ بڕوایانە هیچ بەڵگەیەکی عەقڵی‌و نەقڵییان بەدەستەوەنیە. هیچ نامەیەکی ئاسمانی‌و وادەو بەڵێنێکی خودایی‌و هیچ کەفیل‌و بەرعودەبوویەکیان نیە، پشتگیری بیرو بۆچونەکەیان بکا، ئەمجار پەروەردگار تەحەددایان دەکا کە: ئەو بت‌و صەنەمانەی کە بە هاوشانی خودایان دەزانن ئامادەیان بکەن لەرۆژی تەنگانەدا کە رۆژی قیامەتە.. ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ لە ئەو رۆژەدا کە: ئەو پەڕی سەختی‌و ناڕەحەتی پەیدا دەبێ، تەنگ‌و چەڵەمە دەگاتە ئەوپەڕی، پەردە لەسەر هەموو

شـتێك لادەبـرێ. راسـتی هـەموو كارێـك دەردەكـەوێ، ئەوانـە بـانگ دەكـرێن بـۆ سوژدەبردن بۆ خودا، بەمەبەستی تانەو تەشەر لێدان‌و داخ كـردن بەدڵیانـدا، بـەڵام ناتوانن سوژدە بەرن، جا یان لەبەر ئەوە كە ماوەی سوژدەبردن بـە سەرچووە، یـان لەواقیعدا توانای سوژدەبردنیان نامێنێ.

﴿خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ﴾ لـەو رۆژەدا چاو بەرەو ژێرو ڕوسـیاو زەلیـل، لەشـەرمەزاریاندا چـاویان بـۆ هـەڵنابڕدرێ، ریـسوایی‌و پەشـیمانی‌و حەسـرەت دایـان دەپۆشـن، وەلحـاڵ ئـەوان لـەدونیادا بـانگ دەكـران بـۆ سـوژدەبردن بـۆ خـودا، بـۆ نوێـژكردن‌و خواپەرسـتی، پـشتیان لێ هەڵدەكرد، هەرچـەند لـەش ساغ‌و بـەتوانا بـوون، بەئەنقەسـت نوێـژیان نـەدەكردو ئەركی بەندایەتییان بەرامبەر بە خودا بەجێ نەدەهێنا.

بـەكورتی ئـەوان داوایـان لێ نـاكرێ نوێـژو عیبـادەتی تـەكلیف ئـەنجام بـدەن، قیامەت شوێنی عیبادەت‌و نوێژكردن نیە، وەلێ كە داوایـان لێ دەكـرێ سـوژدەبەرن‌و نوێـژ بكـەن بـۆ سەرزەنـشت‌و تەوبیخـە لەسـەر ئـەوەی لـە دونیـادا بـە ئەنقەسـت‌و ملـهوڕی‌و بەندایـەتی خودایـان نـەكردوە، بۆیـە لەقیامەتـدا بـە پێچەوانەی حـاڵی دونیایانەوە سزا دەدرێن، لـەوێدا دەیانـەوێ سـوژدە بـۆ خـودا بـەرن، بـەڵام پشتیان رەق دەبێ‌و ناتوانن سوژدەبەرن. كاتێـك خـودا خـۆی بـۆ ئـەهلی مەحـشەر دەردەخـا هەموو خاوەن باوەڕان دەچـنە سـوژدەوە، وەلێ كـەس لـە كـافرو دووڕوەكـان نـاتوانن سـوژدەببەن، چـونكە پـشتیان رەق دەبـی‌و دانایەنـەوە. ئامـاژە بـەو فەرموودەیـەی بوخاری‌و موسلیم كە لەئەبوسەعیدی (الخدری)یەوە ریوایـەتیان كـردوە، دەڵێ: لـە پێغەمبەرم ﷺ زنەوت دەیفەرموو: (يكشف ربنـا عـن ساقه، فيسجد لـه كل مـؤمن ومؤمنة ويبقى من كان يسجد في الدنيا رياءً وسمعة فيذهب ليسجد فيعود ظهره طبقـا واحـدا) مانـای (یكـشف

عن ساق) لە ئایەت و حەدیثەکەشدا تەنگ و چەڵەمەی گەورەو عەزابی بە شیدەت و دیمەنی سامناکە.

## هەڕەشە لە کافرەکان و فەرمان کردن بە پێغەمبەر ﷺ بەصەبرو خۆڕاگری

﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا الْحَدِيثِ ۖ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِي لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَا أَن تَدَارَكَهُ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِ لَنُبِذَ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٥٢﴾﴾

لەوەپێش کافرەکانی ترساند لە عەزابی قیامەت و روداوە سامناکەکانی، ئەمجار بەشێوەیەکی کاریگەرتر هەڕەشەیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَذَرْنِي وَمَنْ يُكَذِّبُ بِهَـذَا الْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لا يَعْلَمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! تۆ لێم گەڕێ چ کارت

بەسەر منو ئەوانەوە نەبێ کە ئەم قورئانە بەدرۆدەخەنەوە، من خۆم چاریان دەکەمو دەزانم چییان بەسەر دێنمو چ عەزابێکیان توش دەکەم، تۆ خۆتیان پێوە خەریك مەکە، ئێمە غافلگیریان دەکەینو پلە پلە بەرەو عەزاب کێشیان دەکەین تا پێوە دەبن، نازو نیعمەتیان بەسەردا دەڕێژین بۆ تاقیکردنەوەو لەخشتەبردن، تا لەناکاما عەزابی سەختی ئێمە یەخەیان دەگرێو ئیتر رزگار بوونیان نیە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ، نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ؟ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾ (المؤمنون/٥٥-٥٦) یان دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ﴾(الأنعام/٤٤)

پێویستە هەموو ئادەمیزاد بەتایبەتی ئەوانەی خودا نیعمەتی لەشساغیوماڵو سامانو منداڵی پێداون لە خودا بپاڕێنەوە کە ئەو نیعمەتانەی پێیان بەخشراون نیعمەت بنو نیقمەت نەبن. هەمیشە داوا لە خودا بکەن ئیستیدراجیان نەکا.

﴿وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾ مۆڵەتیان دەدەمو سزادانیان دوادەخەم تازیاتر سووربن لەسەر هەڵوێستی نالەباریان، پتر بکەونە وەرطەوە، بێگومان پلانی من بۆ ئەهلی کوفر زۆر توندوتۆڵەو بەهێزە، هیچ کەس ناتوانێ بەرگری بکا، لە فەرمودەی صەحیح دا هاتووە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إن الله ليملي للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته) نموونەی ئەو ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾(هود/١٠٢).

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەوان هیچ بیانویەکیان نیە کە ئیمان ناهێنن دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْراً فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ﴾ ئایا تۆ داوای کرێیان لێ دەکەی لەسەر ئەوەی کە بانگەوازییان دەکەی بۆ ئیمان هێنانو ئەوان ناتوانن ئەو کرێو باربەهایە دابین بکەنو دڵیان نایە ئەو مەبلەغە بدەن؟!

واته: خۆ تۆ داوای کرێت لێ نەکردون لەبەر ئەوە ئەوان پشتیان هەڵکردبێ؟ نەخێر تۆ داوای کرێو پاداشتت لێ نەکردون ئەتۆ بانگەوازییان دەکەی بۆ لای خودا بەبێ ئەوەی داوای کرێیان لێ بکەی! ئەتۆ بەهومێدی پاداشتی خودایو هیچت لەئەوان ناوێ. کەچی وێڕای ئەوەش بەدرۆت دەخەنەوە، هیچ بەڵگەو نیشانەیان پێ نیە بەڵکوو بەنەفامیو بەئەنقەست بەپیر بانگەوازییەکەتەوە نایەن.

﴿أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ﴾ ئایا ئەوانە زانیاری غەیبو پەنامەکییان لایەو ئاگادارن بەسەر لەوحولمەحفوظدا بەئارەزۆی خۆیان چی بەڵگەو نیشانەیەکیان بوێ دەینووسنەوە ئەمجار دەکەونە کێشەو جیدالەوە لەگەڵ تۆداو چییان بوێ بۆ خۆیانی بڕیار دەدەنو هیچ پێویستییان بەوە نیە شوێنت بکەونو فەرمانبەرداری فەرمانەکانت بن!!

بێگومان هیچ کامێ لەو بەڵگە نەقڵییانەیان لانین تاپشتی پێ ببەستنو ڕو لەپەیامی تۆ وەرگێڕن ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَى وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾ ئەتۆ ئەی موحەممەد، پشوو درێژبە لەسەر بڕیاری خودا دەربارەی خۆتو بتپەرستەکان، خۆڕاگربە لەبەرامبەر ئەزیەتو هەڵوێستی ناشیرینیان..

بەردەوام بە لەسەر بانگەوازیو جیهادو تێکۆشانی خۆت. سەرەنجام سەربەرزیی دونیاو قیامەت هەر بۆ تۆیە. نەچی وەکوو یونسی کوڕی مەتێ بێ حەوصەلەو نەفەس کورت بێ، کاتێك ڕقی لە نەتەوەکەی هەڵساو بەجێی هێشتن. توشی ئەو هەموو دەردی سەریو خەمو خەفەتە بوو، سواری کەشتی بوو، کەوتە ناو دەریاوە ماسی قوتیدا، ماوەیەکی زۆر لەناو سکی ماسییەکەدا مایەوە. لەهەڵوێستی خۆی پەشیمان بووە.

لەناو تاریکی سکی ماسیو دەریادا هاواری کردە خودا دڵی پڕ غەمو نارەحەتی لە داخی گەلەکەی کەوا ئیمانیان پێ نەهێنا! واتە تۆ وەکوو یونس خێرا

هەڵمەچۆو رقت هەڵنەسێ بۆ ئەوەی توشی ئەو ناڕەحەتی‌و دەردی سەریە نەبێ کە بەسەر ئەو هات.

﴿لَوْلا أَنْ تَدَارَكَهُ نِعْمَةٌ مِنْ رَبِّهِ لَنُبِذَ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ﴾ ئەگەر فەضل‌و رەحمەتی خودا نەبوایەو تۆبەی لێ قبوڵ نەکردایە، لەسکی ماسیەکەوە فڕێ دەدرایە سەر پارچە زەوییەکی وشك‌و برینگ‌و بێ گیاو درەخت، لۆمەی دەکرا لەسەر ئەو تاوانەی کردی کە: زوو رقی هەڵساو بێ چکڵدانە بوو، نەتەوەکەی جێ هێشت! ئەگەر خودا رەحمی پێ نەکردایە خەسارەتمەند دەبوو، بەڵام خودا بەزەیی پێدا هاتەوە، رەحمی پێ کرد.

﴿فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ پەروەردگاری خۆی هەڵی بژاردو دەست نیشانی کرد بۆ پێغەمبەرایەتی‌و کردی بە پێغەمبەرو پیاوێکی راستاڵ، رەوانەی کرد بۆ سەر گەل‌و نەتەوەیەك ژمارەیان سەدهەزارو زیاتریش، هەموویان ئیمانیان پێ هێنا.

ئەمجار پەروەردگار پێغەمبەرﷺ لەدوژمنایەتی موشریکەکان ئاگادار دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ﴾ موشریکەکان هێندەیان رق لێتەو ئەوەندە بەچاوی دوژمنایەتیەوە سەیرت دەکەن، لەوانەیە قاچت هەڵخلیسکێنن. یان بەهیلاکت بەرن، بەتایبەتی ئەم چاو تێ برینە دوژمنکارییەیان لەکاتی قورئان خوێندنیدا پتر دوژمنایەتی پێوە دیاربوو، ئەوەندەیان رق لێ دەبوەوە ئەوەندەیان حەسودی پێ دەبرد کە: کراوە بە پێغەمبەرو ئەو پلەو پایەی دراوەتێ، سەریان لێ تێك چوو بوو، یان بۆ ئەوەی خەڵکی لێ بتەکێننەوە دەیانگوت: شێتە.

هەندێ لە موفەسسرین گوتویانە: مەبەست ئەوەیە لەوانەیە کافرەکان بەچاو بتهەنگێون‌و چاوەزاریان کارت تێ بکا.

ریوایەت کراوە لەناو هۆزی بەنی ئەسەددا چاوپیس هەبوون، بەچاوەزار کاریان لەخەڵکانی تر دەکرد.. هی وایان هەبوو سێ ڕۆژ خۆی برسی دەکردو ئەمجار بەشت هەڵدەکاڵی یەکسەر کاری تێدەکرد.. هەندێ چاوپیسیان ئامادەکردن بۆ ئەوەی بە پێغەمبەرﷺ هەڵکاڵن، ئەوانیش پێی هەڵکاڵین، بەڵام خودا پاراستی.

هەندێ لەراڤەکەرانی قورئان یەژن: ئایەتەکە بەروونی ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە: چاوەزار هەیەو کاریگەری سەلبی لەسەر شت هەیە.. واتە بەفەرمانی خودا هۆکارو کاریگەری خۆی هەیە. چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە بەریوایەتی جیاجیا ریوایەت کراون.

یەکێك لەو فەرمودانە ئەو حەدیثەیە کە ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (لاعدوى ولا طيرة ولا هامة ولا حسد، والعين حق).

ئەبوبەکری بەزاز لەموسنەدەکەیدا لە جابیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (قد تدخل العين الرجل في القبر و تدخل الجمل القدر) وادەبێ چاوەزار پیاو دەخاتە ناو گۆڕەوە، وشتر دەخاتە ناو مەنجەڵەوە. واتە چاوپیسێك بەکابرایەك هەڵدەکاڵی و دەیهەنگێوی و دەمرێ و دەیخەنە گۆڕەوە. چاوەزار کار دەکا لەحوشترو سەری دەبڕن و گۆشتەکەی دەکەنە ناو مەنجەڵەوە.

﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ﴾ ئەوانە دەڵێن: موحەممەد ﷺ شێتە، چونکە قورئانی هێناوە، لەکاتێکا قورئان ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئادەمیزادو جندۆکە، کەسێك ئەم قورئانە وەردەگرێ و پێی پەند ئامێز دەبێ کە: خاوەن عەقڵ بێ، هەر عاقڵمەند دەتوانن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم قورئانە بکەن، دەی

ئەوانە بەچ عەقڵێك نیسبەتی شێتی پاڵ پێغەمبەرﷺ دەدەن. لەکاتێکدا ئەم قورئانە پڕ حیکمەتو زانستو زانیارییەی هێناوە؟!

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الحاقة)

ئەم سورەتە مەککییەو پەنجاو دوو ئایەتەو لەدوا سورەتی (الملك) نازڵ بووە، ناونراوە سورەتی(الحاقة) چونکە بەپرسیارکردن لەبارەیەوە دەست پێ دەکا. پرسیارەکەش گرنگی پێدانو سامناکیو گەورەیی روداوەکانی رۆژی (الحاقە) دەگەیەنێ کە: ناوێکە لەناوەکانی قیامەت، بۆیەش ئەم ناوەی لێ نراوە، چونکە وادەو هەڕەشەی پەروەردگاری تێدا دێنەجێ. یان چونکە رۆژێکە هاتنی حەقەو نەهاتنی مەحاڵە، هەردیو گومانی تێدا نیە.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشووی لەدوو رووەوەیە :**

١- لە سورەتی (ن)دا بەکورتی باسی قیامەتی کرد، لەم سورەتەدا بەدرێژی باسی لێوە دەکاو روداوەکانی ڕادەنوێنێ.

٢- لە سورەتی پێشوودا باسی ئەوانەی کرد کە: قورئانیان بەدرۆخستۆتەوەو هەڕەشەی لێ کردن. لەم سورەتەدا حاڵو وەزعی گەلو نەتەوە بەدرۆخەرەوەکانو ئەو کارەساتەی بەسەریاندا هاتن بەیان دەکا بۆ ئەوە کافرو بێ بڕوایانی سەردەمی پێغەمبەر هەڵسڵەمنەوە.

وەکوو گوترا: ئەم سورەتە مەککییە، سورەتی مەککییش گرنگی بەچەسپاندنو سەلماندنی بنەماکانی عەقیدە دەدەن.

بۆیە لێرەدا جەخت لەسەر ئەو بنەمایانە کراوەتەوە، باسی روداوی سامناکی قیامەت دەکا، ڕاستی نیگاو سروشو قورئان دووپات دەکاتەوە، پاکانە بۆ پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی دەکا. درۆو بوختانی کافرەکان ڕەت دەکاتەوە سەرەتا

بەگەورە کردن و ناوهێنان و گرنگی پێدانی رۆژی قیامەت دەست پێ دەکا. باسی هەڵوێستی نەفامانەو سەرڕەقانەی گەلە پێشینەکانی وەکوو عادو ئەمودو قەومی لوطو دارو دەستەی فیرعەون و قەومی نوح دەکا. لەناوبردن و شێوەی سزاو تۆڵە لێ ستاندنەوەیان دیاری دەکا. عەزابی قیامەتیشیان لەوێ بوەستێ!!

ئەمجار باسی حاڵ و وەزعی خوداپەرستان و چارەڕەشانی رۆژی قیامەت دەکا. کاتێك نامەی عەمەلیان دەدرێتێ. پاشان پەروەردگار سوێندێکی بەلیغ و سەرنج راکێش دەخوا لەسەر ئەوە کە: قورئان بەسروش بۆ پێغەمبەر ﷺ نێردراوەو کەلامی خودایە. کۆتایی سورەتە بەبەڵگەی حاشا هەڵنەگر لەسەر ڕاستی پێغەمبەر ﷺو راستگۆیی و دەستپاکی لە گەیاندنی پەیامەکەی ڕادەنوێنێ..

## بەگەورە گرتن و گرنگی دان بەرۆژی قیامەت و باسی لەناوبردنی گەلە ستەمکارەکان

﴿ٱلۡحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ﴿٨﴾ وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ

رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾ ﴾

پەروەردگار سەرەتای سورەتەکەی بەگرنگیدان بەرۆژی قیامەت دەست پێ کردوەو دەفەرموێ: ﴿الْحَاقَّةُ، مَا الْحَاقَّةُ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحَاقَّةُ﴾ وشەی ﴿الْحَاقَّةُ﴾ بەمانای قیامەتە. چونکە وادەو هەڕەشەکانی خودای تێدا دێنەجێو حەقیقەتی تێدا دەردەکەوێ.

واتە: ئەو قیامەتەی کە: وادەو بەڵێنی خودای تێدا دێنەجێو ڕۆژێکە هەر دێو هەر دەبێ بێ، دیارەو صیفاتی چۆنە؟ حەقیقەتو چۆنیەتی ئەو ڕۆژە هەر خودا خۆی دەزانێ چۆنەو کەسی تر دەرکی ناکا. ئەتۆ چوزانی ئەی پێغەمبەر! ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکە، ئەو ڕۆژە زۆر لەوە گەورەترە زانیاریو تێگەیشتنی ئادەمیزاد پەی پێ بەرێ، وەصفو پێناسەی ئەو ڕۆژە بەزانیاری ئادەمیزاد کۆنترۆڵ ناکرێ. بۆیە وەڵامی پرسیارەکەی بەسەر مۆری هێشتەوەو ئادەمیزادی دەستەوسان کرد لەئاستی ئەو ڕۆژە گرنگو سامناکەدا.

یەحیای کوڕی سەلام دەڵێ: لەقورئاندا هەرشتێك بە ﴿وَمَا أَدْرَاكَ﴾ تەعبیری لێ دابێتەوە، ئەوە خودا پێغەمبەری لێ ئاگادارکردوەو پێی زانادوە. هەرشتێك بە ﴿وما يدريك﴾ تەعبیری لێ دابێتەوە لەو شتانەیە کە خودا پێغەمبەری بەسەردا ئاگادار نەکردوە.

ئەمجار باسی چەند گەلو نەتەوەیەك دەکا لەوانەی بڕوایان بەو ڕۆژە نەهێناو بەدرۆیان زانی، سزاو عەزابی کۆکوژیان رادەگەیەنێو شێوەی لەناوچونو ڕیشەکێش کردنیانمان بۆ دەگێڕێتەوە.

دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌ بِالْقَارِعَةِ﴾ گەلی ثەمودو (قەومی صالح)و گەلی عاد(قەومی هود) هاتنی قیامەتیان بەدرۆ زانی.

وشەی (قارعة) کە مەبەست پێی قیامەتە، بەمانا: بەڵاو کارەساتێکە کە دڵی ئادەمیزادەکان دەکوتێ‌و هەموو شتێك لێك هەڵدەوەشێنێ‌و تەفرو تونای دەکا.

ئەمجار سزای گەلە ستەمکارو بەدرۆخەرەوەکان دەست نیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ﴾ گەلی ثەمود بەتەواویی لەناوبران بەگرمەو پیا هەڵشاخانێکی لەرادەبەدەر، دەنگێکی تاسێنەرو راتڵەقاندنێکی بێ ئەندازەو گرمەو ناڵەیەکی زەندەقبەر، لەماوەیەکی کورت‌و کەمخایەندا ڕیشەکێشی کردن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾(الأعراف/٧٨و ٩١).

﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ، سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُوماً﴾ گەلی عاد لەناوبران‌و ئاسەواریان نەما بەڕەشەبایەکی دەنگ تیژو زۆر ساردو ڕیشەکێشکەرو ترسناك‌و درێژخایەن، بەتەوژمی‌و درێژخایەنی ڕەشەباکە برستی لێ برین، خودا ئەو ڕەشەبایەی لەسەر هەڵکردن حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بەردەوام بوو بێ وەستانەوەو بروکە پێدان، زیخ‌و بەردی لەگەڵ خۆیدا دەهێناو بەسەریدا دەکردن‌و لەناوی دەبردن. .

﴿فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ، فَهَلْ تَرَى لَهُمْ مِنْ بَاقِيَةٍ﴾ ئەتۆ ئەگەر لەو شوێنە ئامادەبویتایە ئەو گەلە بەدبەختە ستەمکارەت دەبینی لەماوەی ئەو شەوو ڕۆژانەدا لاڵ و پاڵ کەوتبوون، دەتگوت: بنکە دارخورمای لارو لوێر کەوتوی گەندەڵو بێ نرخ فڕێ دراون، کەسیان لێ دەرنەچوو، ئایا هەست دەکەی کەسیان لێ دەرچوو بێ؟ کەسیان ماوەتەوە؟ نەخێر کەسیان نەماوەو دوابڕاو بوون. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَصْبَحُوا لَا يُرَى إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ﴾ (الأحقاف/٢٥).

﴿وَجَاءَ فِرْعَوْنُ وَمَنْ قَبْلَهُ وَالْمُؤْتَفِكَاتُ بِالْخَاطِئَةِ﴾ فیرعەونی ستەمکارو ملهوڕو ئەو گەل و نەتەوە کافرو وڵاتە ژێرو ژوورکراوانە تاوانیان ئەنجامدان‌و کردەوەی

ناشیرینیان کردن، بیرباوەڕی کوفرو شیرك ئامێزیان راگەیاندن. ﴿فَعَصَوْا رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَابِيَةً﴾ هەرگەلو نەتەوەیەکیان لە پێغەمبەرەکەیان یاخی بوون، پشتیان لە بانگەوازیو پەیامەکەی هەلکرد، گوێیان بەئامۆژگاریو بانگەوازی پێغەمبەرەکان نەدا، ئیتر خودا قارو غەزەبی خۆی لێ گرتنو تێکی شکاندن بەکوشندەترین سزا لەناوی بردن.

﴿إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ، لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾ ئێمە کە: ئاو سەرکەشی کردو لەسنوور دەرچوو، تۆفان هەلسا لەسەردەمی حەزرەتی نووحدا، باوكو باپیرانی ئێوەمان لەکەشتیدا هەلگرتو ئێوەش لە پشتیاندا بوون، هەلمان گرتنو لەناو کەشتییەکی گەڕۆکدا بۆ ئەوەی لە خنکان رزگاریان بکەین. هەروەها بۆ ئەوەی ڕزگارکردنی خوداپەرستانو خنکاندنی کافرو ستەمکاران بکەینە پەندوئامۆژگاری بۆ چینەکانی دوای خۆیانو ببێتە بەلگە لەسەر دەسەلاتی رەهای خوداو کار دروستیو سەختی تۆلە لە ستەمکاران، هەروەها بۆ ئەوەی هەرکەس ژیرو تێگەیشتوو بێ پەندی لێ وەرگرێو تەمێ خواردو ببێ. بەکورتی ئێمە تۆفانمان هەلساندو خوداپەرستانمان لەناو گەمیدا ڕزگارکردنو کافرەکانمان خنکاندنو بۆ ئێوەشمان باسکرد، بۆ یادەوەریو بیر لێ کردنەوەو تەمێ خواردوییو پەند لێ وەرگرتن.

## برێ لەڕوداوە سامناکەکانی ڕۆژی قیامەت

﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴿١٦﴾ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ

رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی سامناکی رووداوەکانی قیامەتی کرد، ئەمجار بەکورتی سێ چیرۆکی گێڕانەوە بۆ دەست نیشان کردنی سەرەنجامی سەرڕەق‌و ستەم کاران، ئەمجار دەست دەکات بەباس کردن‌و رانواندنی رووداوەکانی قیامەت‌و دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ﴾ کاتێك یەکجار فوو دەکرێ بەشاخی صوردا واتە: کاتێك ئیسرافیل فووی یەکەمجاری بەکەرەنای صوردا دەکا.

﴿وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً﴾ زەوی بەکێوو کەژیەوە بەقودرەتی خودا لەشوێنی خۆیان هەڵدەکەندرێن‌و یەکجار پێکدا دەدرێن‌و دەبنە تەپ‌و تۆزو هیچ مەعالیمێکی زەوی وەکوو خۆی نامێنی‌و دەبێتە زەویەکی تر، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ﴾(إبراهيم/٤٨). هیچ بەرزی‌و چاڵی‌و چۆڵیەکی نامێنێ کاتێك ئەوە رووی‌دا. ﴿فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾ ئەوکاتە قیامەت رادەبێ‌و رووداوی گەورە دێتەدی نەك رووداوێك بەڵکوو زۆر رووداوی گەورە دێنەدی. ﴿وَانشَقَّتِ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾ ئاسمان شەق‌و پەق دەبێ ئەو رۆژە ئاسمان بەو تۆکمەیی‌و پتەوییەی، هیچ هێزو پێزێکی نامێنێ وەکوو لۆکەی کراوەی لێ دێ!! ﴿وَالْمَلَكُ عَلَىٰ أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ فریشتەکان لەم لاو ئەو لای ئاسمان دەوەستن چاوەڕێی فەرمانی پەروەردگارن‌و ئامادەن بۆ تەنفیذکردنی. ئەو رۆژە عەرشی پەروەردگارت لەژوور فریشتەکانەوە هەشت هەڵی دەگرن، هەشت فریشتە یان هەشت ریز، یان هەشت چین، یان هەشت لەو شتانەی خودا دەزانێ، ئێمە نازانین ئەو هەشتە کێن‌و چین؟ هەر وەکوو نازانین عەرش چیەو چۆنە، چۆن هەڵدەگیرێ‌و

بۆچی هەڵدەگیرێ! واچاکە ئێمە خۆمان لەچوونە ناو شیکردنەوەی ئەو شتە غەیبییانە بپارێزین‌و دەمیان لێ نەکوتین، خوداش زیاد لەوەی بۆی گێڕاوینەوەو پێی زاناندوین داوای زیاترمان لێ ناکا. عەرش گەورەترین دروستکراوی خودایەو هەر خوداش دەزانێ چیەو چۆنە. ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لا تَخْفَى مِنْكُمْ خَافِيَةٌ﴾ لەو رۆژەدا ئێوەی ئادەمیزاد رادەنوێندرێن بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوە، هیچ شتێکتان لە خودا نادیار نیە، جەستەتان دیارەو ناو دڵ‌و دەرونتان، کردەوەو گوفتارتان، ئاکام‌و سەرەنجامتان هەمووی لای خودا ئاشکرایەو هیچی لێ گوم نیە، چونکە ئەو زانایە بەهەموو نهێنی‌و ئاشکرایی‌یەک، هیچ شتێك لە خودا ناشاردرێتەوە، فرت‌و فێڵی لێ ناکرێ، پەردەو پەنهانی لە خودا ناگیرێتەوە. ئیتر پەروەردگار بەگوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداشی بەندەکانی دەداتەوە، دادوەرانە حیساب‌و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکاو تۆزقاڵێك ستەم لەکەس ناکا. بێگومان ئەمە هەڕەشەیەکی توندە لە کافرەکان‌و ریسواکردنیانە، لەهەمان کاتدا دڵخۆشکردنی موسوڵمانانە بەوەی کە: هەندێ خێرو خەیراتیان کردوە، خودا بۆی نوسیون‌و ئەوان بەهەندیان وەرنەگرتووە، لەو رۆژەدا بۆیان دەردەکەوێ‌و پێی کەیفخۆش دەبن.

## حاڵ‌و وەزعی خوداپەرستان لەدوای حیساب‌و لێکۆڵینەوە

﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُواْ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِي ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند کە: هەموو ئادەمیزاد رادەنوێنرێن بۆ حیساب و لێکۆڵینەوەو هیچ شتێکیان لەخودا پەنامەکی نیە. ئەمجار لێرەدا باسی حاڵ و وەزعی خوداپەرستان دەکا دوای ئەوەی نامەی عەمەلیان دەدرێتێ بەدەستی راستیان وەری دەگرن دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمْ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ﴾ جا ئەگەر کەسێك نامەی عەمەلی بدرێتە دەستی راستی ئەوە لەخۆشیان شاگەشکە دەبێ و توشی هەر کەسێ ببێ دەڵێ: ئەوە نامەی عەمەلەو فەرموو بیخوێنەوەو بزانە چی تێدایە، دڵخۆش و تەردەماخە بەوەی کە رزگاری بووەو لەپێڕی بەهەشتیانە. ترسی لەوەپێشی نەماوە، لەترس و بیمی دەشتی مەحشەر قوتاری بووەو رزگاری بووە!

﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ﴾ ئەمن گومانم وابوو تووشی حیساب و لێکۆڵینەوە دەبم و خودا لەسەر تاوانەکانم سزام دەدا، وەڵێ خودا بە فەضڵ و گەورەیی خۆی عەفوی کردم و لێم خۆش بوو.

یان مانای وایە: من لەدونیادا دەمزانی و لێم روون بوو، کە لەم رۆژەدا حیساب و لێکۆڵینەوەم لەگەڵ دەکرێ و ئەم رۆژە هەردێ و گومان لەهاتنیدا نیە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُوا رَبِّهِمْ﴾ (البقرة/٤٦).

(الضحاك) دەڵێ: هەموو ووشەیەکی (ظن) لەقورئاندا ئەگەر لەموسوڵمانەوە بوو بەمانا یەقینیە، ئەگەر لەکافرەوە بوو بەمانا گومانە.

حەسەن لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: موسوڵمان لەدونیادا گومانی بە خودای خۆی باش بووەو کردەوەی باشی بۆ قیامەت ئەنجام داوە، کافر گومانی بە خودای خۆی خراپ بووە کردەوەی خراپی ئەنجام داوە.

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامی موسوڵمانی کردار چاك روون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ، فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ، قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ ئەو لەژیانێکی خۆش و خۆشگوزەرانیدایە، ژیانێکی وەها گلەیی لێ نەکرێ، لەناو باخ و باخاتێکی

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند کە: هەموو ئادەمیزاد ڕادەنوێنرێن بۆ حیساب و لێکۆڵینەوەو هیچ شتێکیان لەخودا پەنامەکی نیە. ئەمجار لێرەدا باسی حاڵ و وەزعی خوداپەرستان دەکا دوای ئەوەی نامەی عەمەلیان دەدرێتێ بەدەستی ڕاستیان وەری دەگرن دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ﴾ جا ئەگەر کەسێك نامەی عەمەلی بدرێتە دەستی ڕاستی ئەوە لەخۆشیان شاگەشکە دەبێ و توشی هەر کەسێ ببێ دەڵێ: ئەوە نامەی عەمەلەو فەرموو بیخوێنەوەو بزانە چی تێدایە، دڵخۆش و تەڕدەماخە بەوەی کە ڕزگاری بووەو لەپێڕی بەهەشتیانە. ترسی لەوەپێشی نەماوە، لەترس و بیمی دەشتی مەحشەر قوتاری بووەو ڕزگاری بووە!

﴿إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ﴾ ئەمن گومانم وابوو تووشی حیساب و لێکۆڵینەوە دەبم و خودا لەسەر تاوانەکانم سزام دەدا، وەلێ خودا بە فەضل و گەورەیی خۆی عەفوی کردم و لێم خۆش بوو.

یان مانای وایە: من لەدونیادا دەمزانی و لێم ڕوون بوو، کە لەم ڕۆژەدا حیساب و لێکۆڵینەوەم لەگەڵ دەکرێ و ئەم ڕۆژە هەردێ و گومان لەهاتنیدا نیە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُوا رَبِّهِمْ﴾ (البقرة/٤٦).

(الضحاك) دەڵێ: هەموو ووشەیەکی (ظن) لەقورئاندا ئەگەر لەموسوڵمانەوە بوو بەمانا یەقینیە، ئەگەر لەکافرەوە بوو بەمانا گومانە.

حەسەن لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: موسوڵمان لەدونیادا گومانی بە خودای خۆی باش بووەو کردەوەی باشی بۆ قیامەت ئەنجام داوە، کافر گومانی بە خودای خۆی خراپ بووە کردەوەی خراپی ئەنجام داوە.

ئەمجار پەروەردگار سەرەنجامی موسوڵمانی کردار چاك ڕوون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ، فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ، قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ ئەو لەژیانێکی خۆش و خۆشگوزەرانیدایە، ژیانێکی وەها گلەیی لێ نەکرێ، لەناو باخ و باخاتێکی

بـەرزو شـكۆمەندىدا دەبـن، بـەرزو پـیرۆز لەهـەموو رویەكـەوە لـەرووی مادییـەوە لەرووی مەعنەویشەوە.

كۆشـكی خـۆش‌و ڕازاوە، هـەموو كـاتێ گـوزەران تیانـدا خـۆش‌و دلگـیرە، میـوەی درەختەكان شۆڕبۆتەوە، كەسێك بەپێوە بـێ یـان بەدانیـشتنەوە بـێ دەسـتی دەگاتـە میوەكان. چۆنێك بیەوێ ئاوا میوەكەی لێ نزیك دەبێتەوە. پێیان دەگوترێ:

﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَـةِ﴾ ئـەی خوداپەرسـتان‌و كـردار چاكەكان، لـەناو بەهەشـتی ڕازاوەو ڕەنگینـدا خـواردنی خـۆش‌و بـەتام بخـۆن‌و ئـاوو شـلەمەنییەكانی تـری بخۆنـەوە، نەوشـی گیانتـان بـێ، هـەموو كاتێكتـان خـۆش‌و خۆشگوزەرانییە، چونكە ئێوە لەدونیادا كـردار چـاك بـوون‌و بیروباوەڕتـان پەسـەند بووە، ئێستا لەپاداشتی ئەوەدا بەفەضل‌و ڕەحمـەتی خـودا ئـەو بەهەشـتەتان پـیرۆز بێ‌و بۆ هەتا هەتایە تێیدا بمێننەوە.

هەڵبەتـە چـوونە نـاو بەهەشـت بـە فـەضل‌و ئیحـسانی پـەروەردگارە، چـونكە لەحەدیثی صەحیحدا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ( إعملوا و سـددوا وقاربوا، واعلموا أنَ أحداً لن يدخله عمله الجنة، قالوا: ولا أنت يا رسول الله؟ قال: ولا أنا إلا أن يتغمدني الله برحمة منه وفضل).

## حاڵ‌و وەزعی كافرو بەدبەختەكان لە ڕۆژی قیامەتدا

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ

صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِئُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾

لەوەپێش باسی حاڵو وەزعی خواپەرستە بەختەوەرەکانی کرد، شوێنی حەوانەوەو نازو نیعمەتی بەهەشتی وەصف کردن، ئەمجار لەبەرامبەر ئەوانەدا حاڵو وەزعی کافرە بەدبەختەکان لەرۆژی قیامەت دەست نیشان دەکا دەفەرموێ:

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ﴾ ئەو کەسەش کە: نامەی ئەعمالی بدرێتە دەستی چەپی، یان لەدواوە ڕا پێی بدرێ، هاواری لێ هەڵدەستێو غەمو پەژارەی لەئەندازە بەدەر دای دەگرن، بەهەناسە ساردیو دڵتەنگییەوە دەڵێ: خۆزگە هەر نامەی عەمەلم پێ نەدرایە.

﴿وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ، يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ﴾ خۆزگە هەر نەمزانیایە حیسابم چۆنەو چیە، کاشکێ ئەو مردنەی لە دونیادا بەسەرم هات کۆتایی ژیانم بوایەو ئیتر زیندو نەکرامایەتەوە، بەدبەختو چارەڕەش خۆی کاتێك ناوەڕۆکی نامەی ئەعمالی خۆی دەبینێ، ئاواتەخوازی مردنە، چونکە دەزانێ بەرەوکوێ کێشی دەکەنو سەرەنجامی چیە.

قەتادە دەفەرموێ: ئاواتە خوازی مردنە لەکاتێکدا لەدونیادا مردنی لەهەموو شتێك بەلاوە ناخۆشتر بوو. هیچ شتێکی بەئەندازەی مردن بەلاوە قێزەونو بێزراو نەبوو... نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَاباً﴾(النبأ/ ٤٠).

ئەمجار خەم و خەفەتی ئەوە دەخوا کە ئەو شتانەی لەدونیادا هەوڵی بۆ دەدان، هیچیان فریای نەکەوتن، دەڵێ: ﴿مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ، هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ﴾ ماڵ و سامانەکەم کە: لەدونیادا زۆرم هەڵپە بۆ کرد، هیچ سودی پێ نەگەیاندم، بەرگری هیچ سزاو نارەحەتیەکی لێ نەکردم، بەڵگەو شایەتم لەدەس چوو، پلەو پایەو جاهوو سوڵتانم فەوتا، سزایان لێ دوور نەخستمەوە ئای ماڵوێران و خەسارەتمەن خۆم!!

ئای لەو تەنگانەیەی کە: لەم کاتەدا فەرمان لەپاشاو فەرمانڕەوای گشتی و (مالك يوم الدين)ەوە دەردەچێ، بۆ ئەو فریشتانەی کاروباری دۆزەخیان پێ سپێرراوە، فەرمانەکە بەجۆرێکە دڵ دەخاتە لەرزەو موچوڕکە بەجەستەدا دێنێ و دەنگ دەتاسێنێ. دەفەرموێ:

﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ، ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ، ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعاً فَاسْلُكُوهُ﴾ ئەو تاوانبارە بگرن، زنجیرو کۆت بخەنە دەست و ملی و توند شەتەکی بدەن، ئەمجار تورِی دەنە ناو دۆزەخەوە، ئەمجار بیخەنە ناو زنجیرێکەوە کە: حەفتا گەز درێژە، ئەو زنجیرەی تێوە بهاڵێنن با هیچ جەم و جوڵێکی نەمێنێ و سزاو سوتانی دۆزەخ بچەژێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم دێژێ: کاتێ فریشتەکان ئەم فەرمانەیان ئاراستە دەکرێ دەسبەجێ حەفتا هەزار فریشتە پەلاماری دەدەن، پەلاماری ئەو ئادەمیزادە بێ دەسەڵاتە دەدەن؛ هەر فریشتە لەعاست خۆیەوە پەلاماری دەداو زنجیری دەخاتە مل!!

ئەمجار پەروەردگار هۆی ئەو عەزابدانە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ كَانَ لا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَلا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ بێگومان ئەم تاوانبارە لەدونیادا کافرو بێ بڕوا بوو، بڕوای بە خودای گەورەو خاوەن دەسەڵات نەبوو، خەڵکی هەڵنەدەنا بۆ یارمەتیدانی هەژارو بێ نەوایان، گوێی نەدەدا بەبرسیەتی ئاتاجان و

دڵی پێیان نەدەسوتاو ئاگری برسیایەتی ئەوانی نەدەکوژاندەوە. بەکورتی مافی خودای نەدەدا بەندایەتی بۆ نەدەکرد، مافی بەندەکانی نەدەدا، بەمجۆرە چاکەیان لەگەڵ بکاو یارمەتییان بدا!

﴿فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ﴾ ئەمرۆ کە: رۆژی قیامەتە کەس نیە فریای بکەوێ، دۆستێکی نیە شەفاعەتی بۆ بکا، یان لەعەزاب رزگاری بکا.

﴿وَلا طَعَامٌ إِلاَّ مِنْ غِسْلِينٍ، لا يَأْكُلُهُ إِلاَّ الْخَاطِئُونَ﴾ لەناو دۆزەخدا هیچ خواردەمەنیەکی نیە جگە لەو کێم و زوخاوەی لە جەستەی دۆزەخیەکانەوە دەچۆڕێ کە: ئەو خۆراکە ناخوا جگە لە تاوانباران، قەتادە دەڵێ: ﴿غِسْلِينٍ﴾ خراپترین خۆراکی دۆزەخیانە..

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ﴾ (الغاشية/٦) (ضريع) رومەکێکی چقڵاویە، تابڵێی تامی تاڵە.

لەسورەتی (صافات)و سورەتی (واقعة)دا دەفەرموێ: خۆراکی دۆزەخیەکان زەقومە. جا ئەگەر ئەم سێ خۆراکە (غیسلین، ضەریع، زەقوم) یەك خۆراك بن ئەوە ئاشکرایەو هیچ جێگای قسە نیە، خۆ ئەگەر ئەم خۆراکانە جیاجیا بن، ئەو کاتە دەگوترێ: عەزابی خودا چەند جۆرێکەو شێوازی هەیەو تاوانبارانیش هەمە جۆرن برێکیان (غیسلین)خۆرو هەندێکیان (زەقوم)خۆرو تاقمێکیشیان (ضەریع)خۆرن!! خودایە بمانپارێزیو نەمانخەیتە پێری ئەوانەوە..

## بـەگـــەورە گرتن و گرنگی‌دان بەقـورئـان و سەلمـانـدنـی کە بەنیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖۚ قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوۡلِ كَاهِنٖۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذۡكِرَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعۡلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسۡرَةٌ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٥٢﴾ ﴾

لەوە پێش رابوونی قیامەت و وەزع و حاڵی کافرەکانی لەو رۆژەدا روون کردەوە، ئەمجار کۆتایی بەسورەتەکە دێنێ بە دوپات کردنەوەو سەلماندنی ئەوە کە: قورئان کەلامی خودایەو بەنیگاو سروش نێرراوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، وَمَا لا تُبْصِرُونَ، إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ واتە: سوێند ناخۆم، شتەکە هێندە ئاشکرایە پێویست بە سوێند ناکا، ئەمە ئەگەر پیتی (لا) زێدە نەبێ. ئەگەر بەزێدەی دابنێین ئەو کاتە ماناکەی بەم جۆرە دەبێ: سوێند دەخۆم بۆ ئێوە بەو مەخلوقاتەی دەیبینن لە بوونەوەردا کە نیشانەی پاکی و بەرزی و بێ کەم و کوڕیمە لەزات ء صیفاتمدا، هەروەها سوێند دەخۆم بەو شتانەی

لەئێوە نادیارن و غەیبین، ئەم قورئانە شك و گومانی تێدا نیە کەلامی خودایەو بەسروش نازڵی کردوە بۆ بەندەو فروستادەی خۆی کە: موحەممەدەو خودا هەڵی بژاردوە بۆ گەیاندنی پەیامی خۆی بەبەندەکانی، خوێندنەوەو گەیاندنی بە ئێوە لەلایەن پێغەمبەرێکی رێزدارو دەست پاکەوەیە، چۆنی بۆ نازڵکراوە ئاوا بەبێ گۆڕانکاری کردن تێیدا، بەئێوەی گەیاندووە!

زۆربەی زۆری موفەسسیرین و زانایانی تری ئیسلام پێیان وایە: مەبەست بە(رسول) لەم ئایەتەدا حەزرەتی موحەممەدە ﷺ نەك جوبرائیلە، چونکە دوا بەدوای ئەوە دەفەرموێ:

﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلاً مَا تُؤْمِنُونَ﴾ ئەو قورئانە قسەی شاعیر نیە ئێوە بەهەڵە چون کە دەڵێن: ئەم قورئانە شیعرەو موحەممەد ﷺ شاعیرە، بە هیچ جۆرێك قورئان لەشیعر ناچێ، شیعر وەزن و قافیەی هەیە، ئایەتەکانی قورئان وەها نین. شیعر هەڵقوڵاوی (إنفعالات)و عاتیفەو خەیاڵەو کەم وادەبێ لەسەر یەك تێڕوانین و دیدو بۆچون دەربارەی ژیان ثابیت بێ، بەڵام قورئان بەرنامەیەکی یەکانگیری تەواو بۆ ژیان دادەڕێژێ و یەك تێڕوانینی بەردەوام و نەگۆڕی هەیە بەرامبەر بوونەوەرو ئەوەش دوپات دەکاتەوە کە: سەرچاوەی ئەم قورئانە پەروەردگارە. .. .. . الخ

وەلێ وێڕای ئەو راستیەی قورئان و بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ ئێوە کەم ئیمان دێنن، کەمتر بڕوا دەکەن، ئەو بڕوا کەمەی هەتانە، هیچ سودی لێ وەرناگرن...

چونکە عەرەبەکان هەموویان ئیمانیان بەبڕێ لە پەیامی ئیسلام هەبوو، هەندێ لەو شتانەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دەکرد، ئەوان تەنفیذیان دەکرد. بۆ نموونە وەکوو خێرکردن و صیلەی رەحم و داوێن پاکی و ئەم جۆرە شتانە..

﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ﴾ قورئان قسەی کاهین و کۆڵەوە نانیەکانیش نیە، چونکە قورئان دژایەتی شەیاتینیەکان دەکا، ناگونجێ بە ئیلهام و یارمەتیدانی

ئـەوان قورئـان دانرابـێ، وەلێ ئێـوە کـەم بـیر دەکەنـەوەو لەشـت وردنابنـەوە بۆیـە سەرتان لێ شێواوەو ناتوانن ڕێبازی حەق‌و ڕاست بدۆزنەوە!

﴿تَنزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ قورئـان قـسەی شـاعیرو کـاهین نیـە بـەڵکوو لەلایـەن خـودای ئـادەمیزادو جندۆکـەوە نـازڵ کـراوە، خـودا بـە جـوبرائیلی ئـەمیندا بـۆ پێغەمبـەری نـاردوە، تـا بەخـەڵکی ڕابگەیـەنێ‌و بانگـەوازییان بکـا بـۆ پابەنـدبوون بـەناوەڕۆکی‌و ڕەنگدانــەوەی قورئــان لەرەوشــت‌و ڕەفتــارو ئاکاریانــدا، بـۆ ئــەوەی لەسۆنگەی ئەم قورئانەوە بەختەوەریی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر ببێ.

ئەمجار جەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە: موحەممـەد ﷺ نـاتوانێ بـۆ خـۆی قورئان دابنێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ﴾ ئەگـەر لەفـەرزی مـەحاڵدا موحەممـەد ﷺ یـان جوبرائیـل، بـۆ خۆیـان قـسەیەك هەڵبەستن‌و پاڵ خـودای بـدەن، بەتوندوتیـژی دەیـانگرین‌و خێـرا سـزایان دەدەیـن‌و تۆڵەیان لێ دەستێنین، لەناویان دەبەین.

﴿ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ﴾ ڕەگی (وتین)مان دەبڕی؛ ئەو ڕەگەی دڵ‌و سـەر پێکـەوە دەبەستێتەوە دەمان فڕتاندو یەکسەر گیانی لەدەست دەدا.

﴿فَمَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ کەس نەدەبوو لەئێوە بتوانێ ببێتە لەمپـەڕو دەسـتی ئێمـە بگـرێ‌و نـەهێڵێ ئـەو کارەیـان بەسـەر بێـنین. دەی کـەوابێ چـۆن موحەممەد یان جوبرەئیل جەسارەتی ئەوە دەکەن درۆ لەسەر خودا هەڵبەستن؟!

﴿وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِلْمُتَّقِينَ﴾ قورئـان پەنـدو ئامۆژگارییـە بـۆ تـەقواکاران، ئەوانـەی ترسـی خودایـان لـە دڵدایـەو هـەرگیز سەرپێـچی فەرمانـەکانی ناکـەن، ملکـەچ‌و پابەنـدن بەفـەرمان‌و جڵەوگیرییـەکانی. چـونکە تـەقواکاران دڵیـان ئامادەباشـی وەرگرتنی هیدایەت‌و حەق‌و ڕاستـیە ﴿وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنْكُمْ مُكَذِّبِينَ﴾ ئێمە دەزانـین هەنـدێکتان بەئەنقەسـت‌و ملـهوڕیی قورئـان بەدرۆدەخەنـەوە، ئێمـە ڕۆژی

قیامەت سزاتان دەدەینەوە، بڕێکیشتان بڕوای پێ دەکەنو شوێن پێغەمبەر ﷺ کەوتوون، دڵنیان لەوەی کە هیدایەتتان دەدا بۆ ڕێبازی حەقو ڕاستی.

﴿وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ بێگومان قورئان دەبێتە داخو کەسەر لەسەر دڵی کافرەکان، کاتێك دەبینن موسوڵمانان پاداشتی باش وەردەگرن.

﴿وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ﴾ بێگومان قورئان حەقو ڕاستو یەقینە، شكو گومانی تێدا نیە لە خوداوە هاتووە، قسەو ئاخاوتنی خودی پێغەمبەر نیە، کەوابێ: ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ ئەو خودایەی ئەم قورئانە گەورەو پیرۆزەی نازڵکردووە لەهەموو عەیبو لەککەو کەمو کوڕییەك بەدووری بگرە تەسبیحاتی ئەو خودا گەورەو خاوەن دەسەڵاتە ڕەهایە بکە، بڵێ: (سبحان الله)، شوکر و سوپاسی بکە لەسەر ئەو نیگایەی بۆی ناردوییو هەڵی بژاردوی بۆ فروستادەیی، هەمیشە بە پاكو تەمیز ناوی خودای خۆت بێنە، ناوێکی بۆ بەکاربێنە کە: شیاوی خودابێ، بەو ناوانە ناوی بێنەو هاواری لێ بکە کە: بۆ خۆی دایناون بۆ خۆی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی المعارج

ئەم سورەتە مەککیەو چلو چوار ئایەتە، لەدوای سورەتی (الحاقة) نازڵ بووە. ناونراوە سورەتی (المعارج) چونکە لەسەرەتاکەیدا ئایەتی ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ﴾ هەیە، واتە: فریشتەکانو جوبرائیل کە: بەرپرسیاری نیگاو سروش هێنانە بۆ پێغەمبەران بەرز دەبنەوە بۆ لای پەروەردگار.

ئەم سورەتەش وەکوو سورەتە مەککییەکانی تر باسی بنەماکانی عەقیدەو بیروباوەڕ دەکا. بەتایبەتی گرنگی دەدا بەباسی زیندووبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەی سارای مەحشەرو دیمەنە سامناکەکانی دۆزەخ.

ئەمجار باسی سروشتی ئادەمیزاد دەکا کە: لەسەر هیچ بارێك خۆڕاگرو پشوو درێژ نیە، بەنازو نیعمەت لەخۆ بایی دەبێ و یارمەتی هەژاران نادا، کاتێکیش تووشی تەنگ و چەڵەمە دەبێ جەزەع و فەزەع دەکا.

## هەڕەشە لەموشریکەکان بەعەزابی قیامەت و جەخت کردنەوە لەسەر هاتنی عەزابەکە

﴿ سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ١ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ٢ مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ٣ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ٤ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ٥ إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا ٦ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا ٧ يَوۡمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلۡمُهۡلِ ٨ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٩ وَلَا يَسۡـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمٗا ١٠ يُبَصَّرُونَهُمۡۚ يَوَدُّ ٱلۡمُجۡرِمُ لَوۡ يَفۡتَدِي مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِئِذِۭ بِبَنِيهِ ١١ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ١٢ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِي تُـٔۡوِيهِ ١٣ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ يُنجِيهِ ١٤ كَلَّآۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ١٥ نَزَّاعَةٗ لِّلشَّوَىٰ ١٦ تَدۡعُواْ مَنۡ أَدۡبَرَ وَتَوَلَّىٰ ١٧ وَجَمَعَ فَأَوۡعَىٰٓ ١٨ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی(١-٢) نەسائیو ئیبنوحاتەم لەئیبنوعەبباسەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: ئایەتی ﴿سَأَلَ سَائِلٌ﴾ دەرحەق (النضر)ی کوڕی (الحارث)نازڵ بووە، ئەوەبوو ئەو پیاوە (خراپە گێل کەزابە) وتی: ﴿اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾.

ئیبنوحاتەم لە (السدی)یەوە دەربارەی ئایەتی ﴿سَأَلَ سَائِلٌ﴾ دەڵێ لەمەککە نازڵ بووە، دەربارەی (النضر)ی کوڕی (الحارث)ە کە وتی: ﴿اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ . . . الآية﴾ هاتۆتە خوار بێگومان حەقیقەتی قیامەتو چۆنیەتی زیندوبوونەوە لای موشریکەکانی مەککە شتێکی نەسەلمێنراو بوو، بەهیچ شێوەیەك بڕوایان بە رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە نەبوو، بەوپەڕی سەرسامییەوە بەرەنگاری هەواڵو بانگەوازی بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو رۆژە دەبوونەوە. بۆیە تەحەددایان لە پێغەمبەر ﷺ دەکردو بەتەحەدداوە، بە لاقرتێوە نەضری کوڕی حاریث دەیوت: موحەممەد بەسزا دەمانترسێنێ، دەبێ ئەو سزایە چی بێو بۆ کێ بێو کەی بێ؟. ئەی خودایە ئەگەر ڕاستە ئەم قورئانە لای تۆوە هاتووە دەی لەئاسمانەوە بەردبارانمان بکەو سزایەکی سەختمان بدە!

ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵکردو فەرمووی: ﴿سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ، لِّلْكَافِرِينَ لَيْسَ لَهُ دَافِعٌ﴾ داواکەرێك داوای سزایەکی هاتووی کرد، ئەو سزایە دێو گومانی تێدا نیە، یەخەی کافرەکان دەگرێو جگە لە خودا کەس نیە بتوانێ بیگێڕێتەوە، پرسیارەکە بۆ لاقرتێو گاڵتە پێکردنە، پرسیارکەرەکە نەضری کوڕی حاریثی کەلدەیە یان ئەبوجەهلە. ئەوەبوو بەتەحەدداوە وتیان: ﴿اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾(الأنفال/٣٢) دەی بادڵنیابن ئەو عەزابەی کافرەکان داوای دەکەنو لەهاتنی بەپەلەن، هەردێو گومان لەهاتنیدا نیە.

﴿مِنْ اللَّهِ ذِي الْمَعَارِجِ﴾ ئەو عەزابەیان بۆ دێ لەلایەن خودای خاوەن هەموو ئاستە بەرزەکانو پلەو پایەکان.

ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: ﴿ذِي الْمَعَارِجِ﴾ واتە: خاوەنی هەموو ئاسمانەکان، بۆیەش ناوی ئاسمانەکان بە ﴿الْمَعَارِجِ﴾ ناو دەبا چونکە فریشتەکان پێیاندا سەردەکەون. قەتادە دەڵێ: ﴿ذِي الْمَعَارِجِ﴾ واتە: خاوەنی نیعمەتو چاکە، چونکە نیعمەتەکانی خودا پلەپلەن، بۆ هەندێ کەس زۆرو بۆ هەندێکیان مام ناوەندیو بۆ هەندێکیان کەم.

﴿تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ فریشتەکانو جوبرائیل (روح الأمين) بۆ لای خودا بەرز دەبنەوە لە رۆژێكدا کە بە پەنجا هەزار ساڵ مەزەندە دەکرێ. واتە: ئەگەر ئادەمیزاد بیانەوێ ئەو رێگایە ببڕن پەنجا هەزار ساڵی دەوێ، وەڵێ فریشتەکان لەماوەیەکی زۆرکەمدا تەی ئەو مەسافە دەکەن، هەڵبەتە مەبەست لە (پەنجا هەزار) سنووردارکردنی ماوەکە نیە، بەڵکوو مەبەست ماوەی زۆرە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست بەو رۆژە رۆژی قیامەتە، واتە: حیسابو لێکۆڵینەوەی ئادەمیزاد لە سارای مەحشەردا پەنجا هەزار ساڵی دەوێ ئەمجار دۆزەخیەکان تورِ دەدرێنە ناو ئاگرەوە. پەیوەندی پرسیار لەهاتنی عەزابو بەرز بوونەوەی فریشتەکان بۆ بەراورد کردنە لەنێوان ماوەی رۆژ لەدیدو بۆچونی ئادەمیزادو ماوەی رۆژ لای خودا. ئەوان پێیان وایە دونیا دورو درێژە وەڵێ لای خودا کورتو کەمخایەنە..

لە سورەتی (السجدة) لەئایەتی پێنجەمدا دەفەرموێ: ﴿يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾(السجدة/٥) لە سورەتی (الحج)یشدا دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْماً عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾(الحج/٤٧).

هەندێ لە موفەسیرین بۆ بەراورد کردن و جەمع لەنێوان ئایەتەکاندا دەڵێن: قیامەت شوێن شوێن و مەوقیف مەوقیفە، پەنجا مەوقیفی هەیە، هەر مەوقیفەی هەزار ساڵە..

**هەندێ لەموفەسیرین دوو مانایان بۆ ئایەتەکان کردوە:**

١- رۆژی قیامەت (مەوقیف)و رۆژی وای تێدایە هەزار ساڵ درێژە رۆژی وای هەیە پەنجا هەزار ساڵە واتە: پەروەردگار کاروباری بوونەوەر هەڵدەسوڕێنێ هەر لەو کاتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناون تا رابوونی قیامەت. پاشان هەموو کاروبارێك بۆ لای خۆی دەگەڕێتەوە لەرۆژێکدا کە رۆژی قیامەتەو درێژ خایەنەو ئەندازەی هەزار ساڵە.

٢- پەروەردگار قەزاو قەدەری دەربارەی دانیشتوانی سەر زەوی بە فریشتەکانیدا دەنێرێتە خوار، پاشان فریشتەکان یان هەواڵی روداوەکانی سەرزەوی لەگەڵ فریشتەکاندا بەرز دەبنەوە لەرۆژێك لەرۆژەکانی دونیادا، ئەو فریشتانە لەو رۆژەدا مەسافەی هەزار ساڵ بەحیسابی رۆیشتنی ئادەمیزادیان بڕیوە.

مامۆستا(عبدالکریم الخطیب) دوای هێنانی چەند ڕاڤەو تەفسیرێك بۆ ئەم ئایەتانە، دەفەرموێ: ئەوەی دڵوەری دەگرێ و بەلامەوە تەفسیرێکی وێچووە بۆ ئەو دوو رۆژەی قورئان باسیان دەکا؛ یەکیان هەزار ساڵ و ئەویتریان پەنجا هەزار ساڵ ئەوەیە: ئەو دوو رۆژە مەزەندەی دوو جۆر لەدەورەو هەڵسوڕانی قەبارە ئاسمانییەکان دیاری دەکەن، ئەو رۆژەی کە: ئەندازەکەی هەزار ساڵە لەساڵ و رۆژەکانی سەر زەوی، ئەوە رۆژی ئەستێرەیەکە لە ئەستێرە ئاسمانیەکان کە بە هەزار ساڵی سەر زەوی ئەو یەك جار هەڵسوڕان و خول تەواو دەکا. ئەو رۆژەیش کە بەپەنجا هەزار ساڵ مەزەندە دەکرێ رۆژی ئەستێرەیەکی ترە کە: بەپەنجا هەزار ساڵی سەر زەوی، ئەو یەك خول تەواو دەکا...

بێگومان درێژخایەنی رۆژی قیامەت بەنیسبەت کافرەکانەوەیە، ئەگینا بەنیسبەت موسوڵمانانەوە کورت خایەنە، ئاماژە بەو فەرموودەی

کە: ئیمام ئەحمەدو ئیبنو جەریر لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕۆژی قیامەت چەند درێژە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (والذي نفسي بيده انه ليخفف عن المؤمن حتى يكون أخف عليه من صلاة مكتوبة يصليها في الدنيا) ئەرك و ماوەی رۆژی قیامەت لەسەر موسوڵمان سوك دەكرێ هەتا وای لێ دێ كەمتر لە ئەنجامدانی نوێژێكی فەرز دەبێ...

﴿فَاصْبِرْ صَبْراً جَمِيلاً﴾ ئەی موحەممەد! تۆ بەپرسیاركردنی شێوە قەشمەری و ملهورانەیان تەنگە تاو مەبە. بەبڕوا نەكردن و پشت هەڵكردن لەپەیامەكەت دڵگیر مەبە. لەبەرامبەر بەدرۆخستنەوەیان بۆت، پشوو درێژبە. گوێ مەدەرە پەلە كردنیان لەهاتنی عەزاب بۆیان، تەحەددا كردنیان لەتۆ كە بەلایانەوە دوورە شتی‌وا رو بدا. صەبری جوانت هەبێ، صەبر بگرە، لەغەیری خودا هاوار مەكەرە كەس، پشت هەر بەئەو ببەستە.

﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيداً، وَنَرَاهُ قَرِيباً﴾ ئەوان هاتنی قیامەتیان بەلاوە دوورە، رابوونی قیامەتیان پێ مەحاڵە، هەروەها ماوە درێژی قیامەت بەئەندازەی پەنجا هەزار ساڵ بەمەحاڵ دەزانن. ئێمە دەزانین كە: قیامەت دێ و نزیكیشە هاتنی، چونكە هەرشتێك هاتنی مسۆگەر بێ نزیكە هاتنی...

ئەمجار پەروەردگار برێ دیاردەی ئەو رۆژە بەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاءُ كَالْمُهْلِ، وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ، وَلا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيماً﴾ رۆژی قیامەت رۆژێكە ئاسمان وەكوو خڵتەی زەیتی لێ دێ و دەبێتە ماددەیەكی روون و رەوان و هیچ رەقایی و پتەویەكی تێدا نامێنێ. كێوەكان وەكوو خوریی شیكراوەیان لێ دێ، هیچ خزمێ لەخزم و كەسی ناپرسێ، خزم خزمی خۆشەویستی خۆی دەبینێ. بەلام لەبەر وەزعی سامناك و وەزعی ناخۆشی خۆی نای پەرژێ پرسیاری لێ بكا.

﴿يُبَصَّرُونَهُمْ﴾ هەموو خزمێ خزمی خۆی دەبینێو دەیناسێتەوە، کەس کەسی لێ گوم نابێ، یەکتر دەبینن بەبێ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ یەکتری بکەن.

﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ، وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ، وَمَنْ فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ يُنجِيهِ﴾ کافرو تاوانبار پێیان خۆشە لەو رۆژەدا کورِو خێزانو براو هۆزو خزمو کەسو کاری هەرچی وا لەزەویدا هەیە، بەگیانداروو بێ گیانەوە بیکاتە فیدیەو قوربانی بۆ خۆی، بەمەرجێ لەو سزایەی وا لە پێشیەوە رزگاری بێ، بەڵام بێ سودەو هیچ فیدیەو قوربانیەك نیەو هیچ شتێك فریای ناکەوێ..

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ! اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْماً لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِ شَيْئاً إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ (لقمان/٣٣) یان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ﴾ (المؤمنون/١٠١) یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ، وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ (عبس/٣٤-٣٧).

﴿كَلَّا إِنَّهَا لَظَى، نَزَّاعَةً لِلشَّوَى، تَدْعُوا مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّى، وَجَمَعَ فَأَوْعَى﴾ نانا، شتی وانیە، فیدیەو قوربانی لەتاوانباران قبوڵ ناکرێ، تەنانەت ئەگەر هەموو ماڵی دونیاو خۆشەویسترینو بەنرخترین شت پێشکەش بکا، بێ سودە، ئەوە دۆزەخە بەڕاستی! رۆژی قیامەتەو کاتی سزاو تۆڵەیە، ئەوە ئاگرو بڵێسەی دۆزەخە. زۆر گەرمو لەرادەبەدەر سوتێنەرە، هێندە گەرمو بەتینە پێستی جەستەی دادەڕنێ، ئێسقانی دەردەخاو پاشان وەکوو خۆی لێ دێتەوەو سەر لەنوێ دادەپلۆخێتەوە.

هەرکەسێ لە دونیادا پشتی لە ئیمان هەڵکردبێو روی لە حەق وەرگێڕا بێ ماڵی کۆکردبێتەوەو بەشی هەژارانی لێ نەدابێ. دۆزەخ ئامەزرۆیەتیو بانگی لێ دەکاو بۆ لای خۆی کێش دەکا.

## ئەو ڕەوشتانەی چارەسەری سروشتی ئادەمیزاد دەکەن

﴿ ۞ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى جَنَّٰتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

لەوەپێش دیمەنە سامناکەکانی قیامەتی ڕانواند، ئەمجار سروشتی ئادەمیزادو خۆڕانەگری‌و بێ چیکڵدانەیی‌و بوغڕایی‌و ڕژدی‌و چاوچنۆکی ئادەمیزاد بەیان دەکا.

پاشان موسوڵمانان جەرت دەكاو (دە) صیفاتی جوانو پەسەندیان رادەنوێنیو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعاً، إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعاً، وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعاً﴾ بێگومان ئادەمیزاد لەسەر بەتەماعیو بێ چیكڵدانەییو نا ئارامی سروشتی دارێژراوە، نەخۆ بۆ ساردی رادەگرێ نەخۆ بۆ گەرما رادەگرێ، لەسەر بەلاو ناخۆشی صەبری نیە، لەسەر نازو نیعمەت سوپاسگوزار نیە. هەر كاتێ توشی هەژاریو نەخۆشیو زەرەرو زیانێ بێ دەست دەكا بەهاتو هاوارو جەزەع و فەزەع. كاتێكیش خێرو خۆشیو لەشساغیو سامانو پلەو پایەی دەستكەوت رژدو بێ خێرو نامەردە. یارمەتی هەژاران ناداو پیاوەتی لەدەست هەڵنایە.

ئەمجار خودا كەسانێك جەرت دەكا كە: (دە) رەوشتیان تێدانو دەفەرموێ: هەموو ئادەمیزادێك ئەو رەوشتە ناشیرینو ناپەسەندەیان تێدان ﴿إِلاَّ الْمُصَلِّينَ. الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلاتِهِمْ دَائِمُونَ﴾ جگە لەو موسوڵمانە نوێژكەرانەی هیدایەت دراون بۆ رێبازی حەقو نوێژەكانیان بەئەنجام دەگەیەنن، پارێزگاری كاتەكانیان دەكەنو لەكاتی خۆیاندا نوێژەكانیان بەجێ دێنن. هیچ شتێك لەنوێژەكانیان غافڵیان ناكاو بە رێكوپێكی فەرزو سوننەتەكانیان ئەنجام دەدەن، پەیوەندیان بە خوداوە توندوتۆڵەو خوشوعو سوكونیان هەیە، ئەوانە لەو پێرە سەرزەنشتكراوانە نین. بەهۆی ئیمانو ئایینی حەقیانەوە بەختەوەری دونیاو قیامەتن.

﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ، لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ ئەوانەی لەماڵو سامانیاندا بەشی دیاریكراو دەدەن بە ئاتاجانو زەكاتی ماڵو سامانی خۆیان دەردەكەن، چاو ورد دەكەنەوە كێ هەژارەو پێویستی بەیارمەتی هەیە بەشی خۆیان دەدەنێ، خێرو خێراتو نەزرو صەدەقەی بەردەوامو بەهاناچونی هەژارانو داڵدەدانی ئاتاجان ئەنجام دەدەن.

﴿وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەرابوونی ڕۆژی قیامەت هەیەو ترسی حیسابو لێکۆڵینەوەی دەشتی مەحشەریان لەدڵدایە. عیبادەتو خوداپەرستی دەکەن بەتەمای پاداشتنو ترسی عەزابیان هەیە.

﴿وَالَّذِينَ هُمْ مِنْ عَذَابِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ، إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ﴾ ئەوانەی لەعەزابی خودا ترسو بیمیان هەیە، بەهۆی ئەو ترسەوە کەمتەرخەمی لەئەنجامدانی (واجبات)دا ناکەنو تاوان ئەنجام نادەن، بێگومان عەزابی خودا مسۆگەرەو پێویستە کەس لێی ئەمین نەبێ. دەشێ هەموو کەس لێی بترسێ.

﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ﴾ ئەوانەی شەرمگای خۆیان لەحەرام دەپارێزنو توخنی شتێکی ناخەن خودا لێی حەرام کردبێ. تەنهاو تەنها لەگەڵ خێزانی خۆیدا یان ئەمەتەو جارییەی خۆیدا سەرجێیی ئەنجام دەدا. بەکارهێنانی شەرمگای خۆی لەگەڵ حەڵاڵی خۆیدا جێگای ڕەخنەو سەرزەنشت نیە. بەڵکوو پێویستو ئەرکی سەرشانیەتی داخوازییە جینسییەکانی خۆی بە حەڵاڵی دابین بکا. وەلێ ئەگەر کەسێك بیەوێ لەرێگای نامەشروعەوە داخوازییە جینسییەکانی دابین بکا، ئەوە سنوور بەزێنو تەجاوز کارە، لەڕێگای ڕاست لای داوەو سەرپێچی فەرمانی خودای کردوە، زیان بەخۆیو گەلو نەتەوەکەی دەگەیەنێ..

﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ ئەوانەی پارێزگاری سپاردە دەکەنو پابەندی بەڵێنو پەیمانی خۆیاننو پاشگەز نابنەوە.

ئەمانە ڕەوشتی موسوڵمانانو پێچەوانەشی ڕەوشتی دووڕووەکانە، وەکوو لەحەدیثی صەحیحدا هاتووە دەفەرموێ: (آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب وإذا وعد أخلف وإذا أؤتمن خان). نیشانەی دوڕوو سێ شتە: کەقسەی کرد درۆ بکا، کەوادەیدا پێچەوانەی وادەکەی هەڵسوکەوت بکا، ئەگەر سپاردەی لادانرا خیانەتی

لێ بکا. ﴿وَالَّذِينَ هُمْ بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ﴾ ئەوانەی شایەتیەك کە: لایانە لای دادوەرو قازی دەیدرکێنن و نایشارنەوە. بەبێ زیادەو کەم و کورِی چیان لایە رِایدەگەیەنن. حەق و راستی چۆنە ئاوا شایەتیەکەیان دەدەن، لەبەر خاتری خۆشەویستی لایەنێك و دژایەتی لایەنەکەی تریان شایەتیەکەیان ناگۆرِن.

﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ ئەوانەی پارێزگاری کات و شەرت و روکن و پێداویستی نوێژەکانیان دەکەن، لەکاتی خۆیاندا بەخوشوع و خضوعەوە نوێژەکانیان بەجێ دێنن و دوای نوێژکردنیش کارێك ناکەن ناپەسەند بێ و خێرو پاداشتی نوێژەکانیان پوچەڵ بێتەوە. بەحەزو ئارەزۆوە دەست دەکەن بەنوێژەکانیان، دڵ و دەرونیان لەهەموو مەشغەڵەتێکی دونیایی خاڵیە. بیر لەوە دەکەنەوە کە: ئاخاوتن لەگەڵ خودادا دەکەن و لەمانای وتەکانیان ورد دەبنەوە. دڵیان پەیوەست دەکەن بە خوداوەو لەئایەتەکانی قورئان و ویردو ذیکرەکان حاڵی دەبن. ﴿أُوْلَئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُكْرَمُونَ﴾ ئەوانەی ئەو رەوشتە ئاماژەپێکراوانەیان تێدان، ئەوانە لە بەهەشتی رازاوەو پان و بەریندا جێگیر دەکرێن و جۆرەها رێزیان لێ دەگیرێ و نازو نیعمەتی هەمە جۆریان بەسەردا دەرژێ.

## حاڵ و وەزعی پەیام رەتکەرەوەکانی پێغەمبەر ﷺ لەدونیاو قیامەتدا

﴿ فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهۡطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطۡمَعُ كُلُّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ أَن يُدۡخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٖ ﴿٣٨﴾ كَلَّآۖ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّمَّا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٩﴾ فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٤١﴾

﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَـٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَـٰشِعَةً أَبْصَـٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار وادەی بەهەشتی بەوانەدا کە: خاوەنی (دە) ڕەوشتی پەسەندن ئەمجار لێرەدا حاڵ و وەزعی کافرەکان رادەنوێنێ؛ چ لەدونیاو چ لەقیامەتدا، لەدونیادا سوورن لەسەر کوفرو زێدەڕەوەی دەکەن لەتاوانکردندا. بۆیە خودا هەڕەشەیان لێ دەکا بەلەناوبردنی بەکۆمەڵ و فەرمان بە پێغەمبەرﷺ دەکا کە: گوێیان نەداتێ و لێیان بگەڕێ بۆ رۆژی قیامەت. لە قیامەتیشدا کاتێك زیندوو دەکرێنەوە لەگۆڕەکانیان رادەبن و بەهەڵەداوان رادەکەن بۆ لای بتەکانیان و چاو بەرەو ژێرو ریسواو سەرشۆڕ.

دەفەرموێ: ﴿فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ، عَنْ الْيَمِينِ وَعَنْ الشِّمَالِ عِزِينَ﴾ چیە حاڵی ئەو موشریکانە لەدەوری تۆ کۆ دەبنەوە ئەی پێغەمبەر! هێندە بەپەلەن بۆ کوفرو بەدرۆخستنەوەت، هەر لەگەڵ گوێیان لەئامۆژگاری و ئایەتەکانی قورئان دەبێ، خێرا بێ سێ و دوو بیر لێ کردنەوە بەدرۆت دەخەنەوەو دەست دەکەن بەگاڵتە پێکردنت، ئەتۆ دەیان بینی کۆمەڵ کۆمەڵ لای راست و چەپتەوە دادەنیشن، جیاجیاو پرژو بڵاو کۆمەڵ کۆمەڵ، بەبیستنی قورئان هەڵدەسڵەمنەوە لەبەری هەڵدێن، گوێی خۆیانی لێ نەبان دەکەن.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ، كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنفِرَةٌ، فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾(المدثر/٤٩-٥١). جا وەکوو ریوایەتکراوە موشریکەکان لەدەوری پێغەمبەر ﷺ کۆدەبوونەوەو گوێیان لەئامۆژگاری و قورئان دەگرت و نەدەچووە دڵیانەوە. بەدرۆیان دەزانی و گاڵتەیان بەپێغەمبەرو پەیامەکەی دەکردو

دەیانگوت: ئەگەر راست بێ ئەمانەی لەگەڵ موحەممەددان دەچنە بەهەشت. بێگومان ئێمە پێش ئەوان دەچینە ناوی‌و لەوێ بەشی ئێمە لەهی ئەوان زۆر باشتر دەبێ. ئیتر پەروەردگار قەشمەری بەقسەو بۆچونەکەیان دەکاو لەچونە ناو بەهەشت نائومێدیان دەکاو دەفەرموێ:

﴿أَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِنْهُمْ أَنْ يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ؟﴾ ئایا ئەو موشریکانە بەتەمان وێڕای ئەو هەڵوێستو بیروباوەڕە ناپەسەندەیان‌و هەڵسڵەمینەوە لە قورئان‌و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرو هەڵهاتن لەحەق‌و راستی بەتەمان بچنە ناو بەهەشتەوە؟! حاشا وەلیلا؛ ئەوانە شوێنیان دۆزەخەو تورِ دەدرێنە ناوی بۆ هەتا هەتایە. ﴿كَلَّآ إِنَّا خَلَقْنَاهُمْ مِمَّا يَعْلَمُونَ﴾ نەخەیر، بائەوان بەتەمای چوونە ناو بەهەشت نەبن، ئێمە ئەو ئادەمیزادانەمان لەئاو دروست کردوە کە خۆیان دەیزانن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِينٍ﴾ (المرسلات/ ٢٠).

جاوەکوو چۆن توانیومانە لەو تۆوە دروستیان بکەین، بەو جۆرەش دەتوانین بیانمرێنین‌و زیندویان بکەینەوە، هەڵبەتە لە دیدو تێڕوانینی ئادەمیزادەوە کەسێك بتوانێ سەرەتا لەنەبووەوە ئادەمیزاد دروست بکا، پاش مردنی زیندوکردنەوەی ئاسانترە، هەرچەندە بەنیسبەت خوداوە هەموو کارێك ئاسان‌و چون یەکە، لای خودا کارێك نیە گران بێ‌و کارێك ئاسان بێ جا کە ئەوان لەو دڵۆپە ئاوە زەبوونە دروستکراون‌و ئەوەندە زەعیفن مردن یەخەیان دەگرێ‌و دەسەڵاتی خۆ لێ رزگارکردنیان نیە، ئیتر لەروانگەی ئەو دەسەڵاتە رەهاو بێ سنوورەمانەوە یاسای ئایین‌و ژیانمان بۆ داناون، رێگەی راستو پەسەندمان بۆ دیاری کردون، هەرکەسێك پابەندی ئەو رێگا راستەی ئێمە نەبێ، بەهەشتی نادرێتێ.

ئەمجار هەڕەشەی لەناوبردن‌و ریشەکێش کردنیان لێ دەکا ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو تاوان، ئەوان لەناو دەباو گەل‌و نەتەوەی تر دێنێتە کایەوەو دەیانخاتە شوێنی ئەوان..

دەفەرموێ: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ، عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ خَيْراً مِنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ سوێند دەخۆم بەخودای شوێن هەڵاتی خۆرو مانگو ئەستێرەکان لە هەموو شەوو ڕۆژێکی ساڵ دا، ئێمە دەتوانین و زۆر لامان ئاسانە کە ئێوە لەناو بەرین و گەل و نەتەوەیەکی باشترو گوێڕایەڵ و ملکەچ بۆ فەرمان و جڵەوگیریەکانی خودا بێنینە کایەوە، هیچ شتێك نیە بتوانێ ببێتە کۆسپ و تەگەرەو نەتوانین ویستەکانمان بەدی بێنین، ئێمە لەئاست بەدیهێنانی ئەو جۆرە کارانەدا دەستەوسان نین. وەلێ ئیرادەو حیکمەتمان داخوازی ئەوە بووە کە سزاکەیان دوابخەین بۆ ڕۆژی قیامەت.

ئەوانە سەریان لێ شێواوەو هیچیان بەسەر هیچیانەوە نیە، ئەوەتا ئەوان بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە، کەچی بەتەمای بەهەشتن، دان دەنێن بەوەدا کە خودا بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوێکە. کەچی ئیمانیان بەوە نیە کە: خودا بتوانێ جارێکی دی زیندویان بکاتەوە.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکا کە: گرنگی بە موشریکەکان نەداو کۆڵیان پێوە هەڵنەگرێ، تارۆژی قیامەت دێ و تۆڵەیان لێ دەسێنێ. دەفەرموێ: ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلاقُوا يَوْمَهُمْ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! وازیان لێ بێنە با قسەو ئاخاوتنی پڕوپووچی خۆیان بکەن، لە بەتاڵ و گومڕایی خۆیاندا بتلێنەوە، با سەرگەرمی کارو کردەوەی بێ نرخی خۆیان بن، هەتا دوچاری ڕۆژی خۆیان دەبن، هەتا کاتێك بەخۆیان دەزانن، کەوتوونەتە ناو تەنگ و چەڵەمەی ڕۆژی قیامەتەوە، توشی سزای سەختی تاوان و هەڵوێستیان دەبن.

﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنْ الأَجْدَاثِ سِرَاعاً كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾ ئەو ڕۆژەی لەگۆڕەکانیان ڕادەبن بەپیر بانگەوازی خوداوە بەهەڵەداوان کۆدەبنەوە بەرەو سارای مەحشەر ڕادەجمن، بەپەلە ڕۆیشتن و ڕاکردنیان بۆ سارای مەحشەر لەقیامەتدا

دەق دەشوبهێنە ئەو حاڵەتەی دونیایان کە: بە گورگەلۆقە بەرەو ئاڵا یان بتو صەنەمێك کە: ئامادەکراوە بۆ پەرستن رادەجمن و بەهەڵەداوان بەرەو هەدەفو ئامانجی خۆیان دەکشێن.

﴿خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ﴾ چاو بەرەو ژێرو سەرشۆڕو ریسوا، زەلیلیو پەشیمانی دایان دەپۆشێ، ناچارو بێ دەسەڵات روبەڕوی عەزابی سەخت دەبنەوە، لەتۆڵەی لوت بەرزیو تەکەببوری دونیایاندا توشی ئەو زەلیلیو بێچارەیی‌یە دەبن..

ئەو رۆژە سەختە پڕ کارەساتو ناخۆشە ئەو رۆژەیە کە: خودا هەڕەشەیان پێ لێ دەکاو لە تێکەوتنی رۆژێکی وەها دەیانترسێنێ، ئەو رۆژە پەشیمان دەبنەوە، بەڵام پەشیمانی دادیان نادا، خۆزگە دەخوازن هەر زیندونەکرانایەوە، یان پاش زیندوکردنەوەش جارێکی تر بمردنایەوو ئیتر ژیانیان نەبینیایەوە..

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتـــی (نوح)

ئەم سورەتە مەککییەو بیستو هەشت ئایەتەو دوای سورەتی (النحل) نازڵ بووە، ناونراوە سورەتی نوح چونکە لەسەرتاوە باسی چیرۆکی نوحو قەومەکەی دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ. . . .﴾

**پەیوەندی ئەم سورەتە لەگەڵ سورەتی پێشوودا لە دوو ڕوەوەیە:**

١- لەسورەتی پێشودا فەرمووی: ﴿إِنَّا لَقَادِرُونَ، عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ خَيْراً مِنْهُمْ﴾ لەم سورەتەشدا سەرگوزشتەی قەومی نوحمان بۆ دەگێڕێتەوە کە: بریتیە لەخنکاندنو لەناوبردنی سەرلەبەری ئەو گەلە، جگە لەوانەی ئیمانیان بە (نوح) هێنابوو، ئەوانی لەناوبردو گەلو نەتەوەیەکی تری هێنایە کایەوە.

٢- سەرەتای هەردوو سورەتەکان لێك دەچن لەوبارەوە کە: باسی ئەو عەزابو سزایە دەکا کە بۆ کافرەکان دانراوە ئەم سورەتەش وەکوو باقی سورەتە مەککییەکانی تر گرنگی دەدا بە عەقیدەو رونکردنەوەی بنەماکانی بیروباوەڕ کە بریتین لە بەندایەتیکردن بۆ خوداو گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی، پوچەڵکردنەوەی دیاردەی بتپەرستیو بەڵگەهێنانەوە لەسەر هەبوونی خوداو تاکو تەنهایی زاتی پاکیو دەسەڵاتو توانای بێ سنووری.

## سورەتـــی (نوح)

﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ① قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ② أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ③ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ④ ﴾

دەفـەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بێگومان ئێمە (نوح)مان کردە پێغەمبەرو رەوانەمان کرد بۆ سەر گەلەکەی‌و پێمان گوت: گەل‌و نەتەوەکەت لەعەزابی خودا بترسێنە پێش ئەوەی عەزابی بە ئێش‌و ئازاریان بۆبێ کە: ئەویش عەزابی دۆزەخە یان خنکاندنیانە بەتۆفان، ئەگەرتۆبە بکەن‌و ئیمان بێنن ئەو عەزابەیان لەسەر لادەچێ !!

حەزرەتی نوح یەکەم پێغەمبەرێکە کە: رەوانەکراوە بۆ سەر گەل‌و نەتەوەکەی لەپاش ئادەم. لەبارەی ئادەمەوە قورئان باسی رەوانەکردنی بۆ سەر گەل‌و تاقمێ ناکات، وێدەچێ حەزرەتی ئادەم لەپاش دابەزینی بۆ سەر زەوی‌و خەریکبوونی بەژیانی سەر زەوییەوە، مامۆستاو تەربیەت دادەری رۆڵەو نەوەکانی بووبێ..

لەدوای لەدونیا دەرچوونی حەزرەتی ئادەم‌و تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر وەچەو نەوەکانی لەرێبازی خوداپەرستی لایاندا، دەستیان کرد بەبتپەرستی سەرەتا چەند هەیکەل‌و وێنەیەکیان دروست کرد کە: ئاماژەیان دەکرد بۆ پیاو چاکانی رابووردویان، هەروەها بۆ چەند هێزێکی غەیبی‌و نادیار پاشان بەتێپەڕبوونی

ڕۆژگار، ئەو هەیکەل و وێنانەیان لێ بوونە حەقیقەت و ملیان دایە پەرستش بۆ کردنیان.

ئیتر پەروەردگار حەزرەتی (نوح)ی ڕەوانە کرد بۆ سەر ئادەمیزاد بۆ ئەوی بیانگێڕێتەوە بۆ خواپەرستی و یەکتاپەرستی بۆ ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕیان دەربارەی خوداو ژیان و بوون.

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە لەگێڕانەوەی سەرگوزشتەی پێغەمبەران ئەوەیە کە: حەزرەتی (نوح) تەمەنی درێژ بوو، نۆسەدو پەنجا ساڵ بەردەوام بانگەوازی نەتەوەکەی کرد، وادیارە تەمەنی ئادەمیزادی ئەو سەردەمە تێکڕا درێژ بووە، ئەم تەمەن درێژییەشیان ئاماژە بەوە دەکا کە: ژمارەی ئادەمیزاد لەو سەردەمانەدا کەم بووە، ئەمەش دابونەریتی خودا دەربارەی گیانلەبەران نیشان دەکا، کە هەر ڕەگەزو چینێك تەمەنیان درێژ بێ ژمارەیان کەمە. تا ژمارەیان زۆر بێ تەمەنیان کورت تر دەبێ. ئەمەش تەعادول و هاوسەنگییەکە پەروەردگار لەناو زیندەوەراندا دایناوە.

حەزرەتی نوح کە: خودا کردیە پێغەمبەرو ڕەوانەی کرد، خێرا دەستی بەبانگەوازیی خۆی کرد ﴿قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ وتی: ئەی قەومەکەم ئەمن هوشیارکەرەوەو ترسێنەرتانم لەعەزابی سەختی خودا، ڕێگای بەختەوەری و نەجاتبوون و سەرفەرازیتان نیشان دەدەم، بەگوێم بکەن و شوێنم بکەون.

﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ﴾ فەرمانتان پێ دەکەم کە: عیبادەتی خودا بکەن و یەکتاپەرست بن، مافی خودایەتی بدەنێ، پابەندی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی بن. خۆتان لەسەرپێچی فەرمانەکانی بپارێزن و چیتان پێ دەڵێم بەگوێم بکەن، چونکە من لەلایەن خوداوە ڕەوانەکراوم بۆ سەر ئێوەو ئەرکی سەرشانمە پەیامی پەروەردگارتان پێ ڕابگەیەنم!

جا ئەگەر ئێوە بەپیر بانگەوازییەکەمەوە بێن و شوێنم بکەون ﴿يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ خودا لەتاوانتان خۆش دەبێ، تەمەنتان درێژدەبێ و مەرگتان دوادەکەوێ بۆ ئەو کاتەی خودا بۆی مەزندەکردون، بەکورتی دوو وادەیان دەداتێ ئەگەر ئیمان بێنن و طاعەتی خودا بکەن. لێخۆشبوون لەتاوان، تەمەن درێژی.

زومەخشەری دەڵێ: (مەثەلەن) پەروەردگار بڕیاری دابوو ئەگەر گەلی نوح ئیمان بێنن هەزار ساڵ تەمەنیان دەبێ، ئەگەر لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان بمێننەوە تەمەنیان نۆ سەد ساڵ دەبێ، بەڵام ئەوان ئیمانیان نەهێناو خودا لەسەری نۆسەد ساڵەی تەمەنیاندا لەناوی بردن.

زانایانی ئیسلام لەم ئایەتەوە ئەوەیان وەرگرتووە کە: کردەوەی چاك و صیلەی ڕەحم تەمەن درێژ دەکا، ئەبو ئەعلا لەئەنەسەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صلة الرحم تزيد العمر) بەجێهێنانی صیلەی ڕەحم دەبێتە هۆکاری تەمەن درێژی.

﴿إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئێوە بەردەوام بن لەسەر کوفرو ئەو عەزاب و مەرگەساتەی خودا بۆی دیاریی کردون، هەر کاتێ هات گەڕانەوەو دواکەوتنی نیە، بەڵکوو بەحەتمی لەکاتی خۆیدا واقیع دەبێ. دەی کەوابێ ئێوە پەلە بکەن بۆ ئیمانهێنان و خوداپەرستی و خۆتان لەسزای سەختی خودا بپارێزن. ئەگەر ئێوە کەمێ زانیاریتان هەبوایە دەتانزانی کە ئەجەلی بڕیاردراو لەلای خوداوە هەرکاتێ هات دواکەوتنی نیە.

بەکورتی مەرگ شتێکی حەتمیەو دواکەوتنی نیە، وەلێ پەیوەستە بەشتی ترەوە، بەمەرجێ ئیمان بێنن تەمەنتان درێژدەبێ و مەرگتان دوادەکەوێ بەڵام هەر دەبێ بمرن، ئەگەر لەسەر کوفرو بێدینی بمێننەوە تەمەنتان کورت دەبێ و هەر

دەبێ تاڵاوی مردن بچێژن خۆ لادان لەمردن نیەو دەبێ هەموو زیندەوەرێك مردن یەخەی بگرێ.

## پاڕانەوەی نوح لە خوداو هانا بۆ بردنی

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَاءِيَ إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْاْ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّواْ وَٱسْتَكْبَرُواْ ٱسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْاْ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا

﴿١٨ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا ١٩ لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ٢٠﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند کە: حەزرەتی (نوح)ی کردوە بە پێغەمبەرو رەوانەی کردوە بۆ سەر گەلەکەی. ئەمجار لێرەدا باسی پاڕانەوەی نوح دەکا کە هانای بۆ خودا بردو شکاتی ئەوەی کرد کە: چەندێك ئەو بانگەوازیی نەتەوەکەی دەکاو لەعەزابی خودا دەیانترسێنێ، ئەوان پتر سوور دەبن لەسەر کوفرو بتپەرستی خۆیان.

ئەو چەندێك شێوازی بانگەوازیەکەی خۆی دەگۆڕێ بێ سودە، چەندێك پێیان دەڵێ: ئەگەر ئیمان بێنن خودا بارانتان بۆ دەبارێنێ ماڵو سامانو منداڵتان بۆ زۆر دەکا، بەختەوەریی دونیاو قیامەتتان بۆ دەستەبەر دەبێ، چەندێك بەڵگە لەسەر گەورەیی خوداو دەسەڵاتی رەهای رادەنوێنێو هەوڵیان لەگەڵ دەدا بۆ ئەوەی ئیمان بهێنن بەڵام ئەوان سورتر دەبن لەسەر کوفری خۆیان، دەفەرموێ:

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَاراً، فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلاَّ فِرَاراً﴾ حەزرەتی نوح کە: دڵنیا بوو لەئیمان نەهێنانی قەومەکەی، هانای بۆ پەروەردگار بردو شکاتی وەزعو حاڵی خۆی لاکردوتی: خودایە! من لەسەر فەرمانی تۆ ئەوە نۆسەدو پەنجا ساڵە بەردەوام بە ئەوپەڕی دڵسۆزیو لێبڕانەوە، بەبێ ئەوەی کەمتەرخەمی بکەم، بانگەوازیی نەتەوەکەم دەکەم، هەوڵیان لەگەڵ دەدەم بەهەموو شێوەو شێوازێك بانگەوازییم کردونو بارم لێ گۆڕیون، دەی بانگەوازی کردنم بۆیان هیچ کاری تێ نەکردن، بەڵکوو پتر شێلگیر بوونو پشتیان لە بانگەوازییەکەم هەڵکردو لێم دوورکەوتنەوە. هەرکە بانگم کردن بۆ نزیکبوونەوە لەحەقو ئیمان هێنان. ئەوان روویان لێ وەرگێڕاوەو پەرمیان بەکوفرو بێدینی خۆیان داوە.

﴿وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَاراً﴾ هەرکاتێك بانگیان کردبن و بانگیان بکەم، بۆ ئەوی ئیمان بەتاك و تەنهایی تۆ بێنن و بەندایەتیت بکەن بۆئەوەی لێیان خۆش بیّ، ئەگەر بواری راکردن و هەڵتیزانیان نەبیّ، پەنجەیان دەخەنە گوێچکەیانەوە بۆئەوەی بانگەوازییەکەم نەبیسن، بە پۆشاکەکانیان دەم و چاوی خۆیان دادەپۆشن بۆ ئەوەی دیدارم نەبینن قسەکانم نەبیسن، بەردوام بوون لەسەر کوفرو بتپەرستی و هاوەڵدانان بۆ خودا، لوتبەرزی دەنوێنن لەبەرامبەر قبولکردنی حەق و مل بۆ ڕاستی نادەن!! بەهیچ جۆریّ پیّ لەکەللەی شەیتان ناهێننە خواریّ.

﴿ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَاراً، ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَاراً﴾ پاشان من شێوەی بانگەوازیم لیّ گۆڕین بەئاشکرا بانگم کردن بۆ ئیمان هێنا، بەدەنگی بەرزو لەناو جەماوەردا بانگەوازییم کردن، پاشان هەردوو شێوازی بانگەوازییم تێدا بەتاقی کردنەوە، هەم بەئاشکراو هەم بەنهێنی بانگم لیّ کردن. هەموو جۆرە بانگەوازییەکم تێدا بەتاقی کردنەوە، گەلێك هەوڵ و تەقەللام لەگەڵدا دان، زۆرم بەڵگەو دەلیل بۆ هێنانەوە، ترساندمن و تەماعم بەرنان.

﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً﴾ بەو گەل و نەتەوەیەی خۆمم گوت: لە خودا بپاڕێنەوە، داوای لێخۆش بوونی لیّ بکەن، تۆبەی دڵسۆزی و نەصوحانە لەتاوانی رابووردوتان بکەن، واز لەکوفرو تاوانباری بێنن، بێگومان پەروەردگارتان ئەو خودایەیە کە: ئێوەی دروست کردوە، پەروەردەی کردون، زۆر لێبوردەو لیّ خۆشبووە.

بەم جۆرە بەردەوامییە، ئەو هەموو ماوە درێژە، حەزرەتی نوح لەگەڵ نەتەوەکەیدا هەوڵیدا، بیّ پسانەوە بەپشوو درێژیەوە تێکۆشا، نۆسەدو پەنجا ساڵ بەشەوو بەرۆژ بەئاشکراو بەنهێنی، بانگەوازی کردن ساڵ بۆ ساڵ کە حیسابی خۆی دەکرد، دەیڕوانی ژمارەی ئەوانەی کە بەپیر بانگەوازیەکەیەوە هاتوون زیاد

ناکەن و ئاستی ڕو وەرگێڕان و سووربوون لەسەر کوفرو بتپەرستی لەزیادبوون و بەرزبوونەوە دایە، ئیتر لەئاکامدا بەدڵی پڕ لەغەم و پەژارەوە، حیساب و سەرەنجامی هەوڵ و تێکۆشانی پێشکەش بە پەروەردگاری دەکا (هەرچەندە خودا ئاگاداری هەموو شتێکەو دەشزانێ: کە خودا ئاگادارە) وەڵێ شەکوای دڵ و دەروونی ماندوی خۆیەتی و بۆ خودای خۆی دەدرکێنێ و غەم و پەژارەی خۆی دەردەبڕێ.

داب و نەریتی پێغەمبەران و خوداپەرستانی ڕاستەقینە وایە شەکواو ناڕەحەتی خۆیان تەنها ئاڕاستەی پەروەردگاریان دەکەن و بەس!

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە: تۆبەو ئیستیغفار دەبێتە مایەی ڕژانی خێرو فەڕ بەسەر گەل و وڵاتدا، هەروەکوو چۆن گرانی و هەژاری و ئێش و ئازارو ترس و دڵەڕاوکێ لەشومی تاوانەوەیە. هەر گەل و نەتەوەیەك توشی ئەو جۆرە بەڵاو ناخۆشیانە بوون، پێویستە تۆبە بکەن و دەست لەتاوان هەڵبگرن و ڕوبکەنە خوداپەرستی.

ئەوەتا حەزرەتی نوح فەرمانی بە نەتەوەکەی کرد کە: تۆبەو ئیستیغفار بکەن، فەرمووی: ئەگەر تۆبەو ئیستیغفار بکەن ﴿يُرْسِلْ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَاراً، وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَاراً﴾ خودا ناخۆشی و وشکەساڵی و قاتی و قڕیتان لەسەر لادەبا، لێکدان لێکدان بارانتان بۆ دەبارێنێ، بارانی خێرو بەرەکەت و بەردەوام و ئیقلیمگیر، کشتوکاڵ و بەروبومتان بەباشی دێتە بەرو سود بەخش دەبێ. هەرزانی و ئارامی و بەختەوەری و کامەرانی، هەموو وڵات و هەرێمتان دادەگرێ، ماڵ و سامانی زۆرتان دەداتێ، منداڵ و وەچەو نەوەتان زۆر دەبن. باخ و باخات و وڵاتی ئاوەدان و میوەجاتتان زۆر دەکا، کانی و کانیاوی جوان و دڵڕفێن و چۆم و جۆگاتان بۆ وەدی دێنێ.

تۆبەو ئیستیغفار گەورەترین دەرگایە بۆ وەدەستهێنانی ڕەحمەتی خودا بەهەردوو جۆرەکەیەوە (ماددی و مەعنەوی) لەدونیاو لە قیامەتدا. بۆیە لە

ئیسلامدا هەر کاتێ وشکە ساڵیو بێ بارانی بوو موسوڵمانان تۆبەو ئیستیغفار دەکەنو بەرۆژوو دەبنو واز لە تاوان دێننو ئەو جار نوێژە بارانە دەکەن.

دوای تەماع بەرنانو هەڵنانیان بۆ تۆبەو ئیستیغفار ئەمجار سەرزەنشتیان دەکاو دەیانترسێنێ دەفەرموێ: ﴿مَا لَكُمْ لا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَاراً، وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً﴾ ئەوە چیتانە بۆ لە گەورەییو دەسەڵاتی بێ سنووری خودا ناترسن؟! واز لەتاوان بێننو بەندایەتی بکەنو بەتاکو تەنهای بناسنو گوێڕایەڵی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بن. لەکاتێکدا ئەو زاتە ئێوەی بەچەند قۆناغێك بەدی هێناوە...

سەرەتا دڵۆپە ئاوێكو ئەمجار خوێنپارەو ئەمجار گۆشتپارە پاشان ئێسقانو ئەمجار داپۆشینی بەگۆشتو دروست کردنتان بەتەواوی، ئەمجار لە ڕەحەمی دایکەوە دێنە سەر دونیاو قۆناغەکانی ژیان دەبڕن، سەردەمی منداڵیو سەردەمی گەنجیو کامڵ بوونو ئەمجار پیریو کەنەفتی!! ئێوە بەچ عەقڵێك کەمتەرخەمن لە ڕێزگرتنو بەحەقناسینی ئەو خودایەی ئێوەی بەو جۆرە لەو قۆناغانەدا دروستکردوە!

دوای بەڵگە هێنانەوەو سەرنج ڕاکێشانیان بۆ خودی خۆیان ئەمجار سەرنجیان رادەکێشێ بۆ عالەمی باڵاو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً، وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُوراً وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً﴾ ئایا ئێوە ناڕوانن و نازانن، نابینن پەروەردگار چۆن حەوت ئاسمانی یەك لەژوری یەکەوە دروست کردوە؟ مانگی لەناو ئاسمانەکاندا (لەناو ئاسمانی دونیادا) کردوە بەنوورو روناکیو روی زەوی روناك دەکا بێ ئەوەی گەرمایی بدا، خۆری کردوە بەچرای روناککەرەوە گەرمیو روناکی بەزەوی دەبەخشێو تاریکی شەو لادەبا، مانگی وا دروست کردوە هاتووچۆی مەنزڵ مەنزڵو قۆناغ قۆناغ بێو بێتە نیشانەی رۆژو مانگ، خۆریش نیشانەی تێپەڕبوونو تازەبوونەوەی ساڵە.

وەكوو لە ئایەتێكی تردا ئاماژە بەم مانایە دەكاو دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاء وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ. ﴾(یونس/٥)

ئەمجار بەلگە لەسەر عالەمی خوارو دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتاً﴾ پەروەردگار باوكە ئادەمی ئێوەی لە زەوی دروست كردوە، جەستەی ئێوەی لەخاك وەدی هێناوە؛ لەم روەوە ئادەم كە: بابە گەورەی هەموو ئادەمیزادە جەستەی لەگڵ دروست كراوە، ئەمجار گیانی بەبەردا كراوە لەدوا ئادەمیش رۆڵەو نەوەكانی لەدلۆپە مەنی دروست كردوە، ئەو دلۆپە ئاومیش لەخۆراكەوە پەیدا دەبێ، خۆراكیش لە زەوییەوە وەدی دێ، كەوابێ لەبناغەدا ئادەمیزادی لەزەوی دروست كردوە.

پەروەردگار ئەم جۆرە دروست كردنەی بەرواندن تەعبیر كرد، لە شوێنی تری قورئانیشدا هەر بەو جۆرە تەعبیری دەكاو پەیوەندی دەخاتە نێوان درەخت و روەك و ئادەمیزادەوە بەیەكەوە جوتیان دەكا..

تەعبیرەكەش تا بڵێی بەجێیەو ماناكەی دروستە؛ چونكە ئادەمیزادو روەك و درەخت لەزۆر شتدا لەیەك دەچن و لەزۆر شتی تایبەتیدا هاوبەشن هەردووكیان لەپێكهاتەی زەوی (عونصورەكانی) پێك هاتوون زادەی زەوین و زەوی دایكیانەو بە بەروبوومی ئەم زەویە دەژین و گەش و نما دەكەن، هەردوكیان پێویستان بەخۆراك و ئاوو هەوا هەیە، هەردووكیان نێرو مێیان تێدایەو هەناسە هەڵدەمژن و دەیدەنەوە، وەلێ هەناسەدان و هەناسە هەڵمژینەكەیان پێچەوانەی یەكترە، ئادەمیزاد ئۆكسجین هەڵدەمژێ و (ثاني ئۆكسیدی كاربون)دەداتەوە، دارو درەخت و روەك (ثاني ئۆكسیدی كاربون) هەڵدەمژن و ئۆكسجین دەدەنەوە. هەروەها لەزۆر شتی تریشدا لێك دەچن، لێدوان لەم بارەیەوە زۆری دەوێ..!

﴿ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجاً﴾ پاشان ئێوە دەمرێنێ و دەتانخاتە ناو زەوی و دەبنەوە خاك و جەستەتان تێكەڵ بەزەوی دەبێتەوە، دوایی رۆژی قیامەت

زیندوتان دەکاتەوە، لەگۆڕەکانتان یەکسەر دەرتان دێنێتەوە، دروست کردنەوەو زیندوکردنەوەتان لەجاری دووەمدا وەکوو جاری یەکەم نیە، بەتەدریجو قۆناغ بێ، بەڵکوو یەکسەرو یەك دەفعەیە.

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ الآرْضَ بِسَاطاً، لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلاً فِجَاجاً﴾ پەروەردگار زەوی بۆ ئێوە راخستووە، کێوی تێدا چەقاندونو لەنگەری زەوی پێ راگرتوون، زەوی وا بۆ ئێوە رام کردوە، دەتوانن کونو قوژبنی بپشکنن، رێگاو بانی فراوانی بۆ کردونەوە بەناو کێوو شیوو دۆڵو ساراىدا بگەڕێنو ڕزقو رۆزی خۆتانی لێ فەراهەم بێنن.

زەوی هەرچەندە خڕەو مەیلەو هێلکەییە، وەلێ لەبەر گەورەییو پانو پۆڕی لەپێش چاو وەك راخراو وایە. چەندێك ئادەمیزاد پێیدا بگەڕێ هەست بە خڕیەکەی ناکا. وای رام کردووە هەموو جۆرە گەڕانو هاتوچۆیەکی بە ئاسانی بەناودا دەکرێ وێڕای بەرزی شاخەکانیو قوڵی شیوەکانیشی.

پەروەردگار زەوی بەجۆرێك دروست کردوە گونجاو بێ بۆ ژیانو بەخۆشی گوزەرانی تێدا بکرێ، هەتا زانستو زانیاری پێش بکەوێ، باشتر لایەنە ئیجابیەکانی زەوی بۆ تێدا ژیان دەردەکەوێ ئەو هۆکارە نهێنییانەی خودا لە زەویدا فەراهەمی هێناون بۆ تێدا ژیان ئاشکرا دەبنو پێیان دەزاندرێ.

## کردارو گوفتارو هەڵویستی ناشیرینی گەلی نوح

﴿ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾

وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴿٢٤﴾ مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴿٢٨﴾

دوای ڕانواندنی ئەو بەڵگانەی حەزرەتی نوح ئاڕاستەی نەتەوەکەی خۆی کردن بۆ چەسپاندنو سەلماندنی تاكو تەنهایی خودا، دێتە سەرباسی ئەوە کە: حەزرەتی نوح، یاخی بوونو سەرپێچیو گومڕایی نەتەوەکەی ڕادەگەیەنێو هەڵوێستی ناشیرینو کردارو گوفتاری بەدیان دەخاتەڕو، نائومێدی خۆی لێیانو سوور بوونیان لەسەر بتپەرستیو گومڕایی بەناسورەوە دەردەبڕێ، ئەمجار باسی ئەوە دەکا کە ئەو گەلو نەتەوە شیاوی سزای دۆزەخن، دەفەرموێ:

﴿قَالَ نُوحٌ رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَنْ لَمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلاّ خَسَاراً﴾

حەزرەتی نوح لە خودا پاڕایەوەو وتی: خودایە! تۆ ئاگات لێیە قەومەکەم بەردەوامن لەسەر یاخی بوونو بەگوێ نەکردنی ئامۆژگاریەکانم، بەهیچ شێوەیەك بەپیر بانگەوازیەکەمەوە نەهاتن، گوێڕایەڵی سامانداراکانو ملهوڕەکان دەکەن، شوێن کەسانێك دەکەون کە ماڵو سامانو کوڕو منداڵیان پتر گومڕایان

دەكــەن و زیــاتر هــەڵیان دەنــێن بــۆ بــەردەوام بــوون لەســەر بتپەرســتی و خەسارەتمەندییان.

﴿وَمَكَـرُوا مَكْـراً كُبَّـاراً﴾ پیلان و مـەكرو فێڵێكی گـەورەیان كـرد، بەرپەرچی ئەوانەیان دایەوە كە لەوانـەبوو ئیمان بـەنوح بێـنن، نـەیان دەهێـشت كـەس شـوێن پەیامی حەزرەتی نوح بكەوێ. ڕەشە خەڵكەكەو بۆرە پیاوەكانیان هەڵنان بۆ ئەوەی زیان بە نوح بگەیەنن و بیكوژن!

﴿وَقَالُوا لا تَذَرُنَّ آلِهَـتَكُمْ وَلا تَـذَرُنَّ وَدّاً وَلا سُـوَاعاً وَلا يَغُـوثَ وَيَعُـوقَ وَنَـسْراً﴾ ملهوڕان و سەرانی گـەلی نـوح، مـسكێن و ڕەشـە خەڵكەكـەیان هەڵدەنا بۆئـەوەی دژی حەزرەتی نوح بوەستن و گوێڕایەڵی فـەرمان و جڵەوگیرییـەكانی نـەبن. پێیـان گـوتن: واز لـەعیبادەتكردنی خوداكـانی خۆتـان مـەهێنن. نەكـەن بەندایـەتی خـودای نـوح بكـەن. بەتایبـەتی واز لەپەرسـتنی ئـەو بتانـە مـەهێنن كـە ناویـان (وەددو سـواع و یەغوث و یەعوق و نەسر)ە.

ئەم ناوانە ناوی چەند پیاوێكی چاكی قەومی نوح بوون كـە: لـەدونیا دەرچـون بەوەسوەسەو دنەدانی شەیتان پەیكەریان بۆ دروست كردن و هەریەكـەو نـاوی پیـاو چـاكێكیان لێ نـان بەتێپـەڕبوونی ڕۆژگـارو وەسوەسـەی شـەیتان دەسـتیان كـرد بەپەرستش بۆ كردنیان، ساڵ دوا ساڵ عیبادەتكردنی ئەو بتانەیان لاشیرین بوو، پتر ڕێزیان لێ دەگرتن، دوای لەناوچوونی گەلی نـوح پەرسـتنی ئـەم بتانـە گوێـسترایەوە بۆ ناو عەرەبەكان.

بتـی (ودد) تایبـەت بـوو بەهۆزی (كلـب)ەوە (سـواع) بتـی هـۆزی هوزەیـل بـوو، (یغوث) هی خێڵی غەطـەفـان بـوو، (یعـوق) بتـی هـۆزی هەمـدان بـوو، (نـسر) بتـی حیمیەرو (آل ذي الكلاع) بـوو.

عەرەبەكان بتی تریشیان هەبوو بەناوبانگترینیان بتی (اللات) بوو، تایبەت بوو بە هۆزی ثەقیف لەشاری طائیف. (العزیٰ) بتی هۆزی سولەیم و غەطەفان و جوشـەم

بوو، (مناة) بتی هۆزی خوزاعە بوو لەقەدید، بتی (أساف)و (نائلة)و (هبل) تایبەت بوون بەدانیشتوانی مەککەوە. (هبل)یان گەورەترین بت بوو لایانو لەسەر بانی کابە دایان نابوو.

﴿وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيراً وَلا تَزِدْ الظَّالِمِينَ إِلاَّ ضَلالاً﴾ واتە: سەرانی قەومی نوح خەڵکێکی زۆریان گومڕا کرد، یان ئەو بتانە مرۆڤگەلێکی زۆریان گومڕا کرد. ماوەیەکی زۆرو لەپانتایەکی بەرفراواندا دیاردەی بتپەرستی باڵی بەسەر دونیادا کێشا بوو، دیاردەی بتپەرستی لەناو عەرەبو عەجەمدا چەند سەدەیەك درێژەی کێشاو لەناو عەرەبەکاندا تا سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام بەردەوام بوو.

مانای دووەم: کە راناوی (أضلوا) لەئایەتەکەدا بگێڕینەوە بۆ بتەکان، واتە: گومڕاکردنەکە پاڵ بتەکان بدەین وێچوترە.. وەکوو لە ئایەتێکی تردا لەسەر زوبانی ئیبراهیم کە: لەخودا دەپاڕێتەوە دەفەرموێ:

﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الآصْنَامَ، رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ﴾ (إبراهيم/٣٥-٣٦).

کەوابوو جێی خۆی بوو کە: حەزرەتی نوح دوعای شەڕیان لێ بکاو بڵێ: خودایە! بۆ ئەو کافرو گومڕاکەرو گومڕابووانە سەرگەردانیو دووربوون لەحەقیان بۆ زیاد بکە، هەرگیز حەقو راستی نەدۆزنەوە، خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بن.

ئەمجار جۆری سزاکەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَاراً فَلَمْ يَجِدُوا لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْصَاراً﴾ بەهۆی زۆر تاوان کردنیانو سووربوونیان لەسەر کوفرو دژایەتیکردنی پێغەمبەرەکەیان بەتۆفان خنکێندرانو پاشان توڕدرانە ناو ئاگری دۆزەخەوە، کەس نەبوو عەزابی خودایان لێ بگێڕێتەوە.

﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لا تَذَرْ عَلَى الآرْضِ مِنْ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾ کاتێك حەزرەتی نوح لەئیمان هێنانی نەتەوەکەی ناهومێد بوو، پەروەردگار نیگای بۆ کرد کە دوعایان لێ

بکا، دوعای شەڕی لێ کردن‌و وتی: خودایە لەسەر زەوی کافرێك بەزیندویی مەهێڵەوە، سەر لەبەر لەناویان بەرە.

﴿إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا﴾ لە راستیدا ئەی خودایە! ئەگەر تۆ یەکێك لەو کافران بهێڵیەوە ئەو بەندانەی لەوەدوا دروستیان دەکەی‌و دێنە گۆڕەپانی ژیانەوە، ئەمانە ئەوانیش گومرا دەکەن‌و لەرێبازی حەق لایان دەدەن..

هەروەچەو نەوەیەکیشیان ببێ فاجرو تاوانبار دەبن‌و بە هیچ جۆرێ تاعەتی تۆ ناکەن‌و لەدڵدا کافرو سپڵە دەبن‌و هیچ سوپاسی نیعمەتەکانت ناکەن‌و بڕوایان بە خودایەتی تۆ نابێ!

﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا﴾ خودایە! لەتاوانی خۆم‌و تاوانی باوك‌و دایکم خۆش ببە، هەروەها لەتاوانی هەموو ئەوانە خۆش ببە کە: بە موسوڵمانی هاتونە ماڵەکەم، هەروەها خۆش ببە لە هەموو پیاوو ئافرەتی موسوڵمان لە هەموو کات‌و شوێنێکدا.

دوعاو پاڕانەوەکەی حەزرەتی نوح بۆ لێبوردن لەخۆی، ڕەوشت‌و ئەدەبی پێغەمبەرایەتییە بەرامبەر خودای خۆی. شەرم‌و حەیای بەندەی خوداناس‌و خۆناسە لەبەرامبەر پەروەردگاری خۆیدا، بەندەیەکە دەزانێ خۆی ئادەمیزادەو چەندێك هەوڵ بدا گوێڕایەڵی خودا بێ ناتوانێ بەتەواویی ئەرکی بەندایەتی خۆی ئەنجام بدا، کەم‌و کوڕی هەر تێدا دەبێ، دەزانێ هیچ کەس بەکردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە، ئەگەر ڕەحمی خودای لەپاڵدا نەبێ، وەکوو لەفەرمودەیەکدا پێغەمبەری ئیسلام ئاماژە بەوە دەکا.

ئەمە ئەو داوای لێبوردنەیە کە: ئەو هەموو ماوە دوورو درێژە بانگەوازی نەتەوەکەی بۆ کردو ئەوان گوێڕایەڵی نەبوون. لە کیسی خۆیاندا، ئەم کە

پێغەمبەرەو ئەو هەموو هەوڵ و تەقەللایەی لەگەڵ دان و ئەو هەموو ماندوبوون و شەونخونیەی کرد، ئەو هەموو سزاو مەینەتیەی چەشت لەرێگای خودادا.

ئەمجار خۆی بەکەمتەرخەم دەزانێ و داوای لێبوردن لە خودا دەکا، بەراستی بەندەی خوداناس دەبێ وابێ و پێویستە خودای خۆی ئاوا بناسێ.

حەزرەتی نوح (علیه السلام) کە داوای لێخۆشبوونی بۆ باوك و دایکی کرد، بەشێکە لەچاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکی موسوڵماندا. بەجێهێنانی فەرزەندەیی خۆیەتی بۆ ئەوان، باوك و دایکی خوداپەرست بوون ئەگەر وانەبوونایە ڕەخنەی لێ دەگیراو ئاگادار دەکرایەوە، وەکوو دەربارەی کوڕەکەی ئاگادار کرا.

هەروا داوای لێخۆشبوون بۆ بڕواداران بەگشتی و بەتایبەتی ئەوانەی چونە ماڵەکەیەوە، بەجێهێنانی ئەرکی بڕوادارە بەرامبەر بڕوادارو پێویستە خوداپەرستان دوعای چاکە بۆ یەکتر بکەن و لەهەموو کردارێکی چاکەدا هەماهەنگ و هاریکاری یەکتر بن.. لەهەمان کاتدا پێویستە خاوەن باوەڕ بەرامبەر دوژمنانی خودا دژو نەیار بێ و ڕقی لێ بن..

کەوابێ. جێی خۆی بووە کە: پاش پاڕانەوە بۆ خۆی و دایك و باوکی و تێکڕای موسوڵمانان دوعای شەڕ لەستەمکاران و دوژمنانی خودا بکات.. بڵێ: خودایە بۆ ستەمکاران هەربەهیلاکچوون و زیانباری و ریشەکێش بوونیان بۆ زیاد بکە! خەسارەتمەندی و ماڵوێرانییان بۆ زۆر بکە!

خوێنەری هێژا! ئەوا سورەتی نوح کۆتایی هاتو ئەو وێنە روناکەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرەی لە تێکۆشانی ئەو پێغەمبەرە ئولولعەزمە رانواند، لە بەرامبەردا ئەو هەڵوێستە نامەردی و نەفامییەی ستەمکارە سەرڕەقەکانی گەلی نوحی نیشاندا، ئەمەش پەندو عیبرەتە بۆ بانگخوازانی ئیسلام و پێویستە دەرزی لێ وەربگرن و چاو لە پشوو درێژی حەزرەتی نوح بکەن...

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سوره‌تی الجن

ئه‌م سوره‌ته مه‌ككییه‌و بیست‌و هه‌شت ئایه‌ته، له‌دوای سوره‌تی (الأعراف) نازڵ بووه. ناوی نراوه سوره‌تی(الجن) چونكه باس‌و خواسی ئه‌وانی له خۆ گرتووه.

**په‌یوه‌ندی ئه‌م سوره‌ته به‌سوره‌تی پێشه‌وه له‌چه‌ند رویه‌كه‌وه‌یه :**

١- له‌سوره‌تی پێشوودا فه‌رمووی: ﴿اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً، يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَاراً﴾ له‌م سوره‌ته‌شدا فه‌رمووی: ﴿وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاء غَدَقاً﴾.

٢- له هه‌ردوو سوره‌ته‌كه‌دا باسی ئاسمان كراوه.

٣- له‌هه‌ردوو سوره‌ته‌كه‌دا جه‌خت له‌سه‌ر ئه‌وه كراوه‌ته‌وه هه‌ركه‌سێ له خودا یاخی بێ به ئاگری دۆزه‌خ سزا ده‌درێ.

ئه‌م سوره‌ته له دوو ته‌وه‌ره‌دا ده‌سورێته‌وه، واته: دوو سه‌ره باسی سه‌ره‌كی له‌خۆ گرتوون:

ته‌وه‌ره‌یه‌كیان بریتیه: له باس‌و خواسی جندۆكه‌و هه‌واڵی هه‌ندێ راستی ده‌رباره‌یان.

ته‌وه‌ره‌ی دووه‌م بریتیه: له ته‌وجیهات بۆ پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌رباره‌ی چۆنیه‌تی گه‌یاندنی په‌یامه‌كه‌ی به ئاده‌میزاد.

سه‌ره‌تا سوره‌ته‌كه به‌هه‌واڵدان له‌ئیمانهێنانی كۆمه‌ڵێك جندۆكه ده‌ست پێ ده‌كا، ئه‌وه‌بوو : كه پێغه‌مبه‌رﷺ له طائیف گه‌ڕایه‌وه پێش روداوی ئیسراو میعراج له مینا له‌نوێژدا قورئانی خوێندو جندۆكه‌كان گوێیان لێ بوو، ئیمانیان پێ هێناو ته‌مجیدو ته‌قدیسی خودایان كرد.

ئەمجار بەشوێن ئەو هەواڵەدا باسی ئەوە دەکا: کە جندۆکە لەوەپێش هەوڵی ئەوەیان داوە هەواڵی ئاسمان بدزن و بەسەر هەواڵی عالەمی بالآدا ئاگاردار بن، وەلێ ئێستا دوای ناردنی پێغەمبەری ئیسلام ناتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن. هەرکاتێ هەوڵی لەو جۆرە بدەن خێرا تیر ئەستێرەیان تێ دەگیرێ و دەبنە کۆی زوخاڵ.

ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە جندۆکە دوای نازڵبوونی قورئان، بوون بەدوو تاقم، پێرێکیان موسوڵمان و پێرێکیان کافر.

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا : کە پەیامەکەی بە ئادەمیزاد رابگەیەنێ و بەدڵسۆزیی و ئەرکی سەرشانی ئەنجام بداو کەس نەکاتە هاوەڵ و هاوشانی خودا، ئەوەش بۆ پێغەمبەر ﷺ دوپات دەکاتەوە کە ناتوانێ هیچ زەرەرو ناخۆشییەك لەخۆی دووربخاتەوە، ئەگەر لە خودا یاخی بێ، کەس نیە بتوانێ لەسزای خودا رزگاری بکا، ئەوەشی پێ رادەگەیەنێ: کە هەر خودا دەزانێ کەی عەزاب دەنێرێ و کەی قیامەت رادەبێ.

کۆتایی سورەتەکەش بەو راستیە دێنێ: کە زانیاری غەیب هی خودایەو هەر خودا غەیب زانە.

## ئیمانهێنانی جندۆکە بەقورئان و تاك و تەنهایی خودا

﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا (٢) وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا (٣) وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا (٤) وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ

ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (١) ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ. . . ﴾ بوخاریو موسلیم و تیرمیذیو هیتریش لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ نەقورئانی بەسەر جندۆکەدا خوێندوەو نەبینیویشنی، بەڵکوو لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاوەڵانی بەرەو بازاری عوکاظ رۆیشتن. وەلحاڵ شەیاتینی لەبیستنی هەواڵی ئاسمان مەنع کرابوون، کە ویستبویان هەواڵی ئاسمان بدزن تیر ئەستێرەیان پێوە نرابوو، کە. شەیاتینیەکان گەڕابوونەوە بۆ لای قەومو هۆزی خۆیان، وتبویان ئەم روداوە ئەثەرێکی هەیەو دەبێ بزانین چی روی داوە؟ بڕۆن خۆرهەڵاتو خۆرئاوا بپشکنن‌و بزانن چی روی داوە، هەڵسان‌و لەخۆکەوتن‌و بەچوار دەوردا بڵاوبوونەوە.

ئەو کۆمەڵە جندۆکەی بەرەو (تیهامة) چو بوون، رێیان لە پێغەمبەرﷺ کەوت لەوکاتەدا پێغەمبەرﷺ لە(النخلة) بوو، لەگەڵ هاوەڵانیدا نوێژی بەیانی دەکرد، کاتێ گوێیان لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر بوو وتیان: ئەمەیە: کە ئێوە بیستنی هەواڵی ئاسمانتان لێ یاساغ کراوە. .

ئیتر ئەو تاقمو نەتەوە گەڕانەوە بۆ ناو گەل‌و نەتەوەکەیان وتیان: ئەی نەتەوەکەمان، ئێمە قورئانێکی سەرنج راکێشمان بیست. ئیتر پەروەردگار ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ........﴾ی نازڵ کرد.

بێگومان ئەم سورەتە پێش هەموو شتێك شایەتیدانە لە عالەمێکی ترەوە، لە عالەمی پەرییەوە، دەربارەی زۆر لایەنی عەقیدەو بیروباوەڕ کە موشریکەکانی

مەککە ئینکارییان دەکردن و جەدەل و نیزاعیان تێدا ئەنجام دەدا. هەر لەخۆیانەوە رەملیان لێ دەدا، بەبێ بەلگە قسەیان فڕێ دەدان. جاری وایش هەبوو بۆ ئەوە دەچون کە: موحەممەد لەجندۆکەوە فێری ئەو قورئانە دەکرێ! دەی ئێستا وا لەجندۆکەکان خۆیانەوە شایەتی دەدرێ بەپێچەوانەی بیروباوەڕی موشریکەکان و بە درۆ دەخرێنەوە.

ئەوەی پێویستە ئامازەی پێ بکرێ ئەوەیە: جندۆکەکان بەنازلبوونی قورئانیان نەزانیبوو، تا لەدەمی پێغەمبەرەوە بیستیان، کە گوێیان لە قورئان بوو سەرسام بوون و ترسان و دەهشەت گرتنی، سەرو دڵیان گیراو وایان لێ هات خۆیان پێ نەگیراو نەیان توانی بێدەنگ دابنیشن، بەڵکوو کەوتنە خۆو دەستیان کرد بەهەوڵ و تێکۆشان، بزانن ئەم روداوە گەورەیە چییە؟ ئەو روداوە گەورەیەی ئاسمان و زەوی و ئادەمیزادو جندۆکەو فریشتەو ئەستێرەکانی سەرقاڵ کردوەو کاریگەری گرنگی هەیە لەبوونەوەردا. ئەم شایەتیدانە لەعالەمی جندۆکەوە نرخی تایبەتی خۆی هەیەو کاریگەری هەیە لەسەر دڵ و دەروونی ئادەمیزاد.

وێڕای ئەوەش وەهم و خەیاڵێکی جۆراوجۆرو زۆر دەربارەی عالەمی جندۆکە راست دەکاتەوە، کە ئەو وەهم و خەیاڵە لەدڵ و دەروونی موشریکەکانی مەککەو خەڵکی تری ئەو رۆژگارەدا بەڵکوو لە دڵ و دەرونی زۆرینەی ئادەمیزاددا لەوەپێش و لەوەپاش و بەئێستاشەوە چەسپا بوو.

عەرەبە موشریکەکان پێیان وابوو جندۆکە دەسەڵاتێکی لەرادەبەدەریان لەسەر زەوی هەیە، بۆیە ئەگەر یەکێکیان بەشیوو دۆڵ و چۆڵەوانییەکدا بڕۆشتایە، پەنای بەگەورەو سەرۆکی جندۆکەکانی ئەو هەرێمە دەگرت و هاواری دەکردێ کە: نەهێڵێ شەقاوەو ناکەسبەچەکانی جندۆکە زیانی پێ بگەیەنن، دەیگوت: (أعوذ بسيد هذا الوادي من سفهاء قومه) ئیتر بەدڵنیاییەوە کاری خۆی ئەنجام دەدا.

هەروەها پێیان وابوو: جندۆکە غەیب دەزانن و هەواڵی غەیب بەکاهینەکان دەدەن، هەیانبوو عیبادەتی جندۆکەیان دەکرد بڕوایان وابوو، لەنێوان جندۆکەو

خودادا نەسەب و نەژاد هەیە. پێیان وابوو خودا ژنی لێ خواستون و ئەو ژنانە فریشتە بۆ خودا بەوەلەد دێنن.

ئەم بیروباوەڕانە دەربارەی جندۆکە لەسەردەمی نەزانیدا باوو بەربلاوبوو، تائێستاش وەهەم و خەیاڵات و ئەفسانەی جۆراو جۆر لەو بارەوە لەزۆر کۆمەڵگای ئادەمیزاددا باوو بەربلاوە. لەلایەکی ترەوە ئەمڕۆ کۆمەڵێکی تر لە ئادەمیزاد هەن دان بەهەبوونی جندۆکەدا نانێن و پێیان وایە: قسە کردن لەو عالەمە نادیارە ئەفسانەو خەڕافاتە. دەی قورئان هاتووە لەنێوان ئەو وەهەم و خەیاڵات و ئەفسانە جۆراو جۆرانە دەربارەی جندۆکەو ئەو ئینکارییە زێدەڕۆییە دەربارەی هەبوونیان، حەقیقەت و راستی جندۆکەمان بۆ رون دەکاتەوە، واقیع و حاڵیان چۆنەو چۆن نیە لەسەر زمانی خۆیان بۆمان دەردەخا..

بەڵێ ئەم سورەتە بیروباوەڕی عەرەبە موشریکەکان و هی تریش دەربارەی جندۆکە راست دەکاتەوە. کەپێیان وابوو: جندۆکە تواناو وزەی لەئەندازەبەدەریان هەیە لە بونەوەردا، هەروەها ئەوانەش بەدرۆدەخاتەوە کە: بڕوا بەهەبوونی جندۆکە ناکەن، پێیان وایە بڕوا بەهەبوونیان جۆرێکە لەئەفسانە.

لەراستیدا ئەوانەی دەسەڵاتی رەهایان بۆ داناون و ئەوانەیش کە: بڕوا بەهەبوونیان ناکەن، یەکیان لەیەکێ بێ عەقڵترن، بیروباوەڕەکانیان زۆر منداڵانەو نەفامانەیە!!

دەبێ ئەوانەی کە دەڵێن: جندۆکە نین و ئینکاری هەبوونیان دەکەن، چ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە بێ؟ بە چ زانیارییەك و پشت بەستن بەچی ئاوا سوورن لەسەر نەبوونی عالەمی جندۆکە؟ بەچ عەقڵێك هەبوونیان بەخەرافات و ئەفسانە دەزانن؟! ئایا ئەوانە توانیویانە هەموو بوونەوەر بپشکنن و لەپشکنینی بوونەوەردا جندۆکەیان تێدا بەدی نەکرد بێ؟ بێگومان هیچ کەس لە زانایان ئەم بیرو بۆچونەی نیە..!

له لایەکی ترەوە ئێستا لەناو زەویدا زۆر مەخلوقاتی زیندو هەنو رۆژ دوای رۆژ کەشف دەکرێنو زۆریشیان ماون کەشف نەکراون، کەسیش نەیگوتوەو نالێ: زنجیرەی کەشفو توێژینەوە لەسەر زیندەوران راوەستاوە یان رۆژێك لەرۆژان رادەوەستێ، هیچ زانایەك ئەمەی نەگوتوەو نایڵێ.

ئایا هەر لەبەر ئەوە دەڵێن: جندۆکە نین، چونکە نابیندرێن؟ دەی خۆ زۆر شت هەیەو ناش بیندرێ. بۆ نموونە کارەبا هەیەو نابیندرێ. ئیتر ئەم سووربوونە لەسەر نەبوونی جندۆکە لەپای چی؟ خۆ زانیاریی ئادەمیزاد لەبوونەوەردا هێندە کەمو بێ هێزە، هەرکەسێ تۆزێك رێزی عەقڵی خۆی بگرێ لەم بارەیەوە جەزم نانێ. یان بەڵگەیان لەسەر نەبوونی جندۆکە ئەوەیە کە: ئەفسانەو خەرافاتی جۆراو جۆریان بەدەورەوە هەڵبەستراوە؟

دەی لەم حاڵەدا پێویستە ئێمە ئەو ئەفسانەو خەرافاتانە رەت بکەینەوەو پوچەڵیان بکەینەوە. نەك بەبێ بەڵگە حاشا لەهەبوونی ئەو مەخلوقاتە بکەین کە: ئەفسانەیان بەدەورەوە هەڵبەستراوە. پێویستە هەواڵی ئەم جۆرە غەیبییانە لەسەرچاوەی بڕوا پێکراوەوە وەربگرینو هەرچی لەو سەرچاوەوە وەردەگیرێ بەحەقو ڕاستی بزانین!

دەی بائێستا بچینە خزمەت سورەتەکەو زانیاریی سەد دەر سەدو راستی بێ پێچو پەنا دەربارەی ئەو عالەمە زۆرو نادیارەی پێی دەگوترێ: عالەمی پەری وەربگرین.

﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنْ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً﴾ ئەی موحەممەد بەگەلو قەومەکەت بڵێ: پێیان رابگەیەنە کە: کۆمەڵێك لەجندۆکە قورئانیان بیستووە ئیمانیان پێ هێناوەو ملکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بوون.

پێیان بڵێ: خودا نیگای بۆ کردم، لەسەر زوبانی جوبرائیل پێی راگەیاندم کە: تاقمێك لەپەری گوێیان لە قورئانخوێندنی من بووە، کاتێك لەنوێژدا سورەتی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي.....﴾م خوێندوە گوێیان لێ بووە، دوای گەڕانەوەیان بۆ ناو

گەلەکەیان وتیان: ئەی خەڵکینە! ئێمە گوێمان لەکەلامێکی فەصیحو بەلیغ بوو، پڕ بوو لەئامۆژگاریو خێرو فەڕ، بەراستی ئەو کەلامەی گوێمان لێ بوو قورئانێکی عەجیبو سەرنج راکێش بوو. هەمووومانی سەرسام کرد.

جندۆکە عالەمێکە نادیارن لەئێمەو هیچیان لێ نازانین، جگە لەوەی قورئان پێمانی راگەیاندوە، ئەوان لەئاگر دروست کراون. قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالْجَآنَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ﴾(الحجر/٢٧) خودا پێغەمبەری لەرەگەزی خۆیان بۆ ناردون، بەڵکوو ئەو پێغەمبەرانەی بۆیان رەوانەکراون هەموویان ئادەمیزاد بوون.

ئەوانیش وەکوو ئادەمیزاد هەیانە ئیماندارو خوداپەرستو هەشیانە کافرو بێ بڕوا، هەیانە عاقڵو هۆشیارو زیرەكو هەشیانە گێلو نەفامو کەودەنە. ئەوانیش وەکوو ئادەمیزاد ئامادەباشی وەرگرتنی هیدایەتیان تێدایە، ئەوان ناتوانن یارمەتی ئادەمیزاد بدەن، چەندێك هانایان بۆ بەرنو داوای کۆمەکیان لێ بکەن هیچیان پێ ناکرێ، جندۆکە غەیب نازانن‌و پەیوەندییان بەئاسمانەوە نەماوە.

سەرەتای سورەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە: زانینی پێغەمبەر بەوەی کۆمەڵێك لە جندۆکە گوێیان لە قورئانخوێندنی بووەو روداوەکانی پاش بیستنی قورئانەکەو گفتوگۆی ئەوان لەگەڵ نەتەوەکەیاندا، پەروەردگار بەنیگاو سروش بە پێغەمبەری راگەیاندوە، روداوێك بووە رووی داوەو پێغەمبەر ﷺ پێی نەزانیوەو دوای رودانی روداوەکە خودا هەواڵی بەپێغەمبەر داوە.

ئەمە جاری یەکەم بووە پاشان چەند جاری تر پێغەمبەر ﷺ بەمەبەستو بەتایبەتی قورئانی بەسەر جندۆکەدا خوێندۆتەوە. شایانی باسە، ئەم قسەیەو ئەو ریوایەتە، دەربارەی سورەتی (الرحمن) ریوایەتکراوە..

تیرمیذی لەجابیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو هاوەڵانیو سورەتی (الرحمن)ی بەسەردا خوێندنەوە، هاوەڵان بێدەنگ بوون. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەم سورەتەم بەسەر جندۆکەکاندا خوێندەوە ئەوان

لەئێوە باشتر کاردانەوەیان تێدا بوو، هەرکاتێ دەهاتمە سەر ئایەتی ﴿فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ تێکرا دەیانگوت: خودایە! نەخێر ئێمە هیچ نیعمەتێکی تۆ بەدرۆ ناخەینەوە، خودایە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە.. ئەم ریوایەتە پشتگیری ریوایەتەکەی ئیبنو مەسعود دەکا کە: لەوەپێش ئاماژەی پێ کرا.

﴿يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَداً﴾ واتە: ئەو قورئانە ئێمە بیستمان هیدایەتدەرە بۆ رێبازی حەق و راست، بۆ ناسینی خودا، ئێمەدڵنیا بووین لەوەی ئەو کەلامە لە خوداوە هاتووە، ئێمە ئیتر ببڕای ببڕای کەس ناکەین بەهاوەڵی خودا، جگە لە خودا، کەسی تر بەخودا نازانین.. ئەمە راگەیاندنی ئیمانهێنەکانە لەناو قەومەکەیاندا.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە گەورەترین کار لەبانگەوازی پێغەمبەردا یەکتاپەرستی و لابردنی هاوەڵدانانە بۆ خودا، سەیرە جندۆکەکان ئیمانیان بەوە هێنا کە: قورئان کەلامی خودایە، ئەوان بە بیستنی جارێك قورئانخوێندنی پێغەمبەر موسوڵمان بوون، کەچی کافرەکانی مەککە بەتایبەتی سەرانی قورەیش، ئەو هەموو جارە لەدەمی پێغەمبەرەوە قورئانیان بیست کەچی موسوڵمان نەبوون.

﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَداً﴾ شەئن و حاڵوایە بەرزو پیرۆزە کردەوەو دەسەڵات و فەرمان و گەورەیی و شکۆمەندی پەروەردگارمان. بەرزو پیرۆزو دورە لەوەی خێزان و منداڵی هەبێ، هەرگیز خودا ژنی نیەو منداڵی نەبووە.

بەکورتی ئەو جندۆکانە وێڕای ئەوەی پاکانەیان بۆ خۆیان کردو بڕیاری ئەوەیاندا کە: هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن. خوداشیان لەوە بەدوور گرت کە خێزان و منداڵی هەبێ. بەمەش تەنزیهی خودایان کرد لەوەی هاوەڵ و خێزان و منداڵی هەبن، یەکتاپەرستی خۆیان راگەیاندو باڵادەستی و بەتوانایی بێ سنوورو بێ ئاتاجی خودایان بەسەر هەموو شتێکداو لە هەموو شتێك راگەیاند.

﴿وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطاً﴾ هەروەها جندۆکەو موشریکەکانو نەفامەکانمان پێش ئەوەی موسوڵمان بن قسەی ناشایستەو نابەجێیان بەرامبەر بە خودا دەگوتو لەکوفرو بێدینیدا زێدەڕەوییان دەکرد، بەبێ بەڵگەو دەلیل هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، خێزانو منداڵیان بۆ بڕیار دەدا.

﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَنْ لَنْ تَقُولَ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِباً﴾ ئێمە پێمان وابوو، ئادەمیزادو جندۆکە کە: لەوەپێش دەیانگوت: خودا هاوەڵو خێزانو منداڵی هەن ڕاست دەکەنو درۆ ناکەن. کاتێك قورئانمان بیست ئەمجار زانیمان بیرو بۆچونو قسەکانیان هەڵەن، ئەوەی لەوەپێش بە ڕاستمان دەزانی بۆمان دەرکەوت درۆیەو هیچ بنەماو بناغەیەکی نیە.

ئەمە ئیعتیرافو دان پێدانانە لەلایەن پەرییەکانەوە بەوە کە: ئەوان بەهۆی شوێنکەوتنی کوێرانەوە تووشی ئەو هەڵەو تاوانانە بوونو لەڕێگەی بەڵگەو لێکۆڵینەوەوە، لەو لاسایی کردنەوە ڕزگاریان بوو.

﴿وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنْ الإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنْ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقاً﴾ کۆمەڵێ لەپیاوانی ئادەمیزاد لەبەر نەفامیو نەزانییان لەچۆڵەوانیو دەشتو دۆڵو کەژدا پەنایان بە پیاوانی جندۆکە دەبرد، ئەم پەنا بردنەی ئادەمیزادەکان بەجندۆکەکان هێندەی تر جندۆکەکانی بوغرا کردو کوفرو گومڕاییو سەرلێ شێواویان بۆ زیاد کردن، یان دەتوانین بڵێین پەرییەکان گومڕاییو کوفریان بۆ ئادەمیزادەکان زیاد دەکرد. هەر دوو ماناکە هەڵدەگرێ.

لەسەردەمی نەزانیدا دابو نەریتی عەرەبەکان وابوو ئەگەر ڕێیان بکەوتایەتە کێوو ساراو بیابانێك، دەیانگوت پەنا دەگرین بەگەورەو کاربەدەستی پەرییەکانی ئەم شوێنە کە ئاگای لێمان بێو نەهێڵێ هەتیوو چەتەی جندۆکە زیانمان پێ بگەیەنن، بە خەیاڵی خۆیان لەئەمانو جیواری گەورەی جندۆکەی ئەو

هەرێمەدان و زیانیان پێ ناگا ئیتر بەم جۆرە پەنا پێ براوەکان کوفرو گومڕاییان بۆ پەنا بەرەکان زیاد دەکرد.

﴿وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَنْ لَنْ يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَداً﴾ ئادەمیزادیش وەکوو ئێوە پێیان وابوو زیندوبوونەوە نیە، حیساب و لێکۆڵینەوە نابێ، یان ئەوان و ئێوەش پێتان وابوو کە: ئیتر خودا پێغەمبەرێك نانێرێ بانگەوازیی بکا بۆ یەکتاپەرستی و ئیمانهێنان بە خوداو بە پێغەمبەرانی و بەرۆژی قیامەت.

## چەند هەواڵێکی تر لەجندۆکەکانەوە

﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ۖ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا

﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾

لەم کۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار هەندێ چیرۆك و سەرگوزەشتە لەپەرییەکانەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَساً شَدِيداً وَشُهُباً﴾ جندۆکەکان وتیان: کاتێك پێغەمبەر ڕەوانەکراو قورئانی بۆ سەر نازڵ کرا، بەپێی داب و نەریتی خۆمان ویستمان هەواڵی ئاسمان بزانین ئاخۆ ئەم ڕوداوە تازە چیە؟ ویستمان بزانین ئەم پێغەمبەرە کێیەو چ کەسە؟

بینیمان ڕێگای ئاسمانمان لێ گیراوە، فریشتە هەموو ڕێگاو بانێکیان تەنیوەو بەتوندو تۆڵی حەرەسیاتیان لەئاسمان گرتووەو ئیتر ناهێڵن ئێمە خەبەری ئاسمان بدزین، دیمان هەرکامێکمان هەوڵی وەرگرتنی هەواڵی ئاسمان بدا، یەکسەر تیر ئەستێرە بۆی دەکشێن و دەیسوتێنن!!! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِّلشَّيَاطِينِ﴾ (الملك/٥).

تیرمیذی و ئەحمەدو نەسائی لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکەن دەفەرموێ: شەیاتینی‌یەکان شوێنی هەواڵدزیان لەئاسماندا هەبوو، ئەگەر قسەیەکیان بەر گوێ بکەوتایە نۆی تریان پێوە دەناو بەگوێی کاهین و فالگرەوەکانیاندا دەدا. قسە بیستراوەکە حەق و ڕاست بوو قسە. زیادەکانیش بەتاڵ و پوچ. کاتێك پێغەمبەر ﷺ کرا بە پێغەمبەرو ڕەوانەکرا ئەو گوێگرتن و هەواڵدزییەیان لێ قەدەغە کرا، ئەوەیان بەشەیتان ڕاگەیاند: ئەویش وتی: ئەمە بەهۆی پەیدا بوونی شتێکەوەیە لەسەر زەوی. جاسوس و گوێ لەمستی خۆی بەناو زەویدا بڵاوکردنەوە بۆ ئەوەی بزانن ئەو ڕوداوە چیە!!؟

ئەوەبوو کۆمەڵێکیان پێغەمبەریان بینی لەنێوان دوو کێوی مەککەدا نوێژی دەکرد. ئیتر هاتنەوە ئەو هەواڵەیان بە شەیتاندا، ئەویش وتی: ئەوە ئەو روداوەیە کە بوەتە هۆی مەنع کردنی ئێوە لە قسە دزینی ئاسمان.

بەکورتی دوای ڕەوانەکردنی حەزرەتی موحەممەد ﷺ شەیاتینی لەهەواڵدزینی ئاسمان مەنع کران. نەوەکوو شتێك لەقورئان بدزن و بەگوێی کاهینەکانیدا بچرپێنن و کار بشێوێ و قورئان و فلتە فلتی کاهینەکان تێکەڵاو ببن.

﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَنْ يَسْتَمِعْ الآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَصَداً﴾ ئێمە لەوەپێش دەچوینە ئاسمان و خۆمان دادەنووساند بۆ دزینی هەواڵ، بۆ بیستنی هەواڵی ئاسمان لەفریشتەکان، بۆ ئەوەی بەگوێی کاهینەکانیدا بچرپێنین. ئیتر دوای ناردنی پێغەمبەری ئیسلام. پەروەردگار ئەو دەسەڵاتەی لێ ستاندنەوە، بەتیر ئەستێرە ئاسمانی لێ قەدەغەکردن، ئێستا هەرکامێکیان بیەوێ هەواڵدزیی بکا، یەکسەر تیر ئەستێرەیەك بۆی دەکشێ و دەیسووتێنێ و لەناوی دەبا.

﴿وَأَنَّا لا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَنْ فِي الآرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَداً﴾ ئێمە نازانین ئایا ئەم پارێزگاری کردنە لەئاسمان و حەرەسیات لێگرتنە، شەڕو عەزابی خودایە بۆ سەر زەوی یان خودا خێرو خۆشی بۆ دانیشتوانی سەر زەوی دەوێ؟

﴿وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَلِكَ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَداً﴾ واتە: پەرییەکان لەودەمەدا بانگەوازیی نەتەوەکەیان کرد بۆ ئیمانهێنان بە پێغەمبەری ئیسلام، وتیان: ئێمە پێش بیستنی قورئان هەمان بوو پیاوچاك و خاوەن بڕواو کردار چاك، هەشمان بوو وانەبوو، بەتێکڕا چەند کۆمەڵەو تاقمێك بووین، هەرکۆمەڵەو بیرو بۆچونێکی تایبەتی هەبوو واتە: هەمان بوو موسوڵمان و خوداپەرستو هەمانبوو فاسق و تاوانبار، هەمانبوو کافرو ستەمکار.

سەعیدی کوڕی (المسیّب) دەڵێ: کۆمەڵگای جندۆکە وەکوو هی ئادەمیزاد موسوڵمان و گاورو جولەکەو ئاگرپەرستی تێدایە.

﴿وَأَنَّا ظَنَنَّا أَنْ لَنْ نُعجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَنْ نُعْجِزَهُ هَرَباً﴾ دەمانزانی کە: دەسەڵاتی خودا بەسەر ئێمەدا باڵادەستەو ئێمە ناتوانین لەدەست قودرەتی خودا قوتار بین، هەرکاتێ بیەوێ شتێك دەربارەمان بکا لەزەویدا بین، یان بۆ بەرزایی ئاسمان رابکەین و لەهەر شوێنێك خۆمان حەشار بدەین، خودا دەستی دەمانگاتێ و رزگاربوونمان نیە لەدەستی!

﴿وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَى آمَنَّا بِهِ فَمَنْ يُؤْمِنْ بِرَبِّهِ فَلا يَخَافُ بَخْساً وَلا رَهَقاً﴾ ئێمە کە: گوێمان لەقورئان بوو، یەکسەر ئیمانمان پێ هێنا، چونکە زانیمان کەلامی خودایەو حەقە، وەکوو کافرەکانی ئادەمیزاد بەدرۆمان نەخستنەوە.

کەسێك بڕوای بە خودا هەبێ و بڕوا بەنیگاو سروش بکا کە: خودا نازڵی کردوە بۆ سەر پێغەمبەرەکانی بادڵنیا بێ دادوەرانە رۆژی قیامەت خودا حیساب و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکا. لەکرداری چاکەی کەم ناکرێتەوەو لەکرداری خراپەشی زیاد ناکرێ.

﴿وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَداً﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوان لە رێبازی حەق و راستی لایان داوە، ئەوانە بوونە سوتەمەنی دۆزەخ و ئاگریان پێ خۆش دەکرێ، وەکوو چۆن ئادەمیزادە کافرەکان دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ.

ئەمجار سەرزەنشت و لۆمەی جندۆکەو کافرەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَباً﴾ ئەوانەی کافرو بێ بڕوان لەرێبازی حەق و راستی لایان داوە، ئەوانە بوونە سوتەمەنی دۆزەخ و ئاگریان پێ خۆش دەکرێ، وەکوو چۆن ئادەمیزادە کافرەکان دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ.

﴿وَأَلَّوْ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُمْ مَاءً غَدَقاً﴾ ئەی موحەممەد! پێیان رابگەیەنە کە: نیگام بۆ کراوە، ئەگەر جندۆکەو ئادەمیزاد بەردەوام بونایە لە سەر رێبازی ئیسلام، بارانی زۆرو پڕخێرو بەرەکەتمان بۆ دەبارانـدن، خێرو فەرمان

بەسەردا دەبارانـدن، بۆ ئەوەی بەتاقییان بکەینـەوە، دەربکـەوێ کـێ سوپاسـگوزارەو کێ سپڵەو پێ نەزانە..

جا ئەگـەر سوپاسـگوزاری نیعمەتـەکانی خـودابن پاداشـتیان دەدەینـەوە، ئەگـەر لەخودا یـاخی بـوونو سـپڵەو پـێ نـەزان بـوون سـزایان دەدەیـنو نیعمەتـەکانیان لێ دەسێنینەوە، یان مۆڵەتیان دەدەینو پاشان لەناویان دەبەین.

﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَمَنْ يُعْرِضْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَاباً صَعَداً﴾ کەسێك ڕو لەپـەیامی قورئـانوەربگێڕێو گـوێ بـەئامۆژگاریو فـەرمانو جڵـەو گیریـەکانی نـەدا، ئـەوە دەیخەینە ناو عەزابێکی سەختی دژوارەوە.

## هەندێ لەبنەمای ئایینی ئیسلام

﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْاْ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾

﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَداً﴾ ئەی پێغەمبەر بەو مەردوم گەلە بڵێ: من نیگام بۆ کراوە کە هەموو مزگەوتەکان بۆ خودان وماڵی خودان، تایبەتن بە عیبادەتکردنی خودا تییاندا، ئەو مزگەوتانە شوێنی بەندایەتیکردنن، بەندایەتیکردنیش هەر بۆ خودایە، کەوابێ لەو مزگەوتانەدا جگە لە خودا بەندایەتی کەسی تری تێدا مەکەن، کەس مەکەن بە هاوەڵی خوداو پەرستش هەر بۆ ئەو بکەن و بەس!

هەر عیبادەتێ بکەن لەنوێژو رۆژوو مانەوە لەمزگەوتدا بۆ یادی خودا، قورئانخوێندن و عیبادەتی تر بەساغیو دڵسۆزی بۆ خودای بکەن و کەسی ترتان مەبەست نەبێ، بەندایەتیکردن هەر بۆ خودایەو هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ کردنە.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: مەبەست لە (المساجد) هەموو زەوییە، ئاماژە بەو فەرمودەیەی موسلیم و بوخاریو نەسائی لە جابیرەوە ریوایەتیان کردوە کە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (جعلت لي الأرض مسجداً و طهوراً) کەوابێ مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە (زەوی هەمووی دروستکراوی خودایە بۆ غەیری خودا سوژدەی لەسەر مەبەن).

﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَداً﴾ کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەندایەتی خودای دەکرد، ئەو کۆمەڵە پەرییە لە(وادي النخلة) پێی گەیشتن و گوێیان لە قورئانخوێندنی پێغەمبەر بوو، ئەوەندەیان ئارەزو لەبیستنی قورئان بوو، والەدەوری پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە کەڵەکەیان کردو بە مل یەکا نیشتن، خەریك بوو ببن بەیەك پارچەو وەکوو (لباد) یان لێ بێ، یان ببنە پارچە گۆشتێك لەجەستەی پێغەمبەر ﷺ.

یان ماناکەی بەم جۆرەیە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ بانگەوازیی دەکردو دەیفەرموو: (لاإله إلاّ الله . . . ) خەڵکی بانگ دەکرد بۆ خوداپەرستی، کافرەکان لە

ئـادەمیزادو جندۆکـە گەلەکۆمـەکییان لێ دەکـردو دژی دەوەسـتان و دەیانەویـست نـووری ئیـسلام بکوژێننـەوە، بـەلام خوداویـستی ئـایینی خـۆی سـەرخاو بەرهەڵستکارانی ئایین ببەزن و ملکەچ بىن.

﴿قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلا أُشْرِكُ بِهِ أَحَداً﴾ ئەی موحەممـەد! بـەو خەڵکە بڵـێ: کە لێت کۆبوونەوەو گەلەکۆمەکییان لێ کردووی و دەیانەوێ ئایینەکەت پـوچ بکەنـەوەو نـەهێڵن بـڵاو بێتـەوە، پێیـان بڵـێ: مـن بانگـەوازیی ئێـوە دەکـەم بـۆ لای خـودا، عیبـادەت و بەنـدایـەتی هـەر بـۆ ئـەو دەکـەم، خودایـەکی تـاک و تـەنهاو بـێ هـاوەڵ و هاوسەر و منداڵە، پشت هەر بەو دەبەستم و کەس ناکەمە هاوشانی.

﴿قُـلْ إِنِّـي لا أَمْلِـكُ لَكُـمْ ضَـرّاً وَلا رَشَـداً﴾ بڵێ: مـن نـاتوانم زیانتـان لێ دوور بخەمەوە، یان قازانجتان بۆ کێش بکەم، من بەندەیەکم وەکوو ئێوە نیگام بۆ کـراوە، من هیچم بەدەست نیە دەربارەی هیدایەت و گومڕایی ئێوە، هەموو شتێك بەدەست خودایـە، ج بـاکم لەگەلەکۆمـەکی ئێـوە نیـەو هەڕەشـەو دژایـەتیکردنتان بـۆ مـن تۆزقاڵێك لەهەڵوێستی خۆم نام هێنێتە خوارێ.

﴿قُلْ إِنِّي لَنْ يُجِيرَنِي مِنْ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِـنْ دُونِـهِ مُلْتَحَـداً، إِلاَّ بَلاغـاً مِـنْ اللَّـهِ وَرِسَـالاتِهِ﴾ ئـەی موحەممـەد! بەگەل و نەتەوەکەت بڵـێ: ئەگـەر خـودا عـەزابم بـۆ بنێرێ هیچ کەس نیە بتوانێ ئەو عەزابەم لێ لادا، یارمەتیدەرو پشتیوانم نیە جگە لە خودا، هیچ شتێك نیە بتوانێ لە عەزابی خودا رزگارم بکا جگە لـە پابەنـدبوونم بەو پەیامەی بۆم نێردراوەو ئەرکی سەرشانمە ئەنجامی بدەم.

ئەمن پێغەمبەرم ئەرکی ڕاگەیاندنم لەسەر شانە، بەگوێرەی ئەو پەیامەی بۆم ڕەوانـەکراوە کاردەکـەم، پابەنـدی فـەرمان و جڵەوگیریـەکانی پـەروەردگارم، ئەگـەر وابکەم سەرفرازو بەختـەوەر دەبم، ئـەگینا بەفتارەدەچم و خەسارەتمەندی دونیـاو قیامەت دەبم.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژەبەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَـا أُنـزِلَ إِلَيْـكَ مِـن رَّبِّـكَ وَإِن لَّـمْ تَفْعَـلْ فَمَـا بَلَّغْـتَ رِسَـالَتَهُ وَاللّـهُ يَعْـصِمُكَ مِـنَ النَّاسِ﴾(المائدة/٦٧).

ئەمجار هەڕەشە لەوانە دەکا کە گوێڕایەڵی ئاوەڕۆکی پەیامی پێغەمبەر نابن دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً﴾ پێیان بڵێ: من پەیامی پەروەردگارتان پێ ڕادەگەیەنم، جا کەسێك دوای ئەم ڕاگەیاندنو بانگەوازییە گوێڕایەڵی پەیامەکەم نەبێو پشت هەڵکاو لەخودا یاخی بێ، ئەوە سزای سەختی بۆ ئامادەکراوە، ئاگری دۆزەخ چاوەڕوانیەتیو بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوەو ڕزگار بوونیان نیە.

ئەمجار هەڕەشە لە موشریکەکانی مەککە دەکاو دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا رَأَوْا مَـا يُوعَـدُونَ فَـسَيَعْلَمُونَ مَـنْ أَضْـعَفُ نَاصِـراً وَأَقَـلُّ عَـدَداً﴾ واتە: ئەو موشریکانە لە ئادەمیزادو جندۆکە واز لەهەڵوێستی کوفر ئامێزو ستەمکارانەی خۆیان ناهێنن، هەتا کاتێك ئەوەی هەڕەشەیان پێ لێ دەکرێ یەخەیان دەگرێو چاویان بەئاگری دۆزەخ دەکەوێ، ئیتر ئەوکاتە دەزانن کێ بێ دەسەڵاتو کەم دەستە، کێ یارمەتیدەرو پشتیوانە؟ ئەوان یان موسوڵمانەکان؟ بێگومان موشریکەکان بێ کەسو بێ یارمەتیدەرو بێ دەسەڵاتن. ئەوان لە ئاست سەربازانی خودادا زۆر بێ دەسەڵاتو بێ هێزن!!

## زانیاریی دەربارەی کاتی هاتنی قیامەت، زانیارییەکە تایبەتە بە پەروەردگار

﴿ قُلْ إِنْ أَدْرِيٓ أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّيٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾ ﴾

موقاتیل دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی (٢٥) دەڵێ: موشریکەکان کە ئایەتی ﴿حَتَّى إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ. . . الآية﴾ نازڵ بوو بیستیان، (النضر) کوڕی (الحارث) وتی: دەبێ کەی ئەو ڕۆژە بێ کە ئەم هەڕەشەمان پێ لێ دەکا؟ ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَا تُوعَدُونَ﴾و ئایەتەکانی تری دوا ئەوی نازڵ کرد.

﴿قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَداً﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: ئەمن نازانم کەی ئەو عەزابەی خودا هەڕەشەتان پێ لێ دەکا یەختان دەگرێ. ئەمن نازانم ئایا نزیکە قیامەت ڕابێ یان دوورە. نازانم ئاخۆ خودا کاتێکی دیاریکراوی نزیکی بۆ داناوە یان دوورە؟! جگە لە خودا کەس نازانێ قیامەت کەی هەڵدەستێ.

بە کورتی پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەردەکا کە: بە نەتەوەکەی بڵێ: کە هیچ نازانێ دەربارەی کاتی ڕابوونی قیامەت، زانینو دیاریکردنی کاتی ڕابوونی قیامەت تایبەتە بە خوداوەو هەر ئەو هەڵیدەستێنێو دەزانێ کەی ڕادەبێ.

تەنانەت پێغەمبەر ﷺ کەلەو بارەوە پرسیاری لێ کرا فەرمووی: (ما المسؤول عنها بأعلم من السائل) پرسیار لێ کراو دەربارەی کاتی رابوونی قیامەت لە پرسیارکەر شارەزاتر نیە.

﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً، إِلاّ مَنْ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَداً﴾ واتە: غەیبزان هەر خودایە، هەر ئەو ئاگاداری غەیبیاتە، زانینی غەیب تایبەتە بە خوداوە، کەس بەسەر غەیبدا ئاگادار ناکا مەگەر کەسێ خودا بۆ خۆی هەڵی بژاردبێ‌و لێی ڕازی بێ، ئەوەش فروستادەو پێغەمبەری خودایە، هەندێ لەکاروباری غەیب فێری فروستادەکانی دەکا، بۆ ئەوەی ببێتە موعجیزەو نیشانەی ڕاستی پێغەمبەرایەتی ئەو زاتانە.

بەکورتی پەروەردگار هەندێ لە کاروباری غەیب فێری فریشتەی تایبەتی‌و پێغەمبەرانی دەکاو ئاگاداریان دەکا بەسەریدا.

**بێگومان دوو جۆر غەیب هەیە:**

١- هەرشتێ هەستی پێ نەکرێ‌و بە هەست کۆنترۆڵ نەکرێ ئیتر ئەو شتە بەعەقڵ بزانرێ یان بەهۆی بەڵگەو نیشانەی ترەوە.

٢- هەستی پێ نەکرێ بەهیچ جۆرێکیش عەقڵ پەی پێ نەبا هیچ نیشانەو بەڵگەش لەسەری دەست نەکەون. زانینی جۆری دووەم تایبەتە بە خوداوەو هیچ کەس بەهەوڵ‌و تێکۆشانی خۆی پەی پێ ناباو نایزانێ مەگەر خودا بەفەضل‌و ڕەحمەتی خۆی ئاگاداری بکا بەسەریدا، ئەو کەسەش دەبێ پێغەمبەرو فروستادەی خودا بێ، جگە لە پێغەمبەرو فروستادە، هەرکەسێکی تر شتێکی لەو جۆرە غەیبە بکەوێتە دڵەوە زانینێك نین بگەنە رادەی یەقین‌و گومان‌و دوو دڵی تێدا نەمێنێ. ئەوە جۆرێکن لەئیلهام‌و کەشف‌و فیراسەت.

بێگومان پەروەردگار کە: ئەو غەیب‌و نهێنیانە بۆ پێغەمبەرو فروستادەکانی ئاشکرا دەکاو ئاگاداریان دەکا بەسەریدا لەرێگای نیگاو سروشەوە ئەنجامی دەدا، جا

کە ئەو سروش دەنێرێ بۆ پێغەمبەرەکەی، لەپێش دەمییەوەو لەپاشیەوە، لە هەموو لایەکەوە پاسەوانو حەرەسی تایبەتی لەگەڵدا دەنێرێ بۆ ئەوەی پارێزگاری ئەو غەیبە نێراوە بکەن، لە دەستکاری کردنی شەیاتیینیو شێواندنی، نەوەکوو لێی بدزنو بەگوێی کاهینو کۆڵەوەنانییەکانیدا بچرپێنن..

کەوابوو ئەو نیگایەی خودا دەینێرێ بۆ پێغەمبەرانی بەپارێزراوی دەگاو سەد دەر سەد راستەو جێگای گومان نیە، ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە: کۆڵەوەنانیو ئەستێرەگەریو سیحرو جادوبازیی بەتاڵو پوچنو بێ بنەمان، چونکە ئەنجام دەرەکانیان بەهەوانتە لافی زانستی غەیب لێ دەدەن، لەراستیدا زانیارییەکەیان گومانو مەزەندەکردنەو ناچێتە چوارچێوەی زانیاری غەیبەوە. زانیاری پیاوچاکانو دەرکەوتنی کەرامات لێیان زانیارییەکی ئیلهامییەو لەفریشتەوە وەری دەگرنو ناگاتە زانیاری پێغەمبەران، زانیاریی ئەمان دەگاتە پلەی یەقینو هیچ دوو دڵیو گومانی تێدا نامێنێ.

ئیمامی ڕازی لەتەفسیری ئایەتەکەدا وشەی غەیبی تایبەت کردوە بە رابوونی قیامەتواتە: ئەی موحەممەد! بڵێ: من نازانم کەی قیامەت رادەبێ، خودا غەیبزانە کەس بەسەر زانینی کاتی رابوونی قیامەتدا ئاگادار ناکا. کاتی رابوونی قیامەت لەو غەیبییات ونهێنیانەیە کە خودا کەسی بەسەریاندا ئاگادار ناکا.

ئەمجار ڕازی دەفەرموێ: پێویستە دڵنیا بین لەوەی کە: مەبەست لە ئایەتەکە ئەوە نیە کە خودا جگە لە پێغەمبەران کەس بەسەر غەیبدا ئاگادار ناکا، بەڵکوو هەر دەبێ مەبەست بەغەیب قیامەت بێ لەبەر ئەم بەڵگانە:

١- بە حەدیثی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ سەلمێندراوە کە (شق)و (سەطیح) دوو کاهین بوون پێش پەیدابوونی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پەیدابوونی ئەویان داوە، ئەم کاهینانە لەناو عەرەبدا بەو جۆرە زانستەیە بەناوبانگ بوون، تەنانەت کیسرا لەم بارەوە بانگی کردنو چۆنیەتی پەیدابوونو رەوشتی ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوەی لێ پرسین. چۆنیان وت بەو شێوە پێغەمبەر پەیدا بوو بانگەوازیی

دەست پێ دەکرد. کەوابێ جاری واهەیە خودا زانیاری غەیب بەغەیری پێغەمبەرانیش رادەگەیەنێ.

٢- لەهەموو ئاینەکاندا کۆڕا هەیە لەسەر ئەوە کە: خەون راستەو تەعبیر لێ دانەوە هەیە، دەی زۆر جار ئەو کەسەی تەعبیری خەونەکە دەکا هەواڵ لە داهاتوو دەدا وادەبێ ڕاست دەردەچێ.

٣- سوڵتان سەنجەری مەلیك شا کاهینێکی بەغدایی بانگهێشت کردبوو لای خۆی لە خوراسان، هەندێ هەواڵی داهاتووی لێ پرسی، ئەویش هەندێ شتی پێ گوت، چۆنی گوت ئاوا هاتە دی.

٤- ئێمە زۆر جار ئەو زانیارییە واتە: هەواڵدان لەداهاتوو. لەدەمی ئەوانەوە دەبیستین کە: خاوەن ئیلهامن، وادەبێ هەواڵدانەکەیان راست دەردەچێ، مەرجیش نیە ئەو خاوەن ئیلهامانە پیاو چاك بن. بەڵکوو جاری واهەیە ئەستێرەگەرو ساحیرو جادوبازیش هەواڵەکانیان راست دێنەدی.

ئەمجار ڕازی دەڵێ: لەبەر ئەم هۆیانە پێویستە ئایەتەکە ئاوا تەئویل بکەین. بەهەرحاڵ ئەوە بۆچونێکی ئیمامی ڕازییەو ویستمان لێرەدا بینووسین، ئەگینا بەگوێرەی دەقی قورئان لەچەند ئایەتدا ئەوە دوپات کراوەتەوە کە زانیاری عیلمی غەیب تایبەتە بەخوداوە، نە فریشتەو نەئادەمیزادو نەجندۆکە غەیب نازانن. ئەوەتا فریشتەکان بەئاشکرا لەئاستی زانینی عیلمی غەیبدا دەسەوسانی خۆیان راگەیاند ﴿قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ (البقرة/٣٢).

دەربارەی جندۆکەش کە: غەیب نازانن قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَى مَوْتِهِ إِلَّا دَابَّةُ الْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ﴾(سبأ/١٤). لەکۆتایی سورەتی (لقمان)یشدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي

نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾(لقمان/٣٤).

دەی ئەوەتا بەگوێرەی ئەم ئایەتانەو ئایەتی تریش فریشتەو ئادەمیزادو جندۆکە غەیب نازانن و بۆ خۆیان لەو بارەوە دان بەنەزانی خۆیاندا دەنێن ئەو جۆرە هەواڵ و ئیلهامانەی ئیمامی ڕازی گێڕاونیەوە، ئیلهام و تەوەفقوعاتن بۆ مرۆڤی موسوڵمان و ناموسوڵمان دەستەبەر دەبن مامۆستا مەلا کەریم لە تەفسیری نامیدا دەفەرموێ: ئایەتی ﴿فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً، إِلاَّ مَنْ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ﴾ کراوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە کەرامەت نیەو داوای بوونی کەرامەت داوایەکی پوچ بەتاڵە، چونکە خودا خۆی فەرمووی: خودا کەس لەسەر غەیب و پەنامەکی خۆی ئاگادار ناکا کەسێ نەبێ لەپێغەمبەران کە خودا خۆی بیەوێ ئاگاداری بکا وەڵامی ئەم قسە بەچەند جۆرە:

١- دەڵێین مەبەست بە ﴿رسول﴾ لێرەدا فریشتەیە واتە: کەس ئاگاداری غەیبی خۆی ناکا ئەو کەسە نەبێ کەخۆی بیەوێ لەفریشتە، جا ئەو فریشتە پاش ئاگاداریی خۆی بەفەرمانی خودا هەواڵ دەدا بە پێغەمبەران و بەپیاوچاکان.

٢- مەبەست بەئاگادارکردن لەسەر پەنامەکی، ئەوەیە: ئاگادارکردنەکە راستەوخۆ لە خوداوە بێ بەبێ ئەوەی کەسی تر ناوەند بێ. ئەم جۆرە ئاگادارکردنەوە لەپەنامەکی هەر بۆ پێغەمبەران دروستەو بەس! وەکوو خودا راستەوخۆ بەبێ فریشتە لەکێوی (طور) لەگەڵ حەزرەتی موساداو لەمیعراجدا لەگەڵ حەزرەتی موحەممەد ﷺ قسەی کرد. بەڵام کەرامەتی پیاوچاکان بەهۆی فریشتەوەیە... ئەمە قسەکەی مامۆستایە.

هەندێ تر وەڵامی ئەم ئایەتانەیان داوەتەوە کە مەبەس لەجوملەی ﴿فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً﴾ ئاگادارکرنەوەیە بەسەر جوملەی غەیبییاتا، وەکوو لە(إظهار) دەردەکەوێ کەراماتی ئەولیا ئەو ئەندازە زۆر نیە.

هەنـدێ تـر دەڵـێن: ئـەم غەیبـە لێـرەدا مەبەسـت كـاتی هـاتنی پاشـەرۆژە بەنیشانەی ﴿إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ. . . ﴾ ئادەگاتە ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ﴾.

هەندێ تر دەڵێن: ئەم قەصرە ئیضافییە واتـە: پێغەمبـەران ئاگادار دەكا نـەك ئەسـتێرەناس و كاهین و نموونـەی ئـەوان. ئـیتر مەبـەس ئەمـە نیـە كـە: كەسـی تـر ئاگادارناكا. چـونكی زانینـی پەنامـەكی بـەئاگاداركردن و فێركردنـی خـودا بـۆ زۆر كەسە. ﴿يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ﴾.

هەندێ تر فەرموویانە: ئیضافەی غەیب بۆلای ضەمیری بـاری تـەعالا موفیـدی غەیبێكە غەیری خودا هۆیەكی تر نەبێ بۆ زانینی واتـە: مەبـەس ئـەو غەیبانەیـە كە: نیشانەو كەرەسە بۆ زانینی ببێ وەكوو جیهازی سەیركردنی منداڵانی ئافرەت و هەوای ئاسمان و دووربینی دۆزینەوەی ئاوی بیری دوور. بەڵكوو لەو غەیبانە بێ كـە زۆر تاریـك بـێ، وەكـوو زانینـی بەهـەشت و دۆزەخ و (سـدرة المنتهـى) وە ئـەم جـۆرە غەیبانە دەرناخا بۆ رسول نـەبێ، بـەڵام غەیبییاتـەكانی تـر وەكـوو ئـەو نـموونانە ئـەوە بەگەڵێ كەسی تری دەدا.

هەنـدێ كـەس وتوویانـە ﴿يُظْهِـرُ﴾ فیعلـی مـوضـاریعـەو بـۆ (اسـتمرار)ە واتـە: هەمیشەو بە (اسـتمرار) غـەیب دەرنـاخـا بـۆ (رسـول) نـەبێ بـەڵام غـەیری (رسـول) ئەوە غەیبی نیشان دەدا بەڵام جارجار نەك هەمیشە.

﴿لِيَعْلَمَ أَنْ قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَداً﴾ بـۆ ئەوەی خودا دەری بخا كە: ئەو پێغەمبەرانە پەیامی خۆیان گەیاندووە هـیچ زیـادو كەمیان تێدا نەكردووە، یان بۆ ئەوەی پێغەمبەر بزانێ كە جوبرائیل و فریشتەكانی لەگەڵدان بە تەواوی نیگاكەیان گەیاندووە بە ئەوو هیچ كەم و كوڕی تێـدا نـەكراوە، پەروەردگاریش بە تەواوی ئاگاداری چۆنیەتی گەیاندنی نیگاكەیـە لـە جوبرائیلـەوە بە پێغەمبـەرەكان و لەوانیشەوە بۆ گەل و نەتەوەكان، پـەروەردگار بـۆ خـۆی هـەموو شتێكی سەرژمێر و كۆنترۆڵ كردووە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سورەتی المزمل

ئـەم سـورەتە دوای سـورەتی قەڵـەم نـازل بـووە، نـاونراوە سـورەتی موزەمیـل، چونکە باس لەو حاڵەی پێغەمبەر ﷺ دەکا: کە لەسـەرەتای نیگا بـۆهاتـندا خـۆی پێـچابووەو خـۆی داپۆشـیبوو. خـودا فـەرمانی پـێ کـرد: کـە پێخـەف لەسـەر خـۆی لابەرێ‌و هەڵسێ دەست بکا بە شەونوێژ کردن‌و ڕاگەیاندنی پەیامەکەی.

ئەم سورەتە مەککییە واتە: لەپێش کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینـە نـازڵ بووە، جگە لە ئایەتی ژمارە (١٠)و (١١)و (٢٠)، ئەم سێ ئایەتە مەدەنین.

### پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەچەند رویەکەوەیە :

١- کۆتایی سورەتی (الجن) بەباسی بەیانکردنی گەیاندنی پەیامی خودا لەلایـەن پێغەمبەرانـەوە دێ، سـورەتی (المزمـل)یـش بـەوە دەسـت پـێ دەکـا: کـە پـەروەردگار فـەرمان بـە سـەرداری پێغەمبـەران دەکـا بەگەیانـدنی پەیامەکـەی‌و هەرەشـە لـە موشریکەکان‌و دەست کردن بە هەوڵ‌و تێکۆشانی بەردەوام بـۆ ڕاگەیانـدنی پـەیامی ئیسلام.

٢- لـە سـورەتی پێـشوودا هـەوڵی دەنگدانـەوەی بانگـەوازی پێغەمبـەری لـەناو قورەیشییەکان‌و لەناو کۆمەڵگای پەرییەکانـدا ڕاگەیانـد، فـەرمووی: ﴿وَأَنَّـهُ لَمَّـا قَـامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ......﴾ یان ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّـهِ.....﴾ لـە سـەرەتای ئـەم سورەتەشـدا فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ کرد: کە دەست بکا بەبانگـەوازیی فـەرمووی: ﴿يَـا أَيُّهَـا الْمُزَّمِّلُ، قُمْ اللَّيْلَ إِلاَّ قَلِيلاً.......﴾.

**ڕێنومایی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای نیگاو سروش بۆ هاتندا**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی (١-٢) (الحاکم) لە عائیشەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: کە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ، قُمْ اللَّيْلَ إِلاّ قَلِيلاً﴾ نازڵ بوو ساڵێك شەونوێژیان کرد، ئەوەندە بە پێوە وەستان قاچیان هاوسا، ئەمجار ئایەتی ﴿فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ﴾ نازڵ بوو، ئیبنو جەریر بەهەمان شێوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەم ڕیوایەتەی گێڕاوەتەوە.

ئیبنو عەباس دەفەرمووی: ئەمە لەسەرەتای وەحی بۆ ناردندا بووە، ئەوەبوو: کە پێغەمبەرﷺ گوێی لەدەنگی فریشتەی نیگا بوو سەیری کرد، لەرز دایگرتوو هاتەوە ماڵەوە، بە خێزانی فەرموو: دامپۆشن دامپۆشن.

ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو تیرمیذیو هی تریش لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتیان کردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە حیرا بووم، هاتمە خوارەوە، کاتێك بەخۆم زانی بانگم لێ کرا، سەیری لای ڕاستی خۆم کرد هیچ دیار

نەبوو، سەیری لای چەپم کرد هیچم نەدی، بۆ دواوەم ڕوانی هەر هیچم نەبینی، سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، کە ڕوانیم ئەو فریشتەیەی لە ئەشکەوتی (حیرا) هاتەلام، ئەوا لەنێوان ئاسمانو زەویدا (لەحەوادا) لەسەر کورسییەك دانیشتووە زۆری لێ ترسامو بەپەلە هاتمەوە بۆ ماڵو وتم: دامپۆشن دامپۆشن، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾ی نازڵ کرد.

جەماوەری زانایان فەرموویانە: دوا ئەوە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾ی نازڵ کرد. بەم پێیە سەبەب نزولی ئایەتەکە ئەو ترسو خۆفە بوو: کە لەبینینی فریشتەکە توشی هات.

وەکوو ئامازەمان پێ کرد پەروەردگار بەم ئایەتانەی دوایی خیطابی ئاڕاستەی پێغەمبەرﷺ کرد، لەو سەروبەندانەدا: کە سەرەتای هاتنی وەحی بوو بۆی کە جوبرائیلی بینی ترسو خۆفی تووش بوو، هاتەوە ماڵەوەو وتی: دامپۆشن دامپۆشن، دوایی ئەو حاڵەتەی نەماو خیطابی پێغەمبەرایەتی ئاڕاستەکراو بە وەزعەکە ڕاهاتو ئولفەتی بە جوبرائیلەوە گرت.

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ، قُمْ اللَّيْلَ إِلاَّ قَلِيلاً، نِصْفَهُ أَوْ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلاً، أَوْ زِدْ عَلَيْهِ﴾ ئەی ئەو کەسەی بەنوێنی نوستنی شەو خۆت پێچاوەتەوە بە پۆشاكو بەپێخەف خۆت داپۆشیوە! هەستەو ڕابە، خەریکی شەونوێژ بە، بە ئەندازەی نیوەی شەو، یان تۆزێك زیاتر یان کەمتر، واتە سەرپشك بە، سێیەکی شەو یان نیوەی یان دوو بەش لە سێ بەشی خەریکی شەونوێژبە.

یان ئەی ئەو کەسەی بە بەرگی ڕەهبەری خۆت پێچاوەتەوەو کراویتە پێغەمبەری ئادەمیزادو جندۆکەو نموونەی بەندایەتیکردنو ڕەوشتی جوان لە تۆدا ڕەنگیان داوەتەوە، لەشەودا هەستە بۆ شەو نوێژو ماوەیەکی کەم نەبێ هەر خەریکی شەونوێژ بە ئەو ماوەیە بانیوەی شەو بێ، واتە نیوەی بۆ شەونوێژو

نیوەکەی تری بۆ خۆت بێ، یاخود نیوەکەی خۆت کەمێکی زیاد بکەو یا نیوەی شەونوێژەکە کەمێکی کەمتربێ.

﴿وَرَتِّلْ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً﴾ لەشەو نوێژەکانتدا قورئان بخوێنە بە شێوەی تەرتیل واتە لەسەرەخۆو بەئارامی قورئانەکە بخوێنەو پەلە پەل مەکە، هەموو وشەو پیتێك مافی خۆیان بدەرێ وای بخوێنە گوێگر کەڵکی لێ وەربگرێ، بۆ خۆشت وشەو مانا لە ذیهندا ئامادە بکەو دڵیان بدەرێ.

زۆر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ریوایەتکراون، هەموویان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن: کە خوێندنی قورئان دەبێ بە شێوەی تەرتیل بێو یاسای تەجویدی تێدا رەچاو بکرێو هەوڵ بدرێ بە دەنگێکی خۆش بخوێندرێ، یەکێ لەو فەرمودانە:

حاکمو هی تریش لە (البراء)ەوە ریوایەتیان کردوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (زينوا القرآن بأصواتكم) قورئان برازێننەوە بە دەنگی خۆشتان.

لە صەحیحی موسلیمو بوخاریدا لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ليس منا من لم يتغنَ بالقرآن) بە قورئانخوێنی باش ناژمێردرێ کەسێك بە رێكو پێکیو بە تەجویدو تەرتیلەوە قورئان نەخوێنێ.

بەغەوی لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکا کە دەڵێ: بە پەلە پەلو پرتە پرت قورئان مەخوێنن، وشەکانی وەکوو وردە زیخو بەردە وردە بڵاوەمەکەنەوە، سەرنج بدەنە مانا سەرسورهێنەرەکانیو هەڵوێستەی لەسەر بکەن، وای بخوێنن دڵتان راچەنێو جەستەتان موچورکەی پێدا بێ، لە قورئان خوێندندا مەبەستی ئەوەتان نەبێ سورەتەکە تەواو بکەنو خەتمی قورئان بکەن، لەسەرەخۆو بەسەرنجەوە بیخوێنن، دڵ بدەنە ماناکانیو بیری لێ بکەنەوە.

پرسیار لەخاتو عائیشە کرا دەربارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا وتی: قورئانخوێندنی پێغەمبەر ﷺ وەکوو ئەم خوێندنەوە بە پەلەی ئێوە

نەبوو، کاتێك پێغەمبەر ﷺ قورئانی دەخوێند، ئەگەر گوێگر بیویستایە پیتەکانی بژمێرێ، دەیژماردن.. .

﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلاً ثَقِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەر خۆت ئامادە بکە، ئێمە لەوە بەولاوە قورئانت بە نیگا بۆ دەنێرین، ئەرك و فەرمانێکی قورست دەخەینە سەر شان، پەیامێکت بۆ دەنێرین فەرمان و جڵەوگیری و ئەرکی گرانی تێدان لەسەر دڵ و دەرون، ئەنجامدانیان پێویستی بە لێبوردن و خۆئامادەکردنی تەواو هەیە..

پابەند بوون بەو پەیامە وەکوو ئەرکێکی قورسە لە دونیادا لە تەرازوی کێشانی کردەوەدا ڕۆژی قیامەت قورسایی تایبەتی هەیە، پەیامێکی تۆکمەو حەق و پیرۆزە، هەرکەسێ پێوەی پابەند بێ سەرفرازی دونیاو قیامەتە. وەرگرتنی ئەو پەیامە ئەرکێکی گرانەو دڵێکی نورانی و بەهێزی دەوێ خۆتی بۆ ئامادە بکە.

بوخاری و موسلیم و تیرمیذی و نەسائی لە عائیشەوە ریوایەتیان کردوە: دەفەرموێ: پرسیار لە پێغەمبەرﷺ کرا ئاخۆ چۆن نیگات بۆ دێ؟ فەرمووی: جاری وا هەیە وەکوو زرەی جەرەس وایە، ئەم جۆرە زۆر لەسەرم قورسە، کە نیگاکە تەواو دەبێ دەزانم چیم پێ گوتراوە، هیچم لێ تێك ناچێ. جاری وا هەیە فریشتەی نیگا هێنەر وەکوو پیاوی عادی خۆیم نیشان دەدا، چیم پێ دەڵێ حاڵی دەبم. عائیشە دەڵێ: بە چاوی خۆم پێغەمبەرم بینی لە ڕۆژێکی سارددا نیگای بۆ هات ناوچەوانی عارەقی لێ دەتکا.

﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئاً وَأَقْوَمُ قِيلاً﴾ بێگومان هەڵسان بۆ شەونوێژ و وازهێنان لەخەوو نوێژکردن لە شەودا ئەرکێکی گرانترە لە بەندایەتی کردن لە ڕۆژدا، هەروەها باشتر دڵ تێیدا ئارام دەگرێ و دامەزراوترە لەبارەی خوێندنەوەی قورئان، چونکە شەو کاتی ئارامییەو دڵ تێیدا بە خشوع و ئیخلاص دەبێ، دڵ و زوبان هاوکاریی یەکتری دەکەن، دونیا کش و ماتە، بیرکردنەوەو خوێندنەوەی قورئان لەکاتی ئاوەهادا لە دڵدا جێگیر دەبێ و خودا باشتری وەردەگرێ. ئەمەش

ئەبێتە. هۆی ئەوەی داوای شەو نوێژت لێ بکرێ، بۆ ئەوەی بگەیتە پلەو پایەی بەرز.

﴿إِنَّ لَكَ فِي اَلنَّهَارِ سَبْحاً طَوِيلاً﴾ بێگومان لە ڕۆژدا ماوەیەکی دورو درێژهەیە بۆ تۆ هاتوچۆی تێدا بکەی‌و دەتوانی فەرمبووی ماندووبونی شەوت بکەیتەوەو پێداویستی ژیانت دابین بکەی. بەڵام بە هیچ جۆرێك نابێ لە شەوو ڕۆژدا لەیادی خوا غافڵ بی.

﴿وَاذْكُرْ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلاً﴾ زۆر یادی خودا بکەو بەردەوامبە لە سەری، دڵسۆزانە بەندایەتی خودا بکەو هەرکاتێ لە ئەنجامدانی کارە پێویستییەکانی دونیاییت بویتەوە بە تەواوی لێ ببڕێ بۆ تاعەتکردن‌و خودا پەرستی، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ، وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾( الشرح /٧-٨).

﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لا إِلَهَ إِلآ هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً﴾ ئەو خودایەی تۆ یادی دەکەی‌و لێ دەبڕێی بۆ عیبادەت بۆ کردنی، خودای خۆرهەڵات‌و خۆرئاوایە، خودای هەموو بونەوەرەو هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆ کردنە، هەڵسوڕێنەری کاروباری هەموو شتێکە. هیچ خودا نین جگە لە ئەو، لەهەموو شتێکدا پشت بەو ببەستە.. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾(هود/١٢٣).

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە لەبەرامبەر هەڵوێستی موشریکەکاندا بەصەبرو ئارام بێ دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْراً جَمِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەر! پشوو درێژو خۆڕاگربە لە بەرامبەر ئەزیەت‌و هەڵوێستی نالەباری نەتەوەکەت، گوێ مەدەرە جوێن‌و گاڵتەکردنیان بە پەیامەکەت، موداراپان لەگەڵدا بکە، بە شێوەیەکی جوان‌و ڕێك‌و پێك لێیان دوور بکەوەرەوە.

## هەڕەشە لە کافرەکانو ترساندنیان

﴿ وَذَرْنِي وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەندێ تەوجیهاتو ئیرشاداتی ئاراستەی پێغەمبەرﷺ کرد دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەی، ئەمجار هەڕەشەی توند لەموشریکەکان دەکا ئەگەر روو لەبانگەوازیی پێغەمبەر وەربگێڕن، بەعەزابی قیامەت دەیانترسێنێ، هەروا بەعەزابی دونیاش.

دەفەرموێ: ﴿وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلاً﴾ ئەی موحەممەد لێم گەڕێ بۆ ئەو موشریکو بێ باوەڕانە: کە لەخۆیان بایی بوون، تۆزێك مۆڵەتیان بدە لێیان گەڕێ با ماوەیەك بەخۆشی ژیان بەسەر بەرن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾(لقمان/٢٤).

ئەمجار پەروەردگار چوار جۆر عەزابیان بۆ دیاری دەکا: دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالاً وَجَحِيماً، وَطَعَاماً ذَا غُصَّةٍ وَعَذَاباً أَلِيماً﴾ بێگومان ئێمە کۆت‌و زنجیرمان لاهەیە بۆ ئەوانەی پەیامی پێغەمبەرو قورئان بەدرۆ دەخەنەوە، ئاگری بڵێسەدارو سوتێنەرمان هەیە بۆیان، خۆراکی ناخۆش‌و تفت‌و تاڵی وا کە لەقورگ دەگیرێ، نەتف دەدرێتەوەو نەقوت دەچێ. جۆرێکی تر لەعەزابی سەخت کەهەر خودا دەزانێ چەند سەخت‌و دژوارە.

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتْ الْجِبَالُ كَثِيباً مَهِيلاً﴾ ئەو سزا سەخت‌و دژوارە بۆ موشریك‌و بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا: کە زەوی‌و کێوەکانی دەکەونە شەقە تۆڵەو چی لەسەر زەویدا هەیە دەکەونە لەرزە، لەرزەیەکی بێ‌ئەندازە: کێوەکان دەبنە کۆگا لمێکی بلاوەبوو، ئەو کێوە ڕەق‌و پتەوو سەرکەشانە دەبنە تەپ‌و تۆزو بەهەوادا بلاودەبنەوە.

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا إِلَيْكُمْ رَسُولاً شَاهِداً عَلَيْكُمْ كَمَا أَرْسَلْنَا إِلَى فِرْعَوْنَ رَسُولاً، فَعَصَى فِرْعَوْنُ الرَّسُولَ فَأَخَذْنَاهُ أَخْذاً وَبِيلاً﴾ ئەی ئادەمیزادان بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرێکمان ناردوە بۆ سەر ئێوە، ئەویش موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵایە، ڕۆژی قیامەت دەبێتە شایەت بەسەرتانەوە، شایەتییتان لێ دەدا لەبارەی کردەوەکانتانەوە، دەربارەی بەپیرەوەهاتنی بانگەوازییەکەی‌و ڕوو وەرگێڕانتان لێی. هەر وەکوو چۆن موسامان کردە پێغەمبەرو ڕەوانەمان کرد بۆ سەر فیرعەون. بانگەوازی کرد بۆ ئیمان هێنان‌و خوداپەرستی؛ فیرعەون لە پێغەمبەرەکە یاخی بوو بەدرۆی خستەوە ئێمەیش بەتوندی گرتمان، بەسەختی سزاماندا بەخۆی‌و دارو دەستەیەوە لەناومان بردن، لەناو دەریادا خنکانمانن..

کەوابێ پێویستە ئێوە لەسەرگوزەشتەی فیرعەون پەند وەربگرن‌و پێغەمبەری ئیسلام بەدرۆنەخەنەوە، نەبادا ئەوەی بەسەر فیرعەون‌و تاقمەکەی هات بەسەر ئێوەش بێ، بێگومان ئێوە شیاوترن بەلەناوبردن لەقەومی فیرعەون

ئەگـەر پێغەمبەرەکـەتان بەدرۆبخەنــەوە، چـونکە پێغەمبــەری ئێــوە لەموسـا گەورەترو ڕێزدارترە.

﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِنْ كَفَرْتُمْ يَوْماً يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيباً، السَّمَاءُ مُنْفَطِرٌ بِـهِ كَـانَ وَعْـدُهُ مَفْعُولاً﴾ جا ئەگەر ئێوە لەسەر کوفرو بێدینی خۆتـان بمێننـەوەو ئیمـان نـەهێنن، چۆن خۆتان دەپارێزن لەسزای سەختی ڕۆژێکی درێژی ناخۆشی وا: کە منـاڵان پـیر دەکـاو ئاسمـان بـەوڕۆژە شـەق و پـەق دەبـێ؟ ئەمـەی پێتـان ڕاگەیەنـدرا پەنـدو ئامۆژگارییە، خـودا بیرتـان دەخاتـەوە، بەمـەرجێ خـاوەنی دڵـی وشیاربن و هەسـتی بیرکردنـەوەتان هـەبێ. بێگومـان وادەی پـەروەردگار بـەهێنانی ئـەو ڕۆژەو ڕابـوونی قیامەت دێتەجێ نەهاتنی مەحاڵە.

## یادخســـتنەوەو شـارەزایی کـردن

﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٌۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾ ۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ

ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ﴿٢٠﴾

لەوەپێش حاڵو وەزعی بەختەوەرانو بەدبەختانی رانواند، بەجۆرەها سزاو هەڕەشەی لەموشریکەکان کرد، ئەمجار کۆتایی سورەتەکە بەکۆمەڵێك یادخستنەوەو ئامۆژگاریو رەهنومایکردنی ئادەمیزاد دەهێنێو ئادەمیزادەکان سەرپشك دەکا بۆ خۆیان لایەنی خوداپەرستی هەڵبژێرن یان روبکەنە ستەمکاریو تاوان..

ئەمجار ئەرکی شەونوێژکردن لەسەر موسوڵمانان سوك دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَـٰذِهِ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ سَبِيلاً﴾ ئەو فەرمانو ئامۆژگاریو سەرگوزەشتانەی لەوەپێش لەم سورەتەدا رانوێندران یادەوەریو بیرخستنەوەیە بۆ خاوەن عەقڵەکان، بۆ ئەوانەی بیرو هۆشێکیان هەبێ. جا با بۆ خۆیان سەرپشك بن، کەسێ دەیەوێ بەو تەوجیهو ئیرشاداتە پەند ئامێزبێ، بارێگەی تاعەتو خوداپەرستی بگرێتەبەر، بۆ ئەوەی بەختەوەریی دونیاو قیامەتی بۆ دەستەبەر ببێ، رەزامەندیی خوداو بەهەشتی بەرینی بەنسیب ببێ. کەسێکیش پابەندی ئەو پەیامە نابێ عودەی خۆی لەمل خۆی.

لەدوای نازڵبوونی سەرەتای ئەم سورەتە، پێغەمبەرﷺ خۆی گورج کردەوەو بەتەواوی لێ برا بۆ شەونوێژو خودا پەرستی لەشەودا، پاشان خودا ئەو ئەرکەی لەسەر پێغەمبەرو موسوڵمانان سوك کردو فەرمووی:

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ﴾ بێگومان خودا دەزانێ کە: تۆ ئەی پێغەمبەر! پابەندی فەرمانی خودایو جاری

وادەبێ کەمتر لەدووسێیەکی شەو، جاری واش هەیە نیوەی یان سێیەکی شەو. خەریکی شەونوێژو خواپەرستیت و کۆمەڵێکیش لە موسوڵمانان بەشداریت دەکەن لەو شەونوێژەدا، پەروەردگار پاداشتتان دەداتەوە بە پاداشتی چاك.

﴿وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَنْ لَنْ تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ خودا ئەندازەی شەوو رۆژ دەزانێ و دەزانێ ماوەی چەند لەشەودا خەریکی شەونوێژن، وەلێ خودا بۆ خۆی دەزانێ کە: ئێوە ناتوانن بەوردی و بەحەقیقەت بزانن ئەو ماوەیە چەندە. بۆتان ناکرێ بەتەواوی ماوەی سەعاتەکانی دیاری بکەن، یان خودا زانی کە: ئێوە ناتوانن بەتەواوی شەونوێژەکانتان ئەنجام بدەن، یان ئەو ئەرکەی خراوەتە سەرشانتان ئەنجامی بدەن، بۆیە سەنگ و سوکی بۆ کردن و لەگرانەوە حوکمەکەی بۆ ئاسان کردن.

موقاتیل یەژێ کە: ئایەتی ﴿قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلاً﴾ نازڵ بوو، موسوڵمانان بەلایانەوە قورس بوو بەو جۆرە شەونوێژ بکەن، پیاو هەبوو نەی دەزانی نیوەی شەو یان سێیەکی شەو لێك جیابکاتەو، لەبەر ئەوە هەتا بەیانی شەونوێژی دەکرد. لەترسی ئەوە نەبادا هەڵە بکا لەدیاریکردنی سێیەك و نیوەی شەو. ئیتر هەموویان قاچیان هاوسا رەنگی پێستیان گۆڕا، ئیتر خودا رەحمی پێ کردن و ئەو ئەرکەی لەسەر سوك کردن و فەرمووی: ﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ مەبەست بە ﴿لَّن تُحْصُوهُ﴾ واتە ئەرکێکی گرانەو بەناخۆشی ئەنجام دەدرێ. نەك مەبەست ئەوەیە کە ناتوانن بیکەن!

﴿فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْ الْقُرْآنِ﴾ ئەوەندەی دەتوانن شەونوێژ بکەن، چەندێکتان بۆ دەگونجێ و پێتان دەکرێ شەونوێژ بکەن و قورئانی تێدا بخوێنن.

پەروەردگار بەم ئایەتە شەونوێژی فەرزی لەسەر موسوڵمانان هەڵگرت. فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە موسلیم و تیرمیذی و نەسائی لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتیان کردوە. لەو حەدیثەدا هاتووە کە: یەکێك لەهاوەڵان پرسیاری

لە پێغەمبەر ﷺ کردوتی: قوربان! جگە لەپێنج نوێژە فەرزەکە هیچی ترم لەسەر پێویستە؟ لەوەڵامدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا، إلاّ أن تطوع) نەخێر مەگەر سوننەت بکەی. کەوابێ بەئایەتەکەو بەحەدیثەکە، ئاماژە بەوە دەکەن جگە لەپێنج نوێژە فەرزەکان هیچ نوێژی تر فەرز نین. شەونوێژ سوننەتە نەك واجب.

ئەمجار پەروەردگار حیکمەتو هۆکاری لابردنی شەونوێژ بەیان دەکاو بیانوی بۆ دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنكُمْ مَرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ خودا بۆیە ئەرکی شەونوێژی لەفەرزەوە بۆ گۆڕین بەسوننەت، چونکە دەزانێ ئێوە توشی حاڵەتی وادەبن ناتوانن ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن، وادەبێ بەهۆی ناساغیەوە ناتوانن هەموو شەونوێژەکانتان جێبەجێ بکەن..

دەزانێ تاقمێکی ترتان خەریکی بازرگانیو کاسپی کردنن بەدوی پێداویستی بژێوو ژیاندا دەگەڕێنو بەرۆژ ئەوەندە ماندوو دەبن، بەشەو ناتوانن هەڵسنەوە بۆ شەونوێژ، پێرێکی ترتان موجاهیدو تێکۆشەرن لەرێی خودادا، ناتوانن شەونوێژ بکەن.

هەبوونی ئەم بیانوو عوزرانە بوو بەهۆی سوککردنی شەونوێژ لەفەرزەوە بۆ سوننەت. لەسەر موسوڵمانانو فەرمووی: ﴿فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ ئەوەندەی بۆتان کراو پێراگەیشتن شەونوێژبکەنو قورئان بخوێننو ضەخت لە خۆتان مەکەن، پێنج نوێژە فەرزەکانتان بەرێكوپێکیو لەکاتی خۆیاندا بەجێ بهێنن، خوشوعو خوضوعیان تێدا رەچاو بکەن.

زەکاتی پێویست لەماڵو سامانتان دەربکەن، خێرو خێراتی لەرێگەی خودادا بدەن بەهەژارانو لەپێناو جیهاددا ماڵ ببەخشن جەنگاوەران تەیار بکەن، ئەو ماڵو سامانەی دەیبەخشن لای خودا قەرزەو رۆژی قیامەت بەزیادەوە وەری

دەگرنەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافاً كَثِيرَةً﴾(البقرة/٢٤٥).

ئەمجار پەروەردگار زیاتر موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆماڵ بەخشینو دەفەرموێ: ﴿وَمَا تُقَدِّمُوا لأَنْفُسِكُمْ مِنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِنْدَ اللَّهِ هُوَ خَيْراً وَأَعْظَمَ أَجْراً﴾ هەرچی ئێوە ببەخشنو لەپێش خۆتانەوە بینێرن لەو زەکاتو خێرو خێراتەی باس کرا. پاداشتەکەی لای خودایەو بۆتان هەڵدەگیرێو رۆژی قیامەت سودی لێ وەردەگرن. بێگومان ئەو ماڵەی ئاوا لەپێش خۆتانەوە بەرێی دەکەن، زۆر باشترە لەوەی لەژیاندا بۆ خۆتانی پەزمەندە دەکەنو پاشەکەوت دەبێ، دوایی دەبێتە بەشی میراتگران، یان بۆ دوای مردنتان وەصیەتی پێ دەکەن..

بوخاریو نەسائیو ئەبو یەعلای موصلی لە (الحارث) کوڕی سویدەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود وتی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کێتان ماڵی خۆی لەماڵی میراتگرەکەی خۆشتر دەوێ؟ هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! کەسمان نیە ماڵی خۆی خۆشتر نەوێ لەماڵی میراتگرەکەی. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: قسەی خۆتان لەبیر بێو بزانن چی دەڵێن! وتیان: قوربان! هەموومان پێمان وایە کە: ماڵی خۆمان خۆشتر بوێ، ئەمە شتێکی سروشتییە. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەباش بزانن ماڵی خۆتان ئەوەیە لەپێش خۆتانەوە دەینێرنو دەیکەنە توێشووی قیامەت، ماڵی میراتگر ئەوەیە لەدوا خۆت جێی دێڵی.

ئەمجار پەروەردگار لەکۆتایی سورەتەکەدا فەرمان دەکا بە موسوڵمانان کە: تۆبەو ئیستیغفار بکەن دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ زۆر تۆبەو ئیستیغفار بکەن لەتاوانو کردەوەتان، چونکە کەس نیە توشی هەڵەو تاوان نەبێ. بێگومان پەروەردگار لێخۆشبوونی زۆرە بۆ کەسێك داوای لێخۆشبوونی لێ بکا. رەحمو بەزەیی زۆرە بۆ کەسێك داوای رەحمو بەزەیی لێ بکا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (المدثر)

ئەم سورەتە مەککیەو پەنجاو شەش ئایەتە، لەدوای سورەتی (المزمل) نازڵ بووە.

بەم سورەتە دەگوترێ (سورة المدثر) چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو وەصفە وەصفدار کراوە بەو ناوە بانگی لێ کراوەو سەرەتای سورەتەکە بە ﴿یاأیها المدثر﴾ دەستی پێ کردوە.

**پەیوەندیو موناسەبەی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەچەند رویەکەوەیە:**

١- هەردوو سورەتەکە بەبانگ کردن لە پێغەمبەر ﷺ دەستیان پێ کراوە.

٢- سەرەتای هەردوو سورەتەکە دەربارەی روداوێکی تایبەتین.

٣- لە سەرەتای سورەتی پێشوودا فەرمان کراوە بەشەونوێژ، لەسەرەتای ئەم سورەتەشدا هەڕەشە لەوانەکراوە کە: پابەندی دەعوەی ئیسلامی نابن.

لەصەحیحی بوخاریدا ریوایەتێك لەجابیرەوە نەقڵ کراوە دەڵێ یەکەم شتێك کە نازڵ بوو ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ﴾ە، وەڵێ جەماوەری زانایان پێیان وایە کە یەکەمجار سورەتی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ نازڵ بووە.

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتە بوخاری لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: لە ئەشکەوتی (حیراء) بووم: کە کارەکەم تەواو بوو لەکەژەکە هاتمە خوارێ، بانگم لێ کرا سەیری لای ڕاستی خۆمم کرد هیچم نەبینی، سەیری لای چەپم کرد هیچم نەدی، سەیری بەردەمی خۆمم کرد هەر هیچم نەبینی، روانیمە دوای خۆمەوە هەر هیچ دیار نەبوو، سەرم بەرز کردەوە شتێکم بینی، هاتمەماڵەوە بە خەدیجەم گوت: دامپۆشن

ئاوی ساردم پێدا بکەن، دایان پۆشیم ئاوی ساردیان پیاکردم، ئیتر سورەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ . . . ﴾ نازڵ بوو.

جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە: یەکەم سورەت کە نازڵ بووبێ سورەتی ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾(القلم/١-٥).

بۆ لابردنی دژایەتی نێوان ئەم دوو رایە دەگوترێ: یەکەم شت کە لەقورئان نازڵ بوو دوای بڕانی وەحی ئەم سورەتەیە. وەکوو ئیمام ئەحمەدو موسلیم و بوخاری لە جابیرەوە نەقلیان کردوە دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیست فەرمووی: پاشان نیگام لێ بڕا، ماوەیەك نیگام بۆ نەهات. لەکاتێکدا کە دەڕۆیشتم گوێم لەدەنگێکەوە بوو لە ئاسمانەوە سەرم بەرزکردەوە بۆ لای ئاسمان، بینیم ئەو فریشتەیەی لەوەپێش نیگای بۆ هێنام لەسەر کورسیەك دانیشتوە لەنێوان ئاسمان و زەویدا. زۆری لێ ترسام قاچم نەکردن و کەوتمە سەر زەوی، دوایی هاتمە ماڵەوە وتم: دامپۆشن دامپۆشن، ئیتر دایان پۆشیم و پەروەردگار سورەتی ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ، وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ. . .﴾ی نازڵ کرد.

## ڕەهنومایی کردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای نیگا بۆ هاتنیدا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمۡ فَأَنذِرۡ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ﴿٥﴾ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ﴿١٠﴾ ﴾

﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ﴾ ئەی ئەو پێغەمبەرەی کە خۆت داپۆشیوەو خۆت پێچاوەتەوەو ترساوی لەبینینی فریشتەی نیگا کە: یەکەم جار نیگای بۆ هێنای، هەستەو رابە، ئەهلی مەککە بترسێنە، هەڕەشەی هاتنی عەزابێکیان لێ بکە ئەگەر ئیمان نەهێنن.

﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ خودا بەگەورە بگرەو وەصفی شکۆمەندیو کیبریای پاڵبدە، لەعیبادەت بۆکردنو ناوهێنانیدا بەگەورەی بزانە، بێگومان خودا زۆر لەوە گەورەترە هاوەڵو هاوشانی هەبێ، پۆشاکت پاکو خاوێن رابگرە لەپیسیو پۆخەڵی بیپارێزە.

قەتادە دەڵێ: مانای ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ خۆت لەتاوان بپارێزە، لەم روەوە عەرەبەکان دابونەریتیان وابوو؛ ئەگەر کەسێك پەیمان شکێنو بێ وادە بوایە، پێیان دەگوت: پۆشاك پیس، ئەگەر پابەندی پەیمانو وادەی خۆی بوایە، پێیان دەگوت: پۆشاك خاوێن. هەردوو ماناکە راستن، چونکە پاكوخاوێنی حیسسی پەیوەندی بەپاكوخاوێنی مەعنەوییەوە هەیە.

﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ واز لە بتپەرستی بهێنە، هەرگیز بەخەیاڵیش بیر لەوە مەکەرەوە بتو صەنەم بپەرستی. هەروەها واز لەهەموو تاوانو هۆکارێك بێنە کە: سەردەکێشن بۆ بتپەرستیو دەبنە هۆی ئەوەی توشی عەزابی دونیاو قیامەت بی!

بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەرگیز بتپەرستی نەکردوەو بەخەیاڵیشیدا نەهاتووە رۆژێ لەرۆژان بتپەرستی بکا، یان تاوان بکا. کەوابێ فەرمان کردنو جڵەوگیری کردن لە پێغەمبەر ﷺ لەبتپەرستیو تاوانکردن، ئەوە ناگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ شتێکی لەوانە کردبێ، تەنانەت بەخەیاڵیشیدا نەهاتووە ئەو تاوانە بکا وەلێ کە: فەرمانە بە ئەو کرا کە خۆ لەو تاوانە بپارێزێ، لەم روەوەیە کە ئەو (قدوة)ی ئادەمیزادەو بۆ ئەوەیە کە بەردەوام بێ لەسەر خۆپارێزی لەبتپەرستیو تاوان،

وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا النَّبِـيُّ اتَّـقِ اللَّـهَ وَلَـا تُطِـعِ الْكَـافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾(الأحزاب/١).

بەکورتی ئەم جۆرە فەرمان‌وجلەوگیرییانە کە: ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ کراون، مەبەسـت ئەوەیـە کـە: بـەردەوام بـێ لەسـەر دوورکەوتنـەوەو خۆپاراسـتن لـەتاوان‌و بتپەرستی...

﴿وَلَا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ﴾ ئەتۆ منـەت بەسـەر هاوەڵانـتدا مەکە بـەوە کـە: پـەیامی خودایان پێ رادەگەیەنی‌و ئامۆژگارییان دەکەی، بەچاویاندا مەدەوە، ئەگەر شتێکت بەخشی لەبەر خاتری خودا بیبەخشەو منەت بەسەر کابرای پێ بەخشراودا مەکە.

﴿وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ﴾ لەبەر خاتری خودا ئەتۆ بەصەبرو ئارام بە، گوێ بەئەزیـەت دان‌و هەڵسوکەوتی ناشـیرینیان مـەدە. بێگومـان ئـەتۆ ئـەی پێغەمبـەر! هـەڵگری پەیامێکی گەورەو مـەزنی، ئـەرکی سەرشـانت قـورس‌و ئەسـتەمە دەبـێ ورە بـەرزو پشوو درێژ بێ، صەبر بگـری لەبەرامبـەر ئەزیەتـدانی موشـریکەکان، صـەبر بگـری لەسەر طاعەت‌و خوداپەرستی!

﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ، فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ، عَلَـى الْكَـافِرِينَ غَيْـرُ يَـسِيرٍ﴾ ئـەی پێغەمبـەر، صـەبر بگـرە لەسـەر ئەزیەتـدان‌و هەڵوێستی ناشـیرینی موشـریکەکان. ئەوانـە رۆژێکـی سـامناک چاوەڕێیانە، رۆژێـك کـە: سـەرەنجامی کـوفرو بێـدینی‌و کردەوەی ناشـیرینیان دێتـەوەڕێ. جا کە بـۆ جـاری دووەم فـوو دەکـرێ بەکـەڕەنای صوردا بۆ زیندبوونەوەی مـردوان، ئـەو رۆژە لەسـەر کافرەکـان رۆژێکـی ئەسـتەمەو تابڵێی ترسناکە!

## هەڕەشە لەسەرانی شیرك

﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ كَانَ لِأَيَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾

دوای ئەوەی بەگشتی هەڕەشەی لە موشریکەکان کرد، ئەمجار هەڕەشەیەکی سامناكو گورچکبڕ ئاراستەی یەکێك لەسەرانی قورەیش دەکا؛ وادیارە ئەو کابرایە دەورێکی سەرەکی هەبووبێ لە رەتکردنەوەی پەیامی پێغەمبەرو دژایەتی کردنی بانگەوازیی ئیسلامی.

ئیبنو جەریر لە (عبد الأعلى)وە لە موحەممەدی کوڕی ثەورەوە لە موعەممەرەوە، لەعوبادەی کوڕی مەنصورەوە لەعیکریمەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: وەلیدی کوڕی موغەیرە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش قورئانی بەسەردا

خوێند، تۆزێك دڵی بە قورئانەكە نەرم بوو، ئەم هەواڵە گەیشتەوە ئەبو جەهل. هات بۆلای وەلید وتی:

مامە گیان؛ وا گەلو نەتەوەكەت خەریكن پیتاكت بۆ دەكەن! وتی: بۆ؟ وتی: دەتدەنێ، چونكە تۆ چویتە لای موحەممەد ﷺ ویستوتە شتێكت لێی دەست بكەوێ هەڵبەتە ئەم قسەیەی بەتوانجەوە پێ گوتو ویستی دەماری پێ بگیرێو تورە ببێ دەیزانی وەلید بەوە غیرەت دەیگرێ وەلید وتی: خۆ قورەیش دەزانن، من لەهەموویان دەوڵەمەندترم..

ئەمجار ئەبو جەهل دەڵێ: كەواتە قسەیەكی خراپی دەربارە بڵێ: با قورەیش بزانن كە: تۆ بڕوات پێی نیە، ئەویش وتی: چی دەربارە بڵێم؟ سوێنم وابێ من لەهەموانتان پتر شارەزای جۆرو مەبەستەكانی شیعرم، كەستان هێندەی من شارەزای هەڵبەستەكانی جندۆكە نیە، وەڵڵاهی ئەوەی دەیڵێ هیچ جۆرێك نیە لە شیعری ئادەمیزادو هەڵبەستی جندۆكە، وەڵڵاهی ئەوەی ئەو دەیڵێ: بێ وێنەیەو تابڵێی بەرزو سەنگینە كەلامێكی شیرینو بەتامە، هیچ كەلامێكی تر نیە بگاتە ئاستیو بەسەریا زاڵ بێ.

ئەبو جەهل وتی: وەڵڵاهی نەتەوەكەت وازت لێ ناهێنن تا دژی قورئان نەدوێی. وەلید وتی: لێم گەڕێ تا تۆزێك بیر دەكەمەوە، جا كە ماوەیەك بیری كردەوە وتی: ئەم قورئانە سیحرەو كاریگەرە. ئیتر ئەم ئایەتانە ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً﴾ تا دەگاتە ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ نازڵ بوون.. ریوایەتی تریش هەن بە پێویستم نەزانی بیانهێنم.

﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً﴾ لێم گەڕێ بۆ ئەو كەسەی دروستم كرد لەسكی دایكیدا هیچی نەبووە، نەماڵ نەمنداڵ، یان لێم گەڕێ بەتەنیا من بۆ ئەوم، بزانە چۆن دەرەقەتی دێمو تۆڵەی لێ دەسێنم؟ رۆژێك دێ بۆلامان دەگەڕێتەوە بێ ماڵو منداڵو كەسوكار، هیچ شتێكی لەگەڵدا نابێ لەوانەی ئێستا خۆیان پێوە هەڵدەكێشێ، لێم گەڕێ خۆم شەڕی لەگەڵ دەكەمو لەعۆدەی دێم.

موفەسیرین کۆکن لەسەر ئەوە کە: مەبەست بەو کابرا بەدبەختە هەڕەشە لێ کراوە، وەلیدی کوڕی موغەیرەیە! پەروەردگار بەو شێوە هەڕەشەی لێ دەکا، ئەو چارە ڕەشە خودا نازو نیعمەتی زۆری بەسەردا ڕشتبوو، کەچی سپڵەو پێ نەزان بوو، لەجیاتی سوپاسگوزاری کوفرانی دەکرد، ئینکاری ئایەتی خودای دەکرد. قورئانی بەسیحرو جادوو دەزانی.

ئەو کافرو خودا لێ ڕەنجاوە، بەروتو قوتی هاتۆتە دونیاو هیچی نەبوە، تەنانەت پۆشاکیشی لەبەردا نەبوە، گەورە بوەو پێ گەیشتوە.

﴿وَجَعَلْتُ لَهُ مَالاً مَمْدُوداً، وَبَنِينَ شُهُوداً، وَمَهَّدْتُ لَهُ تَمْهِيداً، ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ﴾ ماڵو سامانی زۆرو زەبەندەم پێ داوە، لەبواری ئاژەڵداریو کشتو کاڵو بازرگانیدا لەناو مەککەو دەوروبەریدا ناوبانگی دەرکردوە، چەند کوڕی گەنجو بەتوانامان پێداوە، هەمیشە لەگەڵیدانو دەستەو نەظەر راوەستاون، ریوایەتکراوە: کە وەلید دە کوڕ یان سیانزە کوڕی هەبوون، هەموویان گەورەو ساغو لەش دامەزراو بوون، هەمیشە لەدەوری باوکیان بوونو لێی جیا نەبوونەوە وەلیدیش ئەوەندە دەوڵەمەند بوو کوڕەکانی پێویستیان بەکاسپی کردنو بازرگانی کردن نەبوە.. وێڕای سامانداریو کوڕ زۆری، ژیانی خۆشو تەمەنی درێژو ریاسەتی هۆزی قورەیشیان پێدابوو. لەهەموو رویەکەوە دەست رۆیشتوو دونیا خۆر بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا تەماعی هەبوو ماڵو سامانی بدرێتێو پتر دەوڵەمەند بێ!!

﴿كَلاَّ إِنَّهُ كَانَ لآيَاتِنَا عَنِيداً﴾ نەخێر بۆی زیاد ناکەین، بێگومان ئەو دژایەتی قورئان دەکا، بڕوای بەپەیامی ئیسلام نیە، بە ئەنقەست پەیامی قورئان ڕەت دەکاتەوە، ئەگینا لەناخی دڵیدا دان بەوەدا دەنێ: کە کەلامی خودایە بە سەرزارەکیو بۆ ڕەزامەندیی گەلەکەی بەزوبان دەڵێ بڕوام پێی نیە. بۆیە شیاوی عەزابی سەختو دژوارە ئەو عەزابەی خودا لەبارەیەوە دەفەرموێ:

﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُوداً﴾ لەوەبەولاوە ئەرکی عەزابی ئەخەمە ئەستۆ، توشی ئازارو مەینەتییەکی ئێجگار سەختو گرانی دەکەین، عەزابەکەی بریتی دەبێ لەوەی دەبێ بەکێوێکی ئاگری زۆر بەرزدا سەر بکەوێ. زۆر ماندو دەبێو ناشتوانێ پێیدا سەربکەوێ.

ئیبنو جەریر ریوایەتێکی هێناوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (صعود) کێوێکی ئاگرە لەناو دۆزەخدا، داوا لەوەلیدو هاوەڵانی دەکرێ پێیدا سەربکەون، کە دەستی لەسەر دادەنێن دەستیان دەتوێتەوە: کە هەڵی دەگرن وەکوو خۆی لێ دێتەوە، کە قاچی لەسەر دادەنێن قاچیان دەتوێتەوە، کە قاچیان هەڵدەگرن وەکوو خۆی لێ دێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار حاڵو وەزعی وەلیدی ستەمکار دیاری دەکاو چۆنیەتی بڕیاردانی دژایەتیکردنی بۆ پەیامی قورئان دەخاتە ڕوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ، فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ، ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ بێگومان وەلیدی چارەڕەش بیری لە قورئانو وەزعی پێغەمبەرﷺ کردەوە، لە دڵی خۆیدا قسەی حازرکردن: کە دەربارەی قورئان بیانڵێ، ئەگەر پرسیاری لێ بکرێ، بیری کردەوە چ درۆیەك هەڵ ببەستێ، نەفرینی لێ بێو بەفەتارە بچێو خودا بیکوژێ! چۆنی تەقدیر کردو چۆنی بیرکردەوە؛ بەڕاستی هەڵوێستی ناشیرینی نواندنو کاری نابەجێی کردن. بۆیە شیاوی عەزابی سەختو دژوارە.

﴿ثُمَّ نَظَرَ، ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ، ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ، فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ يُؤْثَرُ، إِنْ هَذَا إِلاَّ قَوْلُ الْبَشَرِ﴾ پاشان سەرلەنوێ تێفکرییەوە، تەماشای کردو ڕوی خۆی گرژ کردو ناوچاوی بەیەکاداو خۆی مۆڕەمچە کرد، ئەمجار کە نەیتوانی ڕەخنەیەکی زانستی لە قورئان بگرێ، پشتی هەڵکردو فیزی نواند، لوتبەرزی خۆی ڕاگەیاندو ڕوی لەئیمانهێنان وەرگێڕاو لەحەق لایدا، وتی: ئەم قورئانەی موحەممەد دەیخوێنێتەوە

سیحرەو جادویەکە بەدرێژایی ڕۆژگار دوایی نایەو بەردەوام دەبێ، موحەممەد لەکەسانی پێش خۆیەوە نەقڵی کردوە، کەلامی خودا نیەو قسەی ئادەمیزادە.

لەمە دەردەکەوێ: کەوەلید قسەکانی پێچەوانەی قەناعەتی ناو دڵ و دەرونیەتی، ئەو بەدڵ بڕوای وابوو: کە قورئان کەلامی ئادەمیزادو جندۆکە نیەو کەلامی خودایە. وەڵێ بەزوبان پێچەوانەی ئەو باوەڕەی خۆی دەربڕی.

ڕیوایەتکراوە وەلیدی کوڕی موغەیرە بەلای پێغەمبەردا تێپەڕی، لەوکاتەدا پێغەمبەرﷺ ﴿حم، السجدة﴾ی دەخوێند، کە گەڕایەوە بەخێڵی بەنی مەخزومی گوت: سوێندم وابێ ئەمڕۆ لە موحەممەد کەلامێکم بیست نەکەلامی ئادەمیزادو نەکەلامی جندۆکەیە، هەتا بڵێی شیرین و فەصیح و بەلیغ بوو، ئەو کەلامە هێندە بەرزو بڵندە هەمیشە بالآدەست دەبێ و قەت نابێ کەلامی لەوە بەرزتر هەبێ.

قەتادە دەڵێ: وەلید گوتوویەتی: لەو قورئانەی موحەممەد دەیخوێنێتەوە ورد بوومەوە بۆم دەرکەوتووە شیعر نیە، تام و چێژێکی تایبەتی هەیە، بالآدەست دەبێ و هیچ کەلامێکی بەسەردا زاڵ نابێ، پاشان گوتی: گومانم لەوەدا نیە کە ئەوە سیحرە. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ﴾ی نازڵ کرد.

کەوابێ گومان لەوەدا نیە کەسێ بەم جۆرە لە قورئان حاڵی ببێ و پاشان بڵێ: سیحرە، دیارە بەئەنقەست دژایەتی قورئانی کردوەو ئینکاری تاک و تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو رابوونی ڕۆژی قیامەتی کردوە، شیاوی ئەوەیە عەزابی سەختی بدرێ و ناخۆشترین شوێنی دۆزەخی بۆ دیاری بکرێ. بۆیە دەفەرموێ:

﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ، لا تُبْقِي وَلا تَذَرُ، لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ، عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ لەوە بەولاوە دەیخەمە ناو ئاگری دۆزەخەوە، نوغرۆی دەکەم لەئاگردا، ئەتۆ چوزانی سەقەر چیە؟ سەقەر ئەو شوێنەیە هەر کەسێکی تێ بکەوێ خوێن و گۆشت و ئێسقانی یەکسەر نامێنێ، کە سەرلەنوێ جارێکی تر جەستەیان وەکوو

خـۆی لێ دەگرێتـەوە، بەشـیدەت تـر دەسـوتێندرێنەوە، پێـستیان دەبێتـە کـۆی زوخاڵو رەشدەبێ. وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُوداً غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ﴾(النساء/٥٦).

دۆزەخ بۆ ئادەمیزادەکان دەردەکەوێو بەچاو دەیبینن، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾(الشعراء/٩١).

چـەند فریـشتەیەك هـەن بـەرپرسو کاربەدەسـتی دۆزەخـن، رق ئەسـتورو تەبیعـەت تونـدو روتـاڵ، ژمارەیـان نـۆزدە فریـشتە یـان نـۆزدە تـاقمو پێـرن. کەدەفەرموێ: ﴿لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ﴾ بەمانا ئەومیە: دۆزەخ هەڵقرچێنەرو داپڵۆخێنـەری ئادەمیزادە تاوانبارەکانە، یان داپڵۆخێنەرو رەش هەڵگێڕی پێستیانە.

قـورطـوبـی دەفـەرموێ: قـسەی راسـتو صـەحیح ئەومیـە: کـە ئـەو نۆزدەیـە سـەرۆكو نەقیبـەکانن، ئەوانـەن: کـە لێپرسـراوی فریـشتەکانن، ئـەگینا ژمـارەی فریشتەکانی کاروباری دۆزەخ بەرێوەدەبەن زۆرن. ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ لەفـەرمودەی صـەحیحدا هـاتوە عەبـدوڵلای کـوڕی مەسـعود ریوایـەت دەکـاو دەڵـێ: پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: (يؤتى بجهنم يومئذٍ لها سبعون ألف زمام مع كل زمام سبعون ألف ملك يجرونها).

## حیکمەتی یەزدانی لەهەڵبژاردنی نۆزدە بۆ ژمارەی فریشتەکانی دۆزەخ

﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ

وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی (٣١) ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ . . . ﴾ ئیسحاق و قەتادە ریوایەتیان کردوە دەڵێن: رۆژێک ئەبو جەهل وتی: ئەی هۆزی قورەیش؛ موحەممەد پێی وایە ئەوانەی ئێوە لەدۆزەخدا سزادەدەن نۆزدەن، ئایا سەد پیاو لەئێوە دەرەقەتی یەکێک لەوان نایەن؟؟

(السدی) دەڵێ: کە ئایەتی ﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ نازڵ بوو، پیاوێکی قورەیشی ناوی (الأشد)ی کوڕی (كلدة الجمحي) بوو پیاوێکی بەشان و بازوو بەهێز بوو، زۆرجار لەسەر پێستی ڕەشە ولاخ ڕاوەستاوە، دەکەس تێی نوسان بۆ ئەوەی پێستەکە لەژێر قاچی دەربێنن، پێستەکە لەت لەت بووە ئەو لەشوێنی خۆی نەجولاوە. ئەم پیاوە چوارشانە گەدەعە، وتی: ئەی هۆزی قورەیش؛ لە ئەو نۆزدە فریشتە مەترسن و بەلاتانەوە هیچ نەبن، ئەمن بەشانی راستم دەیان وەلادەنێم و بەشانی چەپم نۆیان پاڵ دەنێم، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلاّ مَلاَئِكَةً﴾ی نازڵ کرد.

لەریوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێ: (الحارث)ی کوڕی کەلدە پڕماندویەتی: مـن غەنیمی حەڤدەیانم و ئێوەش هەمـووتان پەلاماری دوانیان بدەن، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلاّ مَلائِكَةً﴾ ی نازڵ کرد.

﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلاّ مَلائِكَةً﴾ ئێمە هەر فریشتەمان گێڕاوە بە بەرپرس و حەرەسی دۆزەخ، ئادەمیمان نەکردون بەفەرمانـدارو کارگێڕی دۆزەخ تابتوانن بەربەرەکانێیان بکەن و بەسەریاندا زاڵ ببن. ئەوانە فریشتەن لەو مەخلوقاتە غەیبیو پەنامەکییانەن، کە جگە لەخودا هیچ کەس سروشت و هێزو تواناییان نازانێ، خودا لەبارەیانەوە ئاگاداری کردوین: کە هەرگیز بێ فەرمانی خودا ناکەن و هەرچی فەرمانیان پێبکا یەکسەر ئەنجامی دەدەن. ئەوانە خودا هێزو توانای تایبەتی پێداون، هەر کارو فەرمانێکیان پێ بسپێردرێ بەبێ دواکەوتن جێبەجێی دەکەن!

دەی ئەو فریشتانە لەلایەن خوداوە کراون بەکاربەدەستی دۆزەخ و هێزو دەسەڵاتی پێویستیان پێدراوە، کەواتە بەهیچ جۆرێك ناتواندرێ ئادەمی بێ دەسەڵات و تاوانبار بەسەریاندا زاڵ ببێ؟ لەکاتێکدا فریشتە بەهێزترین مەخلوقاتی خودان، بەزەبرو زەنگترین دروستکراون، لەهەموو مەخلوقات زیاتر پابەندی فەرمانی خودان و لەبەرخاتری خودا رقیان هەڵدەستێ.

ئەم ئایەتە رەتدانەوەی موشریکەکانی مەککە بوو، لەوکاتەدا ژمارەی بەرپرسەکانی دۆزەخ دیاری کران، ئەبوجەهل وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش! ئەرێ دە کەس لەئێوە ناوێرنە یەکێ لەو فریشتانەو بەسەریاندا زاڵ ببن؟ ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلاّ مَلائِكَةً﴾ی نازڵ کرد، ئەوەی پێ راگەیاندن: کە بەرپرسەکانی دۆزەخ فریشتەن و خاوەن هێزو توانای تایبەتین و بەربەرەکانێیان ناکرێ و ئادەمیزاد بەسەریاندا زاڵ نابن.

﴿وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلاَّ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ نەوەكوو ژمارەكەیانمان باس كرد، ئیللا: كە باسمان كرد بۆ تاقی كردنەوەو سەر لێ شێوانی كافرەكان بوو، بۆ ئەوەی ببێتە هۆی دڵە راوكێو سەرسوڕمانیان، زیاتر شێلگیرو گومڕا ببن، چی لەدڵیان دایە دەری ببڕنو خودا زیاتر رقی لێیان هەڵسێ. ئەوەبوو وتیان دۆزەخێك بەم هەموو گەورەییو بەرفراوانییە چۆن بە نۆزدە فریشتە كاروباری هەڵدەسوڕێندرێ؟ هەروا گەلێ قسەی تری گاڵتە ئامێزی لەم جۆرە ناشیرینتریش !

﴿لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَاناً﴾ پەروەردگار كە ژمارەی فریشتەكانی كردوە بەنۆزدە، بۆ ئەوەیە ئەهلی كیتاب (جولەكەو فەلە) دڵنیابن: كە ئەو پێغەمبەرە پێغەمبەرێكی حەقەو ئەوەی دەیڵێ: دەق وەكوو ئەوە وایە كە لە نامە ئاسمانیەكانی پێشوتردا هاتووە. چونكە لە(تەورات و ئینجیل)یش ژمارەی فریشتەكانی بەرپرسی دۆزەخ بە نۆزدە هاتووە. هەروەها بۆ ئەوەی موسوڵمانان پتر ئیمانیان بەهێزبێو چاكتر پەیامی قورئانیان لەدڵدا بچەسپێ كاتێك: كە دەبینین ئەوەی لە قورئاندا هاتووە موافیقی نامە ئاسمانییەكانی پێغەمبەرانی پێشووەو لەگەڵ هی ئەواندا یەك هاتوەتەوە.

﴿وَلا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ بائەهلی كیتابو موسوڵمانان هیچ شكو گومانیان بۆ پەیدا نەبێ دەربارەی راستیو حەقیقەتی ئەو ژمارەیە: كە نۆزدەیە، هەروەها باهیچ گومانیان نەبێ لەراستیو حەقیقەتی ئایینی خودا !

﴿وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلاً﴾ بۆ ئەوەی دووڕوەكان؛ ئەوانەی گومانیان هەیە لەراستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدو ئەوانەی كافرن لەدانیشتوانی مەككەو كەسانی دیكەش، بڵێن ئەوە خودا مەبەستی بەم ژمارە چیە؟ چ حیكمەتێك لەباس كردنو دیاریكردنی ژمارەی نۆزدەدا هەیە؟ ئەوان كە ئەم پرسیارانە دەكەن بڕوایان بە قورئان نیە، بەگشتی پێیان وایە لە خوداوە نەهاتووە.

﴿كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾ ئابەو جۆرە خودا گومڕا دەکا هەرکەسێ بیەوێ ـ لەسەر کردەوەو بیروباوەڕیان ـ گومڕایان بکا، هیدایەتی ئەو کەسانەش دەدا: کە بیەوێ - لەسەر کردەوەو باوەڕیان - شارەزایان بکا، واتە وەکوو چۆن بێ بڕواکانی بەو ژمارەیە گومڕا کردو بڕوادارانی هیدایەتدا، هەر کەسێ وەکوو ئەو دوو تاقمە بێ ئاوای بەسەر دێنێ. ئەوانەی گومڕایان دەکا خۆیان ئامادەباشی گومڕابوونیان تێدایە، ئەوانەیش هیدایەتیان دەدا خۆیان ئامادەباشی وەرگرتنی هیدایەتیان تێدایە.

مانای (ئیضلال)و (هیدایەت) ئەوەنیە خودا کۆمەڵێك بەزۆرە ملێ گومڕا بکاو کۆمەڵێك بەتۆپزی بخاتە سەر ڕێبازی هیدایەت، ئەمە پێچەوانەی دادوەری پەروەردگارەو لەگەڵ حیکمەتی تەشریعدا ناگونجێ..

بێگومان گرتنەبەری ڕێبازی گومڕایی یان هیدایەت، پەیوەندی سەرەکی بەویستو ئیرادەی موکەللەفەوە هەیە، ئادەمیزاد بەئارەزۆی خۆی ئەم ڕێبازە یان ئەو ڕێبازە هەڵدەبژێرێو ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام دەدا، یان پاشگوێیان دەخا، هەر لەم ڕوانگەشەوەیە: کە شیاوی ئەواب یان عیقاب دەبێ.

هەرگیز خودا بەزۆرە ملێ کارێك بە ئادەمیزاد ناکا فەرمان بەچاکە دەکاو نەهی لەخراپە دەکا، جا ئەگەر بەندە پێچەوانەی فەرمانی خودا جوڵایەوە، ئەوە لەخودا یاخی بووە، بەویستی خۆی تاوانی کردوە، خودا هەموو شتێکی ژێربارکردوە، وەلێ جڵەوی بۆ ئادەمیزاد شل کردوە، بۆ خۆی ڕێبازی خۆی هەڵبژێرێو کاری خۆی ئەنجام بدا.

﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ﴾ واتە: حەرەسو پاسەوانانی هەرچەندە نۆزدەن بەلام یارمەتیدەرو سەربازانو هاوکارانیان ئەوەندە زۆرن هەر خودا ژمارەیان دەزانێ، پەروەردگار بەمە ڕەددی موشریکەکانی دایەوە: کە ئەو ژمارەیان بەکەم زانیو لافی ئەوەیان لێ دەدا: کە ئەوان دەرەقەتیان دێن، پوختەکەی ئەوەیە دەفەرموێ: باشە وای دابنێن ئەوانە نۆزدەن، بەلام خۆ ئەوەندەیان سەربازو

یارمەتیدەر هەن: کە جگە لەخودا کەس ژمارەیان نازانێ، بەلای خوداوە ئاسانە ژمارەیان بکاتە بیست و زیاتریش، وەلێ لەم ژمارەیەدا حیکمەتێك هەیە هەر خودا خۆی دەیزانێ.

﴿وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ﴾ سەقەرو دیاردەکانی، باسکردنی ژمارەی بەرپرسانی دۆزەخ یادخستنەوەو ئامۆژگارییە بۆ ئادەمیزاد، بۆ ئەوەیە بزانن خودا تواناو دەسەلاتی بێ سنوورەو هیچ شتێکی لێ یاخی نابێ و پێویستی بە یارمەتیدانی کەس نیە.

﴿كَلَّا﴾ نەخەیر لە قیامەتدا ناتوانن ئینکاری ئاگری دۆزەخ بکەن، ﴿وَالْقَمَرِ﴾ سوێندم بە مانگی خاوەن نوورو روناکی: کە دەدرەوشێتەوە، ﴿وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ﴾ سوێندم بەشەو: کە بەسەر دەچێ و رادەبرێ، ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ﴾ سوێندم بە بەیانی: کە دەردەکەوێ و ئاسۆ رون دەکاتەوە.

﴿إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ﴾ سەقەر: کە شوێنێکە لە ناخۆشترینی دۆزەخ، یەکێکە لە بەلا گەورەو سامناکەکان بۆ ترساندنی ئادەمیزادو هەرەشە لێ کردنیان لەعەزابی خودا. ﴿نَذِيراً لِّلْبَشَرِ﴾ بۆ بێدارکردنەوەو ترسێنەری سەرجەم ئادەمیزادە، لەهەموو خراپەیەك سڵ بکەنەوە. ﴿لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾ دۆزەخ ترساندنە بۆ کەسانێك لەئێوە: کە بیانەوێ ئیمان بهێنن و مل لە تاعەت کردن بنێن و دەست بکەن بە خوداپەرستی، یان سووربن لەسەر کوفرو بێدینی و لەجیاتی ئەوەی بەرەو پێش بچن بۆ ئیمان هێنان بگەڕێنەوە بۆ دواوەو بۆ سەر کوفر.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەمە ئاگادارکردنەوەو تێگەیاندنی ئادەمیزادە بەوەی هەرکەسێ بەرەو ئیمانهێنان بچێتە پێشەوەو دەست بکا بە خوداپەرستی پاداشی نەبڕاوەی دەدرێتێ، کەسێك دوابکەوێ لە ئیمانهێنان و پێغەمبەر بەدرۆبخاتەوە سزای دۆزەخەو بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێنێتەوە.

## گفتوگۆی نێوان بەهەشتیەکانو تاوانباران

﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰ أَتَانَا الْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا بَل لَّا يَخَافُونَ الْآخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّا إِنَّهُ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَاءَ ذَكَرَهُ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَىٰ وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی لە کافرەکان کردو بە ئاگری دۆزەخ ترساندنی. ئەوەی دوبارە کردەوە: کە رزگار بوون لەئاگری دۆزەخ پەیوەستە بەکردەوەی چاکەوە، ئەمجار لێرەدا مانای پێشووی دوبارەکردەوەو ئەوەی راگەیاند: کە هەموو

کەسێك پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە، هەواڵی ئەوەشی پێداین: کە ئەوانەی نامەیان دەدرێتە دەستی راستیان رزگاربوون، تاوانبار ئەهلی دۆزەخن.

دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾ رۆژی قیامەت هەموو نەفسێ راگیراوو و دیلو داماوەو یەخسیرە، بەهۆی کردەوەکانی دونیای تاوانەکانی وەکوو کۆتو زنجیر تێی دەهاڵێنو رزگاربوونی نیە، ﴿إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ﴾ جگە لەوانەی: کە نامەی کردەوەکانیان دەدرێتە دەستی راستیان، بێگومان ئەمان بەتاوانەکانیانەوە هەڵەو گیرنابن، بەڵکوو بەهۆی کردەوە باشەکانیان زوو لەتەنگانە رزگار دەبن.

﴿فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُونَ، عَنِ الْمُجْرِمِينَ، مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ؟﴾ ئەو خودا پێداوانە لەناو باغەکانی بەهەشتدا رادەبوێرنو پرسیار لەیەکتر دەکەن، دەربارەی وەزعو حاڵی تاوانبارەکان دەست دەکەن بەپرسیارو پێیان دەڵێن: ئەوە چی ئێوەی خستە نــاو دۆزەخــەوە؟ مەبەسـتیش لـەم پرسـیارکردنە سەرزەنـشت کـردنو خەجاڵەتکردنیانە.

تاوانبارە گیرۆدەبوەکان هاتنە وەڵامدانەوەو ﴿قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ، وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ، وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ، حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ﴾ وتیان (دەڵێن): ئێمە لە ژیانی دونیاماندا نوێژە فەرزەکانمان نەدەکردن، نەهاتین وەکوو خوداپەرستەکان بەندایەتی خودا بکەین، چاکەمان لەگەڵ هاوڕەگەزانی خۆمان نەکردوە، بژێوو خۆراکمان نەدا بەگەداو هەژاران.

هاونشینو هاودەمی تاوانبارانمان دەکرد، سەرگەرمی قسەی پوچو بێسود بوینو کۆڕو مەجلیسی بێهودەو بەتاڵخوازمان گەرم دەکردن، لەو گوفتارو کرداری پڕوچوچدا رۆ دەچوین، لەگەڵ هەموو گومڕایەکدا هاوشان بووین، هەر کەسێك بوختانو گاڵتەی بە پێغەمبەرو پەیامی ئیسلام بکردایە، ئێمە هاوکاری دەبووینو مەجلیسمان بەو جۆرە قسەلۆکانە دەڕازاندەوە رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوەمان بەلاوە پەشم بوو، بەدرۆمان دەزانی، هەتا مردن یەخەی گرتینو تارمایی مەرگ

خـۆی نیـشان دایـن! ئـەم چـوار هۆکارانـە بەدرێـژایی ژیانمـان بەشـێکبوون لەهەڵسوکەوتی رۆژانەمانو خومان پێوە گرتبوو.

﴿فَمَا تَنْفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ﴾ کەسێك ئەوە خۆو رەوشتی بێ، بەو جۆرە ژیـانی دونیا بەسەر بەرێ، رۆژی قیامەت شەفاعەتی کەسی فریاناکەوێ، کـەس شـەفاعەتی بـۆ ناکـا، چـونکە بـەکافریی مـردونو کـافریش کـەس شـەفاعەتی بـۆ ناکـا، ئەگـەر بۆشیان بکەن وەرناگیرێ.

﴿فَمَا لَهُمْ عَنْ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ، كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَةٌ، فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ﴾ ئـەوە ئەو موشریکانە چییانەو بەچ عەقڵو هۆشێك پشت لە قورئان هەڵدەکەن؟ روو لـەو پەیامـە پـڕ ئامۆژگارییو خێـرو فـەڕە وەردەگێـڕن؟ بەراسـتی ئەوانـە: کـە روو لـە قورئان وەردەگێـڕنو پـشت لـەو پەیامـە پـیرۆزە هەڵدەکـەنو هەڵدەتیزێنن، دەڵێـی کـەرە کێـوین لەبـەر راوچـییان هەڵـدێن، یـان دەڵێـی شـێری برسـیان بـە دواوەیـەو دەیـەوێ نێـچیریان بکـا ئەوانـە کـە لەحـەق رادەکـەنو روی لێ وەردەگێـڕن، هـیچ بیانویـەکیان نیـەو چ بەڵگەیـەکیان بەدەسـتەوە نیـە جگـە لـەگێلیو نـەفامیو سەررەقی!!

﴿بَلْ يُرِيدُ كُلُّ امْرِئٍ مِنْهُمْ أَنْ يُؤْتَى صُحُفاً مُنَشَّرَةً﴾ بـەڵکوو هەریـەکێ لـەو موشریکانە دەیەوێ نامەی تایبەتی بۆ سەر نازڵ ببێ، وەکوو چۆن قورئان بـۆ سـەر موحەممـەدﷺ نـازڵ بـووە، ئەوانـە سـەر رەقـیو فیرسـیچمەیان گەیـشتۆتە ئەندازەیـەك دەڵـێن: ئـەی موحەممـەد؛ بـڕوات پێناکـەین تـا لـە خـوداوە بـۆ هەریەکێکمان نامەیەکی تایبەتی نەیە تێیدا نوسرابێ، کە تۆ رەوانەکراوی خودای!!

ئیبنولونذیر لە(السدي)یەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: قورەیشییەکان وتیان: ئەگـەر موحەممەد راست دەکات پێغەمبـەرە، باوابکا بـەیانی: کـە لەخـەو هەڵسـاین لـەژێر سەری هەریەکێکماندا نامەیەك هەبێ لەخوداوە هاتبێ، تێیـدا نوسـرابێ: کـە فلانـی کوڕی فلان لە دۆزەخ ئەمین بێ!

لە ریوایەتێکی تردا هاتوە ئەبوجەهل و کۆمەڵێکی تر لە قورەیشییەکان وتیان: ئەی موحەممەد ئێمە ئیمانت پێ ناهێنین، هەتا بۆ هەر یەکێك لەئێمە نامەیەك نەیە لە ئاسمانەوە، تێیدا نوسرابێ لە خودای بونەوەرەوە بۆ فلانی کوڕی فلان، موحەممەدﷺ پێغەمبەری منەو بۆ سەر ئێوە رەوانەکراوە پێویستە شوێنی بکەون!!!

هەڵبەتە ئەمە ئەوپەڕی سەرڕەقی و کەودەنی و گێلییە، پەلپ و بیانوی لەو جۆرە نیشانەی تەعەنونت و دڵڕەقی و موکابەرەیە، ئەوانە هەر نایانەوێ ئیمان بێنن، چونکە ئەگەر نامەی لەو جۆرەشیان بۆ بێ پەلپێکی تر دەگرن و ئیمان ناهێنن.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَاباً فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ (الأنعام/٧).

ئەمجار پەروەردگار هۆکاری ئەو سەرڕەقی و بیانوگرتنەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَلاَّ﴾ نەخەیر شتی وانابێ با ئەوانە واز لەو سەرڕەقی و بیانوگرتنانە بێنن، شتی وایان بۆ ناکەین، داخوازیەکەیان نایەتەدی.

﴿بَلْ لا يَخَافُونَ الآخِرَةَ﴾ بەڵکوو ئەوان لەراستیدا بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە، ترسی عەزابی دۆزەخیان نیە، ئەگەر بڕوایان بە زیندوبوونەوە هەبوایەو ترسی ئاگری سەقەریان لە دڵدا بوایە، پێشنیاری لەو جۆرەیان نەدەکردن و بیانوی ئاوایان نەدەگرتن و قورئانیان بەدرۆ نەدەخستەوە!

﴿كَلاَّ إِنَّهُ تَذْكِرَةٌ، فَمَنْ شَاءَ ذَكَرَهُ﴾ با بەس بێ و چیتر پشت لە قورئان هەڵنەکەن، بێگومان قورئان کیتابی هیدایەتە، پڕە لە پەندو ئامۆژگاریی، هەرکەسێ بیەوێ باگوێی بۆ بگرێ و شوێنی بکەوێ و بیکاتە بەرنامەی ژیانی خۆی و بەختەوەری دونیاو قیامەت بۆ خۆی دەستەبەر بکا، کەسێك بیەوێ بەم قورئانە

پەند ئامێز ببێ بەسیەتی، هەموو شتێکی تێدا رون کراوەتەوەو وەڵامی هەموو پرسیارێکی تێدا دەدۆزرێتەوە.

﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ﴾ ئەوانە پەندئامێزنابن‌و بیرناکەنەوەو بە قورئان سودمەند نابن مەگەر خودا مەیلی لێ بێ. بێگومان خودا بەزۆرە ملێ کەس ناخاتە سەر رێبازی راست، دەبێ بەندەکە بۆ خۆی ئامادەباشی هیدایەت وەرگرتنی تێدابێ، ئەمجار خودا هۆکارەکانی هیدایەتدانی بۆ دەرەخسێنێ خودا شیاوی ئەوەیە: کە خوداناسان خۆ لەعەزابی بپارێزن، تاوان ئەنجام نەدەن‌و پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بن شیاوی ئەوەیە لەتاوانی موسوڵمانان خۆش ببێ‌و تۆبەی تۆبەکاران قبوڵ بکا.

زومەخشەری بەگوێرەی بیروباوەڕە موعتەزیلیەکەی تەفسیری ئایەتی ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ﴾ ی کردوە وتویەتی: (ئەوانە یادی خودا ناکەن‌و ئیمان ناهێنن مەگەر خودا زۆرەملێیان لێ بکاو بەتۆپزی ئیمانیان پێ بهێنێ، چونکە دڵیان مۆرکراوەو ئامادەباشی وەرگرتنی هیدایەتیان تێدا نیە، بەئیختیاری خۆیان ئیمان ناهێنن)[٢].

---

[2] ١- تفسير الكشاف ج ٢٩١/٣.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (القيامة)

ئەم سورەتە مەککییەو چل ئایەتەو دوا سورەتی (القارعة) هاتۆتە خوارێ ناونراوە بەسورەتی (القيامة) چونکە لەسەرەتادا خودا سوێندی بەقیامەت خواردوە.

**پەیوەندی بەسورەتی پێشوویەوە لەم روەوەیە:**

لەسورەتی پێشودا پەروەردگار هۆکاری سەرەکی ئیمان نەهێنانی کافرەکانی دیاری کرد: کە بریتیە لە بڕوا نەبوونیان بە رابوونی قیامەت فەرمووی: ﴿كَلَّا بَل لَا يَخَافُونَ الْآخِرَةَ﴾ لەم سورەتەدا بەڵگەی رابوونی قیامەتی بەیانکردن. ئەمجار وەصفی کارەسات و روداوە سامناکەکانی ئەو رۆژەی کرد، ئەمجار باسی گیان دەرچوونی کرد کە قۆناغی پێش قیامەتە. کۆتایی سورەتەکەشی بەباسی سەرەتای دروستبوون و قۆناغەکانی وەدی هاتنی ئادەمیزاد هێنا !!

## رابوونی قیامەت و زیندوبوونەوەو نیشانەکانی

﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ٣ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ٤ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ٥ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ٦ فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ٧ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ٩

﴿يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ وشەی ﴿لا﴾ وێدەچێ زێدەبێ، واتە: سوێند دەخۆم بەرۆژی رابوون. وێدەچێ زێدە نەبێو(نافیة) بێ ئەو کاتە رەددی کەلامێکە لە سورەتی پێشەوەیدا. واتە: نەخێر ئەو قسەیە وانیە، ئێوە بەهەڵە چون، سوێندی لەسەر دەخۆم یان هەر نافیەبێو ماناکەی بەم جۆرە بێ. (سوێند ناخۆم بە رۆژی رابوون، پێویست بەسوێند خواردن ناکا شتەکە ئاشکرایەو حەوێجەی سوێند لەسەر خواردنی نیە! ) بێگومان هەر سوێندێ بەهەرشتێ بخورێ لەلایەن خوداوە، مەبەست بەدیهێنەرو خاوەنی حەقیقی ئەو شتەیە.

﴿وَلا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾ هەروەها سوێند دەخۆم بەنەفسێك کە سەرزەنشتی خاوەنەکەی دەکا لەسەر کەمتەرخەمی سوێند بەوشتانە، ئێوە زیندودەکرێنەوە.

مەبەست بە (النفس اللوامة) نەفسی موسوڵمانە: کە سەرزەنشتی خاوەنەکەی دەکا لەسەر کاری خراپ بۆچی کردیو لەسەر نەکردنی کاری چاکە بۆچی نەیکرد، یان بۆ زۆری نەکرد هەڵبەتە بۆ خودا رەوایە سوێند بە مەخلوقاتی خۆی بخوا، بەکارهێنانی ئوسلوبی سوێندخواردن بە قیامەت لەسەر رابوونی قیامەت زێدە تەئکیدو چەسپاندنی لەخۆگرتووە.

بە تابیلاکردنەوەی سوێند بە(نەفسی لەووامە) دوا بەدوای سوێند خواردن بە قیامەت ئاماژە بەوە دەکا: کە مەبەست بە رابوونی قیامەت دەرخستنی حاڵو وەزعی نەفسەکانە، دیاریی کردنی پلەو پایەیانە، چ لەبەختەوەریو چ لە بەدبەختیدا.

﴿أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ أَلَّنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ، بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ﴾ ئایا ئادەمیزاد پێی وایە ئێمە ناتوانین دوای مردنیان ئێسقانە رزیوەکانیان کۆبکەینەوەو زیندویان بکەینەوە؟ بێگومان ئەوە بیرو بۆچونێکی هەڵەیەو بەتاڵە. بەڵکوو ئێمە دەتوانین چاوە قامکەکانیشیان وەکوو خۆی رێك بخەینەوە، دەتوانین چاوە قامکەکانیان بەهەموو خەتو نەخشو چاڵیو چوێڵییانەوە دەق وەکوو خۆیان دروستیان بکەینەوە، وەکوو دەرکەوتووە چاوە قامکی هیچ ئادەمیزادێ لەهی ئادەمیزادێکی تر ناچێ.

ئەم ملیارەها ئادەمیزادە هاتوونە کۆڕی ژیانەوەو ملیارەهای تریش دێنە ئەم گۆڕەپانەوە، کەچی چاوە پەنجەی هیچ کەس لەهی کەس ناچێ. بۆیە پەروەردگار لەناو هەموو ئەندامانی لەشی مرۆڤدا بەتایبەتی باسی سەرە پەنجەی کرد.

ئەندامەکانی تری لەشی مرۆڤ (چاو، لوت، گوێچکە، روومەت... . هتد) جاری وادەبێ هی ئەم مرۆڤە لەهی ئەو مرۆڤە دەچێ، بەڵام سەرەپەنجەی هیچ مرۆڤێك لەسەرە پەنجەی مرۆڤێکی تر ناچێ، ئەمەش راستیەکی زانستییەو لەوەپێش نەزانراوە، تەنانەت تا ئەم سەدەیەی رابوردوش، واتە: دوای نازڵبوونی قورئان بە دوانزە سەدەو نیو، ئەمجار هەست بەم حەقیقەتە عیلمییە کراوە، ئەوەبوو ساڵی (١٨٨٤)ی زایینی بەشێوەیەکی رەسمی لە ئینگلتەرا هەست بەگرنگی سەرەپەنجە کراو بۆ رێبازی دۆزینەوەو ناسینەوەو جیاکردنەوەی ئەم ئادەمیزاد لەو ئادەمیزاد بەکارهێندرا. مۆرکردنی پەنجە لەسەر پەیماننامەو بەڵگەنامە... هتد هاتە کایەوە چونکە پێستی سەرەپەنجەی هەر مرۆڤێك داپۆشراوە بەچەند هێڵێك ئەم هێڵانە سێ جۆرن (کەوانەیی، تێکچڕژاو، بازنەیی) جۆرێکی تریش هەیە پێك هاتووە لەتێکەڵی ئەم سێ جۆرە هێڵە. ئەم هێڵانەی چاوەی قامك بەدرێژایی تەمەن ناگۆڕێن، سەرەپەنجەی هەریەکێکیش جیاوازیی هەیە لەگەڵ سەرەپەنجەی یەکێکی تر!!

﴿بَلْ يُرِيدُ الإِنسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ﴾ تۆ واز لە مرۆڤ بێنە، ئەو دەیەوێ بەردەوام بێ لەسەر ئینکاریکردنی زیندوبوونەوە، لەسەر ستەمو تاوان، لەدوا رۆژی ژیانیشیدا هەروا دەبێ، تاوان پێش دەخاو تۆبە دوادەخا، تا مردن یەخەی دەگرێ لە خراپترین حاڵی ژیانیدا گیان لەدەست دەدا. زۆر کەس هەیە لەدزیدا دەکوژرێ، هەیە لەشەڕو پیاوکوشتندا گیان لەدەست دەدا، هەیە لەسەر مێزی مەی خواردنەوە بەلادادێو گیانی دەردەچێ، هەیە لەکاتی پیلان دانان دژی موسوڵمانان گیانی دەکێشرێ..... هتد

﴿يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ﴾ بەسەر سوڕمانەوە پرسیاری گاڵتە ئامێزو سەرڕەقانە دەکاو دەڵێ: ئەوە قیامەت کەی رادەبێ؟ لەراستیدا بڕوای بەهاتنی قیامەتو زیندوبوونەوە نیە، کەسێکیش بڕوای بەزیندوبوونەوە نەبێ لەراستیدا گەورەترین تاوانی کردوەو دەکا. ئاژەڵ ئاسا ژیان بەسەر دەباو چی ئارەزۆ بکاو بۆی بکرێ دەیکا، گوێ بەلێ پرسینەوە نادا.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾(الملك/٢٥) یان دەفەرموێ: ﴿هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ، إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾(المؤمنون/٣٦-٣٧).

ئەمجار پەروەردگار هەندێ لەنیشانە گەورەکانی رابوونی قیامەت دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ، وَخَسَفَ الْقَمَرُ، وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ، يَقُولُ الإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ ؟﴾ کاتێ چاو لەترسو سەرگەردانیدا بەملۆق وەستاو ئەبڵەق بوو، بوەلەرزەی قیامەت بوونەوەری راتڵەقاندو روناکی مانگ نەماو مەحوو بۆوەو کۆتایی هات، خۆرو مانگ لەبێ روناکیدا کەوتنە یەکو دیاردەی هاتنی شەوو رۆژ بەدوی یەکدا نەما، دیمەنو دیاردەی بونەوەر هەمووی گۆڕاو جەمسەری هەموو قەبارەکان لێک ترازانو پەرتو بڵاوبوونەوە. ئەو رۆژە ئادەمیزادە بێ باوەڕەکە

دەڵێ: بۆ کوێ رابکەین‌و پەنا بۆ کێ بەرین؟ چۆن خۆمان لە حیساب‌و لێکۆڵینـەوەو عەزابی خودا قوتار بکەین ؟

﴿كَلاّ لا وَزَرَ، إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ﴾ نەخـەیر هـیچ دەرەتانێك نیـە، هـیچ پـەناو قەرارگایـەك نیـە ئـەو رۆژە ئـادەمیزاد خـۆی تێـدا حەشـار بـدا، سـەرەنجام گەڕانەوەی هەموو ئادەمیزاد بۆ لای حوکم‌و بڕیاری پەروەردگارە، قەرارگاو شـوێنی حەوانەوەی ئادەمیزاد یان بەهەشتە یان دۆزەخـە !

﴿يُنَبَّأُ الإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ هـەر لـەو شـوێنەدا: کە خـودا بڕیـاری داوە سارای مەحشەر بێ‌و مەخلوقاتی تێدا کۆبکرێتەوە بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوە، هـەموو ئادەمیزاد ئاگادار دەکرێنەوە بەو کردەوانـەی لـەدونیادا ئـەنجامیان داون، چاکە بـن یـاخود خراپــە، هەرچـی ئـادەمیزاد کردویـەتی لەنامـەی عەمـەلدا تۆمـارکراوەو دەخرێتە بەردەستی. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِراً وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَداً﴾(الكهف/٤٩)

﴿بَلْ الإِنسَانُ عَلَى نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ، وَلَوْ أَلْقَى مَعَاذِيرَهُ﴾ تـۆ واز لەوەبێنـە: کـە بڵێـی ئــادەمیزاد لەلایــەن فریــشتەوە ئاگــادار دەکــرێ، دەربــارەی کردەوەکــانی، چــونکە ئادەمیزاد شایەتێکی ئاگاداری هۆشیارە دەربارەی خۆی، دەزانێ چـی کـردوەو چـۆنی ئـەنجام داوە، هەرچـەندە بەروالــەت لـەبارەگای خـودادا عـوزرو بیـانوو بێنێتــەوە بێسودە، چونکە دەست‌و قاچ‌و ئەندامەکانی تری جەستەی شـایەتی لێ دەدەن، ئـیتر ئـەو بیانوانـە بێسـودن. وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿اقْـرَأْ كَتَابَـكَ كَفَـى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيباً﴾(الإسراء/١٤).

ئادەمیزاد بۆ خۆی باشترین شایەتە لەسەر خودی خۆی، بەڵگەیـەکی ئاشـکرایە لەســەر کردەوەکــانی خــۆی، تەنانــەت ئەگــەر ئینکــاریش بکــاو بیــانوو پاســاو بــۆ کردەوەکــانی جیهــانی بێنێتــەوە بڵــێ: مــن شــتی وام نــەکردوە، ئــەوە ئەنــدامانی

جەستەی لێی دێنە زوبان و شایەتی لەسەر دەدەن، چەندێك عوزر بێنێتەوە خێرا ئەندامانی جەستەی خۆی، بەدرۆی دەخەنەوە !!

## هەوڵدانی پێغەمبەر ﷺ بۆ لەبەرکردنی قورئان، حاڵ و وەزعی ئادەمیزاد لە قیامەتدا

﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ ﴿١٩﴾ كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَنْ يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾﴾

پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە پەرۆشی ئەوەبوو سروش بەباشی وەربگرێ و لەبەری بکاو بەگەلەکەی رابگەیەنێ، لەترسی ئەوەی نەوەکوو شتێکی لێ بیر بچێ، هاودەم لەگەڵ جوبرائیل دا وتەکانی دەخوێندەوە، رانەدەوەستا ئەو لێ بێتەوە ئەمجار ئەم بیخوێنێتەوە. بۆیە پەروەردگار شارەزای دەکا بۆ چۆنیەتی پەیام وەرگرتن و دڵنیای دەکا: کە ئەو سروشە لەدڵی دا جێگیر دەکاو ناهێڵێ هیچی لەبیر بچێتەوە. دەفەرموێ:

﴿لا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ، فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾ ئەی پێغەمبەر لەکاتی وەرگرتنی نیگاو سروشدا تەنها گوێ رابگرە، بەزمان وتەکان مەڵێوە، ترسی ئەوەت نەبێ بۆت لەبەرنەکرێ، ئێمە قورئان

لەسنگی تۆدا کۆدەکەینەوە، ناهێڵین هیچی لێ بفەوتێ، ئەمجار بە رێکوپێکی بەسەر زوبانتدا جاریی دەکەین..

هەرکاتێ لەسەر زوبانی جوبرائیل قورئانمان بۆ خوێندی، گوێ رابگرەو بێدەنگ بە، پاشان بۆ خۆت بیخوێنەوەو چەند جارێك خوێندنەوەکە دوبارە بکەرەوە بۆ ئەوەی لەدڵدا جێگیر بێ. پاشان ئێمە مانای ئایەتەکانت بۆ رون دەکەینەوە، حەڵاڵو حەرامو ئەحکامە تەشریعیەکانت بۆ شی دەکەینەوە.

﴿كَلَّآ﴾ ئەی ئادەمیزادینە؛ واز لەو بیروباوەڕە هەڵەو چەوتانەی خۆتان بێنن، چی تر ئینکاری رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە مەکەن، یان ئەی پێغەمبەر پەلەوپەل لەفێربوونی قورئان مەکە، ئێمە خۆمان فێرت دەکەینو لەسینەتدا کۆی دەکەینەوە.

﴿بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ ، وَتَذَرُونَ الآخِرَةَ﴾ بەڵکوو ئێوە دونیاتان خۆش دەوێو سەرگەرمی دابینکردنی لەززەتو خۆشی دونیای بێ بەقاو تەمەن کورتن، بێ ئاگابوون لەقیامەتو هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی سەرفرازیی رۆژی دوایی.

دەشگونجێ وشەی ﴿كَلَّآ﴾ بەمانا (حقا) بێ، واتە: بەراستی ئەوانە دونیایان خۆش دەوێو وازیان لە قیامەت هێناوە، دونیایان خۆش دەوێو کاری بۆ دەکەن وازیان لە قیامەت هێناوەو پشت گوێیان خستووە.

زومەخشەری دەڵێ: وشەی ﴿كَلَّآ﴾ لێرەدا بۆ گێڕانەوەی پێغەمبەرە لە پەلە پەلکردن بۆ فێربوونی قورئان، هەڵنانیەتی بۆ لەسەرە خۆییو ئارامگرتن، موبالەغەشی لەم مانایەدا کردوە فەرمووی: ﴿بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ﴾ بەڵکوو ئێوەی ئادەمی، لەهەموو شتێك پەلە دەکەن، چونکە سروشتتان پەلەپەلی تێدایە، لەپەلە دروستکراون، بۆیە دونیای کەمخایەنو تەمەن کورتتان خۆش دەوێو وازتان لەقیامەت هێناوە.

ئەمجار پەروەردگار حاڵو وەزعی خواپەرستانو کافرەکان لە دونیادا بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ، وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ، تَظُنُّ أَنْ يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ﴾ دەمو چاوو روخساری موسوڵمانان لە بەهەشتدا تەڕو تازەو درەوشاوەو گەشاوەن، کەیفخۆشو تەڕدەماخن. بەئاشکراو بێ پەردە خودای خۆیان دەبینن راستەوخۆ دەڕواننە زاتی پاکی دەموچاوی تاوانباران لە دۆزەخدا گرژو رەش هەڵگەڕاو، دڵنیان لەوەی: کە بەڵاو کارەساتێکی هەند گەورەو سامناکیان توش دێ بڕبڕەی پشتیان دەشکێنێ.

زومەخشەری کەڕێبازی موعتەزیلەی هەیە رستەی ﴿إلى ربها ناظرة﴾ ی تەئویل کردوە، بەوە (إلى) حەرفی جەڕ نیە بەڵکوو (ألى) یەو موفرەدی (آلآء)ەو (مفعول بە)ێیەو پێش کەوتووە.

ئیبنو کەثیر لەتەفسیری ﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ دا دەڵێ: واتە بەئاشکرا خودای خۆیان دەبینن، وەکوو بوخاری لە صەحیحەکەیدا فەرموودەیەکی ریوایەت کردوە: کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إنكم سترون ربكم عيانا) ئێوە لەرۆژی قیامەتدا خودای خۆتان بەئاشکرا دەبینن بینینی خودا لەلایەن موسوڵمانانەوە لەرۆژی قیامەتدا شتێکی چەسپاوە، فەرمودەی (متواتر)ی تێدا ریوایەت کراون و بەربەرەکانێیان ناکرێ.

ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرە فەرمودەیەکیان لە پێغەمبەرەوەﷺ ریوایەت کردوە، فەرمودەکە لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا هاتووەو دەفەرموێ: هەندێك لەهاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئایا ئێمە رۆژی قیامەت خودای خۆمان دەبینین ؟ پێغەمبەرﷺ لەوەڵامیاندا فەرمووی: (هل تضارون في رؤية الشمس والقمر ليس دونهما سحاب؟ ) هاوەڵان وتیان: نەخەیر، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إنكم ترون ربكم كذلك) بێگومان ئێوە چۆن ئێستا مانگو خۆر دەبینن ئاواش رۆژی قیامەت خودای خۆتان دەبینن.

هەر لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا لە جەریرەوە هاتوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەشەوی چواردەی مانگدا سەیری مانگی کردو فەرمووی: (إنكم ترون ربكم كما ترون هذا القمر، فإن استطعتم أن لاتغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس ولا قبل غروبها فافعلوا) هەر لە صەحیحەیندا هاتووە ئەبو موسا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (جنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما و جنتان من فضة، آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم و بين أن ينظروا الى الله عزّو جلَ إلاّ رداء الكبرياء على وجهه، في جنة عدن)[1].

## هەڵ لەکیس چوونی کافرەکانو سەلماندنی زیندوبوونەوە

﴿ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِىَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلْتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴿٣٣﴾ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج ١٩٧١/٤

لەوەپێش پەروەردگار حاڵ و وەزعی قیامەتی گەورەی باس کرد، دیمەنە سامناکەکانی ڕانواندن، حاڵی بەختەوەرەکان و بەدبەختەکانی دیاری کرد، ئەمجار لێرەدا ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە دونیا دەبێ کۆتایی بێ و هەموو زیندەوەرێك دەبێ پیاڵە شەرابی مەرگ بچێژێ. مردنیش قیامەتی بچکۆلەیەو سەرەتای قۆناغی قیامەتە، جا ئەگەر کافرەکان بڕوایان بەقیامەت نەبێ، خۆ ناتوانن خۆیان لەمردن قوتار بکەن.

پاشان بەدوو بەڵگە ڕابوونی قیامەت دەسەلمێنێ و دەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ وانیە ئەی ئادەمیزاد! ئەتۆ ناتوانی ئەوکاتە، ڕابوونی قیامەت بەدرۆ بزانێ، چونکە یەقین و عەیان دەبێ و جگە لەدان پیانان چارەی ترت نیە.

﴿إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ﴾ کاتێك گیان دەگاتە بینە قاقاو کابرا دەکەوێتە حاڵەتی گیانەڵاوە وە ﴿وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ ؟﴾ لەلایەن ئامادەبوانی نەخۆشەکەوە دەگوترێ: کێ هەیە دوعاو نوشتەیەك بکا؟ ئایا پزیشکێك هەیە دەرمانی ئەم دەردەی لابێ و چارەسەری نەخۆشەکەمان بکا؟ واتە ئەوانەی لەدەوروبەری نەخۆشەکەن دەکەونە هەوڵ و تەقەلاّ بۆ دۆزینەوەی چارەسەر ﴿وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ﴾ کابرای نەخۆش پێی وایە ئیتر دونیا جێ دێڵێ و ئەمە حاڵەتی مردنەو کۆچی دوای دەکا.

﴿وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ﴾ قاچی دەپێچێ بەقاچیەوە ناتوانێ بیانجوڵێنی و گیانیان تێدا نامێنێ! یان مەبەست یەککەوتنی بەڵاو کارەساتی ترسناکن، غەمی لەدونیا دەرچوون و جێ هێشتنی ماڵ و خێزان و پێخۆشبوونی دوژمنان و بەرەو ڕووبوونەوەی مردن.

﴿إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ﴾ گیانەکان بۆ لای خودا سەوق دەکرێن، سەرەنجام و گەڕانەوەی ئادەمیزاد بۆژێر بڕیاری پەروەردگارە، جا یان بۆ بەهەشتە، یان بۆ دۆزەخە.

ئەمجار چۆنیەتی وەزعو حاڵی ئەو کابرا نەخۆشە لە گیانەڵاو کەوتووە بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلا صَدَّقَ وَلا صَلَّى، وَلَكِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى، ثُمَّ ذَهَبَ إِلَى أَهْلِهِ يَتَمَطَّى﴾ ئەو کابرایە نەبڕوای بە پەیامی پێغەمبەر کردومو نەنوێژی فەرزی بۆ خودا ئەنجام داوە، بەڵکوو پێغەمبەری بەدرۆخستۆتەومو پەیامەکەی رەت کردۆتەوە، پشتی لەتاعەتو خوداپەرستی هەڵکردوەو ئیمانی نەهێناوە، سەرباری ئەمانە هەمووی بەکەشخەو کەشو فشێکەوە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەومو کەیف خۆش بووە بەو هەڵوێستەیو رازی بووە بەکردەوە بەدەکانیو سور بووە لەسەریان.

﴿أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى، ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى﴾ دەك بەفتارە بچیو شیوی ومیلت بەنسیب بێ، هاوار بۆ تۆبێو خودا لەناوت بەرێو بەکوشت چی، ئەم دوعا شەڕەت بەسەردا دووبارەو سێ بارە بێتەوە.. ئەو خۆبادانو کەشو فشەت پیرۆز بێ! جێی خۆیەتی ئەوە هەڵوێستو هەڵسوکەوتت بێو بڕوات بە خودای خۆت نەبێ!! خۆت دەبینیەوە چیت بەسەردێو چ عەزابو عیقابێك یەخەت دەگرێ! نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کەدەفەرموێ: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ﴾(الدخان/٤٩) یان دەفەرموێ: ﴿فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِ﴾(الزمر/١٥) یان ﴿اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ﴾(فصلت/٤٠).

قەتادەو کولەبیو موقاتیل دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ مەچەکی ئەبو جەهلی گرتو فەرمووی: ﴿أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى، ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى﴾ واتە: هەڕەشەی لێ کرد، ئەبو جەهل وتی: ئەوە بەچی هەڕەشەم لێ دەکەی؟ نەتۆو نەخوداکەت ناتوانن هیچم لێ بکەن! ئەمن پیاو ماقوڵی ئەم هەرێمەمو خاوەن هێزو توانام ئەمجار رۆیی، ئیتر خودا ئەم ئایەتەی نازڵ کرد وەکوو چۆن پێغەمبەر فەرمووی!!

ئەمجار دوو بەڵگە دێنێتەوە لەسەر راستی رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە: بەو دوو بەڵگانە ئایەتی سەرەتای سورەتەکە کە فەرمووی: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَجْمَعَ عِظَامَهُ﴾ جەخت دەکاتەوە.

یەکەم ئەوەیە: دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى ؟﴾ ئایا ئادەمیزاد وابەتەمایە بەرەڵڵا بکرێ و وازی لێ بهێنرێ، فەرمان و جڵەو گیریەکانی ئاراستە نەکرێن، هیچ ئەرك و ئورکێکی نەخرێتە سەرشان و لەقیامەتدا هیچ حیساب و لێکۆڵینەوەیەکی لەگەڵدا نەکرێ؟؟ نەخەیر با وا نەزانێ و بەتەما ئەوە نەبێ. ئیهمال کردنی ئادەمیزادو لێ نەپرسینەوەی پێچەوانەی داخوازی عەدالەتکارییە..

پێویستە لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش هەبێ بۆ ئەوەی موسوڵمان و کافر بەیەك چاو سەیر نەکرێن. فەرمانبەردارو سەرپێچیکار وەکوو یەك مامەڵەیان لەگەڵ نەکرێ، حیکمەتی پەروەردگاریش واداخوازە تۆڵەستاندن لەکافرو ستەمکاران و پاداشتی خوداپەرستان هەڵبگیرێ بۆ قیامەت، بۆ ئەوەی هەموو کەس فرسەتی خۆی بدرێتێ، لەماوەی ژیانی دونیایدا چی دەکاو چی ناکا، ئەوجار هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی خۆی، سزاو پاداش وەربگرێتەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ السَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَى﴾(طه/١٥) یان دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الآرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾(ص/٢٨).

دووەم بەڵگە ئەوەیە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى، فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالأُنثَى، أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ ئایا ئەو ئادەمیزادەی ئەوەندە لەخۆی رازییەو خۆی بەزل دەزانێ، لەسەرەتادا دڵۆپە ئاوێکی هیچ و پوچ نەبووە رژێندراوەتە رەحەمی دایکیەوە ؟ پاشان ئەو دڵۆپە مەنییە بوەتە خوێن پارەو پاشان بوەتە گۆشتپارەو پاشان بوەتە ئێسقان و ئەمجار بەگۆشت داپۆشراوەو رەنگ و روخسارو شێوەی کێشراوە.

ئایا خودایەك بتوانێ ئاوا لەنەبووەوە ئەم ئادەمیزادە رێك و پێکە دروست بکا، ئایا ناتوانێ پاش مردن جارێکی تر زیندوی بکاتەوە؟! بەڵێ ئیعادەکردنەوە زۆر ئاسان ترە، هەرچەندە بۆ خودا هەموو شتێك وەك یەك ئاسانە.

ئیبنو ئەبی حاتەم و هی تریش ریوایەتیان کردوە دەڵێن: پێغەمبەرﷺ: کەئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەیفەرموو: (سبحانك اللّهم وبلى) ئەحمەدو ئەبوداودو تیرمیذی و ئیبنو مەردەویهی و حاکم دەڵێن: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێك لەئێوە ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ ی خوێندو گەیشتە کۆتایی ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ با بڵێ: (بلى وأنا على ذلك من الشاهدين )، هەر کەسێك سورەتی ﴿لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ ی خوێندو گەیشتە ﴿أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ با بڵێ: (بلى)، هەر کەسێك سورەتی ﴿وَالْمُرْسَلَاتِ . ﴾ی خوێندو گەیشتە ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ﴾ با بڵێ : (آمنا بالله).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی( الإنسان)

ئەم سورەتە مەدەنییەو سی و یەك ئایەتەو دوای سورەتی (الرحمن) نازڵ بووە. ناوی (سورەتی ئینسان)ی لێ نراوە، چونکە لەسەرەتادا باسی دروستبوونی ئادەمیزادی لەخۆگرتووە. ئادەمیزاد خودا لەنەبوونەوە دروستی کردوەو کراوە بەجێنشینی خودا لەسەر زەوی، هەر لەبەرخاتری ئادەمیزادو بۆ بەرژەوەندی ئەو، چی لەزەویدا هەیە لەخەیرو فەڕ دروستکراوە.

**پەیوەندی و موناسەبەی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەچەند رویەکەوەیە :**

١- لەکۆتایی سورەتی پێشوودا باسی ئەوەی کرد: کە ئادەمیزادی لەدڵۆپە ئاوێك دروست کردوە، پاشان ئادەمیزادی کردوە بەدوو رەگەز (نێرو مێ) پیاوو ئافرەت، ئەمجار لەسەرەتای ئەم سورەتەدا باسی دروستبوونی بابە ئادەم دەکا.

٢- لەسورەتی پێشوودا بەکورتی وەصفی بەهەشت و دۆزەخی کرد، لەم سورەتەدا بەدرێژی باسیان دەکا، بەتایبەتی لەباسی بەهەشتدا.

٣- له‌سوره‌تی پێشوودا باسی ئه‌و ناخۆشی‌و سزایانه ده‌كا: كه توشی تاوانباران ده‌بێ له‌قیامه‌تدا. له‌م سوره‌ته‌شدا باسی ئه‌و نازو نیعمه‌تانه ده‌كا: كه له‌به‌هه‌شت دا ده‌درێ به‌خواپه‌رستان.

هه‌رچه‌نده ئه‌م سوره‌ته وه‌كوو وترا مه‌ده‌نییه، واته: دوای كۆچكردنی پێغه‌مبه‌رﷺو هاوه‌ڵانی له‌مه‌ككه‌وه بۆ مه‌دینه نازڵ بووه. وه‌ڵێ گرنگی ده‌دا به‌باسی قیامه‌ت‌و له‌ززه‌ت‌و خۆشی ناو به‌هه‌شت. كه ئه‌مه به‌زۆری له‌سوره‌ته مه‌ككییه‌كاندا به‌دی ده‌كرێ.

## په‌روه‌ردگار ئاده‌میزادی دروست كردووه‌و رێگای راست‌و ناڕاستی بۆ روون كردۆته‌وه

﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾

ده‌فه‌رموێ: ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الإِنسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً﴾ بێگومان زه‌مانێك به‌سه‌ر ره‌گه‌زی ئاده‌میزاددا هاتووه، ئاده‌میزاد وجودی نه‌بوه. هیچ نه‌بووه نه‌ئاده‌م‌و نه نه‌وه‌كانی، هیچ ناوو ده‌نگ‌و ره‌نگێكیان نه‌بووه، لای فریشته‌و جندۆكه‌ش كه‌پێش ئاده‌میزاد دروست كراون - نه ناسراوو له‌بیر كراو بوون..

لەنەبووەوە خودا دروستی کردون، کاتێ ویستی دروستیان بکا هەواڵی دروست کردنیانی بە فریشتەکانی راگەیاندو فەرمووی من لەسەر زەوی رەگەزێك دێنمە کایەوەو زەویان پێ ئاوەدان دەکەمەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلآئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الآرْضِ خَلِيفَةً﴾ (البقرة/٣٠).

ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ئاشکراو نمایانە: کە ئادەمیزاد تازە پەیدا بووە، رۆژگارێك بەسەر ئەم زەوییەدا تێپەڕیوە ئادەمیزادی لەسەر نەبووە، کەخودا دروستیشی کردوە لەشێوەو روخساری جواندا دروستی کردوەو زانینو زانیاری پێویستیشی فێرکردوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾(التين/٤) یان دەفەرموێ: ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الآسْمَاء كُلَّهَا﴾(البقرة/٣١).

ئێمەی موسوڵمان بڕوامان بەم دەقە قورئانیانە هەیەو هەر ئەمە بەراست دەزانین، هەر کەسێ پێچەوانەی ئەمە بڵێ: هەڵەیەو درۆ دەفەرموێ: هەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی زانایانی ئاثارو کۆمەڵایەتی دەربارەی مێژووی ئادەمیزاد لەسەر زەوی پێچەوانەی ئەم دەقە قورئانییانە بوو، لێکۆڵینەوەی زانستی نیەو شێواندنی حەقیقەتەو دەستدرێژیکردنە بۆ سەر مێژوو، بۆ سەر خودی زانیاری !! وەکوو جەنابی داروین کردیو داروینزمەکان پەرەیان پێداو ئادەمیزادیان کردە کوڕی مەیمونو جانەوەری ترو عەیامێکی دورو درێژ زانایان کاتی خۆیان لەو جۆرە لێکۆڵینەوانەدا بەفیڕۆداو چەند (مجلد)اتیان لەو جەهل نامانەدا نووسیو نەگەیشتنە ئاکامو هەرسیان هێنا !!

حەق وایە ئادەمیزاد بیر لەم دەقە قورئانیانە بکاتەوەو بەخۆیدا بچێتەوە، بیر بکاتەوە لەوەی رۆژگارێك هەبووە لەم بونەوەرەدا ئەو وجودی نەبووە، دەنگوباسی نەبووە دەستی قودرەت هێنایە کایەوەو کردی بەم گیانلەبەرە بەنرخەو هۆی جێگیربوونو پەرەسەندنی لەسەر زەوی بۆ دەستەبەر کرد!! بیر بکاتەوە لەچی دروست کراوەو بۆ دروستکراوەو چی داوا لێ دەکرێ ئەنجامی بدا ؟!

لەسەرەتای سورەتەکەدا هەواڵی دروستکردنی ئادەمی راگەیاند: کە باوکی هەموو ئادەمیزادەو لەخاك دروستکراوە وەکوو لەچەند ئایەتێکی تری قورئاندا ئاماژەی پێکراوە.

ئەمجار دێتە سەر باسی نەوەکانی بەگشتی چ نێرو چ مێ. دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾ ئێمە ئادەمیزادمان دروست کردوە لەدڵۆپە ئاوێك کەتێکەڵە لە کەرەسەو ماددەی نێرو مێ. لەرەحمی دایکدا ئاوی پیاوو هێلکۆکەی گەرای ئافرەت یەکدەگرن‌و تێکەڵ بەیەکدی دەبن‌و ئادەمیزادی لێ پەیدا دەبێ، ئیتر دوایی عەقڵ‌و هۆشی دەدەینی‌و تەکالیفی شەرعی دەخەینە ئەستۆو بەخێرو شەڕ بەتاقی دەکەینەوە، بۆ ئەوەی دەربکەوێ رێگای حەق دەگرێتەبەرو خوداپەرستە، یان گومڕا دەبێ‌و خۆی بەفتارە دەدا.

ئێمە ئامێری تێگەیشتن‌و هەست کردنی پێ دەبەخشین، ئامێری بیستن‌و دیتنی بۆ دەستەبەر دەکەین، بۆ ئەوەی بتوانێ ئەرکی سەرشانی ئەنجام بدا، لەتاقیکردنەوە دەربچێ، گوێ لەئایەتەکانی خودا بگرێ‌و بەدڵ لێیان ورد بێتەوە، بۆی دەربکەوێ: کە بەدیهێنەری بونەوەر تاك‌و تەنهاو بێ هاوەڵ‌و وەزیرە، لەهەموو شتێك بێ ئاتاجەو هەموو شتێك ئاتاجی ئەوە.

﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً﴾ ئێمە رێگای راست‌و ناڕاستمان بۆ دیاریی کردوە، حەق‌و بەتاڵمان بۆ دەست نیشان کردوە، خێرو شەڕمان بۆ لێك هەڵاواردوە، سەرەنجامی رێبازەکانمان بۆ رون کردۆتەوە، سودو زیانی کردەوەو هەڵوێستەکانیمان پێ راگەیاندوە. بۆ ئەوەی لەئاکامدا ئادەمیزاد ببنە دوو تاقم، تاقمێکیان سوپاسی نیعمەتەکانی خودا بکەن، ئیمانیان پێ هەبێ‌و پابەندی فەرمان‌و جڵەو گیرییەکانی بن، تاقمێکیشیان کافرو سپڵەو پێنەزان دڵڕەق‌و سەرپێچیکار..

بەکورتی رێگای خێرو رێگای شەڕمان بۆ دیاریی کردوە، ئەمجار بۆ خۆی کامیان دەگرێتەبەر بابیگرێ. زۆرەملێ لەکەس ناکەین‌و کەس بەزۆر موسوڵمان

ناكەین !! جا ئەو مرۆڤە بەهۆی كردەوەكانییەوە یان كامەران و بەختەوەرە یان بەدبەخت و چارە ڕەشە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفەرموێ: ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ (البلد/١٠) موسلیم لە ئەبو مالیكی ئەشعەرییەوە ریوایەتی كردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (كل الناس يغدو فبائع نفسه، فموبقها أو معتقها)هەموو ئادەمیزادێك: كەرۆژی لێ دەبێتەوە خۆی دەفرۆشێ جا یان خۆی دەكاتە كۆیلەو خۆی بەهیلاك دەبا، یان خۆی رزگار دەكا.

## سزاو پاداشی كافران و خوداناسان لەرۆژی قیامەت

﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ سَلَـٰسِلَا۟ وَأَغْلَـٰلًا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾

فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی بەیانکرد: کە ئادەمیزادی شارەزاکردوە بۆرێگای خەیرو رێگای شەڕ، ئەمجار دابەشی کردون بۆ دووتاقم : (سوپاسگوزار، سپڵەو پێنەزان) ئەمجار پەروەردگار لەسەر شێوەی هەرەشە باسی ئەوە دەکا: کە زنجیرو ئاگری بۆ کافران ئامادەکردوە، بۆ موسوڵمانانیش بەهەشتی رازاوەو پڕ نازو نیعمەت. دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلاسِلاً وَأَغْلالاً وَسَعِيراً﴾ ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ کافرو خودانەناسان سزای جۆراو جۆر، هەرکەسێ بڕوای بە خودا نەبێ‌و سەرپێچی فەرمانەکانی بکا، زنجیریان لەقاچ دەکەین‌و بەرەو دۆزەخ کێش دەکرێن. بەزنجیرێك دەست‌و قاچیان بەملیانەوە شەتەك دەدرێن‌و ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخیان بۆ ئامادەکراوە بۆ ئەوەی بەو زنجیرو ئاگرە عەزابیان بدەین.

لە سورەتی (الحاقة) دا ئاماژە بەوە دەکا هەر زنجیرێك حەفتا گەزە (أغلال) بەو زنجیرە دەگوترێ: کە دەستیان بە ملیانەوە پێ شەتەك دەدرێ.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ، فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ﴾(غافر/٧١-٧٢). ئەمە حاڵ‌و وەزعی ستەمکارانە لەرۆژی قیامەتدا.

ئەمجار وەزع‌و حاڵی خوداپەرستەکان رادەنوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِنْ كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُوراً، عَيْناً يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيراً﴾ بێگومان خوداپەرستەکان ئەوانەی ئەهلی طاعەت‌و خوداپەرستی بوون لەدونیادا، بەدڵسۆزی ئەرکی سەرشانی خۆیان لەکاتی خۆیدا بەرێکو پێکی بەجێ هێناوە، خۆیان لەتاوان‌و نافەرمانی خودا پاراستووە، ئەوانە لەبەهەشتدا شەرابی تێکەڵ

بـەکافورو سـاردو سـپیو بۆنخـۆش دەخۆنـەوە. هـەروەها ئـەو شـەرابەیان تێکەڵـە بەئاوی کانیـاوی تـری بەهەشـت: کـە بەنـدە صـاڵحەکانی خـودا لێـی دەخۆنـەوە، بـۆ کوێیان بویٚ ئەو کانیاوە بۆ ئـەویٚ رادەکێـشنو چۆنیان بـویٚ ئـاوا تەصـەروفی پێـوە دەکەن.

چـونکە ئـەوان لـەژیانی دونیایانـدا ﴿يُوفُـونَ بِالنَّـذْرِ وَيَخَـافُونَ يَوْمـاً كَـانَ شَـرُّهُ مُـسْتَطِيراً﴾ وەفـا بەنـەذرو فۆتـۆی خۆیـان دەکـەن، ئـەو ئەرکانـەی بەمەبەسـتی نزیکبوونەوە لەخودا دەیخەنە سەرشانی خۆیان. بەدڵسۆزی ئـەنجامیان دەدەن، هـەر شتێك حەرام بیٚو نـەی لیٚ کرابیٚ ئـەوان تـوخنی ناکـەون. ئەوانـە ترسـی رۆژێکیـان هەیە: کـە رۆژی قیامەتـە، کارەسـاتو شـەڕو بـەڵاکانی بڵاودەبنـەوەو هـەموو کـەس دەگرنەوە مەگەر کەسانێك بکەونە ژێر رەحمەتی خوداوە.

﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّـهِ مِـسْكِيناً وَيَتِيمـاً وَأَسِـيراً﴾ خـۆراكو بـژێوی خۆیـان دەبەخشن ـ هەرچەندە بۆ خۆیان زۆریان پێویستە ـ بە هەژارو بەهەتیوو دیـل بـۆ خۆیان برسییانەو لەدەمی خۆیان دەگرنـەوە دەیدەن بە ئادەمیزادی گەداو بەمنداڵی هەتیوو بەمرۆڤی بـەدیل گـیراو مەبەسـتیـشیان رەزامەنـدیی خودایـەو لەبـەرخاتری خودا ئەو ئیثارو لـەخۆ بـوردوییـە ئـەنجام دەدەن وێـڕای ئـەوەی کـە بەدڵخۆشـیو بەروی خۆشەوە خواردنەکەیان پیٚ دەبەخشن، پێیشیان دەڵێن:

﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لا نُرِيدُ مِـنْكُمْ جَـزَاءً وَلا شُـكُوراً﴾ نـەوەکوو ئێمـە ئـەم خـواردنو پێداویـستیانەتان پـیٚ دەدەیـن تـەنها لەبـەرخاتری رەزامەنـدیی خودایـەو بەس! هـیچ منـەتتان بەسـەردا ناکـەین، پاداشمـان لـەئێوە نـاویٚ، شـوکرو سوپاسـی ئێوەمان مەبەست نیە، بەتەما هیچ پاساودانەوەیەکی ئێوە نین.

﴿إِنَّـا نَخَـافُ مِـنْ رَبِّنَـا يَوْمـاً عَبُوسـاً قَمْطَرِيـراً﴾ ئێمـە وێـڕای ئـەوەی بەتـەمای رەزامەندیی خودای خۆمانین، ترسی عەزابو تەنگانـەی رۆژێکیـشمان هەیـە تـابڵێی سەختو دژوارە، لەترسی دیمەنە سامناکەکانی دەمو چاو گرژو تـاڵ دەبـن، رۆژێکـی

درێژی پڕ بەڵاو کارەسات و عەزابی سەخت، دەمانەوێ لەو ڕۆژە سەخت و دژوارەدا پاداشتی خۆمان وەربگرینەوە.

﴿فَوَقَاهُمْ اللَّهُ شَرَّ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُوراً﴾ خودا لە پاداشتی ئەو خۆراك بەخشین و لەخودا ترسانەیان، شەڕو نەگبەتی ئەو ڕۆژە گرژو سامناکەی لێ دوورخستنەوە، لەو عەزاب و ناخۆشییە پاراستنی، ئەو ترس و بیمەی لێ ڕەواندنەوە، دڵنیای کردن کە ئەوان لە عەزابی دۆزەخ ڕزگاریان بووەو ئەهلی بەهەشتن. لەبەرامبەر ڕوگرژی و دڵ تەنگی کافرەکاندا، ئەمان دڵخۆش و ڕوگەشن، دەم بەپێکەنین و تەڕ دەماخن، دیاردەی نازو نیعمەتی خودایان پێوە دیارە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ، ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ﴾(عبس/٣٨-٣٩)

ئەم جۆرە تەعبیرانە کە دەفەرموێ: ﴿فَوَقَاهُمْ﴾ و ﴿وَلَقَّاهُمْ﴾ کە کرداری ڕابووردون و هێشتا قیامەت نەهاتووە، بۆ تەئکیدو دڵنیابوونە لەڕودانیان. هەروەها لە هەرشوێنێکدا بۆ تەعبیری موستەقبەل کرداری ڕابوردو (فعل ماض)ی بەکاربێنێ ئەوە مەبەستە.

﴿وَجَزَاهُمْ بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيراً﴾ پەروەردگار لەپاساوی بەردەوام بوون و خۆڕاگرییان لەسەر ئەرکی سەرشانیان بەهەشتی ڕازاوەو پان و بەرینی پێ بەخشین، ژیانی خۆش و جاویدانی بۆ دەستەبەر کردن، پۆشاکی ئاوریشم و نەرم و نۆڵی لەبەر کردن.

ئایەتەکە بەروونی ئەوەی تێدا بەدی دەکرێ: کە چاکەکردن لەگەڵ دیلدا موسوڵمان بێ یان کافر بێ، دەبێتە هۆی ڕەزامەندیی پەروەردگار لەپاسای ئیسلامدا صەدەقەی (تطوع) بەکافر دەدرێ و دەبێتە هۆکاری دەستەبەربوونی ڕەزامەندیی خوداش. وەلێ زەکاتی فەرز هەردەبێ بدرێ بە موسوڵمان. زۆربەی زانایانی ئیسلام پێیان وایە چاکە کردن لەگەڵ کافرو خودانەناساندا لەناو وڵاتی موسوڵماندا

کارێکی پەسەندەو بەسوننەت دەژمێررێ و واجب نیە. داڵدەدانی دیل ئەرکی سەرشانی حکوومەتەو دەبێ لەخەزێنەی دەوڵەت دابین بکرێ ئەگەر دەوڵەت نەیکرد دەکەوێتە سەرشانی موسوڵمانان.

## خانووبەرەو خواردنەوەو پۆشاك و خزمەتچی بەهەشتیەکان

﴿ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ ۖ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی خۆراك و پۆشاکی بەهەشتیەکانی کرد، ئەمجار باسی کۆشك و تەلارو شێوەی دانیشتن و خواردنەوەو خزمەتچی و سینی و پیاڵەی خواردنەوەکانیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الآرَائِكِ لا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْساً

وَلا زَمْهَرِيـراً﴾ پاداشـتی خوداناسـان بەهەشـتی رازاوەیـە تێیـدا دادەنیـشن لەسـەر کورسـی‌و مۆبیلـەی رازاوە، کـەش و هەوایـەکی خـۆش‌و دڵـرفێن، نـە گـەرمای خـۆر دەبیـنن نەسـەرمای ساردی زەمهەریرو سەهۆڵ بەندان لێیان دەدا، نە گەرمایان دەبێ نەسەرما، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هو الجنـة سجسج لاحـرّ ولاقـرّ) سەجـسەج بریتیە لەو سێبەرەی نێوان بەرەبەیان‌و هەڵهاتنی خۆر.

﴿وَدَانِيَـةً عَلَـيْهِمْ ظِلالُهَـا وَذُلِّلَـتْ قُطُوفُهَـا تَـذْلِيلاً﴾ بـۆ زێـدە خۆشـی لـق‌و پـۆپی درەختـەکان بەسـەریاندا بڵاوبوونـەوەو شـۆڕبوونەوەو سـێبەریان لێ دەکـەن. هەرچـەندە لەبەهەشـتدا خـۆر نیـە، میـوەی درەختـەکان لێیـان نزیـك کراوەتـەوە دانیشتوو راکشاوو راوەستاو دەستیان دەگاتێ‌و دەتوانن بەئاسانی میوەی لێ بکەنەوە. دەسـت بـۆ هـەر میوەیـەك بـەرن هـیچ شـتێك نیـە بتـوانێ دەسـتیان بگێڕێتـەوە. پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێ کـە: سێبەری بەهەشـت سێبەری ئاسایی دونیـا نیـە بەم جۆرە شتێك ببێتە پەردەو تیشکی خۆر بگێڕێتەوە!

مانـای ئـەوە کـە: سـێبەرەکە نزیکـەو ئـەوان لـەژێر سـێبەردان. ئەوەیـە درەختەکانی بەهەشت بەجۆرێك دروست کراون ئەگەر لەفەرزێکدا خۆر هەبێ ئەو درەختانە سێبەر دەکەن‌و ناهێڵن تیشکی خۆر لێیان بدا.

﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِمْ بِآنِيَةٍ مِنْ فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَـوَارِيرَ، قَـوَارِيرَ مِـنْ فِـضَّةٍ قَـدَّرُوهَا تَقْـدِيراً﴾ خزمەتـچیەکانی بەهەشـت بەپیاڵـەو سینی‌و دەوری لـەزیو دروسـتکراوی خۆراکـەوە، بـەفنجان‌و کـوپی بلـورین‌و شـەراب‌و شـیرو هەنگوینـەوە بەسـەریاندا دەگەڕێن‌و خـواردن‌و شـلەمەنی جـۆراو جۆریـان بەسـەردا دەگێـڕن، کوپـەکانیان بـێ قوڵفەو لولەن. سپێتی زیوو روونی بلورەکان تێکەڵاو بـوون‌و لـەدەرەوەو ناوەوەیـان دیارەو دیمەنێکی نایاب‌و جوانیان هەیە.

ئیبنـو ئـەبی حاتـەم لـەئیبنو عەبباسـەوە ریوایـەت دەکـا دەڵـێ: هـەر شـتێك لەبەهەشتدا هەبێ ئێوە لە دونیادا وێنەیەکی ئەو شتەتان پێدراوە جگـە لـەبلووری

زیوین. جاری وایش دەبێ بەپیاڵەی زێڕین شلەمەنییان بەسەردا دابەش دەکرێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ﴾(الزخرف/٧١).

ئەمجار وەصفی مەشروباتەکانیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْساً كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلاً﴾ ئادەمیزادە خوداپەرستەکان لەبەهەشتدا بەو پیاڵەو فنجانە زیوو بلوورینانە مەی تێکەڵاو بەزەنجەبیلیان دەرخواد دەدرێ. جاری وادەبێ شەرابەکەیان تێکەڵ بەکافور دەکرێو ساردو فێنکە، جاری وایش دەبێ تێکەڵ بەزەنجەبیل دەکرێو مەیلەو گەرمە..

﴿عَيْناً فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلاً﴾ ئەو خوداپێداوانە لەکانیاوێکی بەهەشتدا کە ناوی سەلسەبیلە ئاوی خواردنەوەیان بۆ دابین دەکرێ، بۆیە ناوی سەلسەبیلی لێ نراوە چونکە ئاوەکەی گوارایەو بەئاسانی دەخورێتەوە صافو بێگەردو شیرینو زوڵاڵە.

﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤاً مَّنثُوراً﴾ خزمەتچیەکانی بەهەشت بەسەر بەهەشتیەکاندا دەسوڕێنەوە، چیان بوێ لەخواردنو خواردنەوە بۆیان دابین دەکەن؛ ئەو خزمەتچییانە هەموویان تازەلاوو لاوچاکن، پیرنابنو روخساریان ناگۆڕێو مردنیان بەسەردا نایە، ئەگەر تۆ بیانبینی لەو کاتانەدا کە: بلاوبوونەوە بەناو بەهەشتیەکاندا بەمەبەستی خزمەتکردنیان. وادەزانی لوئلوئی بلاوە بوون، ئەوەندە جوانو شۆخو شەنگن.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيماً وَمُلْكاً كَبِيراً﴾ ئەگەر تۆ لەبەهەشتدا بروانیو سەرنج بدەی لەنازو نیعمەتی بەهەشت بەهەموو جۆرەکانی، نازونیعمەتێکی وادەبینی هەر وەصف ناکرێ. سەڵتەنەتو شکۆمەندیی وەهات چاو پێ دەکەوێ کە: سنووری نازاندرێو مەزەندە ناکرێ.

﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِنْ فِضَّةٍ﴾ پۆشاکی ئاوریشمی تەنکی سەوزیان لەبەرکراوە، هەروەها دێباجی ئەستوور لەبەر دەکەن. بازنەی زیویان لەمەچەك کراوە، جاری وایش دەبێ بازنەی زێڕیان لەدەست دەکرێ.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ﴾ (الكهف/٣١).

ئەمجار جۆرێکی تر شەرابیان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَاباً طَهُوراً﴾ پەروەردگار شەرابێکیان دەرخوارد دەدا کە: ناو سکیان لەحەسوودیو رژدیو زیانە خرۆپیو ڕەوشتە ناشیرینەکانی تر پاك دەکاتەوە، هەرچی دەیخۆن‌و دەیخۆنەوە دەبێتە ئارەق‌و لەجەستەیان دێتەوەدەر بۆنی ئارەقی جەستەیان وەکوو بۆنی میسك وایە.

ئەبو قولابەو ئیبراهیمی نەخەعی ریوایەتیان کردووە کە: بەهەشتیەکان خواردنیان بۆدێ دەیخۆن پاشان شەرابی (طهور)یان دەدرێتێ‌و دەیخۆنەوە، ئیتر ورگیان بچوك دەبێتەوەو ئارەقێکی بۆن خۆش لەجەستەیان دەردەچێ وەکوو بۆنی میسك وایە.

﴿إِنَّ هَذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُوراً﴾ بەو پیاو چاك‌و خوداپێداوانە دەگوترێ: ئەم بەهەشتە ڕازاوەو نازو نیعمەتەی پێتان دراوە، پاداشتی کردەوەکانتانە، خودا بەفەضل‌و ئیحسانی خۆی لە جیاتی کردەوەی کەمتان پاداشتی زۆری پێداون، طاعەت‌و عیبادەتی لێ قبول کردون، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ (الحاقة/٢٤).

## وەزعو حاڵی خوداپەرستانو موشریکانو بێ بڕوایان لەدونیادا

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ۖ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾﴾

لەوەپێش وەزعو حاڵی کافرو موسوڵمانەکانی لەقیامەتدا رونکردەوە، پێغەمبەری هەڵنا کە: سووربێ لەسەر راگەیاندنی پەیامی خۆیو گوێ بەقسەی پڕوپوچی کافرەکان نەدا.

ئەمجار وەزعو حاڵی هەردوو تاقم لەدونیادا روون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنْزِيلاً﴾ ئیمە خاوەنو پەروەردگاری بوونەوەرین، خودای

بەحەق و راستین، قورئانمان بەپارچە پارچە نازڵکردوە بۆ سەر تۆ ئەی پێغەمبەر! لەماوەی (٢٣) ساڵدا بەگوێرەی پێویست و روداو هەرجارەو بەشێك لە قورئانمان بۆ ناردویە خوارێ. بەیەکجار بۆمان نەناردوی بۆ ئەوەی ئوممەتت فێری ببن و لەدڵیاندا جێگیر ببێ و چارەسەری کێشەو نیزاعی خۆیانی پێ بکەن، قورئان هەڵبەستراوی خۆت نیە. سیحرو شیعرو چیرۆکی دانراوو ئەفسانە نیە.

﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِماً أَوْ كَفُوراً﴾ ئەی پێغەمبەر! وەکوو رێزمان لێ گرتوی و کردومانی بە پێغەمبەر قورئانمان بۆ نازڵ کردوی لەبەرامبەر سەر رەقی و هەڵوێستی ناشیرینی موشریکەکان بە صەبرو ئارام بە، مل کەچی قەزاو قەدەری خودا بە، بەوە دڵتەنگ مەبە کەسەرکەوتنت بەسەر موشریکەکاندا تۆزێ دوابکەوێ..

پشوو درێژ بە لەسەر گەیاندنی پەیامی پیرۆزت، پابەندی حوکم و بڕیاری خودابە، هەموو کارێك وادەی خۆی هەیە، خودا بۆ هەموو شتێك ئەجەلی داناوە، گوێڕایەڵی هیچ کەس لەدوڕوو کافرەکان مەکە، بەقسەی تاوانبارو ستەمکاران هەڵمەخەڵەتێ، وریابە لەرێگەی حەق لات نەدەن یان پشتت سارد نەکەنەوە. بەڵکوو پەیامی خۆت بگەیەنەو پشت بەخودا ببەستە، بێگومان خودا پارێزگاریت دەکاو ناهێڵێت دەستی چەپەڵیان بتگاتێ.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە: هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ نەکەم و نەزۆر گوێڕایەڵی کافرو دووڕوەکانی نەکردوە، وەلێ ئەم نەهیەی ئاڕاستەکراوە چونکە ئەو قودوەیە بۆ موسوڵمانان و ئاماژەیە بەوە کە پێویستە خێرا خێرا ئادەمیزادەکان ئاگادار بکرێنەوەو ئامۆژگاری بکرێن، چونکە لەسروشتیاندا تۆمی شەڕ هەیەو نەفسی ئادەمیزاد فەرمان دەکا بەخراپەو خراپەکاری. هیچ کەس لەتەوفیق و هیدایەتی خودا بێ ئاتاج نیە. کەوابێ پێویستە هەموو موسوڵمانێك لە خودا بپاڕێتەوە کە لە شوێنکەوتنی هەواو هەوەس بیپارێزێ و هەڵنەخلیسکێ.

﴿وَاذْكُرْ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلاً، وَمِنْ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ وَسَبِّحْهُ لَيْلاً طَوِيلاً﴾

بەردەوام بە لەسەر ذیکرو یادی خودا، هەموو کات بەدڵو بەزوبان یادی خودا بکە، نوێژ بۆ خودای خۆت بکە بەیانیو ئێوارێ. بەیانی بریتیە لەنوێژی بەیانی، ئێوارە نوێژی عەصر دەگرێتەوە، لەنێوانیشیاندا نوێژی نیوەڕۆ، بەڕستەی ﴿وَمِنْ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ.......﴾ ئاماژە دەکا بەنوێژی شێوانو خەوتنان، بەڕستەی ﴿وَسَبِّحْهُ لَيْلاً طَوِيلاً﴾ ئاماژە بەشەونوێژ دەکا.

﴿إِنَّ هَؤُلاءِ يُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَاءَهُمْ يَوْماً ثَقِيلاً﴾ بێگومان ئەو کافرو بێ باوەڕانەی مەککەو هاو وێنەکانیان دونیا ویستو هەوەسبازن، هەموو هەوڵو تەقەللایەکیان بۆ دابین کردنی ئارەزۆکانی دونیایانەو هیچ خەمی ژیانی قیامەتیان نیەو هەوڵی بۆ نادەنو ئەو رۆژە سەختەیان لەبیر خۆیان بردۆتەوە، ئەمەش جوداوازی نێوان موسوڵمانو کافرە، موسوڵمانان هەوڵ بۆژیانی دونیاو قیامەتیان دەدەنو ژیانی دونیا دەکەنە مەزرەعەی قیامەت. کافرەکان تەنها کار بۆ دونیا دەکەنو بڕوایان بەزیندوبوونەوەو ژیانێکی تر نیە. تێڕوانینێکی مادییانەیان هەیەو لە قیامەتو غەیبییاتی تر بێ ئاگانو بڕوایان پێیان نیە.

ئەمجار بەڵگە لەسەر خودایەتی خۆیو دەسەڵاتی رەهای دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَاهُمْ وَشَدَدْنَا أَسْرَهُمْ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَا أَمْثَالَهُمْ تَبْدِيلاً﴾ بەچ عەقڵێك ئەو موشریکانە لە خودای خۆیان غافڵنو قیامەتیان بیرنایەتەوە؟ ئێمە ئەوانمان دروست کردوە، جەستەیانمان رێكوپێك کردوە، بەئێسقان ماسولکەو رەگو دەمار جەستەیانمان بەهێز کردوە.

خۆ ئەگەر مەیلمان لێ بێ لەناویان دەبەینو گەلو نەتەوەیەکی تر دێنینە گۆڕێ کە: فەرمان بەردارو گوێڕایەڵی پەروەردگار بن. وەکوو لەئایەتێکی دیدا دەفەرموێ: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ وَيَأْتِ بِآخَرِينَ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى ذَلِكَ

قَدِيراً﴾(النساء/١٣٣) یان دەفەرموێ: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ، وَمَا ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ (إبراهيم/١٩-٢٠).

کەواتە کە: خودا ئێوەی مۆڵەت داوەو کۆمەڵ کوژی نەکردون، لەبەر چاوتان بێ‌و بەخۆتاندا بچنەوەو بیر لەسەرەنجامی حاڵی خۆتان بکەنەوە. واز لەسەر ڕەقی‌و یاخی بوون بێنن.

﴿إِنَّ هَذِهِ تَذْكِرَةٌ فَمَنْ شَاءَ اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلاً﴾ ئەم سورەتەو هەموو ئایەتەکانی تری قورئان کە: پڕن لە ئامۆژگاری‌و هەڕەشەو تەماع بەرنان (تەرهیب‌و تەرغیب) بیرخەرەوەو ڕێنومایین بۆ عاقڵ مەندان، جا کەسێك بەختەوەریی دونیاو قیامەتی دەوێ، با ڕێگای نزیکبوونە بۆ لای خودا بگرێتەبەر، ئیمان بهێنێ، فەرمانبەرداری فەرمانی خودا بێ‌و خۆ لەنەهیەکانی پەروەردگار بپارێزێ. کەسێك دەیەوێ با بەقورئان هیدایەت وەرگرێ.

﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً حَكِيماً﴾ ئێوە مەیلی گرتنەبەری ڕێبازی خوداتان نابێ مەگەر خودا بۆ خۆی مەشیئەتی لەسەر ئەوە بێ، کەس ناتوانێ هیدایەتی خۆی بدا، کەس ناتوانێ بەبێ ویستی خودا ئیمان بچێتە ناو دڵیەوە. تەوفیقی خودا نەبێ کەس ناتوانێ سود بۆ خۆی کێش بکا، هەموو کارێك بەدەست خودا خۆیەتی، بەدەست بەندەکان نیە. ویست‌و ئیرادەی بەندە ناتوانێ بەبێ ویست‌و ئیرادەی خودا کاریگەر بێ.

وەڵێ ئادەمیزاد کە: پاداشتی دەدرێتەوە بەسونگەی ئەوەوەیە کە بۆ خۆی ڕێبازی حەقی هەڵبژاردوە کە سزاش دەدرێ بەهۆی ئەوەوەیە کە: ڕێگای بەتاڵی هەڵبژاردوە. پەروەردگار بۆ خۆی دەزانێ کێ شیاوی هیدایەتە، ئاسانکاری بۆدەکا. دەزانێ کێ شیاوی گومڕا بوونە لەهیدایەت لای دەدا. خودا بۆ خۆی حەکیم‌و دانایە، کاردروست‌و فەرمانڕەوایە، هەموو بڕیارو کارێکی لەجێی خۆیدایە. بە کورتی هەر کارێ لە بەندەکانەوە ئەنجام بدرێ بەمەشیئەتی پەروەردگارە، وەڵێ زۆرە ملێیان لێ ناکا.

﴿يُدْخِلُ مَنْ يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ وَالظَّالِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ پەروەردگار هەر کەسێکی مەیل لێ بێ بەفەزڵو ئیحسانی خۆی دەیخاتە بەهەشتی ڕازاوەی خۆیەوە. ستەمکارانیش بەسزای سەخت سزا دەدا، لە قیامەتدا عەزابی دۆزەخی بۆ ئامادە کردون.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سورەتی المرسلات

ئەم سورەتە مەککیەو پەنجا ئایەتە جگە لە ئایەتی ژمارە چلو هەشت کە مەدەنییە. ئەم سورەتە ناوی نراوە سورەتی (مورسەلات) چونکە لەسەرەتای سورەتەکەدا خودا سوێندی پێ خواردوە، دەفەرموێ: ﴿وَالْمُرْسَلاتِ عُرْفاً﴾.

**پەیوەندیو موناسەبەی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەدوو ڕوەوەیە:**

١- لەسورەتی ئینساندا وادەی بەهەشتیدا بە خوداپەرستانو هەڕەشەی توندی لەستەمکارانو تاوانباران کرد بەوە کە: لەکۆتایی سورەتەکەدا فەرمووی: ﴿يُدْخِلُ مَنْ يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ وَالظَّالِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ پاشان لەسەرەتای ئەم سورەتەدا پەروەردگار سوێندی خواردو جەختی لەسەر ئەوە کردوە کە: ئەو وادەو هەڕەشانەی دێنێتەدیو کاتەکەشی بەیانکرد بەوە کە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا النُّجُومُ طُمِسَتْ﴾.

٢- لەسورەتی پێشودا دەربارەی حاڵو وەزعی کافرەکان لە قیامەتدا بەکورتی بەسەریدا تێپەڕیو دەربارەی حاڵی موسوڵمانەکان بەدرێژیی، لەم سورەتەدا بەپێچەوانەوەیە، بەدرێژی باسی کافرەکان دەکاو بەکورتی وەزعی موسوڵمانەکان رادەنوێنێ. بەمەش موعادەلەو هاوتەرازویی لەنێوان هەردوو سورەتەکەدا هاتە جێ.

ناوەڕۆکی ئەم سورەتەش وەکوو باقی سورەتە مەککییەکانی تر ئەوەیە: گرنگی بەبواری عەقیدەو بنەماکانی دەدا. باسی یەکتاپەرستیو رابوونی قیامەتو بەڵگەی جۆراو جۆر لەسەر دەسەڵاتو بەتوانایی خودا دەهێنێتەوە.

## رابوونی قیامەتو کاتو نیشانەکانی

﴿ وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴿١٢﴾ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿وَالْمُرْسَلاتِ عُرْفاً﴾ سوێند بەو بایانەی یەك لەدوای یەك وەك یاڵی ئەسپ هەڵدەبن، سوێند بەو بایانەی خودا دەیان نێرێ بۆ وێرانکردنی شارو دێهات، یان نیعمەت دەرژێننو دەبنە پێشەنگی بارانو هەور لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگوێزنەوە، یان سوێند بەو بایەی هەورەکان لە ئاسماندا بڵاودەکەنەوە.

هەندێك لە موفەسیرین دەڵێن: مەبەست بە (المرسلات) ئەو فریشتانەن کە: خودا دەیاننێرێ بۆ ئەوەی نیگاو سروشو فەرمانو جڵەو گیریەکانی بە پێغەمبەرانی بگەیەنن.

﴿فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفاً﴾ سوێند بەو فریشتانە کە: بەرپرسن لە هەڵکردنی با بۆ تارومار کردنی هەندێك وڵاتو هەرێم.

﴿وَالنَّاشِرَاتِ نَشْراً﴾ سوێند بەو فریشتانەی بەرپرسن لەبڵاوکردنەوەی هەورەکان یان ئەو فریشتانەی کە لە حەوادا لەکاتی هاتنی نیگاو سروشدا باڵەکانیان بڵاودەکەنەوە، یان مەبەست کۆمەڵی پێغەمبەرانە کە: خودا کردونیە فروستادەو هۆی شارەزایی کردنی ئادەمیزادانو حەقو بەتاڵیان بۆ لێك جیاکردونەوە، موسوڵمانو کافرو خاوەن بڕواو بێدینیانی لێك هەڵاوەردونو ئامۆژگاریو بیری یەکتاپەرستیو بەندایەتیکردن بۆ خودایان فێری ئادەمیزاد کردوە.

﴿فَالْفَارِقَاتِ فَرْقاً، فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْراً، عُذْراً أَوْ نُذْراً﴾ سوێند بەو فریشتانەی سروشو فەرمانی خودا نازڵ دەکەن بۆ پێغەمبەران، بۆ جیاکردنەوەی حەقو بەتاڵو هیدایەتو گومراییو حەڵاڵو حەرام، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد عوزرو بیانوویان نەمێنێو بترسن لەعەزابی بێ ئامانی ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی بکەن.

سوێند بەو شتانەی باسکران ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ﴾ ئەوەی وادەتان پێدراوە لەرابوونی قیامەتو زیندوبونەوەی مردوانو کۆکردنەوەی هەموو ئادەمیزاد، هەر لە یەکەم ئادەمیەوە تا دوایین ئادەمی هەموانیان لەسارای مەحشەردا کۆدەکاتەوە، هەموو کەس پاداشو سزای خۆی بەگوێرەی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە، چاکە بە چاکەو خراپە بەخراپە.

ئەمجار پەروەردگار نیشانەو دیاردەکانی رابوونی قیامەت باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا النُّجُومُ طُمِسَتْ، وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ، وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ﴾ ئەو

کاتەی نورو روناکی ئەستێرەکان مەحوو بووەوە، ئەو دەمەی ئاسمان شەقار بوو، ئەو وەختەی کێوەکان لەبێخ هەڵکەندران و وردو خاش بوون و بوونە تەپو تۆز بەحەوادا چون و ئاسەواریان نەما.

﴿وَإِذَا الرُّسُلُ وُقِّتَتْ، لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ﴾ ئەو کاتەی پێغەمبەران کۆکرانەوەو کاتێکیان بۆ دیاریی کرا بۆ یەکالاکردنەوەی کێشەی نێوان ئەوان و نەتەوەکانیان، بۆ دادگایی کردنی نەتەوەکانیان و شایەتیدانی پێغەمبەران لەسەریان وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ اللَّهُ الرُّسُلَ﴾(المائدة/١٠٩)

جا لەبەر سەرسوڕمانی خەڵکەکە لەرووداوەکانی ئەو رۆژە، دەگوترێ: ئەوە ئەو کاروبارەی پەیوەندە بەو پێغەمبەرانەوە بۆ چ رۆژێك دواخراوە؟ واتە: عەزابدانی بەدرۆخەرەوەکانیان و رێزگرتن لەوانەی بڕوایان پێ کردون و دەرکەوتنی ئەو راستییانەی وادەیان بە گەلەکانیان دابوو بۆ چ رۆژێك دواخراوە؟

﴿لِيَوْمِ الْفَصْلِ﴾ دواخراوە بۆ ئەو رۆژەی حیساب و لێکۆڵینەوە لەگەڵ مەخلوقاتدا دەکرێ و چاك و خراپ و بەختەوەرو چارەڕەش لێك جیا دەکرێنەوە!!

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الْفَصْلِ﴾ ئەتۆ چوزانی رۆژی فەصل و جیاکردنەوە چۆنەو کارەساتەکانی چۆنن؟ واتە رووداوی گەورەو دیمەنی سامناك لەو رۆژەدا هەن کە زۆر سەرنج راکێش و سەرسوڕهێنەرن!

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ ئەو رۆژە هاوارو عەزابی سەخت بۆ بەدرۆخەرەوەکان، هاوار سەد هاوار بۆ ئەوانەی بڕوایان بە تاك و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەران و رابوونی قیامەت نەکرد! رۆژێکە پڕ لەکارەسات و رووداوی گەورەی وەها کە

لافاوو بومەلەرزەو تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمو هایدرۆجینو ئەو جۆرە شتانە لە چاو بومەلەرزەو راتلەقاندنو لێك پچڕانی بوونەوەرو شەقبوونی ئاسمانو لەبێخ هەلکەندنی کێوەکان وەکوو تەقاندنی میزەلدانی منالان وایە!!

## هەڕەشەو ترساندنی کافرەکان لە سەرەنجامی هەڵوێستی کوفر ئامێزیان

﴿ أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْآخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾ أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾ ﴾

لەوەپێش هەڕەشەی لە کافرەکان کرد بەروداوە ترسناکەکانی رۆژی قیامەت. ئێستا هەڕەشەیان بەوە لێ دەکا کە: ئەگەر لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان بەردەوام بن، ئەوە دوور نیە خوداوەکوو گەلە پێشینەکان لەناویان بەرێ، ئەمجار هەڕەشەیان بەوە لێ دەکا کە: ئەگەر ئینکاری نیعمەتەکانی خودا بکەن بەسەریانەوە ناچێو لەسزای رۆژی قیامەت قوتاریان نابێ.

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نُهْلِكْ الأَوَّلِينَ، ثُمَّ نُتْبِعُهُمْ الآخِرِينَ﴾ ئایا ئێمە لەرابوردودا کافرە بەدرۆخەرەوەکانمان لەناو نەبردوە گەلو نەتەوەی ترمان نەخستنە شوێن؟ بێگومان هەر لەرۆژگاری ئادەمو حەواوە هەر گەلو نەتەوەیەك پێغەمبەرەکەیان بەدرۆخستبێتەوە، لەناومان بردونو گەلو نەتەوەیەکی ترمان خستۆتە شوێنیان. ئەمە سوننەتو دابو نەریتی ئێمەیە لەبوونەوەردا.

﴿كَذَلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ﴾ هەر بەو جۆرە هەڵسوکەوت لەگەڵ گەلە بەدرۆخەرەوەکان دەکەین، هەر کەسێ پێغەمبەری خودا بەدرۆبخاتەوە شوێن پەیامی ئاسمانی نەکەوێ، هەمان دابو نەریتی خۆمانیان بەسەردا دەسەپێنین. بەعەزابی کۆکوژ قەلاچۆیان دەکەین.

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ ریسوایىو عەزابی سەختو دژوار لە رۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانەی بڕوا بەهەبوونو تاكو تەنهایی خودا ناکەنو پەیامی پێغەمبەر رەت دەکەنەوە، قورئان بەسیحرو جادو لەقەڵەم دەدەنو پێغەمبەر بەساحیر دەزانن.

ئەمجار سەرزەنشتیان دەکا بەوە کە: هەندێ لە نیعمەتەکانی خۆی بەسەریاندا دەژمێرێو دیاردەی دەسەلاتی خۆی رادەنوێنیێو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَخْلُقْكُمْ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ، فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَكِينٍ، إِلَى قَدَرٍ مَعْلُومٍ، فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ﴾ ئێوە نازاننو هەست بەوە ناکەن کە: ئێمە ئێوەمان لە دلۆپە ئاوێکی پروپوچ دروست کردوە، دلۆپە ئاوێکی پروپوچو زەعیفە بەنیسبەت قودرەتی خوداوە، ئەو دلۆپە ئاوە کە لە پشتی پیاوەوە دێتە خوارێ، لەگەڵ هێلکە گەرای ئافرەت تێکەڵ بەیەکدی دەبنو لە منداڵدانی ئافرەتدا جێگیری دەکەین کە: شوێنێکی گونجاوو ئەمینو قایمە بۆ پەروەردەکردنی کۆرپەلە تێیدا، ئیتر لەوێدا کۆرپەلە دەهێڵینەوەمو قۆناغە ئاساییەکانی پەروەردەبوونی بەسەردا تێپەڕدەبنو کاتی لەدایك بوونی دێ، ئێمە جەستەو شێوەو روخسارو رەوشتەکانیمان نەخشەکێشاوەو چۆنمان ویستووە ئاوا شکڵو شێوەی هاتوونە کایەوە. بەراستی ئێمە مەزنەدەکارو نەخشەکێشێکی

باشـینو بـەتواناو دەسـەلاتین بەسـەر دروسـتکردنو شـکڵو شـێوە کێـشانیدا. بەجوانترین روخسارو شێوە دروستمان کردوە.

﴿وَیْلٌ یَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِینَ﴾ ریسواییو عەزابی سەختو دژوار لەرۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانـەی تەکذیبی دەسەلاتـی ئێمە دەکەن، چۆنو بەچ رویـەك نیعمەتـەکانی ئێمـە رەت دەکەنەوەو سپڵەییان بەرامبەر دەکەن!؟

﴿أَلَـمْ نَجْعَـلِ الأَرْضَ كِفَاتـاً، أَحْیَـاءً وَأَمْوَاتـاً﴾ ئایـا ئێمـە زەویمـان نـەکردوە بـە کۆکەرەوەتان؟ سەر زەوی بۆ زیندووەکانتانو ناو سکیشی بـۆ مردوەکانتـان، بووەتـە شوێنی جێگیر بـوونو حەوانـەوەتانو تێیـدا کۆبوونـەوە.. ﴿وَجَعَلْنَـا فِیهَـا رَوَاسِـيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَیْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتاً﴾ بـەدیمان هێنـاوە لـە زەویدا کێـوی دامـەزراوو بـەرزو بڵند، بۆ ئـەوەی لەنگەر بە زەوی بگـرن لەرەلـەر نـەکا، ئێوەی ئـادەمیزاد لەسـەری ئـارام بگـرن، ئـاوێکی سـاردو شـیرینو گواراتـان پـێ نـۆش دەکـەین، کانیـاوو بـیرو سەرچاوەی ئاوی زوڵاڵمان بـۆ بـەدی هێنـاون. ﴿وَیْـلٌ یوْمَئِـذٍ لِلْمُكَـذِّبِینَ﴾ ریـسواییو عـەزابی سـەختو دژوار بـۆ ئەوانـەی سوپاسـگوزاری ئـەم نیعمەتانـە نـینو سـپڵەو پێنەزانن. هاوار بـۆ ئەوانـەی لـەم بوونـەوەرە ورد دەبنـەوەو ئـەم دیاردانـە دەبیـنن کەچی ئیمان ناهێننو بەردەوام دەبن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان.

## چەند جۆرێکی تر لەعەزابی کافرەکان لە قیامەتدا

﴿ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ

لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾

لەوەپێش پەروەردگار هەڕەشەی لە کافرەکان کرد بەعەزابی ڕۆژی قیامەت، ئەمجار لێرەدا چۆنیەتی عەزابەکەیان دیاریی دەکاو دەفەرموێ:

﴿انطَلِقُوا إِلَى مَا كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ، انطَلِقُوا إِلَى ظِلٍّ ذِي ثَلاثِ شُعَبٍ﴾ بەگاڵتە پێکردنەوە پێیان دەگوترێ: بڕۆن بۆ ژێر سێبەری دوکەڵی دۆزەخ کە سێ پەلە، لەبەر بەرزیو گەورەیی ئاگرەکە سێ لقی لێ بۆتەوە. بووەتە سێفاق! مەبەستەکە ئەوەیە: ئەو دۆزەخییانە لە عەزابێکەوە دەچن بۆ ژێر عەزابێکی تر، لە هەموو لایەکەوە ئاگر دەوریان دەداو هیچ دەرەتانیان بۆ ناهێڵێتەوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾ (الكهف/٢٩). واتە: دوکەڵی ئاگرەکە دەوریان دەدا، مەبەستیش بەدوکەڵەکە خودی ئاگرەکەیەو بەمەجاز تەعبیری لێ داوەتەوە یان دەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾ (الزمر/١٦) یان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾(العنكبوت/٥٥)

ئەمجار بەگاڵتە پێکردنەوە وەصفی سێبەرەکە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لا ظَلِيلٍ وَلا يُغْنِي مِنْ اللَّهَبِ﴾ ئەو سێبەرە گەرما گێڕەوە نیە، فێنکایی نابەخشێ، بڵێسەی ئاگرو گەرمای دۆزەخیان لێ دوور ناخاتەوە، چونکە ئەو سێبەرە لەناو دۆزەخ دایەو سێبەر نیە لەگەرمی، سێبەری ئاسایی نیە، وەکوو سێبەری درەختەکانی

بەهەشتیش نیە، نەفێنکایی دەبەخشێو نەگەرمی دەگێڕێتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ، وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ، لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾ (الواقعة/٤٢-٤٤).

﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ، كَأَنَّهُ جِمَالَةٌ صُفْرٌ﴾ ئەو ئاگرەی نێڵە نێڵەیەتیو پریشکی جۆراو جۆر دەهاوێ، هەر پریشکێکی دەیهاوێ لەو پریشکانە دەڵێی کۆشكو باڵەخانەی بەرزو گەورەیە، هەروەها دەڵێی وشتری زەردە، یان لە درێژیدا دەڵێی گوریسی کەشتین. مانای یەکەم وێچوترە. واتە چونکە دوکەڵی ئاگر بە زەرد دەبینرێ، ئەو پریشکانە کە لێکدان لێکدان بەدوای یەکدا دێن دەڵێی کۆمەڵە حوشتری زەردی پرژو بڵاون.

جا لەو کاتەدا کە بیرو هۆشو واقیان وڕماوە سەرنج دەدەنە ئەو تەشبیهەو ئەو دیمەنە دێننە بەرچاوی خۆیانو بیری لێ دەکەنەوە، دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾ ریسوا بوونو سزای سەخت لەرۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانەیە پێغەمبەران بەدرۆدەخەنەوە، پەیامی پێغەمبەر رەت دەکەنەوە.

ئەمجار پەروەردگار وەصفی وەزعو حاڵی کافرەکان دەکا لەو رۆژەدا، دەفەرموێ: ﴿هَذَا يَوْمُ لا يَنطِقُونَ، وَلا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾ ئەو رۆژە رۆژێکە ئەوانە زمانیان گۆناکاو ناتوانن هیچ بڵێن. کارەساتو روداوەکان هێندە سامناکن، تاوانباران سەرسامو حەیران دەبنو واقیان وڕ دەمێنێ، رێگەیان پێ نادرێ عوزرو پاساو بهێننەوە، بەڵگەیان لەسەر راست کراوەتەوە بۆڕدراون!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾(التوبة/٦٦) یان دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾(التحريم/٧) مەبەست ئەوەیە ئەوانە عوزریان بەدەستەوە نیە بیهێننەوە، هەرچی کردەوەیانە خراپەو تاوانکارییەو مێژووی ژیانیان ستەمو کوفرو بێدینییە. هێزو توانای ئەوەشیان نیە عەزابەکە لە خۆیان دوور بخەنەوە.

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ عەزابی سەختو دژوار لە رۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەران بەدرۆدەخەنەوەو رو لەپەیامەکەیان وەردەگێڕن!

﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ جَمَعْنَاكُمْ وَالأَوَّلِينَ﴾ پەروەردگار پێیان دەفەرموێ: ئەمڕۆ ئەو رۆژەیە کێشەی هەموو مەخلوقات یەکالا دەکرێتەوە، حەقو بەتاڵ لێك جیا دەکەینەوە، بەهێزو توانای خۆمان ئەی موشریکەکانی قورەیش؛ ئێوەو کافرە پێشینەکان هەر لەسەرەتای پەیدابوونی ئادەمیزاد تا کۆتایی دونیا لەسارای مەحشەردا کۆمان کردونەوە..

﴿فَإِنْ كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ﴾ ئەگەر دەتوانن بەفرتو فێڵ خۆتان لەو عەزابە بپارێزن دە دەست بەکاربن، بەڵام دڵنیابن هیچتان بۆ ناکریو چتان لەدەست نایە.

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ سزای سەختو دژوار لەرۆژی قیامەت دا بۆ ئەوانەی بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە. لەو رۆژەدا بۆیان دەردەکەوێ کە: بێ دەسەڵاتو هیچ لەبارا نەبوون! هیوای قوتار بوون لەعەزابیان نامێنێ!!

## نازو نیعمەتی بەهەشتیەکانو هەڕەشە لەکافرەکان

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ (٤١) وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ (٤٢) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٤٣) إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٤٤) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ (٤٥) كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ (٤٦) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ (٤٧) وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا

لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار چەند جۆرە عەزاب و ریسواکردنێکی کافرەکانی بەیان کردئەمجار لەبەرامبەری ئەوەدا وەزع و حاڵی موسوڵمانەکان لە قیامەتداو نازو نیعمەتی بەهەشتیان بەیان دەکا، ئەوە روون دەکاتەوە کە: نازو نیعمەتی دونیا کورت و کەم بایەخەو بەسەر دەچێ، نازو نیعمەتی نەبڕاوەو بەنرخ نازو نیعمەتی بەهەشتە. ئەمجار سەرزەنشتی کافرەکان دەکا کە گوێ بەپەیامی قورئان نادەن و ئیمانی پێ ناهێنن. ئەگەر ئیمان بە قورئان نەهێنن، ئیمانهێنانیان بە پێغەمبەران و نامە ئاسمانییەکانی تر سودیان پێ ناگەیەنن.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ، وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ بێگومان خوداپەرستان و لەخوداترسان و خۆپارێزان لە قیامەتدا وان لەژێر سێبەری درەختی گەڵاپڕی پۆشناخدا، هەروا لەژێر سێبەری کۆشك و تەلاردان، بەچوار دەوریاندا جۆگاو جۆبارو کانیاوە، هێندەی تر جوانی و رازاوەیی بەدیمەنەکە دەبەخشن. بەپێچەوانەی وەزع و حاڵی کافرەکان لە دۆزەخدا کە لەژێر سێبەری دوکەڵی رەشدان و لە هەموو لایەکەوە ئاگر دەوری داون..

﴿وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ﴾ جۆرەها میوەجات و بەروبوومیان بۆ بەیدەستەوە چۆنیان بوێ ئاوا بۆیان ئامادەیە.

﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لە قیامەتدا پێیان دەگوترێ: ئەی خوداپەرستان! بخۆن و بخۆنەوە لە میوەو میوەجات و کانیاوی جۆراو جۆری بەهەشت. بەهۆی کردەوە باشەکانی دونیاتان.

﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە بەو جۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، بەوێنەی ئەو پاداشتە گەورەیە بۆ لە خوداترسان پاداشتی هەموو چاکەکان

دەدەینەوە، پاداشی کەس بەفیڕۆ نادەین. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلاً﴾ (الكهف/٣٠).

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ عەزابی سەخت و ریسوایی لەرۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانەی بڕوایان بە خودا نیە، پەیامی پێغەمبەر ڕەت دەکەنەوە.

ئەمجار خیطاب ئاراستەی ئەوانە دەکا کە: بڕوایان بە قیامەت نیە، دەفەرموێ: ﴿كُلُوا وَتَمَتَّعُوا قَلِيلاً إِنَّكُمْ مُجْرِمُونَ﴾ ئەی بێ باوەڕان! لەم ژیانە کورتەی دونیاتاندا خۆراک و ئاوو شلەمەنی بخۆن و بخۆنەوە، لەززەت و خۆشی لەنازو نعمەتەکانی دونیا وەربگرن، ماوەیەکی کورت و کەمخایەن بەئارەزوی خۆتان رابوێرن، پاشان ئێوە راپێچی دۆزەخ دەکرێن، ئێوە تاوانبارو ستەمکارن، هاوەڵتان بۆ خودا داناوە، دۆزەخیش سزای هەموو تاوانبارو ستەمکارێکە.

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ عەزابی سەخت و دژوار بۆ ئەو موشریک و تاوانبارانەی گوێ بەفەرمان و جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار نادەن، پەیامی قورئان بەدرۆدەخەنەوە. سەرگەرمی خەوو خواردنن، بێ ئاگا لە خوداو ئەرکی سەرشانیانن بەرامبەر بەدیهێنەریان.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ﴾ هەرکاتێ فەرمانیان پێ بکرێ بە ئەنجامدانی نوێژو باقی فەرزەکانی تری سەرشانیان، نوێژەکانیان ناکەن، پشت لەتاعەتی خودا هەڵدەکەن و ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ ناکەن. سوورن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان.

﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ﴾ عەزابی دۆزەخ لەو رۆژەدا بۆ ئەوانەی تەکذیبی فەرمان و جڵەوگیرییەکانی خودا دەکەن! پەیامی قورئان ڕەت دەکەنەوە ئەگەر ئەوانە بڕوا بە قورئان نەکەن.

﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ؟﴾ ئەدی بەچ کەلامێک بڕوا دەکەن؟ ئەگەر ئەوانە ئەم قورئانەی کە پڕە لە بەڵگەو دەلیل لەسەر هەبوونی خوداو تاک و تەنهایی و

دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر هەموو شتێکدا، لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ و ڕابوونی قیامەت‌و زیندوبوونەوە ئەدی بەچ نامەیەکی تر جگە لە قورئان بڕوا دەکەن؟؟

به یارمەتی خودا جزئی تبارك تـــەواو بوو، خودا تۆفیقم بدا بۆتەواو کردنی جوزئی (عمّ) و تەواوکردن و بە چاپگەیاندنی هەموو بەرگەکانی ئەم تەفسیرە پیرۆزە

ملا محمود أحمد

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سەرەتای جزمی (عم)
## سورة النبأ

ئەم سورەتە ناونراوە بە سورەتی (النبأ) چونکە سەرتای سورەتەکەی بە ئایەتی ﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، عَنْ النَّبَإِ الْعَظِيمِ﴾ دەستی پێ کردوە! چل ئایەتە..

پێویستە ئامازە بەوە بکەین کە: ئەم جزمە هەمووی جگە لە سورەتی (البینە، النصر) هەموو سورەتەکانی تری مەککین، هەمووشیان کورتە سورەتن، هەرچەندە کورتییەکەیان جودا وازییان هەیە، وەلێ هەموو سورەتەکان بە شێوەیەکی گشتی‌و بەتێکڕا ئوسلوب‌و شێوازیان، سێبەرو تارماییان مەوضوع‌و ناوەرۆکیان، تەوجیهو خیطابیان لێك چووە وەختە بڵێین: وەحدەی مەوضوعییان هەیە.

خیطاب ئاراستەی دڵەکان دەکەن‌و لێکدان لێکدان لەدەرگایان دەدەن‌و تێیان رادەخوڕن‌و هاواریان لێ دەکەن، لە خەوی بێداری راستیان دەکەنەوە، چاوی مەستە خەوو دڵی مەردویان هۆشیار دەکەنەوە، جزمەکە هەمووی تەقولبابی دەرگای دڵەکان دەکاو بەهێز رایان دەتڵەقێنێ، بەدەنگی بەرز بانگی نوستوو بێ ئاگاو سەرخۆشەکان دەکا، تێیانەوە دەژەنێ‌و ختوکەیان دەدا، بۆ ئەوەی سەرخۆش‌و خەواڵوەکان راپەڕێنێ، هاواریان لێ دەکاو دەڵێ: رابن، لەخەو هەڵسن سەیر بکەن‌و وردبینەوە، بزانن خودایەك هەیە ئەم بونەوەرەی بەدی هێناوە، بە ویستی خۆی هەڵی دەسوڕێنێ نەخشەو پلانی بۆ داناوەو ئەندازەی گرتووە، بێهودە وەدی نەهێناوە، تاقیکردنەوەو لێ پرسینەوەی هەیە، عەزاب ونیعمەتی هەیە. جار دوا جارو خێرا خێرا ئاگاداریان دەکاتەوە، وادەزانی نوستووەکان چاو هەڵدێنن‌و سەرخۆشەکان صەحومیەك رویان تێدەکاو خێرا خەو دایان دەگرێتەوەو مەستی‌یەکەیان لێ تازە دەبێتەوە، ئیتر خێرا دەستێکی بەهێزو دەنگێکی بەرز سەر

لە نوێ دەیان هەژێنێتەوە بانگیان لێ دەکاتەوە. جار جاریش نوستووەکانو مەستەکان بەئاگا دێنەوە، بۆ ئەوەی سوربوونی خۆیانو سەررەقی خۆیان دوبارە بکەنەوەو قسەی رەق وناشیرین ئاراستەی ئەو کەسە بکەن کە: دڵسۆزە بۆیانو دەیەوێ لە خەوی غەفڵەت وەئاگایان بێنێتەوە.

جزمەکە هەمووی دیمەنەو رایاندەنوێنێ، هەمووی حەقائقن و دەیاننوێنێ، دیمەنی بونەوەرو سروشت، دیمەنەکانی رۆژی قیامەت دیمەنەکانی دونیا وێرانبون وگۆڕانی سروشت، بەڵکوو تێکچونی هەموو بونەوەرو رابونی قیامەت. ئەگەر سەرنجێکی ئەم سورەتە بدەین، دەبینین میحوەرەکەی چەسپاندنی رابونی قیامەتە لەروانگەی بەڵگەی جۆراو جۆرەوە، بۆیە سەرەتای سورەتەکەی بەباسی پرسیار کردنی موشریکەکان لە هاتنی قیامەت دەست پێ دەکا. باسی روداوو کارەساتەکانی رۆژی قیامەت دەکاو هەڕەشە لە موشریکەکان دەکا لەسەر ئەوە ئینکاری هاتنی قیامەت دەکەن و بڕوایان بەزیندو بونەوەنیە. ئەمجار بەڵگەی جۆراو جۆر دەهێنێتەوە لەسەر رابوونی قیامەتو زیندو بوونەوە. پاشان جۆرەکانی سزا بۆ تاوانباران و نیعمەتە زۆرو هەمە جۆرەکانی خودا بۆ خوداپەرستان رادەنوێنێ. کۆتایی سورەتەکەش بەوە دەهێنێ کە: رۆژی قیامەت هەردێو گومان لە هاتنی دانیە، لەو رۆژەدا کافرەکان ئاواتە خوازی ئەوەن کەلە ناوبچن وببنەوە بە خۆڵ.

## هەواڵی رابوونی قیامەتو بەڵگە لەسەر هاتنی ئەو رۆژە

﴿ عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَـٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَـٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾

وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ ﴾

**سورەتەکە بە پرسیارێکی سەرنج راکێش‌و سەر سوڕهێنەر دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ﴾ ئەوە ئەو موشریکانە لە ناو خۆیاندا لە چی پرسیار دەکەن؟ دەمە قالێ‌و دەمە دەمێی چیانە؟ پەروەدگار خۆی وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: پرسیارەکەیان لە هەواڵێکی گەورەیە. پرسیارەکەیان دەربارەی رووداوێکی گەورەو گرنگە. ﴿الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ﴾ ئەو رووداوەی ئەوان تێیدا دوو بەرەکین، واتە: ئادەمیزادەکان خۆیان کەوتوونە کێشەوە دەربارەی رابوونی قیامەت. هەیانە بڕوای بە هاتنی قیامەت هەیەو هەیانە بەدرۆی دەزانێ. هەیانە سوورە لەسەر کوفرو هەیانە ئیمانی هێناوە. کافرەکان پێیان وابوو ژیان هەر ژیانی دونیایەو دوای مردن زیندوبونەوە نیە وەکوو پەروەدگار لەسەر زوبانی ئەوان دەفەرموێ: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ المؤمنون/٣٧ سەرەتای سورەتەکە بە پرسیارێکی ئینکار ئامێز دەست پێ دەکا دەڵێ: جێگای سەر سورمانە کە: ئەوانە پرسیار لەوە بکەن‌و لەوەدا بکەونە شك‌و گومانەوە.**

**﴿كَلَّا سَيَعْلَمُونَ، ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ نەء با پەشێمان بینەوە نابێ لە شتی وادا شك‌و گومانیان هەبێ، ناگونجێ ئەوانە دەربارەی رابوونی قیامەت گومانیان هەبێ، چونکە هاتنی قیامەت حەقیقەتێکەو گومانی تێدانیە، لەوە بەولاوە ئەوانەی**

بڕوایان بە هاتنی ئەو ڕۆژە نیە سەرنجامی ئەوبێ بڕوایی یەی خۆیان دەزانن. دەی کەوایە با ئەوانە واز لەو هەڵوێستە نادروستەی خۆیان بهێنن چونکە لە ئێستا بەولاوەو پاش کەمێکی تر ئاکامی بیرو باوەڕی خۆیان بۆ رون دەبێتەوەو دەزانن چەند بەدبەختو چارەڕەشو چییان بەسەردێ! ئەمجار پەروەدگار هەندێ دیاردەی دەسەڵاتی بەرفراوانی خۆی رادەنوێنێ، ئاوڕێك بە مەردوم دەداتەوە بەلای هەندێك لەو شتانەی لە بونەوەردا نیشانەی میهرەبانی پەروەدگارن، سەرنجیان رادەکێشێ بەلای دیاردەی دەریایی رەحمو فەضلی بێ پایانی زاتی پاکی خودای بە تواناو خاوەن دەسەڵات بەسەر هەموو شتێك دا بەرابوونی قیامەتیشەوە.

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلْ الآرْضَ مِهَاداً، وَالْجِبَالَ أَوْتَـاداً﴾ ئێوە بەچ عەقڵێکەوە ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن؟ خۆ ئەوەتا بەچاوی خۆتان نیشانەی دەسەڵاتی رەهای پەروەدگار دەبینن. ئایا ئێمە زەویمان بۆ بلاو نەکردونەوەو وامان لێ نەکرد بەئاسانی بەسەریدا بێنو بچن؟ وامان لێ کردوە دەڵێی بێشکەیە تێیدا دەخەونو ئارام دەگرن. ئایا کێوەکانمان نەکردوە بە میخ وبەزەویمان دا نەکوتاون تا لەنگەر بگرێو گیانلەبەران بتوانن بە ئاسانی لەسەری هەڵسوڕێنو ژیانی لەسەر بەسەر بەرن. پێداویستی ژیانی تێدا بەدەست بێنن. ﴿وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجاً﴾ ئێوەمان دروست کردوە بە دوو رەگەز، واتە: بە نێرو مێ، بۆ درێژەدان بە ژیانو رێکخستنی خێزانو پێکهێنانی کۆمەڵو پەروەردە کردنی منداڵو چاندنی تۆوی خۆشەویستی لە نێوان ژنو مێردو باوكو دایكو منداڵو خزمو کەسو کاردا وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم/٢١ ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً، وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاساً﴾ نوستنمان بۆ کردون بە مایەی حەسانەوەو ئارامگرتن؟

بەراستی خەو بەهرەیەکی زۆرگەورەو بەنرخە، بۆ هەموو گیانلەبەرێك، بەتایبەتی بۆ ئادەمیزاد کە: لەهەموو شەوو رۆژێکدا بەهۆی هەوڵدان بۆ دابینکردنی بژێوو خوێندنو دەرس گوتنەوەو لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەو گەلێ ئیشوکاری ترەوە جەستەی ماندوو شەکەتدەبێو مێشکی کول دەبێ، لە ئەنجامی نوستنی چەند سەعاتێك بەتایبەتی ئەگەر لە شەودابێ، ماندوی دەحەسێتەوە هێزو توانای تازە دەبێتەوە، عەقڵو هۆشو بیری تیژ دەبێتەوە، بەنیشاتو وزەیەکی تازەوە سەرلەنوێ دەست بەکارەکانی دەکاتەوە!!

شەویش کە بەتاریکی خۆی سروشت دادەپۆشێ وەکوو چۆن پۆشاك جەستە دادەپۆشێو لە سەرماو گەرما دەیپارێزێ شەویش ئاوا بەتاریکی خۆی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تر لە ناحەزانیان دەپارێزێ، هەر کەسێك بیەوێ کارێکی خۆی بەنهێنی ئەنجام بدا، شەو باشترین کاتە بۆ ئەنجام دانی، ئەو زیندەوەرەی لە رۆژدا لە ترسی دوژمنی خۆی حەشاردابێ، لە ژێر پەردەی تاریکی دا دەتوانێ خۆی رزگار بکاو پێداویستییەکانی ژیانی دابین بکا.

﴿وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشاً﴾ رۆژمان گێراوە بە کاتی گونجاو بۆ تێدا هەڵسوڕانو هەوڵدان بۆ دەستە بەرکردنی بژێوو پێداویستی ژیان. وەکوو چۆن شەو کاتی گونجاوە بۆ ئارامگرتنو نوستنو حەسانەوە، رۆژیش کاتی گونجاوە بۆ تێدا هەڵسوڕانو هەوڵدان بۆ کارو کاسبی.

﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِدَاداً، وَجَعَلْنَا سِرَاجاً وَهَّاجاً﴾ دروستمان کردوە لە ژوورتانەوە حەوت ئاسمانی تۆکمەو پتەو، تابڵێ مەحکەمو قایم وبەهێزن. ئاسمانی دونیامان بە ئەستێرەکان رازاندۆتەوە، خۆرمان کردووە بە چرایەکی درەخشانو پرتەو بەخش، بەروناکی خۆی بوونەوەر روناك دەکاتەوەو گەرمی دەبەخشێ بە زەویو مایەی ژیانی خۆتانو ئاژەڵو کشتوکاڵو بەروبومتانە، سەرچاوەی هێزو وزەی هەموو زیندەوەرو درەختو ڕوەکێکە. چونکە تیشکەکەی روناکیو گەرمی

دەبەخشێ. هەر بەهۆی گەرمی خۆیەوە شێو تەڕی لە زەوی و دەریا هەڵدەمژێو بۆ ژوروی کێش دەکاو هەور پەیدا دەبێ...

﴿وَأَنزَلْنَا مِنْ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجاً﴾ نازڵمان کردوە لە هەورەکانەوە کە بەهۆی بای بارانەوە دەیانگوشینو بارانیان لێ دەبارێ بارانی بە خورو لێزمە دەبارێنین، ﴿لِنُخْرِجَ بِهِ حَبّاً وَنَبَاتاً، وَجَنَّاتٍ أَلْفَافاً﴾ بۆ ئەوەی زەویو زاری پێ ئاو دەین، کشتوکاڵو درەختو رەوەکی پێ دەروێنین، دانەوێڵەو بەرومومی پێ پێ دەگەیەنین، باران دەبارێنین بۆ ئەوەی زەوی سەر لەنوێ زیندوبکەینەوە گژوگیاو روەكو درەختی پێ بروێنینو سروشتی پێ ئارایش بدەینو بەجۆرەها دیمەن زەوی برازێنێتەوە جۆرەها دانەوێڵەو بەروبومو میوە جات بۆ ئێوە دابین بکەین. باخو باخاتی چڕو پڕو بهێنینە دیو گەشو نمایان تێ بکەوێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاء وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ الرعد/٤

## چۆنیەتی ڕۆژی قیامەتو نیشانەکانیو جۆری عەزاب

﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَـٰتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّـٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّـٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا

﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَـٰهُ كِتَـٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی ڕاگەیاند کە: خودا دونیا وێران دەکاو جیهانێکی تر دێنێتە کایەوە، ئەمجار باسی ڕۆژی قیامەت دەکاو چۆنیەتی ڕابوونی ئەو ڕۆژەو دیمەنە سامناکەکانی بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتاً﴾ بێگومان ڕۆژی قیامەت کاتی زیندوکردنەوەو کۆکردنەوەی هەموو ئادەمیزادە هەر لەیەکەم فەردیانەوە تادوا کەسیان، لەو ڕۆژەدا هەرچی لە دونیادا وادەیان پێ دراوە. دێتەدیو دەیاندرێتێ. خوداپەرستان بەنازو نیعمەتی خودا دەگەن‌و بەهەشتی ڕازاوەیان دەدرێتێ، تاوانبارانیش سزای سەختی دۆزەخیان پێ دەبڕێ. ڕۆژی قیامەت بە (یوم الفصل) ناونراوە چونکە لەو ڕۆژەدا خودا حەق‌و بەتاڵ لێك جیا دەکاتەوە، بە بڕیاری عادلانەی خۆی بەهەشتی‌و دۆزەخی لێك هەڵدەهاوێرێ. ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجاً﴾ ڕۆژی قیامەت ئەو ڕۆژەیە کە: ئیسرافیل فوو بە شاخی صوردا دەکا، ئێوە ئەی ئادەمیزادینە! لە گۆڕەکانتان ڕاست دەبنەوەو پۆل پۆل‌و کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو سارای مەحشەر دێن. هەموو گەل‌و نەتەوەیەك لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا دێنە ناو گۆڕەپانی مەحشەرەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ﴾ الاسراء/ ٧١.

ئیتر ئەو ڕۆژە هەموو کەسێك چاوی بە کردەوەی خۆی دەکەوێ‌و بەری هەوڵ‌و کۆششی دونیای دەبینێ، پاداشی چاکەو سزای خراپەی خۆی وەردەگرێتەوە ﴿وَفُتِحَتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَاباً﴾ ئاسمان شەق‌و پەق دەبێ‌و هەمووی دەبێ بە دەرگاو کوڵان‌و فریشتەی پێدا دێنە خوار! وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم

مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاء بِالْغَمَامِ وَنُزِّلَ الْمَلَائِكَةُ تَنزِيلاً﴾ الفرقان/٢٥. لەو رۆژەدا دەستورو یاسای ئاسمان تێکدەچێ، هێزی کێشندە نامێنێ، ئەستێرەکانو زەوی خولگەو جەمسەریان نامێنێ، پەرتو بڵاو دەبنو دەبنە تەپو تۆزو سەر لە بەربوونەوەر گۆڕانی بەسەردا دێ. ﴿وَسُيِّرَتْ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَاباً﴾ کێوەکان لە بێخ هەڵدەکەندرێنو وردو خاش دەکرێنو دەکرێنە تەپو تۆزو بە هەوادا دەڕوا.. سەرەتا دونیا وێرانبوون بەلێکدانو پیاماڵینی زەوی دەست پێ دەکا! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً﴾ الحاقة/١٤ دوایی زەویو کێوەکانی وەکوو لۆکەی کراومیان لێ دێ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ﴾ –القارعة/٥ ئەمجار هەموویان وردوخاش دەبن وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجّاً، وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسّاً، فَكَانَتْ هَبَاء مُّنبَثّاً﴾ الواقعة/٤–٦ ئەمجار دەبنە تەپو تۆز بەهەوادا دەڕوا وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفاً﴾ طه/١٠٥.

ئەمجار پەروەدگار باسی ئەو عەزابو نارەحەتیەی دەکا کە: توشی کافرەکان دەبێ، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَاداً، لِلْطَّاغِينَ مَآباً، لابِثِينَ فِيهَا أَحْقَاباً﴾ بێگومان دۆزەخ چاوەڕوانی ملهوڕو ستەمکارانە، لە بڕیارو حوکمی خودادا ئامادە کراوە بۆ تاوانباران، ئاکامو شوێنی حەوانەوەی ملهوڕو ستەمکارو یاخی بووەکانە، رۆژی قیامەت بەریسواییەوە توڕ دەدرێنە ناوی وچەندەها هەزار ساڵو زەمانی دورو درێژ تێیدا دەمێننەوە کە ئەو ماوە دورو درێژانە تەواو بوون ماوەی تریان بۆ دیاری دەکرێ بۆ هەتاهەتایە. ﴿لا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْداً وَلا شَرَاباً﴾ بەدرێژایی ئەو ماوە بێ کۆتاییەی لە ناو دۆزەخدا دەمێننەوە فێنکاییەك ناچەژن گەرماییان لەسەر کەم بکاتەوەو تاوێك بحەسێنەوە، ئاوێك ناخۆنەوە ساردبێو تینوەتی بشکێنێ. ﴿إِلاَّ حَمِيماً وَغَسَّاقاً، جَزَاءً وِفَاقاً﴾ جگە لەئاوی کوڵاتوو کێمو زوخاوێك کە لە جەستەی

دۆزەخیەکان دەتکێ، ئەو عەزابە سەختودژوارە پڕاوپڕی کردەوە خراپەکانیانە، هیچ تاوانێك لە هاوەڵدانان بۆ خودا گەورەتر نیە، هیچ سزایەك لە سزای دۆزەخ بە ئازارتر نیە، ئەوان لە ژیانی دونیایاندا هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، بۆیە بە ئاگر سزا دەدرێن. سزای دۆزەخ سەر بەسەری تاوانەکانیانە.

﴿إِنَّهُمْ كَانُوا لا يَرْجُونَ حِسَاباً، وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّاباً﴾ بێگومان ئەو بەدبەختانە جۆرەها کردەوەی ناشرینیان ئەنجامداوە، جۆرەها تاوانیان کردوە، چونکە ئەوان بەتەما زیندوبونەوە نەبوون، چاوەڕوانی پاداش‌و ترسی سزایان نەبوو، ئیمانیان بە هاتنی ڕۆژی قیامەت نەبوو، بێدین‌و بێ باوەڕ بوون، پەیامی قورئانیان ڕەتکردەوە. هەر بەڵگەو نیشانەیەکیان لە سەر تاك‌و تەنهایی خوداو ڕابونی قیامەت بۆ بهێنرایەوە، ئەوان بەدرۆیان دەزانی‌و ئینکارییان دەکرد. تەنانەت ئینکاری حەقیان کردو پێغەمبەرانیان بە درۆ خستەوە. ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ كِتَاباً﴾ ئێمە ئاگاداری هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بووین‌و لەسەرمان تۆمار کردون، هیچ شتێکی ئەوانمان فەرامۆش نەکردوە، بە گوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداشتیان دەدەینەوە: چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە. ﴿فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلاَّ عَذَاباً﴾ بە دۆزەخیەکان دەگوترێ: بچێژن ئەو عەزابەی وان لە ناویدا، دڵنیابن ئێمە جگە لە عەزاب هیچی ترتان بۆ زیاد ناکەین، سات دواسات عەزابیان لە سەر گران دەکەین.

## حاڵ‌و وەزعی بەختەوەران

﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ ﴾

لەوەپێش حاڵو وەزعی دۆزەخیەکانی بەیان کرد، ئەمجار دێتە سەر باسی بەختەوەرانو بە مراز گەیشتوەکان کە: لە ئاگری دۆزەخ رزگاریان بووەو خراونە ناو بەهەشتی ڕازاوەوە، لە نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی لەززەت وەردەگرن. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازاً﴾ بێگومان چی پیرۆزیو بە مراز گەیشتنو لەززەتو خۆشی هەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە: خۆیان لە تاوان دەپارێزنو هەمیشە ترسی خودایان لە دڵ دایە. لەززەتو خۆشییەکانی بەهەشت زۆرەو هەمە جۆرن. ﴿حَدَائِقَ وَأَعْنَاباً﴾ لەززەت وەرگرتن لە باخو باخاتی رازاوەو پۆشناخو هەمووجۆرە ترییکی بەتامو لەززەت. ﴿وَكَوَاعِبَ أَتْرَاباً﴾ هەروەها لەززەت وەرگرتن لە کچانی تازە مەمك خڕکردوی هاوتەمەن، کە مەمیان شل نەبوەو شوّڕ نەبۆتەوە. ﴿وَكَأْساً دِهَاقاً﴾ هەروەها لەززەت وەرگرتن لە پیاڵەی پڕ لەمەی. وەڵێ ئەو مەیە سەرخۆشکەر نیە، عەقڵو شعور نابا، نابێتە هۆی چەقە چەقو ئاژاوەو شەڕە جنێوو ناکۆکی، لە ئاکامی ئەو مەی خواردنەوەدا ﴿لا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلا كِذَّاباً﴾ لە بەهەشتدا قسەی پڕو پوچ نابیستن کەس درۆ ناکاو کەس کەس بە درۆ ناخاتەوە، کەشو هەواکەی پاكو خاوێنە، قسەیەکی وای تێدا ناکرێ هەستو شعور برینندار بکا، بە پێچەوانەی حاڵی دونیا کە: رۆژانە بە گوێی خۆت جۆرەها قسەی ناخۆشو پڕو پوچ دەبیستی، هەستو شعور برینندار دەبن. قسەی بێ سودی تێدا ناکرێ، هەمووی ئاشتیو برایەتییە. بەم جۆرە پاداشتی چاکان دەدرێتەوە ﴿جَزَاءً مِنْ رَبِّكَ عَطَاءً حِسَاباً﴾ پاداشتەکە لە خوداوەو عەطاو بەخششێکە بە فەضلو ئیحسانی خۆی لە پاداشی کردەوە باشەکانیاندا پێی بەخشیون، پاداشتێکی کافیو وافیە.

## گەورەیی خوداو جەختکردنەوە لەسەر هاتنی رۆژی قیامەتو هەڕەشە لە موشرکەکان

﴿ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًا ﴿٤٠﴾ ﴾

دوای هەڕەشـە لـە کافرەکـانو وادەدان بـە خـودا پەرسـتان، باسـی گـەورەییو شکۆمەندی خۆی دەکا، باسی رەحمـەتی بـەر فـراوانو لـەبن نـەهاتووی خـۆی دەکـا، ئـەمجار ئـەوە رادەگەیـەنێ کـە: رۆژی قیامـەت حەقـەو گومـان لـەهاتنیدا نیـە لـەو رۆژەدا ئـادەمیزاد دەکـرێن بـەدوو تـاقمو لێـك جیادەکرێنـەوە کۆمـەڵێك لـە خـودا دوورنو دۆزەخـین، تاقمێکیـشیان لـە خـودا نـزیکنو بەهەشـتین، دەفـەرموێ: ﴿رَبِّ السَّمَوَاتِ وَالأرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الرَّحْمَنِ لا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَاباً﴾ پاداشتی باشو تەواو بۆ خودا پەرستان لەلایەن خودایەکەوەیە کە: خـاوەنی ئاسمانـەکانوزەویو ئـەوەی لـە ناویـان دایـە، خـودای بوونـەوەرو بەدیهێنـەری هـەموو شـتێکە، خودایـەکی خـاوەن رەحمو بەزەیـیـە، میهرەبانی بەشی هەموو کەسو هەموو شتێك دەکا، وێـڕای ئـەو میهرەبانیـیەی لەبەر شکۆمەندیو هەیبەتو جـەلالی لـەو رۆژەدا کـەس نـاتوانێ بـە بێ ئیزن وەرگرتن لێی خیطابی ئاراستە بکا، هیچ کەس لە دانیشتوانی ئاسمانەکانو زەوی دارای ئـەوەی نیـە بـەبێ ئیـزن شـەفاعەتو تکاکاری بکـا ئـەمجار ئـەم مانایـە

جەخت دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلائِكَةُ صَفّاً لا يَتَكَلَّمُونَ إِلاّ مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَقَالَ صَوَاباً﴾ گەورەیی‌و شکۆمەندی پەروەدگار عەظەمەت‌و جەلالی خودا لە رۆژی قیامەتدا بۆ ئادەمیزادەکان دەردەکەوێ، تەنانەت جوبرائیل‌و هەموو فریشتەکان ریزیان بەستووەو دەستەو نەظەر وەستاون، وێڕای رێزو قەدریان لای خودا، ناتوانن لەو رۆژەدا ورتەیان لەدەمەوە بێ بە دوو مەرج نەبێ.

١. رێگەی شەفاعەت‌و تکاکردن لە خوداوە بدرێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاّ بِإِذْنِهِ﴾ البقرة/٢٥٥.

٢. تکاکار قسەی بەرێ‌و جێ بکا، ئەگەر ئیزن دانەکە بۆ شەفاعەتکار بێ. یان ئەو کەسەی شەفاعەتی بۆ دەکرێ، لە ژیانی دونیایدا ئەهلی تەوحید بووبێ، شایتومانی هێنابێ، ئەگەر ئیزنەکە بۆ شەفاعەت بۆ کراو بێ.

هەردوو ماناکە وێچون، هەر چەند مانای یەکەم واتە: ئیزنەکە بۆ شەفاعەتکاربێ لەگەڵ سیاقەکەدا گونجاوترە. ﴿ذَلِكَ الْيَوْمُ الْحَقُّ فَمَن شَاء اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ مَآبًا﴾ ئەورۆژەی جوبرائیل‌و فریشتەکان بەو شێوە تێیدا ریز دەبەستن‌و ورتەیان لەدەم دەرنایە، رۆژێکی حەقەو شك لەهاتنیدا نیە، جاکەسێك دەیەوێ سەرفرازی ئەو رۆژە بێ‌و لەتاقمی رزگار بوان بێ، با رێگەی هیدایەت بگرێتە بەرو هانا بۆ خودای خۆی بەرێ، تۆبە لەتاوانەکانی بکاو روبکاتە خوداپەرستی، بۆئەوەی لەورۆژەدا خودا لەڕەحمەتی خۆی نزیکی بکاتەوەو لەسزاو عیقابی خۆی بیپارێ ئەمجار دەگەڕێتەوە بۆسەر هەڕەشەکردن لەکافرەکانی مەککەو وێنەکانیان، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾ ئەی ئەهلی مەککەو هەموو ئەوانەی کافرو بێ بڕوان؛ ئێمە ئێوەمان ترساند لە عەزابێکی نزیك پەیدابوو؛ کە عەزابی رۆژی قیامەتە. بێگومان لەبەر ئەوەی رابونی قیامەت سەد دەر سەدە، بۆیە هاتنەکەی بەنزیك دانا، گوتراوە: ﴿ کل ماهو ات قریب﴾ وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو

دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا﴾ النازعات/٤٦ لەو ڕۆژە نزیك پەیدابووەدا، هەموو ئادەمیزادێك سەیری کردەوەکانی خۆی دەکا. چاکەو خراپەی خۆی دێتەوە پێشی، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَراً وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوَءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ أَمَداً بَعِيداً﴾ آلعمران/٣٠ ئەو ڕۆژە کافرەکان لەبەر سەختی عەزابو ناخۆشی حاڵیان دەڵێن: خۆزگە سەد خۆزگە هەر گڵو خۆڵ بوینایەو زیندو نەکرابنایەو، یان خۆزگە وەکوو ئاژەڵ ببوینایە وەگڵ چونکە حەیوانات دوای دادگایی کردنو تۆڵە ستاندنەوە لێیانو بۆیان دەبنەوە بە گڵ.[٢]

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی النازعات

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (النازعات) چونکە سەرەتای سورەتەکە بە سوێند خواردنی خودا بە (النازعات) دەستی پێ کردوە. (النازعات) ئەو فریشتانەن کە روحی ئادەمیزادن دەکێشن، گیانی خوداپەرستان بەهێدیو لەسەرە خۆیی دەکێشن. گیانی کافرەکان بە توندوتیژی دەکێشن. پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشوویەوە لە چەند رویەکەوەیە.

١. ناوەرۆکی هەردوو سورەتەکە لێك دەچن، سەرەتای هەردوکیان باسی رابونی قیامەتو زیندوبونەوە دەکەن. باسی سەرەنجامی خودا پەرستانو ئاکامی تاوانباران دەکەن

٢. سەرەتاو کۆتایی هەردوو سورەتەکە لێك دەکەن. سورەتەکە بە شێوەیەکی گشتی باسی بنەماکانی عەقیدە دەکاو گرنگی بە تەوحیدو پێغەمبەرێتیو زیندوبوونەوە دەدا.

[٢] تفسیری ئیبنو کەثیر ج/٤-١٩٨٥

## جەختکردنەوە لەسەر ڕابونی قیامەتو حاڵو وەزعی موشریکەکان لەو ڕۆژەدا

﴿ وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَإِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَإِذَا كُنَّا عِظَامًا نَخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقاً﴾ سوێند بەو فریشتانەی بە توندی گیانی کافر دەکێشنو هی خواپەرستان بە هێدیو لەسەرەخۆیی. یان سوێند بە ئەو ئەستێرانەی بە درێژایی ڕۆژگار دێنو دەڕۆنو هەڵدەخولێن، لە تەومری خۆیاندا دەسوڕێنەوە.

﴿وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطاً﴾ سوێند بەو فریشتانەی بە خێرایی بۆ تەنفیذکردنی فەرمانی خودا لە ئاسمانەوە دادەبەزن، یان سوێند بەو ئەستێرانەی کە: هەر یەکەیان لەکەلوو (برج)ێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ برجێکی تر، هەر شەوە لەشوێنێکەوە هەڵدێن.

﴿وَالسَّابِحَاتِ سَبْحاً﴾ سوێند بەو فریشتانەی وەکوو مەلەوان بەئاسانیو بە خێرایی بۆ بەجێ هێنانی فەرمانی خودا بەناو بونەوەردا دێنو دەچن. یان سوێند بەو ئەستێرانەی کەلە بۆشاییدا مەلە دەکەن.

﴿فَالسَّابِقَاتِ سَبْقاً﴾ سوێند بەو فریشتانەی پێشبڕکێ دەکەن بۆ خێرا بردنی گیانی موسوڵمانان بۆ بەهەشت. یان سوێند بەو ئەستێرانەی لە گەردو خولیاندا هەندێکیان پێش هەندێکیان دەکەون.

﴿فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْراً﴾ سوێند بەو فریشتانەی کاروباری ناو بونەوەر جێبەجێ دەکەن، حەڵاڵو حەرام بە نیگا دەهێنن بۆ پێغەمبەران، بەر پرسی باوو بارانن. هەروا هەر کارێك کەلەلایەن خوداوە پێیان پسپێردرێ. یان سوێند بەو ئەستێرانەی تەدبیری کاروباری هەندێ لە جیهانیان پێ ئەنجام دەدرێ وەکوو مانگ کە لە ئاکامی هەڵسوڕانیدا دوانزە مانگەو وەرزەکانی ساڵی لێ پەیدادەبێو مەدو جەزری دەریاو گەلێ شتی تر، ئەوە جگە لە مانگە شەوەکەی کەزۆر کەڵکی هەیە بۆ گژوگیاو روەك.......... هتد.

هەروەها خۆر، کە بەهۆی هاتوچۆی لە بورجەکانیدا وەرزەکانی ساڵ پێك دێ. هەموو زیندەوەرێك پێویستی بەتیشکی خۆر هەیە. هەندێ مەعنای تریش بۆ ئەم پێنج شتە سوێندی پێ خوراوانە هەیە.

جوابی سوێندەکان مەحزوفە واتە: دەفەرموێ: سوێند بە ئەو شتانەی باس کران ئێوە ئەی ئادەمیزادەکان دوای مردنتان زیندو دەکرێنەوە.

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ، تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ﴾ ئەو رۆژەی زەوی دەکەوێتە لەرزەو کێوەکان شەقەتۆڵەیان پێ دەکەوێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ﴾ المزمل/١٤ ئەمجار ئاسمان شەق دەبێو ئەستێرەکان هەڵدەوەرن.

﴿قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ، أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ﴾ چەند دڵو دەرونێك لەو رۆژەدا تـرس‌و لەرزیانە، کاتێك روداوە سامناکەکانی دەبیـنن دەکەونـە هەلەکە سـەماو دڵـە کوتـە، چـاو شـۆڕو زەلیـل‌و ریـسوا، چـونکە کـافربون‌و لەسـەر کـوفر گیانیـان دەرچـووەو ئیمانیان بە زیندوبونەوە نەبووە.

﴿يَقُولُونَ أَئِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ، أَئِذَا كُنَّا عِظَامـاً نَخِـرَةً، قَـالُوا تِلْـكَ إِذاً كَـرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾ موشریکە قورەیشیەکان‌و هاووێنەکانیان کە: کە بڕوایـان بـە زیندوبونـەوە نیە، ئەگەر پێیان بگوترێ: ئێوە دوای مردن زیندو دەکرێنـەوە، بەگاڵتـەو لاقرتێـوە دەڵێن: ئایا کە ئێمە مردین دەگێڕدرێینـەوە بـۆ ژیـانێکی ئاسـایی وەك ژیـانی پـێش مردنمان؟ ئایا ئێمە کە: بووین بـە ئێسقانە ڕزیـو، چـۆن زینـدو دەکرێینـەوە؟ بـێ بڕواکـان بەگاڵتـەوە وتیـان: ئەگـەر راسـت بـێ زینـدو بوونـەوە هەیـە، ئـەوە ئێـوە خەسارەتمەندن، چـونکە ئێمـە پێغەمبـەرمان بـە درۆخـستۆتەوە ئـەو دەمـە ئـەوەی موحەممەد پێی راگەیانـدوین توشمان دەبێ‌و سزامان لێ دەسـەندرێ، لەهـەمان کاتـدا بەدرۆش دەکەوێنەوە. کە دەڵێن زیندوبونەوە نیـە. بەشێوەیەکی گاڵتـە ئـامێز ئـەم قسانە دەکەن. ﴿ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِـدَةٌ، فَـإِذَا هُـمْ بِالـسَّاهِرَةِ﴾ رابـوونی قیامـەتتان بەلاوە دوور نەبێ، ئەوە بۆخودا کارێکی ئاسانە، رابوونی قیامەت تەنها بریتییـە لـە دەنگێك کەپەیدا دەبێ، لـە فوکردنێـك بـە شـاخی صوردا کـە نەفخەی دووەمـە لـە پڕێکـا دەبینـی مـەخلوقات هـەموویان لـە سـارای مەحـشەردا کۆدەبنـەوە؛ هـەموو ئادەمیزاد زیندو کرانەوەو ئامـادەکراون بـۆ حیـساب‌و لێکۆڵینـەوە. (الـساهرة) زەوی سارای مەحشەرە، زەوییەکی دەشتی سپی بێ کەندو لەند، بۆیە ناونراوە (الـساهرة) چـــونکە کەســـی لەســـەر ناخـــەوێ، کـــەس نوســـتنی پـــێ نـــاکرێ.

## هەڕەشە لە کافرەکان بە گێڕانەوەی چیرۆکی حەزرەتی موسا

﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلْـَٔايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾

لەومپێش پەروەدگار باسی کافرەکانی قورەیش‌و سووربونیان لەسەر ئینکاریکردنی زیندوبوونەوەو گاڵتەکردنیان بە پێغەمبەر(دخ) کرد، ئەمجار بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر(دخ)و تەسەللا هاتنەوەی چیرۆکی حەزرەتی موساو بەربەرەکانی فیرعەونی ملهوڕو ستەمکاری گێڕایەوە، هەڕەشەی لە کافرەکان کرد بەوەی ئەگەر واز لەسەر ڕەقی خۆیان نەهێنن دوورنیە خودا بە عەزابی سەختی خۆی ئەوانیش ڕیشە کێش ئەکا. دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَى، إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِي الْمُقَدَّسِ طُوًى﴾ ئەوە چیرۆکی موساو فیرعەونت بۆ نەهاتووە؟ واتە بەڕاستی ئەو سەرگورشتەت بۆ هاتووەو پێت گەیشتووە کە پەروەدگار موسای کرد بە پێغەمبەرو موعجیزەی گەورەی پێ بەخشین، کاتێك خودا لەشەودا بانگی لە موسا کرد لەشیوی پاك‌و پیرۆزی (طوی) کەلە دامێنی (طوری) سینایە. لەوێ ئاخاوتنی لەگەڵدا ئەنجامدا، ئەرکی پێغەمبەرایەتی خستە ئەستۆی‌و پێی فەرموو:

﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى﴾ بڕۆ بۆ سەر فیرعەون‌و دارو دەستەکەی، بێگومان فیرعەون لەڕێ دەرچووەو لە تاوان‌و ستەمکاریدا زێدە ڕەوی کردووە، خۆی بەسەر نەتەوەی ئیسرائیلدا سەپاندووەو لافی خودایەتی لێ دەدا، ﴿فَقُلْ هَلْ لَكَ إِلَى أَنْ تَزَكَّى، وَأَهْدِيَكَ إِلَى رَبِّكَ فَتَخْشَى﴾ بە فیرعەون بڵێ: دەتەوێ خۆت لە تاوانی کوفرو ستەمکاری پاك بکەیتەوە؟ من شارەزایت بکەم بۆ ناسینی خوداو تاك تەنهایی‌و عیبادەت بۆ کردنی، ئیتر لەسزای سەختی خودا بترسی‌و پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بی؟ خودا فەرمانی بە موساکرد؛ بەم جۆرە بانگەوازی بکاو شێوەی نەرم‌و نیانی لەگەڵدا بەکاربێنێ، چونکە ئامۆژگاری ئەو جۆرە ملهوڕانە بە ئوسلوبی ئاوا نەرم‌و نیان کاریگەرترە. پتر هیوای ئەوەی لێ دەکرێ ئامۆژگاریکراو بە خۆیدا بچێتەوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلاً لَّيِّناً لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى﴾ طه/٤٤ .

کاتێك حەزرەتی موسا چووەلای فیرعەون بەم شێوە پەیامی پەروەدگاری پێ ڕاگەیاند، ئەویش بڕوای پێ نەکرد، ﴿فَأَرَاهُ الآيَةَ الْكُبْرَى﴾ حەزرەتی موسا موعجیزەی گەورەی نیشانی فیرعەوندا، موعجیزەی عەصاکەی کە: بووە ئەژدیهاو مارێکی گەورەو چست‌و چالاك‌و هەموو مارە درۆزنەکانی ساحیرەکانی قوت دان، هەروا چەند موعجیزەی تری بۆ نواندن، کە هەموویان بەڵگەبوون لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتییەکەی.

﴿فَكَذَّبَ وَعَصَى، ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَى﴾ فیرعەون حەزرەتی موسای بە درۆ خستەوە، پەیامی حەق‌و ڕاستی ڕەتکردەوە، لە خودا یاخی بوو، ئەمجار پشتی هەڵکردو ڕوی لە ئیمانهێنان وەرگێڕا، دەستی کرد بە ئاشوب نانەوەو فەساد بڵاو کردنەوەو بەربەرەکانی پەیامی حەزرەتی موسا بە هەموو جۆرێك.

﴿فَحَشَرَ فَنَادَى، فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾ دارو دەستەی خۆی خڕکردەوە بۆ ڕاوێژو بڕیاردان دەربارەی پەیامی موسا، یان ساحیرەکانی کۆکردەوە بۆ

بەربەرەکانیو بەگژدا چونەوەی موعجیزەکانی حەزرەتی موسا، ئەمجار لە شوێنی کۆبوونەوەکەدا بانگی هەڵداو وتی: من خودای باڵا دەستو فرمانڕەواو خاوەن دەستەڵاتی ڕەهاتانم، جگە لە من خودای ترتان نیەو هیچ خودایەك نیە لە ژوور منەوەبێ!

﴿فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الآخِرَةِ وَالأُولَى، إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِمَنْ يَخْشَى﴾ پەروەدگار لە تۆڵەی ئەو خۆبەزلزانیو لوتبەرزیو خۆبە خودا زانییەی گرتی بەلام گرتن! تۆڵەی لێ ستاند بەشێوەیەك بوو بەپەندی دونیاو قیامەت، جێگای ئەوەیە هەموو یاخی بوو لوتبەرزێك عیبرەتی لێ وەربگرێ، هەر کەسێك ئەو هەواڵە ببیسێ پەند ئامێزبێ، بێگومان لە چیرۆكو سەر گورشتەی فیرعەوندا عیبرەتی گرنگ هەیە بۆ کەسێك لە خودا بترسێو بیەوێ خۆی لە عەزابی خودا بپارێزێ.

## چەسپاندنی رابوونی قیامەت لەڕوانگەی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوییەوە

﴿ ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٣﴾ ﴾

لەوەپێش چیرۆکی حەزرەتی موساو فیرعەونی ستەمکاری گێڕایەوە، ئەمجار خیطاب ئاڕاستەی ئەوانە دەکا کە: ئینکاری زیندوبونەوە دەکەن، بەڵگە لەسەر راستی رابوونی قیامەت دەهێنێتەوە، دەفەرموێ: ﴿أَأَنْتُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا.

رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا﴾ ئەریّ خەڵكینە، دروستكردنەوەی ئێوە دوای مردنتان سەر لەنویّ بە مەزندەی ئێوە قورسترە یان دروستكردنی ئاسمان؟! زیندوكردنەوەی ئێوە گرانترە یان بەدیهێنانی ئاسمان!؟ بێگومان دروستكردنی ئاسمانەكان لە زیندو كردنەوەو دروستكردنەوەی ئێوە گرانترە هەر چەندە لای خودا هەموو شتێك ئاسانە، بەلاّم بە پێوەرو مەزەندەی ئادەمیزاد دروستكردنی ئاسمان لە دروستكردنی ئادەمیزادەكان گرانترە. نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترەكە دەفەرمویّ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ﴾ غافر/٥٧. یان دەفەرمویّ: ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم﴾ یس/٨١.

دەی كەسێك بتوانیّ ئاسمان بەو هەموو پانوپۆڕیو بەرزیو قەبارە گەورانەوە دروست بكا، بەو هەموو ئەستێرانە برازێنێتەوە چۆن ناتوانیّ ئێوەی ئادەمیزاد دوای مردن زیندو بكاتەوە؟ ئەمجار باسی دروستكردنی ئاسمانمان بۆ دەكاو دەفەرمویّ: پەروەردگار ئاسمانی بەدیهێناوەو پێكی هێناوەو لێكی داوە رێكی خستووە كردویەتی بە یەكپارچەو قەبارەكەی بەرز كردۆتەوە وای لیّ كردوە دەڵێی سەقفێكی بەرزە لە ژوور زەوییەوە بەبیّ كۆڵەكە وەستاندویەتی، هەر خودا بۆ خۆی دەزانیّ چەند بەرزو چەند ئەستورو چەند پانو پۆڕە، زانیاری ئێمەی ئادەمیزاد پەی پیّ نابا. تالێی بڕوانیو بەچاوی ئاساییو ئامێری پێشكەوتوو لێی ورد ببنەوە هەر ئەوە دەبین كە: سەقفێكی بەرزو پانو پۆڕی بیّ چاڵو چوێڵو درزو كونو كەلەبەرە بە ئەستێرەی زۆرو جۆراو جۆر رازێندراوەتەوە، ئەو هەموو ملیۆنەها ئەستێرە لەو فەزا بەر فراوانەدا هەر یەكەیان لە مەداری خۆیاندا دێنو دەچن، بیّ ئەوەی هیچ قەبارەیەك لەو هەموو قەبارە زبەلاحو هەمە جۆرانە، لێك بخشێن یان دەعم بكەنو رێگە بەیەكتر بگرن!

﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا﴾ شەوی ئاسمانی تاریك كرد بە ئاوابوونی خۆر لێی. ﴿وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا﴾ رۆژی روناك كردوە بەلێهەلاّتنی خۆر، شەوو رۆژی بە شوێن یەكدیدا

هێنـاوە، جـودا وازی کـەش‌و هـەوای خـستۆتە نێـوان وەرزەکـانی سـاڵەوە تـا زەوی بگونجێ بـۆ تێـدا ژیـان. هەر خـودا دەزانـێ چـەند هـەزار سـاڵ شـەوو رۆژ بەشـوێن یەکدیدا هـاتوون‌و چـوون، تـا زەوی وای لێ هـاتووە بەکـەڵکی ئـەوە بـێ ئـادەمیزادو گیانلەبەرانی تری لەسەری بـژین. بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿وَالْأَرْضَ بَعْـدَ ذَلِـكَ دَحَاهَـا﴾ دوای دروستکردنی ئاسمانەکان‌و شەوو رۆژ بە هـەزاران سـاڵ ئینجا زەوی راخـست‌و وای لێ کـرد گیانلەبـەر بـە سـەریدا بـڕۆن‌و بگـونجێ بـۆ تێـدا ژیـان، واتـە: تـوێکڵی زەویمان سارد کردەوەو گونجاندمان بۆ لەسەر ژیان!

ئایەتەکە بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئـەوە دەکا کـە: راخـستنی زەوی‌و پانکردنـەوەی، دوای دروسـتکردنی ئاسمانـەکان بـووە. وەلێ خـودی دروسـتکردنی زەوی پـێش دروسـتکردنی ئاسمانـەکان بـووە، وەکـوو لـە شـوێنێکی تـردا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ، وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِـي أَرْبَعَـةِ أَيَّـامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ، ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَـائِعِينَ﴾ فـصلت/٩-١١ ئـەم ئایەتـە ئـەوە دەگەیـەنێ کـە: دروسـتکردنی ئاسمـان دوای دروسـتکردنی زەوی بـووە واتـە: زەوی پـێش ئاسمـان بەشـێوەیەکی تـر دروسـتکراوە ئـەمجار دوای دروسـتکردنی ئاسمـان شـێوەی زەوی کراوەتـە هێلکـەیی‌و راخراوەو وای لێ کراوە بەکەڵکی ژیان لەسەر بەسەر بردن بێ. هۆکاری ژیـانی تێـدا رەخسێندراوە، بەم نەوعە کە: ﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا، وَالْجِبَـالَ أَرْسَـاهَا، مَتَاعـاً لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾ ئاوی لە زەوی دەرهێناوە، کانیاوو جۆگاو دەریای تێدا رەخساندوون. گژوگیاو دارو درەخت روەکی تێدا رواند، بەروبوم‌و میوەجات‌و بژێو بۆ ئـادەمیزادو لەوەڕو ئالف بۆ ئاژەڵەکان‌و باقی گیانلەبـەرەکانی تـری تێـدا دابـین کـرد، کێوەکـانی تێـدا وەکـوو گـوڵمێخ داکـوتراون، بـۆ ئـەوەی لـەرەو راتڵەقانـدن نـەکاو گیانلەبـەران

بتوانن بەئاسانی تێیدا بژین. هەموو ئەو شتانەی لە زەویدا فەراهەم هێناوە بۆ بەرژەوەندی ئێوەو خۆشگوزەرانیتانو هەروەها بۆ ژیانی ئاژەڵەکانتان.

## سزاو پاداشتی خودا پەرستانو کافرەکانو تایبەتمەندی زانیاری دەربارەی قیامەت بە خوداوە

﴿ فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَىٰ (٣٤) يَوْمَ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ مَا سَعَىٰ (٣٥) وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ (٣٦) فَأَمَّا مَن طَغَىٰ (٣٧) وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا (٣٨) فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَىٰ (٣٩) وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ (٤٠) فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ (٤١) يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا (٤٢) فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَاهَا (٤٣) إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَاهَا (٤٤) إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا (٤٥) كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا (٤٦) ﴾

دەربارەی نازڵ بوونی ئایەتی ژمارە (٤٢) حاکمو ئیبنو جەریر لە خاتو عائیشەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر(دخ) پرسیاری لە هاتنی قیامەت دەکرد هەتا ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا.....﴾ی بۆ سەر نازڵ بوو.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: موشریکەکانی مەککە پرسیاریان لە پێغەمبەر(دخ) کرد، وتیان: قیامەت کەی

دەبێ؟ پرسیارەکەیان بەشێوەی گاڵتە ئامێز دەکرد ئیتر پەروەدگار ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا.....﴾ی نازڵ کرد.

پەیوەندیو موناسەبەی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم رووەوەیە: لەوەپێش بەڵگەی لەسەر دەسەڵاتی رەهاو بە توانایی خودا لەسەر زیندو کردنەوە هێنایەوە، دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی کردنە بەڵگە لەسەر بە توانایی خودا بۆ زیندوبوونەوە.

ئەمجار لێرەدا هەواڵی هاتنی قیامەت رادەگەیەنێو روداوەکانی نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَى﴾ کاتێك بەڵای گەورە دێ، بەڵاو کارەساتێك کەلە هەموو روداوێك سامناکترە، ئەویش رابوونی قیامەتە، یان نەفخەی دووەمە: کە بە دوایدا زیندوبوونەوە دەبێ یان ﴿الطَّامَّةُ الْكُبْرَى﴾ بریتیە لەو کاتەی بەهەشتیەکان بۆ بەهەشتو دۆزەخیەکان بۆ دۆزەخ دەنێردرێن. ئەو کاتە خودا چاكو خراپ لێك هەڵدەهاوێرێ، هەیانە بەدبەختو چارە ڕەش، هەیانە بەختەوەرو کامەران، ﴿يَوْمَ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ مَا سَعَى﴾ ئەو رۆژە ئادەمیزاد کردەوەی خۆی دێتەوە یادو چاکەو خراپەی خۆی دێتەوە ڕێو بیری دەکەوێتەوە، چی کردوەو چی نەکردوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى﴾ الفجر/٢٣ لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ﴾المجادلة/٦ رۆژەکە هەمووی کارەساتو روداوی سامناکە، دیمەنەکانی زەندەقبەرو تۆقێنەرن، ﴿وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِمَن يَرَى﴾ دۆزەخ دەرخرا، (دەردەخرێ) بۆ هەر کەسێك بڕوانێو ببینێ،

موقاتیل دەفەرموێ: لەو رۆژەدا پەردە لەسەر دۆزەخ لادەبرێ مەخلوقات چاویان پێ دەکەوێ، موسوڵمان بەبینینی ئەندازەی نیعمەتی خودا دەزانێ بەسەریدا بەوە کە: لەو عەزابە رزگاری دەبێ، کافر بەدیتنی دۆزەخ غەمو ترسی زیاد دەبێو دەزانێ ئەوە سەرەنجامو شوێنی حەوانەوەیەتی. ئەمجار پەروەدگار

حوكم‌و بریاری خۆی دەداو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ طَغَى، وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ جا كەسێك لە دونیادا یاخی بووبێ، لە سنووری یاسای خودا دەرچووبێ، زێدە ڕەوی كردبێ لە كوفرو بێدینیدا، ژیانی دونیای هەڵبژاردبێ بەسەر ژیانی قیامەتدا، ئەوە بەدبەختەو بێگومان دۆزەخ شوێنی حەوانەوەیەتی.

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى، فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ ئەو كەسەیش ترسابێ لە پایەو مەقامی پەروەردگاری خۆی، ترسی ڕۆژی ڕاوەستان لە بەردەم پەروەردگاریدا هەبووبێ ﴿وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى﴾ جڵەوگیری لە نەفسی خۆی كردبێ نەیهێشتبێ تاوان ئەنجام بدا، لە ئارەزوی خراپەی گێڕابێتەوە، ڕامی كردبێ بۆ تەقواو خوداپەرستی ﴿فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ ئەوە بەهەشت شوێن‌و جێگایەتی، بۆ ناو ئەو نازو نیعمەتە بەرێ دەكرێ‌و خەنی لە خۆی!

ئەمجار پەروەردگار باسی پرسیار كردنی موشریكەكان دەكا، كە بەگاڵتەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر دەكرد دەربارەی كاتی هاتنی قیامەت. دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا﴾ ئەی پێغەمبەر موشریكەكان پرسیارت لێ دەكەن قیامەت كەی ڕادەبێ‌و خودا كەی ئەو كارەساتە دەقەومێنێ، یان قیامەت چۆن هەڵدەستێ‌و لەكوێ‌و كەی هەڵدەستێ؟ ئەم پرسیارانەیان كاتێك دەكردن كە: پێغەمبەر(دخ) باسی قیامەتی بەشێوەی سامناك بۆ وەصف دەكردن، ئەوانیش بە گاڵتە پێكردنەوە دەیانگوت ئەوە كەی ڕادەبێ؟! ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ كردو فەرمووی: ﴿فِيمَ أَنْتَ مِنْ ذِكْرَاهَا، إِلَى رَبِّكَ مُنْتَهَاهَا﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! چیت داوە لە زانینی ئەو ڕۆژە؛ تۆ بۆ پرسیار لەهاتن‌و كاتی هاتنی قیامەت دەكەی؟ تۆ بۆ ئەوەندە بەتەنگەوەی كاتەكەی بزانی‌و وەڵامی موشریكەكانی پێ بدەیەوە؟ واتە: زانیاری دەربارەی كاتی هاتنی قیامەت نەبۆ تۆیەو نەبۆ كەسێكی تره لە مەخلووقات، بەڵكو سەرنجام‌و زانیاری لەو بارەوە هەر لای خودایەو بەس! ئەو نەفامانە بۆچی پرسیار لەتۆ دەكەن، بۆچی داوات لێ دەكەن كاتی ڕابوونی

قیامـەتیان بـۆ دیـاری بکـەی؟ نموونـەی ئـەم ئایەتـە ئایـەتێکی تـرەکـە دەفـەرمووێ: ﴿ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لاَ تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِـيٌّ عَنْهَـا قُـلْ إِنَّمَـا عِلْمُهَا عِندَ اللّهِ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ الاعـراف/١٨٧ زانینـی کـاتی رابـوونی قیامەت ئیشی تۆنیە، بەڵکوو ئەرکی سەر شانی تۆ ئامۆژگـاری کردنـی پەیامەکەتـە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَنْ يَخْشَاهَا﴾ ئێمە تۆمان کردوە بـە پێغەمبـەرو رەوانـەمان کـردوی بـۆ ئـەوەی ئـادەمیزاد بترسـێنێ لـە عـەزابی سـەختی خـودا، تـۆ ئامۆژگاریکـەرو ترسـینەری کەسـێکی لـە قیامـەت بترسـێ، کەسـێك لـەخودا ترسـاو ترسی راوەستانی بەردەم بارەگای پەروەدگاری ببێ شوێنت دەکەوێو رزگاری دەبێ. کەسێکیش بڕوای بە قیامەت نەبێ، خەسارەتمەندە، کەوابێ واز لە کارێك بێنە کە: ئیشی تۆ نیە، کارێك ئەنجام بدە کە ئەرکی سـەر شانتە. ئـەویش بریتیـە لـەئاگادار کردنـەوەو ترسـاندنی ئـادەمیزاد، بـۆ خـۆ ئامـادەکردن بـۆ ئـەو رۆژە، وەڵێ ئـەو موشـریكو نەفامانـە تێناگـەنو قـسەی حـەق نابیـسنو ئامۆژگـاری کاریـان تێناکـا. کەوابوو گرنگیان پێ مەدەو دەست بەرداریان ببە، جاکە دووچاری ئـەو رۆژە بـوون. هەموو شتێکیان لەبیر دەچێتەوە ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ عَشِيَّةً أَوْ ضُـحَاهَا﴾ ئـەو رۆژەی پرسـیاری لێ دەکـەن دێو شـك لـە هـاتنی دانیـە، ئـەو رۆژەی قیامـەت رادەبێو ئەوان زیندو دەکرێنەوەو لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە ماوەی ژیانی دونیایان هێندە بەلاوە کورت دەبێ، وا دەزانن: سەعاتێك لە رۆژێك یان ئێـوارە وەختێـك یـان چێشتەنگاوێك ماونەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی عبس

ئـەم سـورەتە مەككيـەو چـلو دوو ئايەتـە. نـاوی نـراوه بـە سـورەتی (عـبس) چـونكە بـەو وشـەيە دەسـتی پـێ كـراوەو تـەعبير لەوەصـفو حاڵـەتێك دەكـا كـە: سروشتی ئادەميزاد داخوازييەتی واتە: كاتێـك كـە سـەرگەرمی ئەنجامـدانی كارێكی گرنگ بێ، يەكێك بێ بيەوێ دەستی پێ لەو كارە هەلبگرێ، روخـساری ئـەو حاڵەی بەسەردا دێ بابەتو ناوەرۆكی سورەتەكە وەكـوو بـاقی سـورەتە مەككييـەكان باسـی عەقيـدەو پێغەمبەرايەتييـە، باسـی ئـەخلاقو ڕەوشـتە، ئـەخلاقو رەوشـتێك كـە لەسەر بنەمای يەكسانی نێوان بەنـدەكان دادەمـەزرێو بـەرزو نزمـی بەنـدەكان بـە تەقواو خودا پەرستی دياری دەكرێ.

سەبەب نزولی ئەم سورەتە وەكوو ريوايەت كراوە روداوی عەبـدوڵلای كـوڕی (أم مەكتوم)ە، كوڕی خاڵی خەديجە بووە، ريوايـەتكراوە رۆژێـك پێغەمبـەر(دخ) لەگـەڵ سـەرانی قوڕەيـشدا (عوتبـەو شـەيبە: دوو كـوڕی رەبيعـەو ئـەبو جـەهلو عەبباسـی كوڕی موطەليبو ئومييەی كوڕی خەلـەفو وەليـدی كـوڕی موغـەيرە) كۆبوبـوەوەو بانگەوازی دەكردن بۆ ئيمانهێنان، بە هيوای موسوڵمانبوونيان، بـە موسـوڵمانبوونی ئەوانيش موسوڵمانبوونی مەككەييیەكان چاوەڕوان دەكرا. لەو كاتەدا كە پێغەمبەر (دخ) سـەر گـەرمی گفتوگـۆو ئامۆژگاريكردنيـان بـوو، عەبـدوڵلا هـات وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! نيگـاو سروشـتی تـازەم فێربكـە، چـەند جارێـك ئـەم قـسەيەی دووبارە كردەوەو نەيدەزانی كە: پێغەمبەر(دخ) لەگەڵ ئەو كۆمەڵە قوڕشەيـشيانەدا مەشغوڵە، پێغەمبەر(دخ) ئەم قسە بڕينەی پـێ نـاخۆش بـوو، روی گرژبـوو، روی لێ وەرگێـڕا، ئـيتر ئـەم سـورەتە نـازڵ بـوو، بـەو شـێوە رەخنـەی لـە هەڵوێـستی پێغەمبەرگرت، لـەوەدوا پێغەمبـەر(دخ) زۆر رێـزی لـەو زاتـە دەگـرتو هـەر لەگـەڵ

تووشی دەبوو دەیفەرموو: (مرحبا بمن عاتبنی فیە ربی) مەرحەبا لەو کەسەی پەروەدگارم لەسەر ئەو سەرزەنشتی کردم. ئەمجار پێی دەفەرموێ: چ ئیشێکت هەیە؟ بۆت جێبەجێ بکەم. دوو جاریش کە تەشریفی چووە بۆ غەزا عەبدوڵڵای کردوە بە والی لەسەر مەدینە.

## یەکسانی لە ئیسلامدا

﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ ﴾

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى، أَنْ جَاءَهُ الآعْمَى﴾ پێغەمبەر روی گرژو تاڵ کرد، روی وەرگێڕا، چونکە کوێرێك هاتە لای قسەی پێ بڕی، پیاوە کوێرەکە عەبدوڵڵای کوڕی (أم مەکتوم) بوو، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر(دخ) سەر گەرمی ئاخاوتنو بانگەازیکردنی پیاو ماقولانی قورەیش بوو، هاتەلای پێغەمبەرو قسەکانی پێ بڕینو وتی: سروشی تازە چی هاتووە فێرم بکە. ئاگای لەوە نەبوو کە پێغەمبەر(دخ) مەشغوڵی ئەو دانوسانە گرنگەیە. ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى﴾ ئەی موحەممەد! تۆ چوزانیت، تۆ ئاگات لە زانیاری ئەو کابرایە نەبوو، بەڵکوو ئەو کوێرە بیەوێ خۆی لە تاوان پاك بکاتەوە بەو قسانەی لەتۆیان دەبیسێ. ﴿أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنْفَعَهُ الذِّكْرَى﴾ یان ئەو ئامۆژگارییەی لە بیری چۆتەوە بیری بکەوێتەوە. ئەو کاتە ئەو ئامۆژگاریو بیرکەوتنەوەیە سودی پێ بگەیەنێ، ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە ئەوانەی

پێغەمبەر (دخ) خەریکی ئامۆژگاریکردنیان بووە لە موشریکەکان هیوای ئیمانهێنانیان لێ ناکرێ. لە هەمان کاتدا ئاماژە بە پلەوپایەو ڕێزی عەبدوڵڵای کوڕی (أم مكتوم)یش دەکا.

هەڵبەتە ئەم کردارو تەصەروفە لەلایەن پێغەمبەر(دخ) بە گوناه ناژمێردرێ، لەگەڵ عیصمەتی پێغەمبەرێتیدا دژ ناوەستێ. بەڵکوو تەرکی ئیحتیاتو وازهێنان لە (أفضل)ەو بەس! دەچێتە چوار چێوەی ( حسنات الابرار سيأت المقربين)ەوە. ئەو هەڵوێستەی لە بوارێکدا لێ دەرکەوتووە کە لە چوار چێوەی سروشتی ئادەمیدا یەو کارێکی (جبلی)و دەرونییە، تەکلیفی شەرعی تێدا نیە. چونکە ئەوە پەیوەندی بە دڵەوە هەیەو دەسەڵاتی ئادەمیزادی تێدا نیە. تۆ بە دەست خۆت نیە جاری واهەیە بەشتێك ڕازیو دەچێتە دڵتەوە بەشتێك نارازیو خۆشت ناوێ. ئەمجار باسی ئەو کردەوەی پێغەمبەر دەکا کە: بوومتە هۆی عیتاب لێگرتنەکەو دەفەرموێ: ﴿أَمَّا مَنْ اسْتَغْنَى، فَأَنْتَ لَهُ تَصَدَّى﴾ ئەمما ئەو کەسەی بە ماڵو سامانو هێزو دەسەڵاتی خۆی دەنازێو خۆی بێ نیاز دەگرێ لە هیدایەتی قورئانو ئیمانهێنانو ڕو لە پەیامەکەت وەردەگێڕێ، ئەوە تۆ ڕوی تێ دەکەیو ئاخاوتنی لەگەڵدا ئەنجام دەدەی، وا دەزانێ ئەوە گرنگترە لە وەڵامدانەوەی کوێرە موسوڵمانەکە.

﴿وَمَا عَلَيْكَ أَلاَّ يَزَّكَّى﴾ چی لەسەر تۆیە کە: ئەو کەسەی بە ماڵو سامانو هێزو دەسەڵاتی خۆی دەنازێ ئیمانت پێ ناهێنێ؟ هیچ سوچو تاوانێك روناکاتە تۆ، تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرەو بەس، ئیتر گرنگی بەو جۆرە کەسانە مەدە کە: سەر ڕەقو ملهوڕو بێ بڕوان. هۆباڵی خۆیان بە ئەستۆی خۆیان.

﴿وَأَمَّا مَنْ جَاءَكَ يَسْعَى، وَهُوَ يَخْشَى، فَأَنْتَ عَنْهُ تَلَهَّى﴾ وەلێ کەسێك بە پەلە دێ بۆلاتو دەیەوێ فێری ئایین ببێ، هیدایەتو ئامۆژگاری تازە وەربگرێو ترسی خودای لە دڵ دایە، ئەتۆ ڕوی لێ وەردەگێڕیو وەڵامی نادەیەوەو خۆتی لێ بێ ئاگا دەکەی!

بەم شێوە پەروەدگار پێغەمبەری ئاگادار کردەوە؛ کە هەژاری‌و بێ دەسەڵاتی ئەو کوێرە نابێ ببێتە هۆی ئەوەی روی لێ گرژ بکەی‌و وەڵامی نەدەیەوە. چونکە ئەوە هەر چەندە کوێرە موسوڵمانەو دڵی زیندوەو ژیرە، دەیەوێ ئامۆژگاری‌وەربگرێ‌و خۆی لە تاوان پاك بکاتەوە، ئامۆژگارییەکانی تۆ دەکاتە سەرە مەشقی ژیانی‌و پەیڕەوو پرۆگرامی خۆی، دڵ‌و دەروونی پێ روناك دەکاتەوە. نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ الانعام/٥٢ یان دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً﴾الكهف/٢٨.

## قورئان ئامۆژگاری‌و بیرخەرەوەیە، نیعمەتی خودایە

﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾ قُتِلَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾﴾

لەوەپێش پەروەدگار رەخنەی لە پێغەمبەر (دخ) گرت، لەسەر ئەوە کە: ناوچەوانی گرژ کردو روی لە عەبدڵلای کوڕی (أم مکتوم) وەرگێرا. بە هۆی ئەوەوە کە مەشغوڵی وتوێژ بوو لەگەڵ سەرانی قورەیشدا. ئەمجار لێرەدا رێنومایی

پێغەمبەر دەکا کە: جارێکی تر ئەو هەڵوێستە نەنوێنیو سەیری رواڵەت نەکا، تەقواو خوداپەرستی بکاتە پێوەرو بەو تەرازوە ورد خوێنەوە ئەندازەی باشیو خراپی ئادەمیزادەکان مەزندە بکا، دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ﴾ جارێکی تر کاری وامەکەو هەڵوێستی لەو جۆرە مەنوێنە، چەلێکی دی روو لە هەژار وەرمەگێڕەو روبکەیت دەوڵەمەند، لە کاتێکدا هەژارەکە دەیەوێ خۆی لە تاوان پاك بکاتەوەو دەوڵەمەندەکە لە پێڕی خۆ پاککەرەوەکان نیە. پێوەری ئادەمێتی لە لات خوداپەرستیو زیرەکیو تێگەیشتن بێ، نەك ماڵو سامانو دەست رۆیشتویی. گرنگی بدە بەوانەی دڵیان زیندوەو خۆت بەوانەوە خەریك بکە. نەکەیت دەست لەو خودا پەرستە دڵ زیندوانە هەڵگریتو روبکەیە ئەو خاوەن ماڵو سامانو کەودەنو دڵ مردوانە، کەوابوو لە هەڵوێستی پێشوت پەشیمان بەرەوە نەچی بۆ ئەوەی بێ بڕوایەکی کەودەن موسوڵمان بکەی رو لە موسوڵمانێکی زیرەکی خودا پەرست وەربگێری. نەخەیر وامەکە، ئەوەندە خۆت بە دەوڵەمەندی سەر رەقو ملهوڕو یاخی بوو خەریك مەکە، تۆ تەنها گەیاندنو ئامۆژگاریو ترساندنت لەسەرە، ئەرکی سەر شانی تۆ بیر خستنەوەو ئامۆژگارییە، دەستووڕو یاسای ئیسلامیش لەگەڵ هەموو سروشتێکدا تێکەڵەو هەر ئەوەندەی دەوێ ئامۆژگارییان بکەیو بیریان بخەیتەوە، جا هەر کەسێك بڕوات پێ نەکا، ئەوە مانای وایە دژی فیطرەتی خۆیەتیو بڕوا بە سروشتی خۆی ناکاو گوێ بۆ سۆزی دڵی خۆی ناگرێ!!

تۆ هەر ئەوندەت لەسەرە پەیامی خودا بە مەردوم بگەیەنێ، زۆرە ملێ لە کەس مەکەو ئایین بە تۆپزی ناسەپێ!! بێگومان تۆ ناتوانی بە زۆرو زەخت ئیمان لەدڵی ئەوانەدا بڕوێنی، ئەوە تەنها بەدەست خودایەو بەس! بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا﴾ بەڕاستی ئەو رینومایيو ئامۆژگارییانەی کەلە نامە ئاسمانییەکاندا هاتوونو لە هەمووشیان گەورەتر کە: قورئانی پیرۆزە ﴿تَذْكِرَةٌ﴾ یاد خەرەوەی شتێکە کەلە سروشتی ئادەمیزاددا هەیە. کە ئیمانی فیطرەتە ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾

هەر کەسێك دەیەوێ با یادی خودا بکاو بەتاكو تەنهای بناسێ بە گوێرەی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی قورئان هەڵسوکەوت بکا. بیکاتە بەرنامەی ژیانی خۆی.

﴿فِي صُحُفٍ مُكَرَّمَةٍ، مَرْفُوعَةٍ مُطَهَّرَةٍ، بِأَيْدِي سَفَرَةٍ، كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ ئەو یاد خەرەوەو رێنموونییە کە: لە نامە ئاسمانییەکاندا هاتووەو جوانترو گەورە ترینیان قورئانی پیرۆزە، لە چەند پەڕەیەکی پیرۆزو بەنرخدا نوسراوەنەوە، بەرزو پاكو خاوێنن لەلای خودا، پڕن لە زانیاریو حیکمەتو لە لەوحولەحفوظەوە نازڵ بوون، فریشتە نەبێ لەوێ کەسی تر دەستی ناگاتە ئەم قورئانە، لە شەیاتینیو کافر پارێزراوە، نامەیەکی تەواوو بێ کەمو کوڕییە، بەدەست چەند فریشتەیەکەوەیە کە بەرپرسیاری هێنانی نیگاو سروشتن لە خوداوە بۆ پێغەمبەران، بۆ ئەوەی ئەوانیش بە ئادەمیزادی رابگەیەنن، ئەو فریشتانە لای خودا رێزدارن، گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو راستگۆن لە ئیمانەکەیاندا. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ﴾ الانبياء/٢٦ یان دەفەرموێ: ﴿لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحريم/٦ ئەمجار پەروەدگار سەر زەنشتی ئەوانە دەکا کە بڕوایان بە زیندوبونەوە نیەو کافرو بێ بڕوان، دەفەرموێ: ﴿قُتِلَ الْإِنْسَانُ مَا أَكْفَرَهُ﴾ دەك بە کوشت چێ ئادەمیو عەمری نەمێنێ چەند سپڵەو پێنەزانە!؟ چەند سەر ڕەقو کافرو بێ بڕوایە؟ بەڕاستی هێندە خراپو بێ ویژدانە، شیاوی ژیان نیە، ئەو هەموو نازو نیعمەتەی خودای بەسەرەوەن، تەنانەت لە هەموو هەناسەدانێکدا دوو نیعمەت هەیە، خودا ئەو هەموو فەضلو ئیحسانەی لەگەڵ کردوە، کەچی ناشکوری دەکاو سوپاسگوزار نیە، یادی خودا ناکا، ئەگەر بیریشی بخرێتەوە گوێی پێ نادا، ئەگەر ئامۆژگاری بکرێ روی لێ وەردەگێڕێ، بانگەوازی بکرێ پشت هەڵدەکا. دەبوایە تۆزێ بیری بکردایەوەو نەختێك لە سروشتی خۆی ورد بوبایەوە تابزانێ ﴿مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ خودا لەچی ئەوی دروستکردوە؟ ﴿مِنْ نُطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ﴾ پەروەدگار ئینسانی لە دڵۆپە ئاوێکی پڕوپوچ دروستکردوە، مەزندەی شێوەو

روخسارو تەمەن‌و رزق‌و رۆژی کردوە، ڕێکی خستوەو ئەندامەکانی جەستەی وا دروستکردون بتوانێ بەویستی خۆی هەریەکەیان بۆ کاری خۆی بەکاربێنێ، هێزو تواناو عەقڵ‌و ژیری پێداوە، بۆ ئەوەی بیر لە بونەوەر بکاتەوە، هەست بە نازو نیعمەتەکانی خودا بکا، ئەو ئەندام‌و ئامێرانەی لە شتێك دا بەکار نەهێنێ کە: خودا پێی ناخۆشە. لە شتێکا بەکاریان بێنێ کە جێگای رەزامەندی خودان. ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾ لەرەحمی دایکیدا دروستی کردوەو ڕێکی خستووە پاشان بە ئاسانی لە منداڵدانی دایکییەوە هێناویەتە دەرەوە.

یان ماناکە بەم جۆرەیە، پەروەدگار ئادەمیزادی لە دڵۆپە ئاوێك دروستکردوە، جەستەی ڕێکخستووەو عەقڵ‌و ژیری پێ بەخشیوە، ڕێگای چاك‌و خراپی بۆ لێك جیاکردۆتەوە، ویست‌و ئیرادەی پێ داوە، کام ڕێگایە دەگرێ بابیگرێ، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً﴾ الإنسان/۳ بەڵێ ئادەمیزاد بەویست‌و ئیرادەی خۆی کارەکانی دەکاو بۆ خۆی لێیان بەرپرسیارە. ﴿ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ، ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ﴾ دوای دروستکردنی‌و ڕێکخستنی جەستەی بەو شێوە کە: بتوانێ پێداویستی خۆی دابین بکا، پێ بەخشینی هەستەکان‌و عەقڵ‌و ژیری بۆ ئەوەی ئامۆژگاری ببیسێ‌و بیربکاتەوەو ڕێگای ژیانی خۆی هەڵبژێرێ، ئەمجار دەیمرێنێ‌و دەیخاتە ناو گۆڕەوە ئەمەش بۆ ڕێزلێنان‌و قەدرزانییەتی: کە خودا ئادەمیزادی فێری مردو شاردنەوە کردووە، پاشان هەر کاتێك ویستی قیامەت هەڵدەسێنێ‌و مردوەکان زیندو دەکاتەوەو لە گۆڕەکانیان دەریان دێنێ بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوەو پاداش وسزا. مردن بۆخۆی نیعمەتە، عەیب‌و عاری پیری‌و نەخۆشی دادەپۆشێ لە قەبر خستنیش ڕێز لێنانە بۆ ئادەمیزاد بۆ ئەوەی درندەو باڵندە گۆشتخۆرەکان نەیخۆن‌و نەبنە مایەی بڵاوبونەوەی نەخۆشی پیس بوونی کەش وهەوا.

زیندوکردنـەوەش ئەوپـەڕی عەداڵـەتکاری‌و فـەضـڵ‌و ئیحـسانی خودایـە بـۆ ئـادەمیزاد... ئـەمجار لۆمـەی دەکـا لەسـەر کەمتەرخـەمی‌و سـپڵەو پێنـەزانینی. دەفەرموێ: ﴿كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَا أَمَرَهُ﴾ نەخـەیر، تائێـستا ئـادەمیزاد ئـەوەی فـەرمانی پێ کراوە ئەنجامی نەداوە، هیچ ئادەمیزادێك لە کەمتەرخـەمی‌و سـەر پێـچی خـاڵی نیـە، بڕێکیـان کـافرن، بڕێکیـان یـاخی بـوو تاوانکـارن، بڕێکیـان کـاری وا دەکـەن خیلافئولایەو شایستەی پلەو پایەی ئـەو نیـە. کـەم ئادەمیزاد هەیـە ئـەوەی خـودا داوای لێ کردوە ئەنجامی دابێ. بەراستی ئادەمیزاد سەیرو سەمەرەیەو جێگای سـەر سـوڕمانە، هەنـدێکیان ئینکـاری هـەبوونی خـودا دەکـەن، لـە کاتێکـدا ئـەو هـەموو بەڵگەو دەلیلـە لەسـەر هـەبوونی هـەن لـە ئاسمـان‌و زەویدا. هەنـدێکیان بەرامبـەر نیعمەتـەکانی سپڵەو پـێ نـەزانن، شـوکرو سوپاسـی ناکـەن، دەڵـێن: بەدەسـت‌و دوی خۆمان‌و لە ئاکامی هـەوڵ‌و تەقـەلڵای خۆمانـدا ئـەم شـتانەمان بـۆ خۆمـان دابـین کـردوە. هەنـدێکیان وێـڕای هـەبوونی بەڵگـەو ڕێنمـونی بـۆ خوداپەرسـتی‌و هەستکردنیان بە زیانی تاوان لە خودا یاخی دەبن.

## بڕێك لە نیعمەتەكانی خودا كە بۆ ئادەمیزادی ڕەخساندون

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَائِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَاكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٢﴾﴾

لەوەپێش هەندێ بەڵگەی لەسـەر دەسـەڵات‌و توانـای خـودا هێنایـەوە، بـڕێ لـە نیعمەتـەکانی ڕانوانـدن، ئـەمجار بـڕێ لـەو نیعمەتانـە بـاس دەکـا کـە: هـۆی درێـژە

پێدانی ژیانن‌و بەبێ ئەوان ژیان نابێ. دەفەرموێ: ﴿فَلْيَنْظُرْ الإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ﴾ با ئادەمیزاد لەو خواردەمەنییە ورد بێتەوە کەمایەی درێژە پێدانی ژیانیەتی، بڕوانێ خودا چۆن ئەو خۆراکەی بۆ بەدی هێناوە؛؛ لە هەموو جۆرە خواردەمەنی‌و خوراومیەك لە زەوییەکی ڕەق‌و تەق، ﴿أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبّاً﴾ ئێمە باران لە بەرزاییەوە دەبارێنین بارانێکی زۆر، زەوی پێ ئاو دەدەین، دەنکە تۆمەکانی پێ زیندو دەکەینەوەو چەکەرەی پێ دەکەین‌و دەیڕوێنین، ﴿ثُمَّ شَقَقْنَا الآرْضَ شَقّاً﴾ ئەمجار زەویمان قەڵشاندەوە بە قەڵشاندنەوە، هەموو ئەو گژوگیایە سەری دەرهێناو ڕوبەری زەویمان پێ ڕازاندەوە، جۆرەها درەخت‌و ڕوەك‌و گژوگیا بە جۆرەها بەروبوم‌و میوەجات‌و دانەوێڵە بە ڕەنگ‌و تام‌و بۆنی جیاجیا خۆیان نواندو بەیدەستی ئێوەی ئادەمیزاد بوون، بۆ ئەوەی لەززەتیان لێ ببینن‌و بیانکەنە بژێوی خۆتان‌و ئاژەڵەکانتان. ئەمجار پەروەدگار هەشت جۆر لە درەخت‌و ڕوەك باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبّاً﴾ ڕواندومانە لە زەوی‌داو بەدیمان هێناوە دانەوێڵە وەکوو گەنم‌و جۆو زوڕات...هتد: کە دەکرێتە قوت‌و بژێو ﴿وَعِنَباً﴾ ترێی جۆراو جۆر ﴿وَقَضْباً﴾ وێنجەو گژوگیا بۆ ئالفی ئاژەڵەکانتان ﴿وَزَيْتُوناً وَنَخْلاً﴾ هەروەها داری زەیتون‌و داری خورماشمان ڕواندوە ﴿وَحَدَائِقَ غُلْباً، وَفَاكِهَةً وَأَبّاً﴾ باخی درەخت گەورەو پڕو چڕی زۆرمان دروست کردوە، هەروەها میوەی زۆرو هەمە جۆری وەکوو سێوو مۆزو قۆخ و هەنجیرو گەلێ میوەی ترمان بەدیهێناوە، هەروەها گژوگیاو لەوەڕگای پێویستمان بۆ ئاژەڵەکانتان دروستکردوە. ﴿ أب﴾ بریتیە لە هەرچی گیاوگژ هەیە کە: ئادەمیزاد نایخواو نایڕێنێ‌و خۆراکی ئاژەڵ‌و گیانلەبەرانی ترە. ئەم گژوگیایانەمان بۆ بەدی هێناون ﴿مَتَاعاً لَكُمْ وَلآنْعَامِكُمْ﴾ بۆ ئەوەی ببنە قوت‌و بژێوی خۆتان‌و ئاژەڵەکانتان‌و سودیان لێ وەربگرن‌و لە پاساویان سوپاسی خودا بکەن!!

## روداوە سامناکەکانی ڕۆژی قیامەت

﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾ ﴾

لەوەپێش باسی نیعمەتەکانی خودای کرد بەسەر بەندەکانیدا، بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆری هێنانەوە لە بونەوەرو لە خودی ئادەمیزادەکان خۆیان لەسەر قودرەتو توانای بێ سنوری پەروەدگار، ئەمجار دیمەنو کارەساتی ئەو ڕۆژە رادەنوێنێ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بیرێك لە خۆیان بکەنەوەو لە هەڵوێستی تاوانکارنەی خۆیان پەشیمان ببنەوە، ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ کە: لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد دوو تاقمن؛ تاقمی بەختەوەران‌و تاقمی بەدبەختەکان. دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَتْ الصَّاخَّةُ﴾ کاتێك قیامەت رابوو، یان گرمەو ناڵەی قیامەت هات؛ کە گوێچکە دەهاخنێ‌و کەڕی دەکا.

هەڵبەتە وشەی ﴿الصَّاخَّةُ﴾ بەو دەنگە دەگوترێ: کە لە ئاکامی لە یەککەوتنی دووشتی ڕەقی زۆر گەورە پەیدا دەبێ، چونکە لەو ڕۆژەدا هێزی کێشندە نامێنێ، قەبارەی خۆرو مانگ‌و ئەستێرەکان لێك دەدەن، لە مەوە شاخە شاخ‌و گرمەو ناڵەیەکی وا پەیدا دەبێ هەموو گوێچکەیەك کەڕ دەکا. ئەو ڕۆژە دەستورو یاسای بونەوەر تێکدەچێ‌و کەس ئاگای لە کەس نامێنێ.

﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ، وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ ڕۆژی قیامەت ئەو ڕۆژەیە کە پیاو خۆشەویسترین کەس‌وکاری خۆی دەبینێ لەبەری هەڵدێ، لەو ڕۆژەدا پیاو لە بەر برای خۆی‌و دایك‌و باوكی‌و خێزانی‌و کوڕەکانی هەڵدێ، ڕۆژی نەفسی نەفسی‌یە، کەس وەسەر کەسی ناپرژێ، ئەو ڕۆژە هەموو ئادەمیزادێك کارو مەشغەڵەتێکی وای هەیە نایپەرژێتە سەر کەسی ترو خزم‌و خۆشەویستی بیرنایەتەوە، ئەگەر بیشیان بینێ خۆیان لێ دەشارێتەوەو لەبەریان هەڵدێ، نەوەکوو داوای شتێکی لێ بکەن، یان بۆ ئەوەی پێی نەزانن لە چ حاڵەتێکی ناخۆش‌و ریسوا ئامێزدایە، بە کورتی ئینسان لە دونیادا ئەگەر توشی ناخۆشییەك بێ، هانا بۆ خزم‌و کەس‌وکاری نزیکی دەبا بە هانایەوە بێن، بەلام لە قیامەتدا بە پێچەوانەوە ئینسان لەبەر خزم‌و کەس‌وکاری خۆی هەڵدێ، چەندێك لە ناخۆشیدا بێ هانا بۆ خزم‌و خۆشەویستەکانی نابا، نەوەکوو ئەوان داوای یارمەتی لێ بکەن‌و ئەوەندەی تر باری گرانی قورس تر بکەن! یان نەوەکوو ئەوان بەو شەرمەزارییە چاویان پێ بکەوێ!!

دەتوانرێ بگوترێ: لەو ڕۆژەدا کەس گرنگی بە کەس نادا، هەر کەسە مەشغوڵی خۆیەتی‌و ڕۆژی نەفسی نەفسی‌یە، چونکە ڕستەی ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ ئاماژە بەوە دەکا. ئەبو حاتەم‌و نەسائی تیرمیذی لە ئیبنو عبباسەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: (تحشرون حفاة عراة غرلاً) ئێوە ڕۆژی قیامەت بەپێخاوسی‌و ڕوتی‌و خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن، یەکێ لەخێزانەکانی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی لەو ڕۆژەدا عەورەتی یەکتری دەبینین؟ یان ئایا لەو ڕۆژەدا سەیری شەرمگای یەکتری دەکەین؟ لە وەلامدا پێغەمبەر (دخ) فەرمووی: ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ .

ئەمجار پەروەدگار ئادەمیزادەکانی سارای مەحشەر دەکاتە دوو تاقم‌و دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ، ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ﴾ زۆر ڕوخسارو دەم‌و چاو

گەشـاوەو درەوشـاوەن، پێدەكـەنن‌و مـژدە بەیەكـدی دەدەن‌و تـەڕ دەمـاخ‌و كـەیف خۆشن. چونكە دەزانن خـودا چ نـازو نیعمـەتێكی بـۆ دانـاون. ئەوانـە خـودا پێـداوو بەختەوەرە بەهەشتییەكانن.

﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ، تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ، أُوْلَئِكَ هُـمُ الْكَفَـرَةُ الْفَجَـرَةُ﴾ زۆر دەم‌و چـاوی تـر هـەن، لـەو ڕۆژەدا ناشـرین‌و تـەپ‌و تـۆزاوی، ڕەنگیـان ڕەش هەڵگـەڕاوەو جۆش داماون، چاو بەرەو ژێرو ڕیسوا، هیوا بـڕاوو خەفـەتبار، ئەوانـە كافرو خـودا نەناسـەكانن، ئەوانـەی بڕوایـان بـە هـەبوونی خـودا نـەبوو، پـەیامی پێغەمبـەرانی خودایان ڕەتكردەوە، تـاوانی گـەورەی تریـان ئەنجامـدا هـەم كافربون‌و هـەم فـاجر. هەڵبەتـە وێـڕای هـەبوونی ئـەم دوو تاقمـە تـاقمی تـریش هـەن كـە: نـە ئەوەنـدە بەختەوەرن نە ئەوەندەش چارە ڕەشن. هەندێكیان بە عەزابێكی كەم‌و هەنـدێكیان بـە شـەفاعەتی پێغەمبـەرو هەنـدێكیان بـە هـۆی شـتی تـرەوە كـە: خـودا بـۆ خـۆی دەزانێ، ڕزگاریان دەبێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی التكویر

ئـەم سـورەتە مەككیـەو بیـست‌و نـۆ ئایەتـە. لـە دوای سـورەتی (مسد) هاتۆتـە خوار. نـاونراوە سـورەتی تـەكویر، چونكە سـەرەتاكەی بـە ﴿إِذَا الـشَّمْسُ كُـوِّرَتْ﴾ دەستی پێ كردوە. پەیوەندی‌و موناسەبەی ئەم سورەتە بە سـورەتی پێـشوویەوە لـە چەند ڕوویەكەوەیە كە: لەبارەی ڕابوونی قیامەت‌و دیمەنە ترسناكەكاننی.

﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ٣ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ٤ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ

حُشِرَتۡ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴿١٣﴾ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴿١٤﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ ئەو کاتەی خۆر دەپێچرێتەوەو لول دەکرێ‌و نورو روناکی نامێنێ‌و نیشانەی وێرانبونوونی بونەوەرو رابوونی قیامەتە ﴿وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ﴾ کاتێك ئەستێرەکان هەڵوەرین‌و پەرت‌و بڵاوبوونەوە، ﴿وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ﴾ وەختێك کێوەکان لە بێنخ هەڵکەندران‌و بوون بە تەپ‌و تۆزو بە هەوادا رۆیەندران وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا﴾ النباء/٢٠ یان دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ وَتَرَى الأَرْضَ بَارِزَةً﴾ الكهف/٤٧ هەروەها ﴿وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ﴾ کاتێك حوشتری ئاوس‌و سکپڕ کەلای عەرەب بە نرخترین ماڵ‌و سامانە بەرەڵلا کراو گوێی پێ نەدراو کەس سەرپەرشتی نەکرد، ﴿وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾ کاتێك جانەوەران هەموویان کۆکرانەوە بۆ داداگایی کردنیان‌و تۆڵە لێ ستاندنیان، یان هەموویان مرێندران، ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ کاتێك دەریاکان بە هۆی بومەلەرزەوەو بورکانی ناو سکی زەوییەوە بوونە ئاگرو داگیرسان‌و سەر رێژیان بۆ سەر یەکتر کردو بوون بە یەکپارچە ئاگری سەرتاسەری‌و هەموو سەر زەوی بوو بە ئاگر. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ الانفطار/٣ یان دەفەرموێ: ﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾ الطور/٦.
﴿وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ ئەو دەمەی گیانەکان لەگەڵ جەستەکانیان یەك دەگرنەوەو

زیندو دەکرێنەوە. ﴿وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ، بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ﴾ کاتێك کچە زیندە بەچاڵکراوەکان زیندو کرانەوەو پرسیاریان لێ کرا بۆچی کوژراون!! لە پێش هاتنی ئیسلامدا داب‌ونەریتی هەندێ خێڵی عەرەب وابوو پێیان شەرم بوو کچیان هەبێ، بۆیە کە کچیان دەبوو بە زیندویی دەیانخستە گۆڕەوە. بە ڕاستی ئەمە گەورەترین تاوانبوو بەرامبەر مرۆڤایەتی‌و بەگشتی‌و ڕەگەزی مێینە بە تایبەتی ئەنجامیان دەدا!! ئەوە ئیسلام بوو ئەو ستەم‌و تاوانەی قەلاچۆکردن، ئازادی بە چینی ئافرەت‌و چەوساوەکانی تر داو لە زوڵم‌و ستەم رزگاری کردن، وردە وردە یاسای کۆیلایەتی‌و دەماگیری‌و خێلایەتی بنەکەن کردو هەرەسی بە کورسی‌و دام‌و دەزگای ملهوڕەکان هێنا. یاسای مرۆڤدۆستی‌و یەکسانی نێوان ئادەمیزادی دامەزراند!!!

ڕۆژی قیامەت ئەو کچۆڵە بەستە زمانانە زیندو دەکرێنەوە پرسیاریان لێ دەکرێ: لە پای چی کوژراون؟ بۆچی‌و لەسەر چی زیندە بە چاڵ کراون؟ جا کە پرسیار لە ستەم لێکراو بکرێ ئەی دەبێ پرسیارو لێکۆڵینەوە لەگەڵ ستەمکاردا چۆن بێ؟

﴿وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾ کاتێك نامەی عەمەل بەسەر ئادەمیزاددا لەسارای مەحشەر دابەش دەکرێ‌و هەر کەسە نامەی خۆی دەدرێتێ ﴿وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ﴾ کاتێك ئاسمان شەق‌و پەق بوو، داماڵێندراو لابرا هیچی لێ نەمایەوە. وەکوو چۆن ئاژەڵ کەوڵ دەکرێ‌و پێستەکەی لا دەبرێ. ﴿وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ﴾ وەختێك دۆزەخ هەڵگیرسێندراو خرایە جونبوش‌و کڵەوو جۆشی گەرمییەوە ﴿وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ﴾ کاتێك بەهەشت نزیك خرایەوە لە خوداپەرستان، ئەو کاتە ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ﴾ هەموو نەفسێك دەزانێ چی ئامادە کردووە بۆ ئەو ڕۆژەو چی نەکردووە. ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾ (الإنفطار/٥) هەموو ئادەمیزادێك ڕووبەڕووی کارو کردەوەی خۆی دەبێتەوە، دەزانێ لە دونیادا چی کردوەو چی بۆ

خۆی ئامادە کردوەو پێش خۆی ناردویەتی لە خێرو چاکە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ القيامة/٣١
ئەم دیاردانەی لەم کۆمەڵە ئایەتەدا ئاماژەیان پێ کرا، هەندێکیان پێش زیندوبوونەوە ڕوو دەدەن. هەتا لێیان وردبیەوە سامناك‌و سەرنج ڕاکێشن، ترس‌و بیم دەخەنە دڵ‌و دەروونەوەو هەست‌و خەیاڵ بۆی کۆنترۆڵ ناکرێن. هەتا بیری لێ بکەیەوە پتر سەرسام دەبێ. هەرەشەو ئینزارکردنی ئادەمیزاد بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکا بۆ ئەو ڕۆژەو هەوڵ بدا ڕێگای سەرفرازی بۆ خۆی دەستەبەربکا.

## سوێند خواردن لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتی حەزرەتی (محمد)و ڕاستی پەیامەکەی

﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾

وەكوو لەوەپێش چەند جارێك ئاماژەمان پێ كردوە لە ناو عەرەبدا واباو بووە، ئەگەر یەكێك بیویستایە لەسەر شتێكی ئاشكرا سوێند بخوا، دەیگوت: (لاأقسم) واتە: سوێندم ناخۆم چونكە شتەكە ئەوەندە ئاشكرایە، سوێند لەسەر خواردنی ناوێ. جایان وشەی (لا) زێدەیە، یان وەڵامی قسەیەكی پێشووە، یان لەسەر مانای خۆیەتی‌و بۆ نەفیە. بە كورتی رستەی (لا أقسم) سێ مانای هەیە. وەكوو لەوەپێش‌و لەسەرەتای سورەتی (القیامة)دا ئاماژەمان بۆ كرد.

دەفەرموێ: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ، الْجَوَارِي الْكُنَّسِ﴾ سوێند ناخۆم بە هەموو ئەو ئەستێرانەی بە رۆژ بە هۆی تیشكی خۆرەوە دیار نامێنن، رۆژی جارێك لەگەڵ خۆردا دەورمیەكی زەوی تەواو دەكەن‌و هەریەكەیان لە چەمەرەی خۆیدا هاتوچۆدەكا، بەشەو لە خۆر هەڵاتەوە سەر دەردێننەوە وەكوو چۆن ئاسك لە لانەو هێلانەی خۆیەوە سەر دەردێنێ پەروەدگار بۆیە سوێندی بەو ئەستێرانە خوارد چونكە لە دیاردەی بە دەركەوتن‌و خۆشاردنەوەیاندا بەڵگەی جۆراو جۆر هەن لەسەر دەسەڵاتی رەهای بەدیهێنەرەكەیان.

جەماوەری زانایان دەفەرموون: مەبەست بەو ئەستێرانە ئەستێرە گەڕۆكەكانن، هەندێكیشیان پێیان وایە جگە لە مانگ‌و خۆر هەموو ئەستێرەكان دەگرێتەوە.

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ، وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ سوێندم بە شەو كاتێك بە تاریكی خۆی هێرش دێنێ، یان كاتێك پشت هەڵدەكاو بەرەو كۆتایی دەڕوا، (هەردوماناكە دەگونجێن) سوێندم بە بەیانی كاتێك شەبەق دەداو ئاسۆ روناك دەكاتەوەو بەدەم هەموو شتێكەوە پێ دەكەنێ، ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ قورئان كەلامێكە فرستادەیەكی گەورە گەیاندویەتی، وتەیەكە جوبرائیلی ئەمین لە خوداوە بە نیگا هێناویەتی بۆ لای پێغەمبەری خودا كە حەزرەتی موحەممەدە (دخ)، قسەو ئاخاوتنی ئادەمیزاد نیە، كەلامی خودایەو بە جوبرائیلدا ناردویەتی بۆ

پێغەمبەر(دخ) تا ئەویش بە ئادەمیزادو پەری رابگەیەنێ. ﴿ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ، مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ﴾ ئەو فروستادەی قورئانی پێدا نێردراوە بۆ پێغەمبەر(دخ). کە حەزرەتی جوبرائیلە، خاوەنی هێزو توانای تەواوە، لە ژیرو بیرو تێفکریندا، خاوەنی رێزو نرخە لای خودای خاوەن عەرش‌و پلەو پایەی بەرزە، لە ناو پێڕی فریشتەی بالادا قسە رۆیشتووە، پرسی پێ دەکەن‌و بەقسەی دەکەن، لە فریشتە رێزدارو نزیکەکانی بارەگای ئەقدەسە. ئەمینداری هێنانی نیگاو سروشە بۆ پێغەمبەران‌و گەلێك کاری تریشی پێ سپێراوە. ئەمە صیفەت‌و رەوشتی فروستادەی نیگاهێنەرە کە: جوبرائیلە، ئەمجار دێتە سەر باس‌و بەیانکردنی صیفەتی نیگا بۆ هاتوو کە: حەزرەتی موحەممەدە دەفەرموێ: ﴿وَمَا صَاحِبُكُمْ بِمَجْنُونٍ﴾ ئەی دانیشتوانی مەککە موحەممەد (دخ) کە لە مێژە شارەزای ئەخلاق‌و رەوشتیی‌و پێغەمبەری ئاخر زەمانە بۆ سەر ئێوەو هەموو ئادەمیزاد رەوانەکراوە، شێت‌و وێت نیە. بەڵکوو هەڵبژاردەی ئێوەو هەموو ئادەمیزادە، عاقڵترین‌و کامڵترین ئادەمیزادە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلاَّ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ الاعراف/١٨٤ بە کورتی ئەو موحەممەدەی کە: لە منداڵیەوە دەیناسن‌و شارەزای رەوشت‌و هەڵس‌وکەوتینی، لەسەرەخۆو ژیرو عاقڵ‌و هۆشمەندە، تا ئێستا هیچ خراپەیەکتان لێ نەدیوە، ئێستا کە تەمەنی چل ساڵەو دەڵێ: پێغەمبەری خودام‌و باسی رۆژی دواییتان بۆ دەکاو مژدەی بەهەشتتان پێ دەداو لە عەزابی دۆزەخ دەتانترسێنێ، بەلگەو دەلیلی بە هێزی بە دەستەوەن‌و موعجیزەی گەورە دەنوێنێ. چۆن پێی دەڵێن: شێتە، بە چ عەقڵێك قورئان بە سیحر دەزانن‌و چۆن دەڵێن جندۆکەو شەیاتینی فێری دەکەن؟

﴿وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ﴾ بێگومان حەزرەتی موحەممەد جوبرائیلی لەسەر شێوەی خۆی بینی شەش سەد باڵی هەبوو، لە ئاسۆی روناك‌و ئاشکراوە چاوی پێکەوت، لە ئاسۆی خۆرەوە لەلای خۆر هەڵاتەوە بینی‌و زانیاری تەواوی بۆ پەیدا

بوو کە: ئەو زاتە فریشتەی خودایەو نیگای بۆ دێنێ. ئەم بینینەی پێغەمبەر (دخ) کە: جوبرائیلی بینی دوای بینینی یەکەمجارو سەرەتای هێنانی نیگایە. کە لە خوار ئەشکەوتی حیرادا بینیو چاوی پێکەوت. هەندێك پێیان وایە: ئەم بینینە لە لای (سورة المنتهی) بووە. وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى، أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى، وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى، عِندَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى﴾ النجم/١١-١٤ .

﴿وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ﴾ موحەممەد(دخ) دەربارەی ئەو نیگاو سروشەی لە خوداوە بۆی دێ رژدو چروك نیە، کەمتەر خەم نیە لە گەیاندنو فێرکردنی نیگاو سروشدا بەرێکوپێکیو بەدڵسۆزی ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دەدا. ئەحکامی ئایین فێری مەردووم دەکاو هیچی لێ زیادو کەم ناکا، بتمانە پێکراوەو لە خۆیەوە هیچ نالێ، هیچی لێ ناگۆرێ. ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَانٍ رَجِيمٍ﴾ قورئان قسەی شەیتان نیە، شەیاتینی نەیان دزیوەو بە تیر ئەستێرە رەجم کرابن، قورئان کە: پەیامی موحەممەدە نەشیعرەو نەسیحرەو نە فاڵو کۆڵەوە نانێیە. وەکوو ئێوە بوختانی بۆ دەکەن. بەڵکوو نیگاو سروشی خودایە بە جوبرائیلدا بۆی ناردوە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ، وَمَا يَنبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ، إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ الشعراء/٢١٠-٢١٢ ﴿فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ﴾ بۆ کوێ دەڕۆنو چ رێگەیەکی ناقوڵا دەگرنە بەر؟ پێغەمبەر(دخ) لەکوێو ئەم بیرو بۆچوونە ناقوڵایانەی ئێوە لە کوێ؟! چۆنو بەچ عەقڵێك قورئان بەدرۆ دەخەنەوە؟! لە کاتێکا ئاشکراو نمایانە کە: قورئان حەقەو لە خوداوە هاتووە. ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ، لِمَنْ شَاءَ مِنكُمْ أَنْ يَسْتَقِيمَ﴾ ئەم قورئانە ئامۆژگاریو بیرخەرەوەی ئادەمیزادە بە گشتی، بیر هێنەرەوەی ئادەمیزادە بۆ شتێك کە: لە سروشتیان دا هەیە کە: بریتیە لە چاکە، وەلێ ئارەزۆبازیو بانگەشەی کوفرو ئیلحادو نەخۆشیە کۆمەلایەتیەکان لە یادیانی بردۆتەوە. بیرخەرەوەیە بۆ کەسێك کە: بیەوێ رێبازی راست بگرێتەبەر، بۆ خۆیان ئامادەباشیان تێدایە بۆ چاکەو

چاکەکاری حەزیان لێیە پابەندی حەقو خوداپەرستی بن. بەڵام ئەوانەی بۆ خۆیان ئامادەباشی چاکە کردنیان تێدانیەو هەمیشە بەندەی گوێ لە مستی ئارەزۆ کانیانن ئەوانە قورئان کاریان تێناکاو لە خەوی گرانی خۆیان بێداریان ناکاتەوە. ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلآ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ ئێوە ئەی موشریکەکان ئارەزۆی ڕێبازی حەقو ڕاست ناکەن، مەگەر خودای بونەوەر حەز بکا ڕێگای ڕاست بگرنەبەر واتە: بە زۆر بتخاتە سەر ڕێبازی ڕاست. بەم ڕەنگە لە ئاسمانەوە یەکە یەکە نامەتان بۆ بنوسرێ بە پێتو نووسینی ڕەوان تێیدا نوسرابێ لە خوداوە بۆ فلانی کوڕی فلان. موحەممەد پێغەمبەری منەو باوەڕی پێ بکە. پەیامەکەی ڕاستەو پەیڕەوی بکە. ئەگەر وابوایە هەموو کەسێك بە ناچاری بڕوای بە پێغەمبەر دەکرد ئەو کاتە ئیختیارو سەر بەخۆیی مرۆڤ لە ئیمانهێنانەکەدا دەما. دەی خۆ ڕۆژی قیامەت سزاو پاداشی بەری ئەو کردەوانەیە کە: مرۆڤ بە ئارەزوی خۆی ئەنجامیان دەدا.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ڕاستییەك بکەینو سەرنجێك لە ئایەتی ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ بدەین. ئاشکرایە ئەم سورەتە هەمووی مەککییەو لە مەککە هاتۆتە خوارێ، ئەم ئایەتەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بانگەوازی ئیسلامی هەر لە سەرەتاوە بانگەوازێکی جیهانی بووەو ئاڕاستەی هەموو کەس کراوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەمکوتانەوەی دوژمنانی ئیسلامو پێغەمبەرە (دخ) ڕەتکردنەوەی بیروبۆچوونی هەموو ئەوانەیە کە دەڵێن: پێغەمبەر (دخ) تا لە مەککە بووەو موسوڵمانان بێ هێزبوون هەر ئیدیعای پێغەمبەرایەتی عەرەبەکانی کردووەو خۆی بە پێغەمبەرێکی ناوچەییو نەتەوەیی لە قەڵەم داوە، دوایی کە کۆچی کردوە بۆ مەدینەو موسوڵمانان بە هێزبوون، ئەمجار ئیدیعای پێغەمبەرێتی هەموو جیهانی کردوە! بەڕاستی ئەم ئایەتەو نمونەکانی بەڵگەیەکی بەهێزن بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو جۆرە بۆچوونانە، ئەگەر وابوایە دەبوو ئەو جۆرە هەر لە سورەتە

مەدینەیی‌یەکاندا هەبوونایە بەڵام ئەوەتا لە سورەتە مەککییەکانیشدا ئەم جۆرە ئایەتانە هەن‌و هەندێکیان هەر لەسەرەتای هاتنە خوارەوەی قورئان‌و پەیدابوونی ئیسلامدا هاتوونە خوارێ، وەکوو لەم سورەتەداو لە سورەتی (یوسف، ص، قلم)دا دەبیندرێن. بەتایبەتی سورەتی قەڵەم کە: لە بەرەبەیانی هاتنە خوارەوەی قورئاندا هاتۆتە خوارێ.

## سورەتی الانفطار

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ (١) وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ (٢) وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ (٣) وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ (٤) عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ (٥) يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ (٦) الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ (٧) فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ (٨)﴾

ئەم سورەتە مەککییەو نۆزدە ئایەتەو دوای سورەتی (نازعات) هاتۆتە خوارێ. ناوی نراوە سورەتی (الانفطار) چونکە بە ئایەتی ﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ﴾ دەستی پێ کراوە. ئەم سورەتەش وەکوو سورەتی تەکویر باسی دیمەن‌و رووداوەکانی رۆژی قیامەت دەکا کە: بڕوابوون پێیان بە شێکن لە بنەمای عەقیدە. دەفەرموێ: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ، وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾ وەختێک ئاسمان شەقار بوو، بەم

رەنگە هێزی کێشندە نەماو دەستووروو یاسای ئاسمانەکان تێکچوو، ئەو کاتە ئەستێرەکان ـ دوای شەقبوونی ئاسمان ـ لێك بڵاوبوونو هەڵوەرین دیارە ئەو کاتە زەویش دەکەوێتە جونبوش‌و تەکاندان‌و بەیەکا هاتن، دەریاکان دەکەونە شەپۆلدان‌و تێکەڵاو بەیەکتر دەبن‌و زەوی دادەپۆشن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ ئەو کاتەی دەریاکان تێکەڵ بەیەك دەبن‌و سەراپا گڕ دەگرن‌و دەبنە یەکپارچە ئاگر، ﴿وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ﴾ گۆڕی مردوەکان هەڵەو گێڕا کران، چی لەناو سکی زەویدایە لە مردو دەر دەکەوێ‌و مردووەکان زیندو دەکرێنەوە، واتە: کە ئەم روداوە سامناکانە رویان داو ئەم نیشانانەی رابوونی قیامەت هاتنەدی، بە تەواوی بونەوەر تێکچوو ئەوکاتە ﴿عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾ هەر کەسە کردەوەی خۆی دێتەوەرێ‌و دەزانێ چ کردەوەیەکی لە پێش خۆیدا ناردوە لە خێرو شەڕ. چی دوا خۆی خستووە بە شوێنیدا بچێ!! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾ القيامة/١٣.

دوای بەیانکردنی شێوەی دونیا وێرانبون‌و رانواندنی هەندێ لە دیمەنەکانی؛ ئەمجار پەروەدگار سەرزەنشتی ئادەمیزاد دەکا لەسەر کەمتەرخەمی‌و تەمبەڵی لە ئەنجامدانی کاری خێرو سپڵەیی‌و ئینکاریکردنی لە بەرامبەر نیعمەتەکانیدا. دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ، الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ ئەی ئادەمیزاد کە: بەهۆی ژیری‌و لێهاتوییتەوە بویتە جێنیشینی خودا لەسەر زەوی، چی تۆی فریو داوەو چۆن جەسارەتی ئەوە دەکەی لە خودای کەریم‌و بەخشندەی خۆت یاخی ببێ، ئەو خودایەی لە دڵۆپە ئاوێك دروستی کردوی‌و رێکی خستوی بەژن‌و باڵای جوان‌و رەنگ‌و روخساری شیرینی پێ بەخشیوی. لە جوانترین شێوەو دیمەندا دروستی کردوی. هەست‌و شعورو عەقڵی پێداوی ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ لە جوانترین‌و رێك‌وپێکترین شێوەیەك کە: خودا خۆی پەسندی کردووە پێکی هێناوی ئەتۆ بۆ خۆت شێوەو روخساری خۆت هەڵنەبژاردووە

پەروەدگار بەو جوانیو قۆزییە دایڕشتووی. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لقد خلقنا الانسان فی أحسن تقویم﴾ التین/٤. دەی خودایەك ئەوەندە بە رەحمو خاوەن بەزەیی بێ، ئەو هەموو نیعمەتە جۆراو جۆرانەی بەسەردا رشتووی. چۆن هەروا بەرەڵلات دەکاو وازت لێ دێنێ چۆن پاداشتی چاکەو تۆڵەی خراپەت لێ ناسێنیتەوە.

## سپڵەیی ئادەمیزادو نینکاری کردنیان بۆ نیعمەتەکانی خوداو چاودێری فریشتە بەسەریانەوە

﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِنَفْسٍ شَيْئًا ۖ وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ ﴿١٩﴾﴾

لەوەپێش نیشانەکانی رابوونی قیامەتی بەیانکردن، نیعمەتەکانی خۆی بەسەر بەندەکانی ژماردن، سپڵەیی ئادەمیزادی بەرامبەر ئەو نیعمەتانە راگەیاند؟ ئەمجار هۆکاری ئەو سپڵەییە دیاری دەکا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ﴾ ئێوە چی تر بە کەرەمو لێبوردەیی خودا لێتان لە خۆتان بایی مەبن، مۆڵەتدانی خودا

مەكەنە هۆی درێژە دان بـە كوفرو ئیلحاد، هیـچ هۆكارێـك نیـە بـۆ یـاخی بونتـان، ئەگەر بە تەما میهرەبانی خودان، دەبوایـە میهرەبـانی خـودا كێشتان بكا بـۆ بـڕوا كردنو ئیمانهێنان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی. كەچی ئەوەی لێی نەترسـنو بـیری لێ نەكەنەوە ڕۆژی قیامەتە. بەڵكوو هاتنی ڕۆژی قیامەت بەدرۆ دەزانـن، ترسـی سـزاو تۆڵەی ئەو ڕۆژەتان نیە، ئەگینا دەبوایە داچڵەكینایەو لەترسی حیسابو سزای ئـەو ڕۆژە خۆتـان لـە خراپـەكاری بپاراسـتایە، دەبوایـە ترسـی عـەزابی ئـەو ڕۆژە ئێـوەی هەڵبنایە بۆ ئیمانهێنانو خودا پەرستی!

ئەمجار هەڕەشەی زیاتریان لێ دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَـيْكُمْ لَحَـافِظِينَ، كِرَامـاً كَـاتِبِينَ، يَعْلَمُـونَ مَـا تَفْعَلُـونَ﴾ بێگومـان بەسـەرتانەوە هەیـە چـەند فریـشتەیەكی ئاگـادارو وریـا، دەرونیـان پـاكو بـێ گـەردە هیـچیان لـەبیر ناچـێو لێ تێـك ناچـێ، كـەوابێ كـاری ناشـرین ئـەنجام مـەدەن، چـونكە هەرچـی بكـەن، لەسـەرتانی تۆمـار دەكـەن، گوفتـارو كردەوەتـان دەنووسـن، هەرچـی بكـەن لـە چـاكەو خراپـە ئەوانـە ئاگـادارنو پێـی دەزانـن! وەكـوو لـە ئایـەتێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿عَـنِ الْـيَمِينِ وَعَـنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ، مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيـدٌ﴾ق/١٧-١٨ ئیبنـو ئـەبی حاتـەم لە موجاهیدەوە نـەقڵ دەكـاو دەڵـێ: پێغەمبـەر (دخ) فەرموویـەتی: (اكرمـوا الكـرام الكاتبين، الذين لايفارقونكم الا عند احدى حـالتين: الجنابـةو والغـائط. فـأذا أغتـسل أحـدكم فليـستتر جـرم حـائط أو بعـيرة، او ليـستره أخـوه )[٤] ڕێـز لـە فریـشتەی سەرشانتان بگرن! كە لێتان جیانابنەوە مەگەر لە حاڵەتی لـەش پیـسیو دەسـت بـە ئـاو گەیانـدنـدا هـەركاتێ خۆتـان شوشـت دیوارێـك یـان شـتێكی تـر بكەنـە پـەردەو حەشارگە، یان بایەكێك پەردەت بۆ بگرێتەوە. پێویستە هەموو موسوڵمانێك بڕوای وابێ كە: هەرچی كـردارو گوفتـاری بەنـدەكان هەیـە لەلایـەن فریـشتەكانەوە تۆمـار دەكرێو لە خودا گوم نابێ، ڕۆژی قیامەت كەس ناتوانێ حاشا لە هیچ كردەوەیـەكی

[٤] ئەم فەرمودەیە تیرمذی لە (كتاب)ی (الادب) دا (٤٤) حدیثی ژمارە (٢٨٠٠) ریوایەتی كردوە

بکا، ئیتر پێویست ناکا ئێمە بزانین ئەم تۆمار کردنە چۆنەو چۆن نیە. ئەوە شتێکی غەیبی‌یەو هەر خودا دەزانێ چۆنەو ئەنجامدانیشی بۆ خودا کارێکی ئاسانە.

ئەمجار لەو رۆژەدا ئادەمیزاد دەبنە دوو تاقم، پێرێکیان بەختەوەرو خۆشنود، کۆمەڵێکیشیان بەدبەختو چارەڕەش، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ، وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ، يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ﴾ خوداپەرستانو چاکان لەناو بەهەشت دان. رۆژی جەزا دەچنە ناوییەوە، بە ئاگری سوتێنەری دۆزەخ دەسوتێندرێنو عەزابی سەختو دژواری دەچێژنو رزگار بوونیان نیە. ئەمەش لە تۆڵەی هەڵوێستی ناشرینو بەدرۆخستنەوەیان بۆ پەیامی پێغەمبەر! ﴿وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ﴾ ئەوانە لە دۆزەخ جیانابنەوەو عەزابی سەختو دژواریان لە کۆڵ نابێتەوەو بۆشیان سوکو کەم ناکرێتەوە، بەڵکوو بۆ هەتاهەتایی تێیدا دەمێنەوە وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ﴾ البقرة/١٦٧. ئەمجار وەصفێکی کورتی سامناکی رۆژی قیامەت دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ، ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ؟﴾ ئەتۆ چوزانی رۆژی قیامەت چۆنە، رۆژی سزاو تۆڵە چیە؟ دووبارە تۆ چی لە رۆژی پاداشو سزا دەزانی؟ دووجار رستەکەی دووبارە کردەوە بۆ زێدە گرنگی پێدانو سامناکی، ئەگەر ئادەمیزاد بەراستی هەستی بە ترسناکی ئەو رۆژە بکردایەو بیزانیایە بەلاو کارەساتەکانی چۆنن، ساتە وەختێك لە طاعەتی خودا بێ ئاگا نەدەبوو؛ بەتەواوی لە تاوانو ستەمکاری دوور دەکەوتەوە، وەڵێ ئادەمیزاد لە غەفڵەتو بێ ئاگایی‌دا دەژیو پشت بە خەیاڵو هیوا دەبەستێو لە واقیع هەڵدێ. ئەگینا دەبوایە زۆر بەجیددی خۆی بۆ ئەو رۆژە ئامادە بکردایەو تێشووی پێویستی بۆ ئەو سەفەرە ئامادەبکردایە، ﴿يَوْمَ لا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئاً وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾ ئەو رۆژە رەشو سامناکە رۆژێکە هیچ کەس ناتوانێ یارمەتی کەس بدا، کەس ناتوانێ خۆی لەتەنگو چەڵەمەکانی بپارێزێ، کەس ناتوانێ شەفاعەت بۆ یەکێکی تربکا، مەگەر خودا ئیزنی بداو رازی بێ بە

شـەفاعەتکردنەکە. کـەس نـاتوانێ بڕیـاری هـیچ شـتێك بـدا، هـەر خـودا خـۆی فەرمانڕەواو خاوەن دەسەڵاتی رەهایـە، ئـەو رۆژە هـەموو شـتێك بەدەسـت خودایـە، هەموو کارێك بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە.

قەتادە دەڵێ: سوێندم بـە خـودا ئـەمڕۆ لـە دونیاشـدا هـەموو شـتێك بەدەسـت خودایە، وەلێ لە دونیادا بەڕواڵەت ئادەمیزاد خۆی بە خاوەن بڕیار دەزانێو هەندێ جار بەربەرەکانی خودا دەکا. بەڵام لە رۆژی قیامەت دا هـیچ فـزەی لێ نایـەو کـەس خۆی بە خاوەن بڕیار نازانێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی المطففين

ئەم سورەتە لە سورەتە مەککییەکانەو سی‌و شەش ئایەتـە، دوا سورەتیـشە کـە: لە مەککە نازڵ بووبێ. هەندێکیش پێیان وایە: یەکەم سورەتە کە لە مەدینـە نـازڵ بووە. ناو نراوە سورەتی (المطففین) چونکە بـە رسـتەی ﴿وَيْـلٌ لِلْمُطَفِّـفِينَ﴾ دەسـتی پێکراوە، موناسـەبەو پەیوەنـدی ئـەم سـورەتە بـە سـورەتەکەی پێـشووی، لـە چـەند رویەکەوەیە:

١. لەکۆتایی سورەتی پێشوودا هەڕەشەی توندی لە یاخی بوان‌و کافرەکان کـرد، بـەوە کـە فـەرمووی: ﴿يَـوْمَ لا تَمْلِـكُ نَفْـسٌ لِـنَفْسٍ شَـيْئاً ...﴾ لەسـەرەتای ئـەم سورەتەشدا هەڕەشەی توندی ئاراستەی بێ بڕواو تەرازو بازەکان کـردوە فـەرمووی: ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ﴾.

٢. لـە سـورەتی پێـشوودا باسـی ئـەو فریـشتانەی کـرد کـە: کـردەوەو گوفتـاری ئادەمیزاد تۆمار دەکەن. فەرمووی: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ، كِرَاماً كَـاتِبِينَ﴾ لێرەشـدا باسی نووسراوەکەی کردو فەرمووی: ﴿كِتَابٌ مَّرْقُومٌ .....﴾.

٣. هـــەردوو ســـورەتەکە دیمەنـــەکانی رۆژی قیامـــەت رادەنـــوێنن.

## هەڕەشە لە تەرازوبازان

﴿وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ٣ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ٤ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦﴾

نەسائیو ئیبنو ماجە بە سەنەدو ریوایەتێکی راست، لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکاو دەڵێ: کە پێغەمبەر(دخ) گەیشتە مەدینە، تەرازو بازییان تێدا بوو! بەڵکوو زۆر زێدە رەوییان تێدا دەکرد، ئیتر کە ئایەتی ﴿وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ﴾ نازڵبوو، وازیان لەو کارە دزێوەی خۆیان هێنا، کێشانەو پێوانەی خۆیان رێك خستن.

(السدی) دەڵێ: لە مەدینەدا پیاوێك هەبوو ناوی ئەبو جوهەینە بوو، دوو ئامێری پێوانەو کێشانەی هەبوون، ئەگەر شتی بکڕیایە بە ڕبەو قسناغو حوققەی گەورە پێوانەو کێشانەی دەکرد ئەگەر بیفرۆشتایە بە ئامێرە پچوکەکە دەیدانێ ئیتر ئەم سورەتە کە دوا سورەتی مەککیە نازڵ بوو، کەوابێ بە قسەی ئیبنو مەسعودو (الضحاك)و موقاتیل ئەم سورەتە مەککیە، بە قسەی (الحسن)و عیکریمە سورەتەکە مەدەنییە، ریوایەتکراوە کە: پێغەمبەر(دخ) کە گەیشتە مەدینە، دانیشتوانەکەی خراپترین کۆمەڵ بوون لە بارەی تەرازو بازییەوە، ئیتر ئەم سورەتە نازڵ بوو، جا خەڵکەکەی وازیان لە تەرازو بازی هێنا. بە گوێرەی ئەم ریوایەتە، سورەتەکە مەدەنی یە یان مەککییەو پێغەمبەر(دخ) کە گەیشتە مەدینە بەسەر دانیشتوانەکەیدا خوێندەوە.

﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ﴾ شیوی ناخۆشی پڕ عەزابی دۆزەخ بۆ ئەوانەی لە کڕین و فرۆشتندا تەرازو بازی دەکەن. ربەو قسناغ کیلۆو حوققە تەغاریان کەم و زیادی تێدایە. ئەمجار پەروەدگار بۆ خۆی تەفسیری ﴿ المطففین﴾ دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾ تەرازوباز ئەوانەن ئەگەر شتومەك لە خەڵك وەربگرن بەباشی کێشانەو پێوانەی دەکەن و پڕاوپڕ یان زیاد لە مافی خۆیان وەردەگرن، خۆ ئەگەر شت بە غەیر بفرۆشن لە کێشانەو پێوانەدا کەمیان دەدەنێ و لێیان دەدزنەوە.

وادیارە لەسەروبەندی هاتنی ئایینی ئیسلام دا دیاردەی تەرازو بازی زۆر بە زەقی لە ناو بازاڕەکانی مەککەو مەدینەدا باو بووە، بازرگانەکان دەسەڵاتێکی تەواویان هەبوەو بە ئارەزۆی خۆیان کە: شتیان کڕیوە بەزیادەوە پێوانەو کێشانەی ئەو کاڵایەیان کردوە کە کڕیویانە، کاتێکیش شتیان فرۆشتووە کەمیان بۆ کڕیارەکان کێشانەو پێوانە کردوە، بە کەڵەگایی ستەمیان لە ڕەشە خەڵکەکە کردوەو کەس نەیوێراوە فزرە بکاو بە ناچاری زۆریان داوەو کەمیان وەرگرتووە.

لەراستیدا ئاینی ئیسلام زۆر دژی تەرازوبازی و ئەو زوڵم و ستەمەبوو کە: بازرگانە بێ ویژدانەکان لە ڕەشە خەڵك و بۆرە پیاوەکانیان دەکرد، بۆیە هەر چەندە هێشتا ئیسلام خۆی دانەکوتابوو جڵەوی فرمانڕەوایی و بەڕێوە بردنی بەدەستەوە نەگرتبوو، بەڵام هەر زوو بەم سورەتەو چەند ئایەتێکی تر خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە بازرگانەکانە سامانپەرستەکانی راچڵەکاندو هەڕەشەی توندی لێ کردن و فەرمووی: ﴿أَلا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ، لِيَوْمٍ عَظِيمٍ، يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئایا ئەو تەرازو بازانە پێیان وانیە کە لە ڕۆژێکی سامناك و کارەساتباردا زیندو دەکرێنەوە نازانن کە: لە ڕۆژێکی بەڵاوای و پڕ مەینەتدا، زیندو دەکرێنەوەو دەبرێنە بەردەم خودایەکی خاوەن دەسەڵات و زاناو بە توانا! بێگومان ئەوانە زیندو دەکرێنەوە لە ڕۆژێکدا تابڵێی سەخت و دژوارە، مەردوم هەمووی

ڕوتو پێخاوس چاوەڕوانی بڕیاری خوداو حیسابو لێکۆڵینەوەن.. ئاشکراشە کە: ئەم هەڕەشەیەی قورئان لە تەرازوبازیو تەرازوبازان، بەڵگەیە لەسەر گەورەیی تاوانی تەرازو بازیو تۆڵەی سەختو دژوار لەسەری، چونکە لە حەقیقەتدا تەرازوبازی خیانەتە لە ئەمانەتو خواردنی ماڵو سامانی خەڵکە بە ناحەق. چەوساندنەوەی هەژارو بێ نەوایانە، ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە: (تطفیف) تەرازوبازی زۆر شت دەگرێتەوە، وەکوو دەرخستنی عەیبو عار لە ماڵی خەڵكو شاردنەوەی هەمان عەیبو عار لە ماڵی خۆیدا....هتد.

## سجیلو دۆسیەی تاوانباران

﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ ﴾

لەوەپێش باسی گەورەیی تاوانی تەرازوبازی کرد، ئەمجار بە ئوسلوبێکی سەرنج ڕاکێش موشریکەکان هەڵدە سڵەمێنێتەوەو ئەوە بەیان دەکا کە: هەرچی

کردەوەیەکی ئادەمیزاد لە دونیـادا دەیکـا، لای خـودا لـە سجیلێکی تایبـەتیـدا تۆمـار دەکرێو رۆژی قیامەت لەسەر ئەو کردەوانە سزاو پاداشیان دەدرێتەوە.

دەفەرموێ: ﴿كَـلاَّ﴾ تـەرازوبازی مەکـەن، واز لـەو کـارە ناشـرینـەتان بێـنن، لـە زیندوبوونـەوەو رابـوونی قیامـەت غافـڵ مـەبن. ﴿إِنَّ كِتَـابَ الفُجَّـارِ لَفِـي سِـجِّينٍ﴾ بێگومان نامـەی عەمـەلی تاوانبـاران ـ بـە تەرازوبازانیـشەوە ـ لـە دەفتـەرێکی ڕەش‌و تاریکدایـە، دەفتـەری شـەڕو دۆسـیەی تاوانبارانـە، ﴿وَمَـا أَدْرَاكَ مَـا سِـجِّينٌ﴾ ئـەتۆ چوزانی ئەو دەفتـەرە ڕەش‌و ناشـرینە چ دەفتـەرێکی شـومو نەگڵەوەتـە، نـاوی هـەر کەسـێکی تێـدابێ بـەد بـەختو چارەڕەشـە...! ﴿كِتَـابٌ مَرْقُـومٌ﴾ دەفتـەرێکی نووسراوی نیشانەکراوە بەوەی کە: دەفتەرێکی تۆڵەو سزایە، نـاوو کـرداری هـەموو کافرو ستەمکارو تاوانباری لە خۆ گرتـووە لـە ئـادەمیزادو شـەیاتینی، ئـەم تـەعبیرە لەم ڕووەوەیە کە دەڵێن: نـاوی فلان کـەس چـووە نـاو دەفتـەری ڕەشـەوە لـە سجیلی ڕەشدا ناوی نوسراوە!

هەندێکیش پێیان وایە: (سجين) شوێنێکە لە نـاو دۆزەخـدا دەکەوێتـە (بنکڵـی) یەوە، واتە: دەق (سجين)و (أسفل السافلين) دوو ناوون بۆ یەك شوێن!

بۆیە موحەممـەدی کـوڕی کـەعبی قـورەظی، دەڵـێ: ڕستـەی ﴿كِتَـابٌ مَرْقُـومٌ﴾ تەفسیری ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا سِـجِّينٌ﴾ نیـە. بـەڵکوو ﴿كِتَـابٌ مَرْقُـومٌ﴾ بـەم مانایـە کـە: سەرەنجامیان بۆ ناو بنکڵی دۆزەخەو بڕیارێکە بۆیان دراوەو بڕاوەتەوەو زیـادو کـەم نـاکرێ. ﴿وَيْـلٌ يَوْمَئِـذٍ لِلْمُكَـذِّبِينَ﴾ شـیوی دۆزەخ یـان عـەزابی بـە ئـێش لـە ڕۆژی قیامەتـدا بـۆ ئەوانـەی پێغەمبـەران بـە درۆ دەخەنـەوەو ڕۆژی قیامـەتو زینـدو بونەوەیان بەلاوە پەشمـە! ﴿الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الـدِّينِ﴾ ئەوانـەی بڕوایـان بـە ڕۆژی سزاو پاداش نیەو ڕابوونی قیامـەتیان بـەلاوە دورەو هـیچ ئامـادە باشـی بـۆ نـاکەن‌و خۆیانی بۆ حازر ناکەن! ﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلاَّ كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ، إِذَا تُتْلَـى عَلَيْـهِ آيَاتُنَـا قَـالَ

أَسَاطِيرُ الآوَّلِينَ﴾ هیچ کەس رابوونی قیامەت بە درۆ نازانێ، مەگەر کەسانێك کە ڕەوشتی ناشرینیان تێدابن.

١. دەستدرێژیکارو ستەمکارو سنوور بەزێن بێ،

٢. لە تاوانو تاوانکاریدا نەغرۆ بووەو هەرخەریکی حەرامو خراپە کارییەو کارێکی حەڵاڵو موباح ناکا.

٣. هەر کاتێك قورئانی بەسەردا بخوێندرێتەوە دەڵێ: ئەمە نامەی ئاسمانیو کەتەلۆکی بوونەوەرو بەرنامەی ژیانە. دەرمانی هەموو دەردێکی دەروونیو ڕەوشتیو کۆمەڵایەتییە، هەر کەسێك پەیڕەوی بکا لە هەر دوو دونیادا سەر فرازو بەختەوەرە وەڵێ ئەو موشریكو نەفامانە بە هۆی دابونەریتی ناشرینو لاسایی کردنەوەی بابو باپیرانیان، ڕەوشتو خۆی خراپی خۆیان وەکوو پەردەی ڕەش دڵو دەروونی داپۆشیون، ستەمو تاوانکاریان بووەتە لەمپەرو ناهێڵێ بڕوا بە قورئان بکەن. دەرگاو پەنجەرەی دڵو دەرونیانیانی هاخنیوە، ملەمای لێ بڕیون نورو روناکی ئایین ناچێتە ناو دڵیانەوە.

ئیبنو جەریرو ئەحمەدو تیرمیذیو نەسائی لە ئەبو هوریرەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: هەرکاتێ بەندە تاوانێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێ، جا ئەگەر تۆبەو ئیستیغفاری کرد، دڵی مشتو ماڵ دەبێو پاك دەبێتەوە ئەگەر تاوانێکی تری کرد خاڵە ڕەشەکەی زیاد دەبێ، تا دڵی دادەپۆشێ ئا ئەومیە کە خودا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾.. حەسەنی بەصری دەفەرموێ: وشەی ﴿رَانَ﴾ کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، بەمانا (تاوان لە سەر تاوان)ە بە جۆرێك چاوی دڵ کوێر بکا. ﴿كَلاَّ إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ﴾ نەخەیر وانیەو ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا پلەو پایەی بەرزیان نادرێتێ بەڵکوو ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە شوێنی پەستو ناخۆشدا دەبن، لە ڕەحمو بەزەیی خودا بەهرەوەر نابن بە پێچەوانەی موسوڵمانەکانن ئەمان

تەماشای خودا دەکەن‌و لەززەتی لێ وەردەگرن، خودا لە گەڵیان میهرەبان‌و بەلوطفە.

بەڵام ئەوان چەنکە لە دونیادا خودایان نەناسیوەو بەندایەتییان بۆ نەکردوە، لەو ڕۆژەدا لە بینینی پەروەردگاریان بێ بەشن، ﴿ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ﴾ ئەوانە لە پاش ناهومێدیەکی ئێجگاری‌و دڵنیا بوونیان لەوەی کە: ڕەحمەتی خودا نایانگرێتەوە، داخڵی ئاگر دەبن، دەبنە ئاگرنیشین‌و لێی دەرناچن، ئازاری دژوارو سەختی دۆزەخ دەچێژن بۆ هەتاهەتایە، ئەمجار بە شێوەی سەرزەنشت‌و ڕیسوا ئامێزەوە سەر کۆنە دەکرێن. دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُقَالُ هَذَا الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ واتە: پاشان لە لایەن بەرپرسانی دۆزەخەوە پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەو عەزاب‌و سزایەیە کە: لە دونیادا ئێوە بڕواتان پێ نەبوو، بە درۆتان دەزانی، دەبخۆن ئەوە دەرتان بێ‌و ئەم شوێنەتان پیرۆز بێ!!!

## سجیلی چاکان‌و حاڵ‌و وەزعی خوداپەرستان لە قیامەتدا

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ

فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾

لەوەپێش هەڕەشەی لە تەرازووبازانو ئەوانەی رابوونی قیامەت بە درۆ دەزانن کرد، بە شوێن ئەوەدا حاڵو وەزعی بەختەوەران بەیان دەکا؛ ئەوانەی بڕوایان بە خوداو بە پێغەمبەرو بە رابوونی قیامەت هەیە. لە ژیانی دونیایان دا کردەوەی باشیان ئەنجام داوە، باسی وەزعو حاڵو پلەوپایەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ حەقو راستەو گومانی تێدا نیە، ﴿إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾ بێگومان نامەی کرداری خوداپەرستان لەناو دەفتەرێکی گەورەو بەرزدایە، بە نووسینی گەورەو خۆشخوێن نووسراوە، یان دەفتەرەکەیان لەلای ژووروووی بەهەشتە. ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ، كِتَابٌ مَرْقُومٌ، يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ﴾ تۆ چوزانی ﴿عِلِّيُّونَ﴾ چیە؟ ئەو سجیلو دۆسیەیە زۆر بەرێزو بەرزو پیرۆزە. نامەو دەفتەرێکی نوسراوە، ناوو کردارو گوفتاری بەندە خوداپەرستەکانی لە خۆگرتووە، هەرکەسێ ناوی لەوێدا تۆمار کرابێ بەختەوەرو سەرفرازە، دەفتەرێکی گەورەو نیشانە کراوە بەوەی تایبەتە بە چاکانەوە، دەستە دەستەو پۆل پۆل فریشتە تەماشای دەکەن، ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ، عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ بێگومان خوداپەرستو کردار چاکو بەندە موخلیصەکان لە رۆژی قیامەتدا لە ناو نازو نیعمەتی جۆراو جۆردان، لە ناو بەهەشتی ڕازاوەو بەریندا، لەسەر کورسیو قەنەفەو موبیلە دادەنیشنو پاڵ دەدەنەوە، سەیری ئەو هەموو نازو نیعمەتانە دەکەن کە؛ خودا بۆی ئامادە کردون، هەست بەو رێزو پلەو پایە مادیو مەعنەوییانە دەکەن کە؛ خودا بۆی ئامادە کردونو پێی بەخشیون چاویان لە تەماشاکردن تێرنابێو کەیفو شادییان دوای نایە. ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ﴾ هەر کاتێ بیان بینی دیاردەی لەززەتو خۆشیو تەڕ دەماخییان پێوە

دیـاره، دەمو چـاویان گـەش‌و درەوشـاوەیه، نـورو جـوانی‌و رەونـەقیان لێ دەبـارێ، چونکه خودا زێده جوانی‌و قەشەنگی پێداون، وەکوو له ئایەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ، ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ﴾ عبس/٣٨-٣٩ ئەمجار باسـی هەنـدێ لـەو شتانه دەکا که: له بەهەشتدا بۆ لەززەت‌و خۆشی دەیخۆنەوە، دەفـەرموێ: ﴿يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ، خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسْ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ شەرابێکیان دەدرێتـێ بۆ خواردنەوە بێ غەش‌و بێ ماددەی سەر خۆشکەر، له پیاڵەی سـەر مۆردایـەو ئـەو خوداپێداوانـه خۆیـان هـەڵی دەپـچڕن‌و دوا قـومی بـۆنی وەك بـۆنی میـسك وایـەو وەکوو شەرابی دونیا تاڵ‌و تفت‌و تیژ نیه، دەی با بۆ گەیـشتن بـەو نـازو نیعمەتانـه دەست پێشخەران دەست پێـشخەری بکەن‌و هەمیـشه لـه کێ بڕکـێ دابـن‌و خۆیـانی بگەیـەننێ وەکـوو لـه ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿لِمِثْـلِ هَـذَا فَلْيَعْمَـلِ الْعَـامِلُونَ﴾ الصافات/٦١.

ئیمام ئەحمەد له ئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەتێکی هێناوە، دەیگەیەنێتـه پێغەمبەر(دخ) که فەرموویەتی: هەر موسوڵمانێك لەسەر تینوەتی قومه ئاوێك بدا بەیـەکێك رۆژی قیامـەت خـودا لـه رەحیقـی سـەر مـۆر شـەرابی دەداتـێ. هـەر موسـوڵمانێك موسـوڵمانێکی برسـی تێربکـا، خـودا رۆژی قیامـەت لـه میوەجـاتی بەهەشت تێـری دەکـا، هـەر موسـوڵمانێك هـەژارێکی روت پۆشـته بکـا خـودا رۆژی قیامەت له پۆشاکی سەوزی بەهەشتی لەبەر دەکا.

﴿وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ، عَيْنـاً يَـشْرَبُ بِهَـا الْمُقَرَّبُـونَ﴾ تێکەڵاوەی ئـەو شـەرابه بـێ غەڵ‌و غەشه ئاوێکه سەرچاوەکەی پێـی دەگـوترێ (تـەسـینم) لـه شـوێنێکی بـەرزو بڵنـدەو هەڵـەڕژێ. هـەر کەسـێك بیـەوێ شـەرابی (رەحـیق) بـەرونی بخواتـەوەو زۆر خەست نەبێ، لەو ئـاوەی تێکـەڵ دەکـا، چ ئاوێـك؟ ئـاوی سەرچاوەیەك کـه ئـەویش جۆره شەرابێکەو هەر بەنده چاك‌و هەڵبژاردەکانی خودا لێی دەخۆنەوەو نایـابترین شەرابی بەهەشته.

ئینـو مەسـعود دەفـەرموێ: (تـەسـنیم) سەرچـاوەیەکە لـە بەهەشـتدا بەنـدە نزیکـەکانی بارەگـای بـاری بـەبێ ئـەوەی هیـچی تـری تێکـەڵ بکـەن نۆشـی دەکـەن، ئەصحاولیەمینیش شتی تری تێکەڵ دەکەن!

## هەڵوێستی ناشرینی کافرەکان بەرامبەر موسوڵمانان لە دونیادا، لە قیامەتیشدا موسوڵمانان تۆڵەیان لێ دەکەنەوە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴿٣٤﴾ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾

لەوەپێش وەزعو حاڵی کافرەکانو موسـوڵمانەکانی بـەیانکرد کـە: لـە قیامەتـدا خـودا چـی بـۆ ئامـادە کـردون، ئـەمجار لێرەدا بـرێ کـردەوەو هەڵوێـستی ناشـرینی کافرەکان رون دەکاتەوە کە: بریتیە لە گاڵتە پێکردنو ئەزیـەتدانی موسـوڵمانان لـە دونیـادا، بۆیـە لـە قیامـەتـدا موسـوڵمانەکان هـەمان مامەڵـەیان لەگەڵـدا دەکەنـەوە. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ﴾ بێگومـان کافرەکـانی قـوڕەیشو هـەوا خواهانیـان لـە دونیـا دا گاڵتـە بـە خـودا پەرسـتان دەکـەن، بـە

هەڵس‌وکەوت‌و نایندارییان پێ دەکەنن، ئەمەش داب‌و نەریتی ملهوڕو دەوڵەمەنـدی بوغڕایـە، لـە هـەموو سـەردەم‌و ڕۆژگارێکـدا، لاقرتـێ بـە نوێژکـەرو هـەژارو خـاوەن ئـەدەب‌و ڕەوشـتە ئیـسلامییەکان دەکـەن، لـە خۆیـان بـایی دەبـن‌و پـشت بـە هێـزو دەسەڵاتی خۆیان دەبەستن‌و بە ماڵ‌و سامانی خۆیان دەنازن، موسوڵمانەکان دەکەنە گاڵتەچی خۆیان.

زانایـانی تەفـسیر لـە ڕاڤـە کردنـی ئـەم ئایەتـەدا فەرموویانـە ئـەو موجریمانـە وەلیدی کوڕی موغـەیرەو عوقبـەی کـوڕی ئـەبو موعیعـەط‌و عاصـی کـوڕی وائیـل‌و ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغوث‌و عاصـی کـوڕی هیـشام‌و ئەبوجـەهل‌و نـەضری کـوڕی حاریث بوون کە: گاڵتەیان بە عەممارو خەبباب صوهەیب‌و بیلال دەکرد.

﴿وَإِذَا مَرُّوا بِهِـمْ يَتَغَـامَزُونَ﴾ هـەر کاتێـك ئـەو کافرانـە بـەلای موسـوڵمانەکاندا تێپەڕببن بە چاوی قێزەون‌و لێو داقرچاندن‌و چاوی لێ داگـرتن‌و عـەیب لێ گـرتن‌و بزەی سوکایەتی پێکردنەوە سەیریان دەکەن، واتە: بە چاوو برۆ ئاماژەی سوکایەتی پێکردنیان پێ دەکەن لەککەو عـەیبیان لێ دەگـرتن، دەڵـێن: سـەیری ئەمانـە بکـەن: خۆیان مانـدوو دەکەن‌و لەززەت‌و خۆشی لە خۆیان قەدەغە دەکەن، خۆیان دەخەنـە هیلاکـەت‌و نارەحەتیـەوە، بەتـەمای پاداشـی ڕۆژی قیامـەتن‌و شـوێن کڵاوی بـابردو کەوتوون. ﴿وَإِذَا انقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِـمْ انقَلَبُـوا فَكِهِـينَ﴾: کـە کافرەکـان لـە بـازاڕو نـادی دەگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ‌و منداڵی خۆیان بە کەیفخۆشـی‌و تـەڕدەماخی دەگەڕێنـەوە، دڵخۆشن بەوەی گاڵتـەو سـوکایەتییان بـە خـودا پەرسـتان کـردوە، بـە تانـەو تەشـەر لێدان‌و قەشمەری کردنیان بە موسوڵمانان توکەی سمێلیـان دێ. ﴿وَإِذَا رَأَوْهُـمْ قَـالُوا إِنَّ هَــؤُلاءِ لَــضَالُّونَ﴾ ئەگـەر موشـریکەکان موسـوڵمانە هـەژارەکانیان دەبینـی، دەیـانگوت: ئەوانـە سـەریان لێ شـێواوە، نـایینی بـاوك‌و بـاپیرانی خۆیـان وەلا نـاوە، شـوێن موحەممـەد کـەوتوون‌و پابەنـدی پـەیام‌و بانگەوازییەکـەینی، وازیـان لـە

لەززەتو خۆشی ئێستا هێناوەو بە تەمای پاداشی دوا زیندو بوونەوەن، نازانین هەیە یان نیە؟

ئیتر پەروەدگار بەرپەچی دانەوەو فەرمووی: ﴿وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ﴾ ئەو تاوانبارو ملهوڕو لە خۆبایی بوانە لەلایەن خوداوە نەنێردراون بێن بە چاودێرو رەقیب بەسەر موسوڵمانانەوە ئەوان چییان بەسەر خودا پەرستانەوە هەیە؟ خۆ لە هەموو شتێکیان تێ هەڵدەقوتێنن، بۆچی حاڵو وەزعو کردارو گوفتاریان دەخەنە ژێر چاو دێرییەوە. ئەوان بەرپرسی حاڵو وەزعی خۆیانن.

بەڕاستی هەمیشە مێژوو دەگەرێتەوەو دووبارە دەبێتەوە، هەر دەمەو ئەو جۆرە کەسانە لە ناو بەرگو پاش دیوجامەیەکدا خۆیان دەردەخەن، تا ئایین کزتر بێو رەوشتو ئەخلاقی ئیسلامی کەم بێتەوە ئەم جۆرە شەقاوەو بوغرابوانە زیاتر سەر هەڵدەدەنو پەرە دەستێنن. بێ شەرمو حەیای زۆر دەبێ گەورەو پچوکی نامێنێ، هەتیوە گاڵتە بە پیاو ماقوڵ دەکا، سەرسەریو نەفامان قشمەری بە زاناو عاقڵو ژیرو دانیشمەندەکان دەکەن، دەم ڕوتو خوێڕیو هەتیومچە لە ڕوی پیرەمێردو ریش سپی هەڵگەڕێتەوە، بێدینو چەپڕەو گاڵتە بە دیندارو خودا پەرستەکان دەکەن زۆرمان بنیوە، هەتیوەو سەرسەری بازان جۆرەها لاقرتێو گاڵتەیان بە پێشەوای زاناو دانا کردوە، زۆر جاریش وابووە پیاوی زاناو دانا لە رقی خوێڕیو دەمڕوتو ناکەس بەچە وڵاتی جێ هێشوە. ئەگەر نموونە بێنینەوە لە هەژمار نایە!! ﴿فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُوا مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا موسوڵمانو خوداپەرستەکان گاڵتە بە کافرەکان دەکەنەوە کە دەیانبینن سەرکزو ریسواو رەنگ هەڵبزرکاو، کێشی ناو دۆزەخ دەکرێنو کەس بە هانایانەوە نایە پێیان پێ دەکەنن، تۆڵەی دونیایان لێ دەکەنەوە. ﴿عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ﴾ موسوڵمانە خودا پێداوەکان لەسەر کورسیو موبیلەو قەنەفەکان پاڵیان لێ داوەتەوەو بەمراز گەیشتونو چییان ویستووە بۆیان دابین کراوە، ئیتر تەماشای دوژمنانی خودا دەکەن کە: لە ناو سزای دژواردا دەتلێنەوە، ئەوەندەی ژیانی خۆیان

لەلا خۆش دەبێو لەززەتو نیعمەتەكانیان لەلا بایەخدار دەبێ. بە چاوی خۆیان دەبینن‌و بۆیان رون دەبێتەوە ﴿هَلْ ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ ئایا كافرەكان پاداشی كردەوەكانی جیهانیان وەرگرتوە؟ تۆڵەی تانەو تەشەرو لە كەداریان لێ سەندراوەتەوە؟ بەڵێ بێگومان كافرەكان پڕاو پڕ سزای خۆیان وەرگرتوە..

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی الانشقاق

ئەم سورەتە مەككیەو (٢٥) ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی ئینشیقاق چونكە بەرستەی ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾ دەستی پێ كردوە.

﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ﴿١٥﴾﴾

ئـەم سـورەتەو سـێ سـورەتەكانی پێـشوو كـە: سـورەتی (المطففـین، الانفطـار، التكویر)ن هەر چواریان دەربارەی دیمەنو دیاردەكانی قیامەت دەدوێن، قۆناغەكانی دونیا وێرانبوون باس دەكەن. تێكڕا وەحدەیەكی بابەتی پێك دێنن.. زوربەی زۆری سورەتی (التكویر) و هـەموو سورەتی (الانفطـار) باسـی دیمەنـە سامناكەكانی پـێش زیندوبوونەوە دەكەن. سورەتی (المطففین) حـاڵو وەزعـی بەدبـەختو بەختـەوەرانی ڕۆژی قیامــەت بــەیان دەكــا، ســورەتی (الانــــشقاق) باســی دیمەنــەكانی پــێش زیندوبوونەوەو دوا زیندوبوونەوە دەكا، باسی حیسابو لێكۆڵینـەوەی ئاسـان لەگـەڵ خودا پەرستانو توندو تیژی لەگەڵ ستەمكارو تاوانباران دەكا، میحوەری سورەتەكە وەكوو بـاقی سورەتە مەككیـەكانی تـر لـە تـەوەری باسـی عەقیـدەدا دەخولێتـەوە.. دەفەرموێ: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ، وَأَذِنَـتْ لِرَبِّهَـا وَحُقَّـتْ﴾ كاتێـك ئاسمـان لـەت بـوو، سەرەتای وێرانبوونی بوونەوەر دەستی پێكرد، ملكەچی فەرمانی خودای خۆی بـوو، جێـی خۆشـیەتی فەرمانبـەرداری فـەرمانی خـودای خـۆی بـێ. چـونكە خـودا بـاڵا دەستو فەرمانڕەوایە، كەس نیە بەرهەڵستكاری بێو كۆسپو تەگەرەی بـۆ دروسـت بكـا، ﴿وَإِذَا الأَرْضُ مُدَّتْ، وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّـتْ﴾ كاتێـك زەوی تـەخت كـراو كێـوو گردۆڵكەو شیوو چاڵو چۆڵی نەماو هەموویان داروخانو تێك روخانو تـەفرو تونـا بوون ئیتر زەوی راكێشرا قەبارەی گەورەتر بوو، هەرچی لە ناو سكیدایە توڕی دایە دەرەوە. بە ئادەمیزادو گەنجو جەواهیراتەوە، هیچی تێـدا نـەماو خـۆی خـاڵی كـرد، ئەمجار یەخەی خۆی لەهەموو ئادەمیـزاد دادڕیو لە خۆیانو كردەوەیـان بـێ بـەری بوو ﴿وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾ گوێ بیـسی فـەرمانی خـودا بـوو، جێـی خۆشـیەتی: كـە خـۆی لـە ئـادەمیزادو گـەنجو خەزێنـە خـاڵی بكـاو گـوێ بـیسو پابەنـدی فـەرمانی خـودابێ چـونكە لـەژێر دەسـەڵاتی بـێ سـنووری پـەروەدگار دایـە، ئـەو كاتـەی ئـەم رووداوانە هاتنـە دی، ئـیتر ئێـوەی ئـادەمیزاد كـردەوەی خۆتـان دێتـەوە ڕێو چاكەو خراپەی خۆتان دەبیننەوە! ﴿يَا أَيُّهَا الإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَـى رَبِّـكَ كَـدْحاً فَمُلاقِيـهِ﴾

ئەی ئادەمیزاد! ـ مەبەست هەموو ئادەمیزادە بە موسوڵمان‌و کافرەوە ـ بێگومان تۆ تێکۆشەرو کۆڵنەدەریت، هەمیشە لە هەوڵ‌و تەقەلادایت‌و بەرەبەرە رووەو مردن هەنگاو هەڵدێنێ کرداری چاکەو خراپە ئەنجام دەدەی‌و بۆلای خودا دەڕۆی. لەوە بەولاوە کردەوەکانی خۆت، چاکە یان خراپە ـ دێنەوە ڕێت!

ئەبو داودی تەبالیسی لە جابیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: جوبرائیل وتی: ئەی موحەممەد! بژی ئەوەندەی دەتەوێ بژی، بێگومان رۆژێك لە رۆژان مردن یەخەت دەگرێ‌و تۆ دەمری. کێت خۆش دەوێ خۆشت بوێ دڵنیابە لێی جیا دەبیەوە، چی دەکەی بیکە لە ژیاندا، بێگومان رۆژێك دێ رووبەڕوی کردەوەکانی خۆت دەبیەوە.

راناو لە (ملاقیه)دا دەگەڕێتەوە بۆ کردەوە خێربێ یان شەڕبێ. یان دەگەڕێتەوە بۆ (ربك) واتە: توشی خودای خۆت دەبیەوە، سزا یان پاداش لەسەر کردەوەکانت دەداتەوە.

ئەمجار پەروەدگار وەزع‌و حاڵی ئادەمیزادەکان لەو رۆژەدا دیاری دەکاو بەدوو تاقم پۆلێنیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً، وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُوراً﴾ جا ئەو کەسەی نامەی ئەعمالی دەدرێتە دەستی راستی، ئەوە حیساب‌و لێکۆڵینەوەی ئاسانی لەگەڵ دەکرێ، لێ پرسینەوەی لەسەر خراپەکانی لەگەڵدا ناکرێ. ئەوە حیسابی ئاسانە کە لەگەڵی دەکرێ.

ئەحمەدو بوخاری‌و موسلیم‌و ترمیذی‌و نەسائی‌و ئیبنو جەریر لە عائیشەوە ـ رەزای خودای لێ بێ ـ دەفەرموێ: پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: کەسێك موناقەشەی لەگەڵ بکرێ تاوانبار دەکرێ‌و عەزابی دەدرێ. عائیشە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەبێ؟ ئەی ئەوە نیە خودا دەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً﴾ پێغەمبەر (دخ) فەرمووی: نا، ئەوە حیساب لەگەڵ کردن نیە، ئەوە رانواندنی کردەوەکانیەتی بە بەرچاویدا. هەر کەسێك موناقەشەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێ

سزای دەدرێ. ئەمجار ئەو کەسەی نامەی عەمەلی دەدرێتە دەستی راستی کردەوە خراپەکانی بەبەرچاوی رادەنوێنـدرێن‌و حیسابی سووك‌و ئاسانی لەگەڵ دەکرێ، ئیتر دەگەڕێتەوە بۆ لای ماڵ‌و خێزان‌و کەس‌و کاری خۆی لە بەهەشتدا، دڵخۆش‌و تەڕدەماخ، هێندەی نازو نیعمەت‌و رێز دراوەتێ لە خۆشیان شاگەشکە بووە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيهْ، إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيهْ، فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾ الحاقة/١٩-٢١.

کۆمەڵی دووەم کۆمەڵی کافرو بەدبەخت‌و چارە رەشەکانە، کۆمەڵی ئەو کۆست کەوتوانەیە: کە خودا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُوراً، وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ، فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُوراً، وَيَصْلَى سَعِيراً﴾ وەئەو کەسەی نامەی کردەوەکانی لە پشتەوەڕا دەدرێتە دەستی چەپی‌و دەستی راستی بە ملیەوە بە زنجیر شەتەك دراوە. نامەکەی دەبینێ‌و دەیخوێنێتەوە هاواری لێ هەڵدەستێ‌و دەڵێ: ماڵ وێران‌و چارە رەش خۆم، خۆزگە نامەم پێ نەدرایەو هەر نەمزانیایە چی تێدایە، خۆزگە هەر زیندونەکرامایەوە خۆزگە پێش ئەوەی نامەی عەمەلم ببینم بمردمایە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيهْ، وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيهْ، يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ﴾ الحاقة/٢٥-٢٨ پاشان ئەو نامەردە تۆڕ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە لەبەر دووشت، کە هەر دوکیان لەبێ باوەڕییەوە بوون.

١. ﴿إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُوراً﴾ ئەو کابرایە لە ژیانی دونیادا کەیفخۆش‌و تەڕ دەماخ بووە هەوەسبازو ئارەزۆ پەرست بووە، سەرگەرمی لەززەت‌و خۆش رابواردن بوو، قیامەتی هەر بە خەیاڵدا نەدەهات.

٢. ﴿إِنَّهُ ظَنَّ أَنْ لَنْ يَحُورَ﴾ لە ئاکامی ئەو کەیفخۆشیو تەڕدەماخییە پێی وابوو: بۆلای خودا ناگەڕێتەوە، قیامەت رانابێو زیندو ناکرێتەوە، حیسابو لێکۆڵینەوە نیە.

﴿بَلَى إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيرًا﴾ بەڵێ: ئەو زیندو دەکرێتەوەو بۆلای خودا دەگەڕێتەوە، خودا زیندوی دەکاتەوەو کێشی دەکا بۆ سارای مەحشەرو حیسابو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکا. بە گوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداشی دەداتەوە، بێگومان خودا ئاگاداری کردەوەکانیەتیو چی دەکاو نایکا لەسەری تۆمار دەکاو هیچ شتێکی لێ گوم نابێو هیچی لێ تێك ناچێ.

## رابوونی قیامەت شكو گومانی تێدانیە

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ (١٦) وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ (١٧) وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ (١٨) لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَنْ طَبَقٍ (١٩) فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ (٢٠) وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ (٢١) بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ (٢٢) وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ (٢٣) فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٢٤) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ (٢٥)﴾

لەوەپێش ئادەمیزادی کردنە دوو تاقمو لە رۆژی قیامەتدا پۆلێنی کردن؛ کردنی بە پێڕی بەختەوەرانو پێڕی بەدبەختەکان، ئەمجار جەخت لەسەر هاتنی

ئەو رۆژە دەکاو بەڵگە لەسەر بە توانایی خودا دەهێنێتـەوە، دیاردەکانی بوونـەوەر دەکاتە نیشانەی بە توانایی خودا بەسەر هەموو شتێکدا : دەفـەرموێ: ﴿فَـلا أُقْـسِمُ بِالشَّفَقِ، وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ، وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّـسَقَ﴾[٥] خـودا دەفـەرموێ: سـوێند دەخـۆم بـە سـورایی کـەناری ئاسمـان. کـە دەمـەدەمی خـۆر ئـاوابوونو دوایـی تـا ماوەیـێك ئـەو سورایییە دەمێنێتـەوە. هـەر کەسـە لەبـەر خۆیـەوە پەلـە پـەلی پـێ دەکـەوێ خـۆی کۆبکاتەوەو خۆی ئامادەبکا بۆ داهاتنی شەوو ئارامگرتن تێیدا. هەروەها سـوێند بـە شەوی تاریكو هەموو ئـەو شـتانەی لـەخۆیان دەگـرێ هـەموو ئـەو شـتانەی بـە رۆژ دیـارنو شـەو دایـان دەپۆشـێ؛ هـەروەها سـوێند بـە مـانگ کـە خـۆی کامـڵ دەکـاو خەرمانـە دەداو دەبێتـە مـانگی شـەوی چـواردە. سـوێند بـەو شـتانە کـە نیـشانەی گەورەیی خودای بەدیهێنەریانن. ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقاً عَنْ طَبَـقٍ﴾ ئێـوە قۆنـاغ بـە قۆنـاغو پلە بەپلە بەرەو گەڕانەوە بۆلای خوداو سەرەنجامتان دەڕۆن، توشی جۆرەها حـاڵو وەزع دەبن هەندێکیان لە هەندێکیان قورسترو بە سامترن. وەکوو مردنو ژیانی ناو گۆڕو ئاستەنگو دیمەنـەکانی رۆژی قیامـەتو حیـسابو لێکۆڵینـەوە ئـەمجار ژیـانی هەتا هەتایی لەناو عەزابی دۆزەخدا (خودا پەنامان بـدا) یـان ژیـانی بەختـەوەریو رابواردنی ناو بەهەشتی رازاوە بۆ هەتا هەتایـە (خـودا بـە نـسیبمانی بکـا) نمونـەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُـمَّ لَتُنَبَّـؤُنَّ بِمَـا عَمِلْـتُمْ﴾ التغابن/ ٧.

ئەمجار پەروەدگار سەرزەنشتی کافرەکان دەکا: کە بۆچی زیندو بوونەوەیان بـە لاوە دوورە. دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ چیە بۆچی ئیمان نـاهێنن؟ چ شـتێك رێگای ئیمانهێنان بە خوداو بە پێغەمبەرو بە رابوونی قیامـەتو زیندوبوونـەوەیان لێ دەگـرێ؟ خـۆ هەرچـی سـەیری بکـەن نیـشانەی هـەبوونو بـەتوانایی خودایـە،

[٥] دەربارەی رستەی ﴿ لا أقـسم.....﴾ و ئەو جۆرە سوێندانە لـەوەپێش بـە تایبـەت لەسـەرەتای سورەتی (القيامة)دا باسمان لێوە کردوە...

دیاردەکانی بوونەوەرو موعجیزەکانی پێغەمبەر نیشانەی هەبوونی خودای تاكو تەنهاو راستی پێغەمبەریەتی حەزرەتی موحەممەدن. دەی بۆچی ئیمان ناهێنن؟ ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمْ الْقُرْآنُ لا يَسْجُدُونَ﴾ ئەوە بۆچی: کە قورئانیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە خێرا سوژدە بۆ خودا نابەنو بەندایەتی خۆیان بۆ خودا راناگەیەنن؟ دان بە گەورەیی‌و بەتوانایی خودادا نانێن؟! ئەو موشریکانەی مەککە لە بواری بەلاغەو زمانڕەوانی‌دا شۆڕە سواری مەیدانن، کە گوێیان لە قورئان دەبێ ئەگەر دڵی بدەنێ‌و گوێی بۆ کلۆر بکەن، دەزانن ئەوە کەلامی ئادەمیزادنیەو موعجیزەیە، دەی بۆ دڵی نادەنێ‌و گوێی بۆ کلۆر ناکەن؟ ئەمجار پەروەدگار هۆی ئیمان نەهێنانیان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلْ الَّذِينَ كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ﴾ بەڵكوو کافرەکان قورئان بە درۆ دەخەنەوە، ئەو قورئانەی پڕە لە بەڵگەی جۆراو جۆر لەسەر هەبوونو تاكو تەنهایی خودا، لەسەر رابوونی قیامەتو هەبوونی سزاو پاداش، رەتی دەکەنەوە، بە چیرۆکە کۆنو ئەفسانەی لە قەڵەم دەدەن، یان دەڵێن: سیحرە یا شیعرە ئەمەش: کە دەکەن لەبەر حەسوودی‌و چاو چنۆکییانە، یان ترسی لەدەستدانی بەرژەوەندی پلەوپایەو ماڵو سامانیان هەیە، یان لەڕوی سەرڕەقی‌و لاسایی کردنەوەی باوكو باپیرانیان...! ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ﴾ خودا لە هەموو مەخلوقات باشتر دەزانێ‌و ئاگادارترە بەسەر ئەو شتانەی لە دڵیاندا حەشاریان داوە. بەڵكوو هەر خودا دەزانێ چی لە دڵیاندایە. ﴿فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی پێغەمبەر خەبەریان بدەرێ بەوە: کە خودا عەزابی بە ئێشی بۆ ئامادە کردون. موژدەیان بدەرێ بە سزای دۆزەخ. ﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ بەڵام ئەوانەی ئیمانیان بەخوداو بە پێغەمبەری خوداو بە رابوونی قیامەت هەیەو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی قورئانن، کردەوەکانیان رەنگدانەوەی ئیمانەکەیانە، لەگەڵ ئیمانەکەیاندا کرداری چاك

دەکەن، ئەوانە پاداشی نەبڕاوەو بێ کەمو کورِیو بێ منەتیان دەدرێتێ. ئەوانە بەختەوەرنو پاداشتیان بەهەشتی پانو بەرینو رازاوەیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی البروج

ئەم سورەتە مەککیەو بیستو دوو ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی (بروج) چونکە بە سوێند خواردنی پەروەدگار بە ئاسمانی خاوەن کەلوو دەست پێ دەکا. پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوەی لەچەند رویەکەوەیە.

١. لێکچوونی سەرەتای سورەتەکان، ئەوەتا سەرەتای سورەتی (الانفطار، الانشقاق، البروج، الطارق) بەباسی ئاسمان دەست پێ دەکا، لە سورەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾ لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾. لە سەرەتای سورەتی (الانفطار) دا فەرمووی: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾.

٢. هەردوو سورەتەکان واتە: سورەتی (الانشقاق، البروج) وادە بە خودا پەرستانو هەڕەشە لە کافرانی لە خۆگرتووە. لە هەردووکیان دا ئاماژە بە گەورەیی خودا کراوە.

٣. لە سورەتی پێشوودا ئەوەی راگەیاند: کە موشریکەکان رقو کینەی زۆریان دژی پێغەمبەر(دخ) و موسوڵمانان لە دڵی خۆیاندا کۆکردۆتەوە. بە ئاشکراو بە نهێنی تەعزیبو ئەشکەنجەیان دەدەن، لەم سورەتەشدا ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەوە دابو نەرێتی گەلە پێشینە کافرەکان بووە، ئەمەش ئامۆژگاریو دڵدانەوەی پێغەمبەر(دخ) موسوڵمانەکانی تێدایە.

سەبەب نزولی سورەتەکە دڵدانەوەی پێغەمبەر(دخ) موسوڵمانەکانە، ئەوە رون دەکاتەوە: کە هەموو نەتەوە پێشینە کافرەکان وەکوو موشریکەکانی مەککە هەڵسو کەوتیان کردوە، ئەوە ئەصحابول ئوخدود لە نەجرانی یەمەنو قەومی فیرعەونو قەومی عادو ثەمود ... هتد هەموویان کافربوونو پێغەمبەرەکانی

خۆیان بە درۆ خستۆتەوە، بڕوایان پێ نەکردون و پەیامەکەیان ڕەتکردوتەوە. خودا تۆڵەی لێ ستاندون بە عەزابی کۆکوژ لە ناوی بردون.

چیرۆکی ئەصحابولئوخدود وەکوو لە (الصحاح) دا لە پێغەمبەرەوە ریوایەتکراوە، دەفەرموێ: یەکێك لە پاشاکانی رابردوو ساحیرێکی هەبوو، کە پیربوو، کوڕە لاوێکی بردە لای خۆی بۆ ئەوەی فێری سیحری بکا، هەموو رۆژێ کوڕە لاوەکە دەچوو بۆ لای کابرای ساحیرو دەرسی سیحری لەلا دەخوێند: لەسەر رێی کوڕە لاوەکە راهیبێك هەبوو، ئامۆژگاری ئادەمیزادەکانی دەکردو خەڵکی هەڵدەنا بۆ خودا پەرستی. هەموو رۆژێ کوڕە لاوەکە کە دەچوو بۆلای کابرای ساحیر گوێی لە ئامۆژگاری و پەندو نەصیحەتی راهیبەکە دەگرت و قسەکانی لە دڵیدا گاریگەر بوون، رۆژێك لە رۆژان: کە دەچوو بۆلای ساحیرەکە لە رێگا بینی وا جانەوەرێك یان ئەژدیهایەك رێگای بە خەڵکی گرتووە کەس ناوێرێ لەو ئاقاستە تێپەڕێ. کوڕە لاوەکە بەردێکی هەڵگرت و وتی: خودایە! ئەگەر راهیبەکە لە ساحیرەکە خۆشەویستره یارمەتیم بدە بەم بەردە بیکوژم. بەردەکەی تێگرت و کوشتی!!

دوای ئەم روداوە کوڕە لاوەکە هاتوچۆی راهیبەکەی دەکردو شتی لێ فێردەبوو، هەتاوای لێ هات نەخۆشی کەڕو لاڵ و بەڵەکی چاك دەکردنەوە. راوێژکاری پاشا کوێر بوو، کوڕە لاوەکەیان هێنایە سەری چاکی کردەوە، پاشا لێی پرسی کێ چاوی چاك کردییەوە؟ وتی خودا چاوی چاك کردمەوە. پاشا رقی لێ هەڵساو ئازارو ئەشکنجەی دا ناوو ناونیشانی کوڕە لاوەکەی پێ گوت. یاساوڵەکانی پاشا کوڕە لاوەکەیان هێناو خستیانە بەر ئازارو ئەشکەنجە، هەتا راستی راهیبەکەی گوت. راهیبیان هێنا خستیانە بەر تەعزیب و لە ئایینی خۆی پەشیمان نەبوەوە، بەمشار دوو لەتیان کردو گیانی سپارد. ئەمجار کوڕە لاوەکەیان هێنا بردیانە سەر شاخێکی بەرز بۆ ئەوەی هەڵیدێرن، هاواری لە خودا کردو پاڕایەوە، ئەوانەی بردبویان بۆسەر شاخەکە کەوتنە لەرزە لەرزو خۆیان کەوتنە خوارو ئەو رزگاری بوو،

ئەمجار برديان خستيانە ناو بەلەمێكەوە بۆ ئەوەی لە ناو دەريـادا بەلەمەكـە خـوار بكەنەوەو بكەوێـتە ناو ئاوەكەوە بخنكێ، بەڵام ئەوان خۆيان خنكان‌و كـوڕە لاوەكـە رزگاری بوو. ئەمجار بە پاشای گوت ئـەتۆ نـاتوانی مـن بكـوژی هـەتا هـەموو خـەڵك كۆنەكەيـەوەو مـن هەڵنەواسـی بـە درەختێكـەوەو تـيرە بـارانم نەكـەی! بـەم جـۆرە تيرێـك لـە تيردانەكـەم دەربێنـەو بڵـێ: ﴿ بـسم الله رب الغـلام﴾ ئـەمجار تيرەكـەم پێوەبنێ. پاشا بەو شـێوە خەڵكەكـەی كۆكردەوەو كوڕەكـەی هەڵواسـی‌و تيرێكـی لـە تيردانی كوڕەكە دەرهێناو خستيە ناو ئامێری تير هاوێژەوەو لە كوڕەكەی گرت‌و لـە بنا گوێی داو شەهيد بوو، خەڵكەكە تێكڕا وتيان ئيمانمان هێنا بە خودای ئەم كوڕە لاوە، هەموويان موسوڵمان بون. راوێژكاران بـە پاشـايان گـوت ئـەوەی لێـی دەترسـای ئەوا رويدا. ئەمجار پاشا شێلگير بوو، فەرمانی دا لەناو كۆڵان‌و سەرەڕێدا خەندەك‌و چاڵ هەڵبكەنن‌و ئاگريـان تێـدا بكەنـەوە، هەركەسـێ نەهاتـەوە سـەر ئـايينی پاشـا، بيخەنە ناو چاڵە ئاگرەكانەوە. خەڵكێكی زۆريان تێ فڕێـدا، هـەتا سـەرە هاتـە سـەر ئافرەتێك منداڵێكی بە باوەشەوە بوو، ئافرەتەكە تۆزێك لەبەر منداڵەكە هەڵوێستی كرد، منداڵەكە هاتەزوبان‌و وتی: دايە صەبربگرەو تـۆ لەسـەر رێبـازی حـەقی، ئـيتر ئەويش چووە ناو ئاگرەكەوە سوتا.

ئيمـامی موسـليم لـە صـەحيحی خۆيـداو ئەحمـەدو نەسـائی ئـەم رووداوەيـان ريوايـەت كـردوە ، پوختەكـەی بـەم جۆرەيـە: يـەكێك لەپاشـا كافرەكـانی رۆژگـاری پێـشوو : كـە (زونـواس جولەكـە بـووە نـاوی زورعـەی كـوڕی توببـانی ئەسـعەدی حيميـەری) بـوو، خەبـەری پـێ گەيـشت: كـە هەنـدێ لـە رەعييـەت‌و مـسكێنەكانی چوونە سەر ئـايينی مەسـيحی، ئـيتر سـوپايەكی لەحيميەريـەكان پێكەوە نـاو چـووە سەريان هەموويانی گرت، سەرپشكی كردن لـە نێـوان سـوتان بـە ئـاگرو گەڕانـەوە بـۆ سەر ئايينی جولەكە. ئەوانيش سووربوون لەسەر مانەوە لـە ئـايينی مەسـيحی. ئـيتر پاشا فـەرمانی دەركـرد چاڵيان بـۆ هەڵكەنـدن، ئاگريـان تێـدا كردنـەوە، ئـەمجار بـە

خەڵکە گیراوەکانیان گوت: هەر کەسێ لە ئایینی تازەی زێوان بێتەوە چمان بەسەریەوە نیە، ئەوەی زێوان نەبێتەوە دەیخەینە ناو ئاگرەوە. خەڵکەکە دانیان بە خۆیاندا گرتو لە ئایینی مەسیح زێوان نەبوونەوە، ئیتر لەپێش چاوی پاشاو داروودەستەکەی ئەو خەڵکە خودا پەرستانەیان خستە ناو چاڵە ئاگرەکانەوە هەموویان سوتانو مردن. هەندێك پێیان وایە ژمارەیان بیست هەزار کەس بووە، هەندێك دەڵێن: دوانزە هەزار کەس بوون. کولەبی دەڵێ: ئەصحابولئوخدود حەفتا هەزار بوون!![1]

## سوێند خواردن بە چەند دیاردەیەکی بوونەوەر بۆ جەختکردنەوە لەسەر بەفتارەچوونی ئەصحابولئوخدود

﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴿٣﴾ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ ﴾

﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾ سوێند دەخۆم بە ئاسمانو بورجەکانی، واتە: سوێند بە ئاسمانی بەرزو فراوان: کە ئەستێرەی گەورەو زەبەللاحی هەن، یان سوێند بە ئاسمان کە خاوەنی چەند مەنزڵو کەلوویەکە بۆ ئەستێرەکان. کە بریتین لە

---

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٤/ ٥٤٩

دوانزە بورج بۆ دوانزە ئەستێرە، خۆر بە ساڵێك ئەو بورجانە دەبڕێو مانگیش بە بیستو هەشت رۆژ، خودای مەزن سوێندیان پێ دەخوا، چونكە كاریگەری گرنگیان لەسەر زەوی هەیە، بە گوێرەی گۆڕانی ئەستێرەكان لەناو ئەو كەلووانەدا گۆڕانكاری وەرزەكانی ساڵ دروست دەبێ. گەرماو سەرماو باوو باران لەسەر زەوی پەیدا دەبن. هەر بەهۆی ئەو بورجانەوە ساڵو مانگو حیساب دەزاندرێن.

وەكوو لە زانیاری ئاسمان شوناسیدا هەیە ئاسمان دوانزە بورجی تێدان، شەش كەلوویان لە شیمالی هێڵی ئیستیواوەن شەش بورجیشیان لە خواروی هێڵی ناو براوەوەن.

شەش بورجی سەرو (شیمال) بورجی (حەمەلو ثەورو جەوزاو سەرەطانو ئەسەدو سونبلە)ن شەشەكەی تریان كە لە خواروی هێڵی (أستواء)ە وەن بریتین لە بورجی (میزانو عەقرەبو قەوسو _ جەدیو دەلوو حوت) لە یەكەم رۆژی بەهاردا خۆر دەچێتە بورجی حەمەلەوە تاكۆتایی بەهار كەلووی حەمەلو ثەورو جەوزا دەبڕێ. لە یەكەم رۆژی هاوینا دەچێتە بورجی سەرەطانەوە تاكۆتایی هاوین كەلووی سەرەطانو ئەسەدو سونبلە دەبڕێ. لە یەكەم رۆژی پاییزدا دەچێتە كەلووی میزانەوە تاكۆتایی پاییز كەلووی میزانو عەقرەبو قەوس دەبڕێ.

لە یەكەم رۆژی زستاندا دەچێتە كەلووی (جدی) یەوە تاكۆتایی زستان كەلووی جدیو دەلوو حوت دەبڕێ ﴿وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ﴾ سوێندم بە رۆژی قیامەت كەوادەمان بە هاتنو رابوونی داوە ﴿وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ﴾ سوێند بە وانەی لەو رۆژەدا حازر دەكرێنو هەموو شتێك دەبینو هەموو شتێكیان رادەنوێندرێ لە سارای مەحشەردا هەروەها سوێند بەو شتانەی تێیدا دەبیندرێ. سوێند بە شایەتو شایەتی لەسەر دراو ﴿قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ﴾ ئەصحابو لئوخدود بە فتارە چونو ماڵوێران بوون. لە رەحمەتی خودا دوور كەوتنەوە. یان دەك بە كوشت بچنو لەرەحمەتی خودا دوور بكەونەوە. ئەوانەی خەندەكی قوڵو درێژیان لێدانو

زەختیان لە موسوڵمانەکان کرد، لە ئایینی خۆیان پەشیمان بنەوە. ﴿النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ﴾ ئەوانەی حازری ئاگری هەڵگیرساوی بڵێسەداری ناو خەندەك و چاڵەکان بوون و هەر کەسێ لە ئایین ژێوان نەبوویایەوە، فڕێیان دەدایە ناو ئاگری بڵێسەدارەوە. نەفرینیان لێ بێ. ﴿إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ﴾ لەو کاتەدا: کەلە دەوری ئاگری هەڵگیرساوەوە لەسەر کورسی و قەنەفە بەریز دانیشتبوون و سەیری دیمەنی سامناکی تێفرێدانی ئەو خەڵکە موسوڵمانە بێ تاوانەیان دەکرد کە دەیاخستنە ناو ئاگری بێ ئامانەوەو هەڵدەقرچان و دەبوونە سوتەمەنی ئاگرەکە هیچ ڕەحم و بەزەییان نەدەجوڵا. ﴿وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ﴾ ئەوانە؛ واتە پاشاو دارو دەستەکەی سەیری ئەوەیان دەکرد کە بەخودا پەرستەکانیان دەکرد، دەیانبینی چۆن ئەو ئادەمیزادە زیندو لەشساغانەیان دەخستە ناو ئاگری بڵێسەدارەوەو چۆن لە ماوەیەکی کورتدا هەڵدەقرچان و دەبوونە قەرەبروت.

ئامادەبونیان بۆ ئەو دیمەنە سامناکە بەڵگەیە لەسەر دڵڕەقی و بێ ویژدانی پاشاو دارو دەستەکەی. لەهەمان کاتدا نیشانەی خۆڕاگری و بڕوا پتەوی موسوڵمانەکانە. ئەو هەموو سزاو ئەندێشەیان چەشت و گیانی خۆیان بەخت کرد بەبێ ئەوەی لە ئیمانی خۆیان پەشیمان ببنەوە. یان ترسێکیان لێ بنیشێ، بەبێ پەروا گەورەو پچوك و دایك و باوك و خوشك و برا خۆیان فڕێ دەدایە ناو ئاگرەوەو لە ئیمانی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە ﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلاَّ أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ، الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ ئەو کافرە سەر ڕەقە دڵڕەقانە تۆڵەی هیچیان لەسەر نەبوون، جگە لەوەی ئیمانیان هێنابوو بە خودای باڵادەستی سوپاس بۆکراو هیچ بیانویان بەدەستەوە نەبوو توشی ئەو سزایانەیان بکەن جگە لەوە کە ئیمانیان بە خودای باڵادەست و شکۆمەندو سوپاس بۆکراو هێنابوو، ئەو خودایە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە،

هەموو شتێك بۆلای ئەو دەگەڕێتەوەو بەدەست ئەوە، هیچی لێ گوم نابێو لێ تێك ناچێ. پاداشی چاکە بە چاکە خراپە بەخراپە دەداتەوە.

## سزای کافرەکانو پاداشی موسوڵمانان

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴿١١﴾ ﴾

لەوەپێش چیرۆكو بەسەر هاتی ئەصحابولئوخدودو کردەوەی ناشرینیان بەرامبەر موسوڵمانان _ رانواند. بە شوێن ئەوەدا ئەحکامی ثەوابو عیقاب بەیان دەکا. ئەو عەزابە ڕون دەکاتەوە کەبۆ بێ بڕوایانی ئامادەکردوە، ثەوابو پاداشی نەبڕواوەو لەبن نەهاتوو بۆ خودا پەرستان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ﴾ بێگومان ئەوانەی پیاوو ئافرەتانی موسوڵمانیان خستە ناو ئاگرەوەو لێیان نەگەڕان بە ئازادی پەیڕەوی ئایینی خۆیان بکەن، زەختیان لێ کردن: کە ئەگەر لەئایینی مەسیحی پەشیمان نەبنەوە، دەبێ بچنە ناو ئاگرەوە. ئیتر خوداپەرستەکان لە ئایینی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە، پاشای کافرو دارو دەستەی ستەمکاری خستیاننە ناو ئاگری هەڵگیرساوەوە، ئەوانەو هەموو کافرێکی تر: کە تۆبەیان نەکردبێو تۆبەنەکەن، عەزابی دۆزەخیان بۆ ئامادە کراوە، بە ئاگری سوتێنەر دەیانسوتێنین. چونکە سزا بە گوێرەی کردەوەیە.

ڕستەی ﴿لَمْ يَتُوبُوا﴾ لە ئایەتەکەدا ئاماژە دەکا

بۆ ئـەوە: ئەگـەر ئـەو دڵڕەقانـە دوای ئـەو هـەموو کوفرو سـتەمو تاوانـە، تۆبـەیان بکردایە خودا لێیان خۆش دەبـوو، بـەڵام هیـچیان تۆبـەیان نـەکردوە لـە هەڵوێـستی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە. بەراستی خـودا بـێ بـاكو خـاوەن رەحـمو بـەزەییـیـە. ئەوانە خۆشەویستانی پەروەدگاریان بـەو شـێوە دڵڕەقـیـە کوشـت: کەچـی ئـەگـەر تۆبەیان بکردایە لێیان خۆش دەبوو!!

ئەمجار موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ زێـدە تاعـەتو بەنـدایـەتی کـردن، دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِـنْ تَحْتِهَـا الأَنْهَـارُ ذَلِـكَ الْفَـوْزُ الْكَبِيرُ﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کـردەوەی چاکیان کـردوە، بڕوایـان بـە تاكو تەنهایی خـوداو راسـتی پێغەمبەرایـەتیو رابـوونی قیامـەتو زینـدوبوونـەوەو هەبوونی فریشتە هەیـە، بڕوایـان بـە نامـە ئاسمانییـەکان هەیـەو کـردەوەی باشـیان ئەنجام داوە، شوێن پەیامی قورئان کـەوتوونو پابەنـدی فـەرمانو جڵەوگیرییـەکانی پەروەدگارن، بە هیچ جۆرێ لە بیرو باوەڕی خۆیان لا نادەن، وەکوو چۆن ئەو خـودا پەرستانەی سـەردەمی (اصحاب الأخـدود) لەبـەردەم ئـەو تاقیکردنـەوە گەورەیـەدا خۆیان راگرتو تۆزقاڵێك لە هەڵوێستی خۆیان نەهاتنە خوارەوە. ئەوانە لە پاداشـی ئیمـانی چەسـپاویانو کـردەوەی باشـیان بـاغو باغـاتی بەهەشـتیان پـێ دەدرێ؛ کـە بەژێر درەخـتو باڵەخانەکانیانـدا جۆگـاو جۆبـار دەکێشێنو هێنـدەی تـر جوانیو رازاوەیی بە دیمەنی بەهەشت دەبەخشن، ئەو پاداشو بەخششە بەمراز گەیشتنێکی گەورەیە هیچ بە مراز گەیشتنێکی تری پێ ناگا.

## پەروەدگار دەسەڵاتی رەهای هەیە، وادەو هەرەشەکانی دێنێتە دی

﴿ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلْ

أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ﴿٢٠﴾ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾ ﴾

لەوەپێش هەڕەشەی لەو کافرو ستەمکارانە کرد: کە سورن لەسەر کوفرو بێدینی، وادەی بەهەشتو نازو نیعمەتی بەوانە دا کە خاوەن باوەڕو کردار چاکن. ئەمجار ئەوەی راگەیاند: کە لەهەموو سەردەمو رۆژگارێکدا وێنەی ئەصحابولئوخدود هەنو هەمیشە کوفرو ئیمان لە صیراعو بەربەرەکانی دان. بەمەش هەڕەشەی توند ئاراستەی کافرەکانی قوڕەیش دەکاو وادەی نازو نیعمەت دەدا بە موسوڵمانانو تەسەللایان دەداتەوە، دڵنیایان دەکا: کە سەرەنجامی هەموو کافرو بێدینێك وەکوو سەرەنجامی ئەصحابولئوخدود وایە. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ بێگومان هەڵمەتی خودای تۆ توندو ئەستەمو بەهێزە، هەڵمەتی تۆڵەستاندنەوەی لە ستەمکارو ملهوڕانو رەتکەرەوەی پەیامی پێغەمبەرانیو سەرپێچیکاران زۆر بە هێزو سامناکە، هیچ شتێك خۆی بۆ ناگرێو هەموستەمکارێك دەپروێنێ. ﴿إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾ بێگومان خودا خاوەنی دەسەڵاتی رەهایە، هەرئەو سەرەتا بەدیهێنەرە، ئەوئادەمیزادی لە دونیادا دروست کردوە، دوای مردن جارێکی دی زیندویان دەکاتەوە، یان خودا سەرەتا هەڵمەت دەباو دوبارەشی دەکاتەوە، واتە: لەدونیاو قیامەتدا خودا هەڵمەتی سەخت بۆ ستەمکارو ملهوڕان دەباو تێکیان دەشکێنێ. لە دونیادا هەڵمەتیان بۆ دەبا چونکە کوفرانی نیعمەتەکانی خودا دەکەن، لە قیامەتدا هەڵمەتیان بۆ دەبا، چونکە بڕوایان بە زیندوبوونەوە نیە. ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾ پەروەدگار زۆر لێخۆشبووە بۆ تاوانی بەندەکانی بە مەرجێ تۆبە بکەنو بۆلای ئەو بگەڕێنەوە. بەندە

گوێڕایەڵەکانی زۆر خۆش دەوێن، بەتەواوی پاداشیان دەداتەوە. ﴿ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ﴾ پەروەدگار خاوەنی عەرشی گەورەو بەرزو شکۆمەندە، خاوەنی مڵك‌و سەڵتەنەتە، خاوەنی بونەوەرە، ئەو پەڕی سەخاوەت‌و بەخشندەیی هەیە ﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ خاوەنی دەسەڵاتی رەهایە، هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا، هەرچی بیکا کەس نیە بتوانێ رەتی بکاتەوەو بەرهەڵستی بکا، پرسیاریشی لێ ناکرێ بۆچی ئەوە دەکاو ئەمە ناکا، هەرکاتێ بیەوێ ستەمکارو سەرڕەقەکان لەناو بەرێ‌و یارمەتی خودا پەرستان بدا، چۆنی بوێ ئاوا ویستی خۆی دێنێتە دی‌و کەس ناتوانێ نە لە ئاسمان‌و نە لەزەویدا بەرهەڵستکاری بێ. ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْجُنُودِ، فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ﴾ ئەی موحەممەد! ئایا هەواڵ‌و سەرگورشتەی کۆمەڵانی کوفرو بەدرۆخەرەوەی پێغەمبەرانت پێ گەیشتووە، سەر گورشتەی ئەو گەل‌و نەتەوانەت پێ گەیشتووە: کە یاساوڵ‌و دەستەو دایەرەی خۆیان کۆ کردەوە بۆ بەگژدا چوونەوەی پێغەمبەران، یان ئایا هەواڵی ئەو عەزاب‌و سزایەی توشی ئەو ستەمکارانە بوو بە تۆ گەیشتووە؟ لەو گەل‌و نەتەوە ستەمکارو بە درۆ خەرەوانە فیرعەون‌و دارو دەستەکەی‌و گەلی ثەموود: کە بەشێکن لە نەتەوەی عەرەب‌و خودا دوابڕاوی کردن. مەبەست بە (حديث) هەڵوێست‌و کوفرو عەنادو ئەو عەزاب‌و سزایەی توشیان بوو، ئەوەبوو خودا فیرعەون‌و دارودەستەکەی لە دەریادا (دەریای سور) خنکاندن‌و ریشە کێشی کردن. گەلی ثەموود حوشتری پێغەمبەرەکەیان سەربڕی، خودا وڵاتی وێران‌و خاپور کردن، سەر لەبەر لەناوی بردن‌و کەسیان لێ دەرنەچوو! ئەمجار پەروەدگار دڵدانەوەی پێغەمبەر(دخ) دەکاو دەفەرموێ: ﴿بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ﴾ ئەمە داب‌و نەریتی کۆمەڵی کوفرو ستەمکارانە، لە هەموو سەردەم‌و ڕۆژگارێکدا، هەرکاتێ پێغەمبەرێکیان هاتبێتە سەر بەدرۆیان خستۆتەوە. بەڵکوو واقیع‌و هەڵوێستی موشریکەکانی قورەیش ئەوەیە بە توندی پەیامەکەت رەت دەکەنەوە، بڕوات پێ ناکەن، پەندو عیبرەت لە گەل‌و نەتەوە پێشینەکان وەرناگرن. ﴿وَاللَّهُ مِنْ

وَرَائِهِمْ مُحِيطٌ﴾ خودا توانای ڕەهای هەیە بۆ ئەوەی عەزابی سەختیان بۆ سەر بنێرێ، دەتوانی ستەمکاران بپروێنێو بشکێنێ. هەموو بوونەوەر لە ژێر دەسەلاتی ڕەهای دایە، کەسیان لەدەستی ڕزگاریان نابێ پێویست ناکا بە هەڵوێستو کوفریان دڵتەنگ بێ. ئەوە دابو نەریتی هەموو کافرو بێ باوەڕانی ڕۆژگارە. ﴿بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ، فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ﴾ بەڵکوو ئەم قورئانەی ئەوان بڕوای پێ ناکەنو بەسیحرو جادوی لە قەڵەم دەدەن هەندێ جاریش دەڵێن: شیعرە یان فاڵو کوڵەوەنانییە یان چیرۆکە کۆنی ڕابردوانە... دڵنیابە ئەو قورئانە قورئانێکی سەر ئاسایە، چەکو شێوازی، ماناو ناوەڕۆکی هێندە بەرزو پیرۆزە، بۆتە موعجیزەو لەتوانای ئادەمیزادانیە کەلامی ئاوادابنێ. کەلامی خودایە، بەنیگاو سروشت ناردویەتی بۆ پێغەمبەر (د.خ) ، لەهەموو کەموکوڕیو گۆڕانکاری تێیدا پارێزراوە. لە لەوحولەحفوظدا نوسراوەتەوە.

لەوحولەحفوظ: یەکێکە لە عالەمە غەیبییەکانو نازانین حەقیقەتی چۆنە، پێویستە ئیمانمان پێی هەبێ وەکوو خودا هەواڵی پێداوین. خودا دەفەرموێ: قورئانی تێدا نوسراوەتەوە. لەمە زیاتر هەرچی بوترێ زیادەیە..

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتى الطارق

ئەم سورەتە مەككیەو حەڤدە ئایەتە. نـاوى نـراوە سـورەتى (الطارق) چونکە لەسەرەتاوە خودا سوێندى پـێ خـواردوە دەفـەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ﴾ وشـەى (الطارق) ناوە بۆ ئەو ئەستێرەیەى بەشەو هەڵدێو بـەنوورى خـۆى تاریکایى شـەو کون دەکا. بەشـەو دیـارەو بـە رۆژ هونـە. ئـەم سـورەتە لـە دوو ڕووەوە دەشـوبهێتە سورەتى پێشووى.

١. لە سەرەتاى هەردووکیاندا سوێند بە ئاسمان خوراوە.

٢. لـە هەردووکیانـدا باسـى زیندوبوونـەوەو رابـوونى قیامـەت کـراوە. لـە هەردووکیاندا پیرۆزى قورئان دەست نیشان کراوە.

﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ﴿٢﴾ ٱلنَّجْمُ ٱلثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾﴾

نـاوەڕۆکى سـورەتەکە وەکـوو بـاقى سـورەتە مەککیـەکان گرنگـى بـە بنـەماى بیروباوەڕ دەدا، دەسەڵاتو بە توانایى خودا رادەنـوێنێ. دیمـەنو روداوو دیاردەکانى رۆژى قیامەت نمایش دەکا. دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ﴾ سـوێندم بـە ئاسمـانى بـەرزو تۆکمـەو جـوانو قەشـەنگ، سـوێندم بـە ئەسـتێرەى درەوشـاوە کـە بەشـەو دەردەکەوێ. ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ﴾ ئـەتۆ چـووزانى حەقیقـەتو چۆنیەتى ئـەو

ئەستێرانە چییە؟ طاریق بریتییە لە ئەستێرەی درەوشاوە: کە بەروناکی خۆی تاریکی شەو کون دەکا. ئەم جۆرە ئەستێرە گەورەترین بەڵگەن لەسەر تاك و تەنهایی و بەدەسەڵاتی خودا بۆ کەسانێك لێیان وردبێتەوە. سوێند خواردن بە ئاسمان و ئەستێرەو خۆرو مانگ و تاریکی و روناکی و شەو رۆژ: کە خودا لە قورئاندا زۆر دوبارەیان دەکاتەوەو سوێندیان پێ دەخوا لەبەر ئەوەیە دیاردەو گۆران و حاڵ و وەزع و هاتوچۆو شێوەو هەڵهاتن و ئاوابونیان تابلۆی سەرنج راکێش و سەر سوڕهێنەرن؛ وەلێ لەبەر زۆر دوبارە بوونەوەیان خومان پێوە گرتون و لەلامان بەشتێکی ئاسایی دێنە بەرچاو. ئەگینا هەموویان جێگای سەرنجن و، نیشانەی تاك و تەنهایی و دەسەڵاتی رەهای پەروەدگارن، نیشانەی ئەوەن: کە خاوەنیان خودایەکی دەستڕەنگین و کار دروست و فەرمانڕەوایە...! کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ﴾؟ پرسیارەکە بۆ بەگەورەزانین و سەر سوڕمانە، مەبەست ئەوەیە: ئەو ئەستێرە دورو قەبارە زەبەللاحانە: کە بەئاسۆی ئاسمانەوە دەدرەوشێنەوە کەی لە توانای ئادەمیزاددا هەیە حەقیقەتیان بزانێ؟ زانیاری و روانین و دیتنی ئادەمیزاد سنووردارە، ناتوانێ حەقیقەتی ئەوانە کۆنترۆڵ بکاو بیانزانێ.

سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێ: هەر شتێك لە قورئاندا بە رستەی ﴿وَمَا أَدْرَاكَ﴾ ئاڕاستە کرابێ، خودا بە پێغەمبەری خۆی زاناندوە. هەرشتێك بە رستەی ﴿وَمَا يُدْرِيكَ﴾ ئاڕاستە کرابێ پێغەمبەری لێ ئاگادار نەکردوەو بە نهێنی ماوەتەوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ﴾ الشورى/١٧ .

ئەمجار مەبەست بەوشەی (الطارق) دەردەخاو دەفەرموێ: ﴿النَّجْمُ الثَّاقِبُ﴾ ئەو شتەی ناوی طاریقی بۆ دانراوەو زانیاری ئادەمیزاد لەوانەنیە بتوانێ کۆنترۆڵی بکا، ئەو ئەستێرانەن: کە بە روناکی خۆیان تاریکی شەو کون دەکەن و بەڵگەو نیشانەی ئاشکران لەسەر بە توانایی خودا، ئەو ئەستێرانە روناکی دەبەخشن و لەساراو بیابان و دەریادا رێگایان پێ دەدۆزنەوە، کاتی باران بارینیان پێ دەزاندرێ.

جەماوەری زانایان پێیان وایە: طاریق ناوە بۆ ئەستێرەی ثورەییا. قەتادەو حەسەن دەڵێن: هەموو ئەستێرەیەك دەگرێتەوە. چونکە ئەستێرە بەشەو دەردەکەون هەر شتێکیش بەشەو پەیدا بێ، پێی دەگوترێ طاریق.

ئەمجار خودا بۆ وەڵامی سوێندەکە دەفەرموێ: ﴿إِنْ كُلُّ نَفْسٍ لَمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ﴾ واتە: سوێندم بە ئاسمانو ئەستێرەکانی هەریەکێ لە ئێوە چاو دێرێکی بەسەرەوەیە، هەمیشە ئاگای لێیەتیو ساتە وەختێك لێی بێ ئاگا نیە، هەمووەم فریشتەی بەسەرەوەن هەرچی دەیکاو دەیڵێ لە خێرو شەڕ دەینوسنو لەسەری تۆمار دەکەن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللّهِ﴾ الرعد/١١

لەڕاستی دا چاودێرو پارێزەر خودایە، فریشتەکانیش هەر بە فەرمانی خودا چاودێرو پارێزگارنی. وەکوو لە شوێنێکی تردا ئاماژە بەو مانایە دەکاو دەفەرموی: ﴿وَيُرْسِلُ عَلَيْكُم حَفَظَةً﴾ الانعام/٦١ یان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ، كِرَاماً كَاتِبِينَ﴾ الانفطار/١٠-١١ یان دەفەرموێ: ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ، مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق/١٧-١٨ .

ئەمجار پەروەردگار سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ سەرەتای دروستبوونی هەموو ئادەمیزادێكو ئەم شێوە دروستبوونە دەکاتە بەڵگە لەسەر رابوونی قیامەتو راستی زیندوبوونەوە، دەفەرموێ: ﴿فَلْيَنظُرْ الإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ، خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ با ئادەمیزاد بیر لە چۆنیەتی دروستبوونی خۆی بکاتەوە، بزانێ لە چی دروست کراوە؟ دروست کراوە لە دڵۆپە ئاوێك بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خودای تاكو تەنهاو زاناو دانای بۆ دەربکەوێو دڵنیابێ لەوەی خودا چۆن لە دڵۆپە ئاوێ دروستی کردوە، ئاوایش زیندوی دەکاتەوە. بەڵێ ئادەمیزاد لە دڵۆپە ئاوێك: کە بە فیچقەو تەکان دەڕژێتە ناو منداڵدانەوە، ئەو دڵۆپە ئاوەی ئادەمیزادی لێ دروست دەبێ دڵۆپە ئاوێکی تێکەڵە لە ئاوی پیاوو ژن،

ئەو ئاوەش لە خواردەمەنی پەیدا دەبێ، خواردەمەنیش لە خاك پەیدا دەبێ. کە وابوو هەموو ئادەمیزادێك لە تۆزێك خاك دروست دەبێ لە رێگەی خواردەمەنییەوە، دەی خودایەك بتوانێ ئادەمیزاد بەو جۆرە لە تۆزێ خاك دروست بکا، دەشتوانێ جارێکی تر پاش مردن لەکاتی خۆیدا زیندوی بکاتەوە..

هەڵبەتە هەموو شتێکی شلەمەنی: کە بەتەکان و فیچقە دەردەچێ دەبێ هێزێك هەبێ پاڵی پێوە بنێ و رێگای دەرچوونیشی تەنگەبەربێ. کەوابێ ئەم (تدفق) و قەڵەمباز بوونەی ئاوی پیاو: کە بەتەکان دەڕژێتە ناو رەحەمی ئافرەتەوە. نەخشەی پەروەدگارەو کارێکی پێویستە بۆ ئەوەی بگاتە دەرگای منداڵدان و شوێنی خۆی بگرێ، ئەگەر ئەو قەڵەمباز بردنەی پیاو نەبووایەو ئاوا فیچقەی نەکردایە. سکی ئافرەت پڕنەدەبوو، چونکە ئاوی پیاوەکە نەدەگەیشتە شوێنی مەبەست. زۆر پیاوی وا هەیە نەزۆکە، هۆیەکەی ئەوەیە: ئاو فڕێدانەکەی سستەو وەکوو پێویست فیچقە ناکاو ناگاتە دەرگای منداڵدان. بەڕستەی: ﴿يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ سەرچاوەکانی ئەو ئاوە دیاری دەکا: کە ئادەمیزادی لێ پەیدادەبێ. دەفەرموێ: ئەو ئاوە لەپشتی پیاوو سنگی ئافرەتەوە هەڵدەقوڵێ؛؛ ئێستا زانیاری فیزیۆلۆجی و زانیاری تایبەت بە زاووزێ دەری خستووە: کە لەناو موراغەی پشتدا مۆخێك هەیە پێی دەگوترێ مۆخی دەرمکی (نخاع الشوکی) لە بڕێکی ئەم مۆخەدا شوێنێك هەیە پێی دەڵێن: مۆخی لۆکەیی ( النخاع القطني) هێزو وزە لەبەشی بەرەوژووری مۆخ وەردەگرێ و دەماغ رۆڵێکی گرنگی لەوەدا هەیە، بەبێ ئیعاز وەرگرتن لەو شوێنە ئاوی پیاو پەیدانابێ، هەڵبەتە ئەگەر گیانلەبەرانی تۆوی (الحیوانات المنویە) کە لە گوندا پەیدادەبن، تێکەڵ بە گەرا (بویضە)ی ئافرەت نەبن و لەگەڵ ئاوەکەدا نەڕژێندرێنە دەرگای منداڵ زارۆك و کۆرپەڵە لە منداڵدانـدا دروست نابێ!! هەموو ئافرەتێك منداڵدانێکی هەیە، لەگەڵ دوو گەرادانـدا یەکیان لەلای راست و ئەویتریان لای چەپ. لە نێوان منداڵدان و گەرادانـدا لولەیەك هەیە. لەهەر گەرادانێکیشیاندا

چەند کیسولکەی پچوك هەن پێیان دەگوترێ (حویصلات) هەموو سەری مانگێك واتە: کاتی عادەی مانگانە یەکێك لەو کیسولکانە دەست دەکا بە گەورەبوونو وردە وردە لەو گەرادانەی کە تیایەتی جیا دەبێتەوە، لە کۆتایی مانگدا لەسەر لێواری گەرادانەکە لەت دەبێ و گەرایەکی لێ دەردەچێ و دەچێتە ناو ئەو لولەیەی نێوان منداڵدان و گەرادانەکەوە. لەوێوە دەچێتە ناو منداڵدان و رودەکاتە ئەو شوێنەی ئاوی پیاو دەیگاتێ، جا: کە گیاندارانی تۆوی (الحیوانات المنویە)ی پیاو بە هەزاران هەزار دەبن لەگەڵ ئاوەکەدا بە تەکان و فیچقە دەرژێندرێتە دەرگای منداڵدان، هێلکە گەرای ژنەکەش ئامادەییان تێدایە بۆ پێشوازی کردن، هەریەکە لە گیاندارە تۆوییەکان پێشبڕکێیانەو دەگەڕێن بە شوێن گەرایەکدا. کام لەم گیاندارە تۆوییانە چاپوکبێ، زوتر دەگاتە گەراکەو سەردەکا بە ناویاو پێکەوە متوربە دەبن و بناغەی کۆرپەڵە لە منداڵداندا پەیدادەبێ، خۆ ئەگەر ئەو گیاندارە تۆوییە، نەگاتە گەراکەو پێکەوە متوربە نەبن، کۆرپەڵە پەیدانابێ، ئافرەتەکە لەکاتی خۆیدا خوێنی حەیزی لێ پەیدادەبێ و دەکەوێتە عادەی مانگانەیەوە.

ئەم خانە پچکۆلە متوربە بووە؛ کە لەبەر پچوکی بەزەرەبینی پێشکەوتوو نەبێ نابیندرێ، بێ فام و تواناو ویست و هێزە، هەر لەگەڵ لە منداڵداندا سەری کرد بەناو گەرایەکداو متوربە بوو جێگیربوو دەست دەکا بە هەوڵ و تەقەللادان بۆ دابینکردنی بژێو، چونکە خودا بە چلێسی دروستی کردوە هەمیشە خۆراکی دەوێ، ئیتر دەستی قودرەت کەش و هەوایەکی وای بۆ دەخولقێنێ کە بەئاسانی بژێوی پێویستی بۆ دەستەبەر ببێ. بەم جۆرە پەروەدگار دیواری منداڵدانی بۆ دەکاتە حەوزێکی خوێنی رەوان و گونجاو بۆ بژێو، بژێوێکی تەڕو تازەی بۆ دەستەبەر دەبێ. ئەمجار کە بژێوی بۆ دابین بوو، دەست دەکا بە گردوکۆی بەردەوام بۆخانە دروستکردن و دابەشبونیان بۆ پێکهێنانی جەستە. هەر کۆمەڵە خانەیەك بە قودرەتی خودا چۆن ئاراستە دەکرێن و پێویستە چ ئەندامێکیان لێ پێك بێ، لەوێ کۆمەڵ دەبن و ئەو ئەندامە پێك دێنن، بەم جۆرە بینای جەستەی ئادەمیزاد

دادەمەزرێ، هیچ کامێ لەم خانانە کە ئاراستە دەکرێن بۆ پێکهێنانی ئەندامەکانی جەستە، ڕێگەی خۆیان هەڵناکەن، ئەو خانانەی گەرمکە چاویان لێ پێك بێ، ناچنە شوێنی لوتو لوتیان لێ پێك نایە. هەروەها ئەو خانانەی چاو لە شوێنی خۆی پێك دێنن ناچنە شوێنێك کە جێگای ئاسایی چاونیە. هەر بەم جۆرە هەموو پارچە ئیسقانێك، هەموو ماسولکەیەكو ڕەگو دەمارێك....... هتد خانەی تایبەتی خۆیان بۆ ئاڕاستە دەکرێو لەشوێنی خۆیدا دروست دەبێ!!

وەلێ ئەم دروستبوونە هەروا بە ئاسانیو سادەیی نیە، بەڵکوو وردەکارییەکی زۆر سەیرو سەمەرەی تێدایەو دەستی قودرەت ڕێکیان دەخا، خودا بۆ خۆی چاودێرو سەرپەرشتیارە بەسەر پێکهێنانی ئەم ملیارەها جەستەو ئەندامانەدا. هەر ئیسقانێك لەو ئیسقانانە، هەر ماسولکەیەك لەو ماسولکانە، هەر دەمارێك لەو دەمارو ڕەگانە هی ئەم جەستە ناشوبهێنێتە هی جەستەیەکی تر هەر خانەیەکی پچوك: کە ئاڕاستە دەکرێ ڕێبازی خۆی دەزانێ، دەزانێ بۆ کوێ دەچێو چی پێك دێنێ! ئەو خانانەی چاویان لێ پێك دێ دەزانن چاو لە جەستەی ئادەمیزاددا لەکوێ دروست دەبێ، بۆ ئەو شوێنە دەچێو ناچێ لەپشت یان لەسەر ئەژنۆو لەلاقەبرغە چاو پێك بێنێ. دەی کێ ئامۆژگاری ئەم خانانە دەکاو کێ ئاڕاستەیان دەکا؟؟ بێگومان ئەو ئەندازیارو چاودێرو سەرپەرشتیارە (الله)یە ئەو ئاڕاستەیان دەکاو ڕێگایان نیشان دەدا.

هەموو ئەو خانانە بە تاكو کۆ، تایبەتمەندی نژادو ڕەچەڵەکیش دەگوێزنەوەو جۆری نژادو تایبەتمەندییەکانی (ویراثة) بە ئەمانەتەوە پارێزگاری دەکەن، ڕەنگو دەنگو شێوەو شکڵەکان چۆن لەو خانە پچکۆڵەدا گوێزرانەوە؟؟ ئەم فیکرو بیروبۆچوونەیان چۆن تێدا خولقا؟ ئەو صیفاتە نەفسیانە چۆن دروست بوون؟ بێگومان ئەمە کاری کردگارەو دەسەڵاتی بێ سنووری پەروەدگارە، سات دوا سات چاودێرو بەدیهێنەریەتی. بێگومان مەسافەی نێوان دڵۆپە ئاوی بەتەکان ڕژێندراو بۆ ناو دەرگای منداڵدانی ئافرەتو ئادەمیزادی خاوەن بیرو هەستو هۆش زۆر دورو

درێـژو سـەرنج ڕاکـێش‌و سـەیرو سـەمەرەیە، زانیـاری ئـادەمیزاد نـاتوانێ هـەمووی بزانێ‌و بیـاژمێرێ، خـۆ ئەگـەر بیـشیانزانێ زۆری دەوێ‌و لێـرەدا جێگـای نابێتـەوەو پێویـستی بـە چـەندان جڵد کتێـب هەیـە تێیـدا بنووسـرێ، دەی کەسـێك بتـوانێ ئادەمیزاد بەو شێوە سەیرو سەرنج ڕاکیشە لەسـەرەتاوە دروست بکاو ئـەو هـەموو دیاردە تایبەتی‌و ڕەوشتە مادی‌و مەعنەوییانەی تێدا بەرجەسـتەبکا، چۆن نـاتوانێ دوای مـردن جارێکی تـر زینـدویان بکاتـەوە؟! ئـەمجار بابـچینەوە سەرباسـی ئـەو کیـسۆڵکەی کەلەسـەر لێـواری گەرادانەکـە لـەت دەبـێ، پـاش لـەتبوونی پڕدەبێ لـە خوێن، لەپاشا لەجیاتی خوێنەکە شتێکی زەردی لێ پەیدا دەبێ، ئەم شتە زەردە: کە بەشـێکە لـە هۆرمۆنـاتی گـەرادانی ئـافرەت پەیوەسـتیەکی بـەهێزی دەبـێ لەگـەڵ مەمکی ژنەکە. ئەم هۆرمۆنە پابەستەو چاوەڕێی ئـەنجامی گەرایەکەو هـەردوکیان زادەی کیـسۆڵەکەن‌و لـەوەوە دەرچـوون، جـا ئەگـەر گـەرا توشـی گیانـدارانی تـۆوی نەبوو پێکەوە متوربەبن، ئەوا پاش ماوەیەك ئاوە زەردەکەش‌و گەراکـەش نـامێنن‌و ئافرەتەکـە توشـی عـادەی مانگانـەی ئاسـایی خـۆی دەبـێ. وەلێ ئەگـەر گـەرا توشـی گیاندارانی تۆوی بوو متوربـە بـوون پێکـەوە، بناغـەی کۆرپەڵە دامـەزرا، ئـیتر ئـەو دەمە ئاوە زەردەکەو ئەو هۆرمۆنەی هەیەتی سێ کاری سەرەکی ئەنجام دەدەن:

١. ناهێڵێ کیسۆڵەی تـر دروسـت بـبن بـۆ ئـەوەی لـە مـاوەی ئـەم سـکەدا گـەراو گیانداری مەنەوی تر متوربەنەبن.

٢. منداڵدان ئامادە دەکات بۆ ئەوەی بگونجێ کۆرپەڵە تێیدا پەروەردە ببێ.

٣. مەمك ئامادە دەکات بۆ گەورە بوون‌و ژیانەوە، کەوابێ گەراو سنگ‌و مـەمکی ژن پەیوەندییەکی بە هێزیان بەیەکەوە هەیە.

کارسازو بەدیهێنەر ئەو خودایەیە: کەلەو دڵۆپە ئاوەی پیاووژن ئەم ئادەمیزادە جـوان‌و قەشـەنگ‌و زیتـە ئـاوا بـەدی دێنـێ؛ ئـەم ڕەوشـتە جـۆراو جـۆرەی تێـدا

دەخـولقێ، بـەو شـێوە سەرسـوڕهێنەرە قەڵـەمی ئەندامـەكانی دەكێـشێو چـاو تروكانێـك لێـی بـێ ئاگا نـابێ، هەمیـشە چاودێرو پارێزەریـەتی ئـەمجار دوای ئـەم پرسیارو وەڵامەو زانینی چۆنیەتی دروستبوونی سەرەتاو قۆناغەكانی دروستبوون: كـە هـەموویان نیـشانەی دەسـەڵاتی رەهـای پـەروەدگارن، باسـی زیندوبوونـەوەی دوامردن دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ، يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾ بێگومـان پـەروەدگار توانـای تـەواوی هەیـە دوای مـردنو رزینـی جەسـتە سـەر لـەنوێ ئادەمیزادەكان زیندوبكاتـەوە. كەسێك بتـوانێ سـەرەتا ئـاواو بـەو جـۆرە لـە دڵۆپـە ئاوێـك ئـادەمیزاد دروسـت بكـا، ئـەو دڵۆپـە ئـاوەش لـە خواردەمـەنی پەیـدابووەو خواردەمەنییەكەش لەچەند پێكهاتەیەكی زەوی پەیدابووە! دیـارە دوا مـردنو لێـك بـڵاو بـوونی جەستە بەئاسانی دەتوانێ سـەرلەنوێ ئـەو ئـادەمیزادە وەكـوو خـۆی درورست بكاتەوە. بەتەئكید دروستی دەكاتـەوە لەرۆژێكدا كـەنهێنـیـەكان ئاشـكرا دەبن، هەرچی نیـازو بـیرو بـاوەڕی ناودڵەكان هەیـە دەردەكـەونو هـیچ شـاراوەیەك نامێنێ ﴿فَمَا لَهُ مِنْ قُوَّةٍ وَلا نَاصِرٍ﴾ ئادەمیزاد لەو رۆژەدا: كە زیندودەبێتـەوە، نـەبۆ خۆی هێزو توانای بەرگری كردنی لەخۆی هەیە، نە كەسێكیش هەیە یارمەتی بداو عەزابی خودای لێ دوور بخاتەوە. نەهێزی خۆی نەهێزی دەرەكی هیچیانی نیە.

## سوێند خواردن لەسەر راستی قورئانو راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد

﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ (١١) وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ (١٢) إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ (١٣) وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ (١٤) إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا (١٥) وَأَكِيدُ كَيْدًا (١٦) فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا (١٧) ﴾

لەوەپێش تاك و تەنهایی خودای سەلماند، ئاماژەی بۆ ئەوەكرد: كە پەروەدگار دەسەڵاتی رەهای هەیە لەسەر دروستكردن و زیندوكردنەوە. ئەمجار سوێند دەخوا لەسەرئەوە: كە قورئان كەلامی خودایەو لە خوداوە نازڵ بووە بۆسەر حەزرەتی موحەممەد. ئەمجار هەڕەشەی توند لەوانە دەكا: كە دژی پێغەمبەرو موسوڵمانان پیلان دادەڕێژن. دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ﴾ سوێند بە ئاسمان كە خاوەنی بارانە، ساڵانەو وەرزانە بەپێی پێویست بارانی لێ دەبارێ، بەم جۆرە بەهۆی تیشكی خۆرەوە لە دەریاكانەوە هەڵم هەڵدەستێ و بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمان و ئەمجار لەوێوە بە گوێرەی پێویست دەبارێتەوە سەرزەوی. زەوی وشك و سوتەمەرو زیندودەكاتەوەو خواردەمەنی پێویست بۆ گیانداران دابین دەكرێ ﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾ سوێند بەزەوی خاوەن قڵیش كە چڵەگیاو نەمام و چروزە سەری لێ دەردێنن، ئاوو نەوت و كان و كانزای جۆراو جۆری لێ دەردێندرێ و پێداویستی ژیانی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تری تێدا دەستەبەر دەبێ. سوێند بە ئاسمان و بەزەوی: كە بەو جۆرەن ئەم قورئانە كەلامێكی حەق و راستە، گومانی تێدانیە لە خوداوە هاتووە. حەق و بەتاڵ لێك جیادەكاتەوە. ﴿إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ﴾ سوێند بە ئاسمان و بە زەوی: كە بەو جۆرەن ئەم قورئانە كەلامێكی حەق و ڕاستە، گومانی تێدانیە لە خوداوە هاتووە حەق و بەتاڵ لێك جیادەكاتەوە. ﴿وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ﴾ بە بێهودەو گاڵتە بازاڕ نازڵ نەكراوە، شیعرو سیحرو فاڵ و ئەفسانە نیە، لە خوداوە نازڵ بووە، فریشتەی ئەمین و دەستپاك بە نیگاو سروش بۆ حەزرەتی موحەممەدی هێناوە، هیچ دەستكاری و گۆڕانكاری تێدانەكردوە.

تیرمیذی و داریمی لە ئیمامی عەلییەوە ریوایەتیان كردوە، دەڵێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: لەوە بەولاوە فیتنەو ئاشوب پەیدا دەبن، وتم: ئەوكاتە چارەمان چیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: قورئان بگرن و بەری مەدەن، پابەندی نامەی خودابن بەسەرهاتی رابوردوان و هەواڵی داهاتووی تێدایە. قانون و یاسایە بۆ

یەکالاّ کردنەوەی کێشەکانتان نامەیەکە حەقو بەتاڵ لێك جیادەکاتەوە، هەرکەسێ بە لوتبەرزی پشتی تێ بکا خودا تێکی دەشکێنێ، کەسێك بە تەمابێ هیدایەتو بەختەوەری لە غەیری رێبازی قورئان دەست بکەوێ، خودا گومڕای دەکا. قورئان حەبلی پتەوی پەروەردگارە هەرکەسێ خۆی پێ هەڵواسێ رزگاری دەبێ. نووری ئاشکراو نمایانی خودایە، یاد خەرەوەی پڕ حیکمەتە، رێبازی راستو حەقە، هەرکەسێ پابەندی بێ سەری لێ ناشێوێ، راڕاو دڵە راوکێی توش نابێ، زانایان لێی تێر ناخۆن، تەقوا کاران لێی وەڕەز نابن، چەند بیخوێنیەوەو دووبارەی بکەیەوە کۆن نابێ هەموو کاتی موعجیزەیەو جێگای سەر سوڕمانە.

قورئان ئەو کەلامەیە کاتێ پەرییەکان گوێیان لێ بوو وتیان: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ﴾ الجن/١_٢ کەسێك فێری ببێ پێشکەوتووە، کەسێك بە قورئان بەڵگە بێنێتەوە راستگۆو حەق بێژە، کەسێك بە قورئان حوکم بکا عادڵو داد پەروەرە، کەسێك کار بە قورئان بکا پاداشی باشی دەدرێتەوە، کەسێك بانگەوازی بۆ رێبازی قورئان بکا هیدایەت دراوەو لەسەر رێبازی راستە[١].

ئەمجار خودا هەڕەشە لەوانە دەکا پەیامی قورئان رەتدەکەنەوەو پیلان دژی موسوڵمانان دادەرێژن. دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْداً﴾ سەرانی قوڕەیشو هەواخواهانیان پیلان دژی پێغەمبەر (دخ) دادەرێژنو هەوڵ دەدەن ئایینی ئیسلام بکوژێنەوە، دەیانەوێ خەڵکی لە رێبازی قورئانو خودا لابدەن، بە قسەو چاووڕاو. بەربەرەکانی دەکەن، دەڵێن: قورئان چیرۆکە کۆنو ئەفسانەیە، موحەممەد ساحیرو جادو بازە، یان شێتو شاعیرە، بەهەموو جۆرێك کودەتاو موئامەرە دروست دەکەن بۆ ئەوەی پێغەمبەر(دخ) لەناوبەرن یان لە مەککە دەری بکەن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ﴾الأنفال/٣٠.

---

[١] تیرمذی لە کیتابی (فضائل القران) دا بابی (١٤) ژمارەی حەدیث (٢٩٠٦) ریوایەتی کردوە.

﴿وَأَكِيدُ كَيْداً﴾ منیش جڵەویان بۆ شل دەکەمو کێشیان دەکەم بۆ ناو گومڕایی، ئــەمجار ســزای پــیلانو تاوانــەکانیان لێ دەســتێنم، نــاهێڵم هــەروا بــە ئاســانی بەسەریانەوە بچێ. ﴿فَمَهِّلْ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْداً﴾ مۆڵەتی کافرەکان بدەو پەلە لە بەهیلاکچونو فەوتانیان مەکە. کەمێك چاوەڕوان بەو مۆڵــەتیان بــدە، بزانــە خــودا چییان لەگەڵ دەکا. دڵنیابە خودا مۆڵەتیان دەدا، بەڵام ئیهمالیان ناکا. تۆڵەی خــودا بەسەبرە بەڵام بە زەبرە!! وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفــەرموێ: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ لقمان/٢٤ .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی الأعلى

ئەم سورەتە مەککییەو نۆزدە ئایەتــە. نــاوی نــراوە ســورەتی ئــەعلا چونکە بــە ئایەتی ﴿سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى﴾ دەستی پێ کــراوە، نــاوەڕۆکی ســورەتەکەش وەکوو باقی سورەتە مەککییەکانی تر بریتییە لە باسی یەکتاپەرستیو پاكو بەرزی زاتو صیفاتی پەروەدگار لە هەموو عەیبو کەمو کوڕییەك.

﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۚ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾ ﴾

جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: کە خودا زاتو صیفاتو نــاوو کــرداری، حــوکمو بڕیــاری، بــێ خــەوشو لەککــەن. شکۆمەندو بــەرزو پــیرۆزە، حــەزرەتی موحــەممــەد

پێغەمبەرو فرستادەی خودایەو فێری قورئانی دەکاو ناهێڵێ ل بیری بچێتەوە. ئەوەش دوپات دەکاتەوە: کە هەرکەسێك خۆی لە کوفرو هاوەڵدانان بۆ خودا دوربخاتەوەو قیامەتی لەدونیا مەبەست تربێ. ئەوە رزگاری بووەو بە مراز گەیشتووە. دەفەرموێ: ﴿سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ تەسبیحاتو تەنزیهی خودا بکە لەهەموو شتێك: کە شیاوی ئەو نیە، هەرچی کەمو کوڕیو عەیبو عارە لە خودای دووربخەرەوە، بڵێ: ﴿سبحانه ربی الأعلی﴾ ناوو صیفاتی خودا بۆ کەسی تر بەرەوا مەزانە، هیچ شتێکی تر مەکەرە هاوەڵو هاوشانی خودا، هەمیشە بە گەورەو بەرزو پیرۆزی بزانە.

ئیمام ئەحمەدو ئەبو داودو ئیبنو ماجە لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە ریوایەت دەکەن: دەڵێ: کە ئایەتی ﴿فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ نازڵ بوو، پێغەمبەر(دخ) پێی فەرمووین: بیخەنە روکوعی نوێژتانەوە. کە ئایەتی ﴿سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ نازڵ بوو فەرمووی: بیخەنە سوژدەی نوێژەکانتانەوە.

ئەمجار چەند صیفاتێك بۆ ئەو خودا بەرزو شکۆمەندە دەهێنێ کە نیشانەی خودایەتیو توانای بێ سنورینیو دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى﴾ ئەو خودایەی هەموو بونەوەری بەدیهێناوە: کە بەشێك لەو مەخلوقاتە ئادەمیزادە، هەموو شتێکی دروست کردوە لەسەر شکڵو شێوەی جوانو نایاب، هەرشتە بە شێوەیەكو هەر رەگەزە بە جۆرێك: کە ئەو پەڕی تەنسیقو گونجان لە نێوانیاندا بەرچاو گیراوە هەریەکە لەتاکی بونەوەرو تێکڕا نیشانەی داناییو کار دروستی خودای زاناو خاوەن حیکمەتە. ﴿ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾ ئەو خودایەی ئەندازەی هەموو شتێکی گرتووە، بۆ هەموو دروستکراوێك شتێکی بۆ داناوە: کە لەگەڵی دا گونجاوبێ. نەخشەی هەموو رەگەزێکی کێشاوە، چەندییەتو چۆنیەتی هەموو شتێکی دەست نیشان کردوە. هەموو گیانلەبەرێکی دروست کردوەو رێگای ژیانی تایبەتی خۆی فێرکردوە، هەریەکە لەو هەزاران جۆرە زیندەوەرانە رێبازی ژیانی خۆیو

چۆنیەتی دابینکردنی بژیوو هۆکاری ژیانی فێرکردوە، هەموو گیانلەبەرێك چاكو خراپی خۆی دەزانێ، بەپێی سروشت ئەو شتانەی پێویستی ژیانی بن فێریان بووە. باڵندە لە هیلانەی خۆی دەردەچیّو دەگەڕێ بەدوی بژێووا کە تێربوو دەگەڕێتەوە بۆ هیلانەکەی خۆی، ئەگەر بێچوی هەبن بەشی ئەوانیش دەباتەوە.

هەنگ شانە هەنگوینی خۆی جێ دێڵێو بەیانی زوو دەردەچێ، چەندان کیلۆمەتر لە هەنگەلانی خۆی دوور دەکەوێتەوەو دەست دەکا بە گەڕان بە ناو گوڵو گوڵزارا بەناو درەختو گژوگیای جۆراوجۆردا، بۆ کۆکردنەوەی هەلاڵو بۆ ناو خواردنەوە، کە کاری تەواو بوو یان ئێوارەی لێ هات لەشوێنی خۆی بەرز دەبێتەوەو بەرەو هەنگەلانی خۆی دەگەڕێتەوەو قەت ڕێگای لێ گوم نابێ[٦]. جاڵجاڵۆکە ماڵی خۆی بە جۆرێکی وا دەتەنێ ڕەنگە ئادەمیزاد نەتوانێ ئاوا بەرێكو پێکی بیتەنێ، لەوانەیە ئادەمیزاد لە تەنینو چنینی خۆیدا هەڵە بکا، بەلام جاڵجاڵۆکە هەرگیز هەڵەناکات. لەهەموو شتێك سەیرتر ئەو رایەڵو پۆیەی ئامادەی دەکا بۆ تەنین کەتیرەیەکی لینجی وای لێ دەدا؛ کە ئەگەر بایەك هەڵبکا یان هەر شتێکی تر بیەوێ ریسەکەی لێ ئاڵۆز بکا، یان لێی تێك بدا لێ تێك نەچێ. ئەگەر مێشێك لێی بکەوێ بەهۆی لینجی کەتیرەکەوە پێوەی دەنوسێو دەبێتە خۆراکی جاڵجاڵۆکە خۆی.

ئەتۆ بەشەوی تاریکی هەنگوستە چاو گوێرێژێك هێسترێك لە بیابان پێش خۆت بدەو دوای کەوە بەناو شیوو دۆڵو سارادا ڕێچکەی خۆی دەبینێو پێیدا دەڕوا تا دەگاتەوە شوێنی خۆی هیچ ریگای لێ تێك ناچێ. کۆمەڵێك ڕەشەوڵاغ لەکێو: کە شەویان لێ هات بۆ خۆیان لە شوێنێك گرد دەبنەوەو پاشیان تێك دەکەنو هەریەکەیان ڕودەکاتە لایەكو خۆیان ئامادە دەکەن بۆ پارێزگاری لە خۆیان. ماسی (سەلمون)ی پچوك ساڵەها بەناو دەریادا دەڕوا کەچی دوایی دەگەڕێتەوە بۆلای ئەو

[٦] لە سورەتی (النحل) لە ڕاڤەی ئایەتی ﴿ وأوحى ربك الى النحل.....﴾ لەبارەی ژیریو کارامەیی هەنگ شتێکمان نوسیوە دەتوانی سەیری بکەی.

چۆمیلکەی تێیدا لە دایك بووە! ئەگەر رەشەبایەك پەپولەیەكی مێینەی لە پەنجەرەیەكەوە بە زۆرێكدا كردو پەنجەرەكە داخرایەوە، پاش ماوەیەك ئەم پەپولە مێیە ئیشارەتێك دەدا بە پەپولە نێرەكەو تێی دەگەیەنێ لە كوێیە، ئەوانیش خێرا وەڵامی دەداتەوە! وادەبێ پەپولە نێرینەكە زۆر لێی دوورە كەچی ئیشارەتەكە دەبیسێ‌و یەكتری حاڵی دەكەن، دەی باشە خۆ هیچیان تەلەفۆن‌و مۆبایلیان پێنیە چۆن یەكدی حاڵی دەكەن؟ لەمەش سەیرتر ماری ئاوییە هەركاتێ گەورەبوو وەختی ئەوەی هات گەرا دابنێ، گۆماوو چۆمەكان بەجێ دێڵێ‌و رودەكاتە دەریاكان، هەزاران كیلۆمەتر بەناو ئۆقیانووس‌و دەریا لوشەكاندا دەبڕێ‌و دەچێتە قوڵایی ترین شوێنی دەریاوە لە باشوری (بەرمودا) لەوێدا گەرا دادەنێ‌و دەتۆپێ، بێچوەكانی لەو قوڵاییەدا كە دەست‌و دوی خۆیان دەناسن بە هەمان ئەو رێگایەی دایكیان پێی داهاتووە، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی دایكەكەیان لێیەوە هاتووە، دەچنەوە هەمان گۆماوو چۆمی پێشوو: كە شوێنی دایكیان بووە!!

لەم بارەوە نموونە زۆرن‌و لە ژماردن نایەن. هەموو ئەو نموونانەو سەدانی ترو هەزارانیتر نیشانەی ئەوەن: كە خودایەكی زاناو داناو ئاگادار هەیە، ئەو رێنمویی هەموو گیانلەبەرێك دەكا بۆ دۆزینەوەی رێبازی ژیانی خۆی!!

﴿وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَى﴾ ئەو خودایەی: كە هەموو جۆرە گیاو گژێكی لە زەوی دەرهێناوەو هەر جۆرەیان بۆ خۆراكی جۆرە گیانلەبەرێك دەگونجێن، هەندێكی بە كەڵكی ئەوەدێ ئادەمیزاد بیخوا، هەندێكی تری دەبێتە خۆراك‌و ئالفی ئاژەڵ‌و باقی گیانلەبەرانی تر. ﴿فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَى﴾ پاشان ئەو گژوگیا جوان‌و سەوزو ناسكەی كرد بە پوشێكی رەش هەڵگەڕاو، ورد بوو هەنجن هەنجن كراو، هەر بەو جۆرە كە هەموو سەوزایی‌و گژوگیایەك دەبێتە پل‌و پوش‌و سەرەنجام لەناودەچێ، هەموو زیندوێكیش سەرەنجامی مردن‌و لەناوچوونە. جا چونكە ئەو تەسبیح‌و تەنزیهەی خودا فەرمانی بە پێغەمبەر(دخ) كرد: كە ئەنجامی بدا فێری موسوڵمانانیشی بكا، هەر ئەوە بۆ خودا گونجاوەو پێ رازییە، پێغەمبەر(دخ) زۆر مەبەستی بوو بیزانێ‌و

لەبەر بکا، مەبەستی بوو ئەو قورئانەی خودا بۆی ناردوە لەبەری بکاو لە بیری نەچێتەوە، بۆیە خودا وادەی پێدا بەوەی: کە قورئانی فێردەکاو لە دڵیدا دەیچەسپێنیو ناهێڵێ لە یادی بچێتەوە، هەر لەو قورئانەدا چی مسبیحو تەنزیهی پێویست هەیە دەست دەکەوێ، هەرچی پێویستە لەناوو صیفەتەکانی خودا بزاندرێ تێیدایە، هەرچی بۆ خودا نەگونجێ لێی دوور دەخاتەوە ئەو سروشو نیگایەی کەبۆی دەنێرێ هەر بەیەکەمجار دێتە بەریو ئیتر لە یادی ناچێتەوە. دەفەرموێ: ﴿سَنُقْرِئُكَ فَلا تَنسَى، إِلاّ مَا شَاءَ اللَّهُ﴾ لەوە بەولاوە قورئانت بەسەرا دەخوێنینەوە، وات لێ دەکەین قورئان بخوێنیەوەو لەبیرت نەچێتەوە. مەگەر شتێك خودا بیەوێ لەبیرت بچێتەوە، ئەگەر خودا بیەوێ شتێکت لەبیر بچێتەوە لەبیرت دەچێتەوە، بەڵام خودا شتی وات لەگەڵ ناکا.

هەندێك پێیان وایە: مەبەست بە چەرتکردنەکە ئەو ئایەتو حوکمانەن کە نەسخ بونەوە، واتە ناهێڵین ئەوەی دەیخوێنیەوە لەبیرت بچێتەوە مەگەر ئەوەی نەسخی دەکەینەوەو خودا دەیەوێ حوکمەکەی هەڵگیرێو خوێندنەوەکەیشی نەسخ بکەینەوە ، ئەوە تۆ وازی لێ بێنە.

﴿إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَى﴾ بێگومان ئەو خودایەی ئەو بەڵێنانەی پێدای ئاگاداری ئاشکراو نهێنییە، دەزانێ بەندەکانی بەئاشکرا چی دەکەنو چی دەڵێن، بەنهێنی چی دەکەنو چی دەڵێن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرمووی: ﴿إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ﴾ (الانبیاء/١١٠)

ئەمجارە مزگێنییەکی تر بە پێغەمبەر(دخ) دەداو دەفەرموێ: ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَى﴾ کاری خێرو گوفتاری باشت بۆ ئاسان دەکەین، شەریعەتێکی گونجاو لەگەڵ سرشتی

ئـادەمیزادو ئاسانت بـۆدەنێرین، تـۆ فیقت دەدەیـن بـۆ پـەیڕەوی کردنـی، هـەموو کەسێکی ژیرو خاوەن عەقڵو فام تێی دەگەن!!

## بیرکردنەوە لە بوونەوەرو پاککردنەوەی نەفسو کارکردن بۆ دوارۆژ

﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾

لەوەپێش دوو موژدەی بە پێغەمبەر(دخ) دان، یەکێکیان لەبـەرکردنی قورئـانو فێربوونیو لەبیر نەچونەوەی. دووەمیـان یارمەتیـدانو تۆفیقـدان بـۆ تێگەیـشتنو ئاسانکاری بۆ کردن بۆ شەریعەتێکی ئاسانو گونجاو.

ئـەمجار فـەرمان بـە پێغەمبـەر(دخ) دەکـا: کـە ئامۆژگـاری ئـادەمیزاد بکـا بـۆ هەرشتێك سودی دونیاو قیامـەتیانی تێـدابێ. بانگـەوازییان بکـا بـۆ ڕێبـازی حـەقو ڕاسـتی، دەفـەرموێ: ﴿فَـذَكِّرْ إِنْ نَفَعَـتْ الـذِّكْرَى﴾ ئـەی موحەممـەد! ئامۆژگـاری ئادەمیزاد بکە بە قورئان، قورئانیان بۆ بخوێنەو بۆیـان شـی بکـەرەوە. شـارەزاییان بکە بۆ ڕێبـازی خێـرو چاکە، شـەریعەتو ئایینیـان فێربکـە، لـە خـەوی بـێ هۆشـی بیـداریان بکـەرەوە، ئەگـەر بێدارکردنـەوە سـوودی هـەبێ. چـونکە ئـادەمیزاد دوو جـۆرن، جۆرێکیـان سـود لـە ئامۆژگـاریو بێدارکردنـەوە وەردەگـرن. هەندێکیـشیان

سوودی لێ وەرناگرن. ﴿سَيَذَّكَّرُ مَنْ يَخْشَى﴾ پەندو عیبرەت وەردەگرێو بیر لە پەندو ئامۆژگاریەکانت دەکاتەوە ئەو کەسەی کە لەخودا بترسێ. هەر کەسێ ترسی خودای لە دڵ دابێو بزانێ: کە زیندوبوونەوە هەیە، سوود لە ئامۆژگاریو بیرخستنەوەکەت وەردەگرێ. وەڵێ کەسێك سووربێ لە سەر کوفرو سەررەقی، هیچ سود لە ئامۆژگاری کردنی دا نیە. زۆر کەس وا هەیە پەردەی رەش بە سەر دڵو دەروونی دا هاتووە، هیوای ئەوەی لێ ناکرێ پەندو ئامۆژگاری کاری تێ بکا، بەلام تۆ ئەی موحەممەد! ئامۆژگاری خۆت بکەو ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدە سودی دەبێ یان نایبێ ئەوە پەیوەندی بە تۆوەنیە. بەلام دەبێ هەر کەسە بە گوێرەی عەقڵو فامی خۆی قسەی لەگەڵدا بکرێ.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: لەماناى ئەم ئایەتەوە ئەوەمان بۆدەردەکەوێ کە بلاوکردنەوەی زانیاری دەبێ بە پێو دان بێ، بزانی قسە لەگەڵ کێ دەکەیو چی تێدەگا، هەر کەسەو بە گوێرەی خۆی زانیاری پێ بدەی، کەسێك شیاوی عیلم وەرگرتن نەبێ خۆتی لەگەڵ ماندو نەکەی.[٧] دەیلەمی لە (الفردوس)دا لە ئیمامی عەلی یەوە، بوخاریش (بەمەوقوفی لەسەر عەلی) دەڵێ: بە جۆرێك قسە لەگەڵ خەڵك بکەن: کە لێی حاڵی بن، قسەیەکیان بۆ بکەن عەقڵیان وەری بگرێ. ﴿أتريدون أن يكذب الله ورسوله﴾ ئایا دەتانەوێ خوداو پێغەمبەر بەدرۆ بخرێنەوە؟ حەزرەتی عیسا(دخ) فەرموویەتی: پەندو حیکمەت بە کەسێك مەڵێن: کە شیاوی نەبێ، ئەگەر وا بکەن ستەم لە حیکمەتەکە دەکەن، کەسێکیش ئەهلی حیکمەت بوو لێی مەنع مەکەن، ئەگەر لێی مەنع بکەن ستەم لەو کەسە دەکەن. پێویستە ئێوە وەکوو پزیشك وەهابن بزانن نەخۆشەکە چییەتی، دەرمانی ئەو نەخۆشییەی بدەنێ. ﴿وَيَتَجَنَّبُهَا الأَشْقَى، الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَى، ثُمَّ لا يَمُوتُ فِيهَا وَلا يَحْيَا﴾ خۆی لە بیرکەوتنەوەو ئامۆژگاری دوور دەخاتەوەو کافرو بەدبەختی خراپ، هیچ

[٧] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٤/ ٢٠٢٠

کەڵکی لێ وەرناگرێو سوردەبێ لەسەر کوفرو بێدینی خۆی. بۆیە ئەو بەدبەختە توشی ئاگری دۆزەخ دەبێو ئازارەکەی دەچێژێ، ئەو بەدبەختەی دەچێتە ناو ئاگری گەورەوە: کە ئاگری دۆزەخەو بە ئێجگاریو بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە، ئیتر نە دەمرێو بۆ خۆی ئیسراحەت بکاو لە ئاگر رزگاری بێ. نە دەژیا بە ژیانێك پێی بگوترێ ژیان.

دوای هەڕەشە کردن لەوانەی روو لە ئامۆژگاریو پەیامی قورئان وەردەگێڕن، وادەی خێرو خۆشی بە خودا پەرستان دەدا، دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى، وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى﴾ بێگومان بە مراز گەیشتووەو رزگاری بووە لە عەزابی دۆزەخ، کەسێك خۆی پاك کردۆتەوە، بڕوای بە تاكو تەنهایی خودا کردوەو پابەندی شەریعەتی ئیسلام بوەو خۆی لە رەوشتی ناشرینو فەسادو ئاشوب پارازتووە. بە زوبان دان بە تاكو تەنهایی خودا دەنێنو دڵسۆزن بۆ ئایینو لەدڵدا ناوی خودایان لا گەورەو بەرزو پیرۆزە، نوێژەکان بە رێکو پێکیو لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدەن، بە هیوای وەدەستهێنانی رەزامەندی خودانو گەردنکەچی فەرمانی پەروەدگارن. بە گوێرەی پەیامی قورئان هەڵسو کەوت دەکەن!

ئەمجار سەرزەنشتی ئەوانە دەکا: کە گرنگی زۆر دەدەن بە دونیاو قیامەت پاشگوێ دەخەن، دەفەرموێ: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، وَالآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ بەڵکوو گرنگی زۆر دەدەن بە ژیانی دونیاو ئەو ژیانە کورتخایەنە هەڵدەبژێرن بەسەر ژیانی قیامەتدا. ئەوەی فەرمانتان پێکراوە بە ئەنجامدانی نایکەن، لەززەتو خۆشی کەمو کورتخایەنی دونیا هەڵدەبژێرن بەسەر ژیانی هەتا هەتاییو نازو نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشتی بەریندا، بەچ عەقڵێك پاساوی دونیای فانی بەسەر قیامەتی نەبڕاوەدا دەدەن؟ وەلحاڵ ژیانی قیامەت گەلێ لە ژیانی دونیا خۆشترو باشترە، دەبوایە هەوڵتان بۆ ئەو ژیانە نەبڕاوەیە بدایە.

ئیمام ئەحمەد لە خاتو عائیشەوە ریوایەت دەکاو دەفەرموێ: پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: ﴿ الدنیا دار من لا دارله، ومال من لا مال له، ولها یجمع من لا عقل له﴾.

لەوەپێش مژدەی ئەوەیدا بە پێغەمبەر(دخ) کە ئاینێکی ئاسانو گونجاو لەگەڵ سروشتی دا بۆ دەنێرێو فێری دەکا ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئایینی ئیسلام لەگەڵ ئایینەکانی تردا لە بنیاتو بنەمادا یەکن، ئەگەر جیاوازییەکیان هەبێ لە فروعیاتدا هەیانە. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَـذَا لَفِي الصُّحُفِ الأُولَى، صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى﴾ ئەوەی گوترا: دەربارەی رزگاربوانو بە مراز گەیشتوان، ئەوانەی یادی خودا دەکەنو نوێژەکانیان لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدەن. هەروا دەربارەی ئەوانەی دونیا بەسەر قیامەتدا هەڵدەبژێرن، لەنامە پێشوەکانیشدا هاتووە لە نامەی ئیبراهیمو نامەی موسادا: کە لەپێش قورئاندا هاتوونە خوارەوە چەسپاوەو ئاماژەی پێ کراوە، بۆیە بەتایبەتی ناوی ئەم دوو نامە ئاسمانییەی هێنا چونکە لەناو کۆمەڵگای قورەیشییەکان بەناو بانگ بوون.

عەبدی کوری حەمیدو ئیبنو مەردەویهیو ئیبنو عەساکیر لە ئەبوزەرەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر(دخ) کرد، ئاخۆ پەروەدگار چەند نامەو صوحوفی نازڵی کردون لە وەڵامدا پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: سەدو چوار کتێب. لەوانە (دە) صحوفی بۆسەر ئادەمو (پەنجا) بۆ سەر شیت (سی) بۆ سەر ئیدریسو (دە) بۆ سەر موسا. ئەمجار خودا تەوراتو ئینجیلو زەبورو قورئانی نازڵ کردوە. بە کورتی بنەما سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلام بنیاتی هەموو ئاینێکن ئەگەر ئایینەکە گۆڕا ئەو بنەمایانە گۆڕانیان بەسەردانایە. دەی ئەگەر ئەوانە بڕوایان بە نامەو صحوی پێغەمبەرەکانی پێشوو هەیە بابڕواشیان بە قورئان هەبێ، چونکە ئەوەی لەواندا هەیە لە قورئانیش هەیە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سورەتى الغاشية

ئەم سورەتە ناوى نراوە سورەتى غاشيە، چونكە بە ئايەتى ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ دەستى پێ كراوە، غاشيە: ناوێكە لەناوەكانى رۆژى قيامەت، چونكە بە كارەسات و ديمەنى ترسناك ئادەميزاد دادەپۆشێ. سورەتەكە مەككييەو بيست و شەش ئايەتە. باسى بنەماكانى عەقيدەى لەخۆگرتووەو لە سێ تەوەرەدا دەخولێتەوە.

١. وەصفى روداو ديمەنەكانى رۆژى قيامەت ..

٢. سەلماندنى تاك و تەنهايى خوداى مەزن و رەهايى توانا و دەسەلاتى: كە دروستكردنى ئاسمان و زەوى و كێووكەژو حوشترو باقى شتەكان، ئاماژە بە بەديهێنەرى داناو زاناو خاوەن دەسەلاتى رەها دەكەن.

٣. كۆتايى سورەتەكە وەكوو كۆتايى سورەتى پێشوو باسى گەڕانەوەى ئادەميزاد دەكا بۆ لاى خوداو هەبوونى حيساب و لێكۆڵينەوە لەو رۆژەدا.

## ديمەنەكانى رۆژى قيامەت و وەزع و حاڵى دۆزەخيان

﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ ﴿٣﴾ تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ ﴿٤﴾ تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ ﴿٥﴾ لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ﴿٦﴾ لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ ﴿٧﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ ئەی موحەممەد هەواڵی هاتنی قیامەتت پــێ گەیـشتووە: کــە بــە کارەســاتو دیمەنــە ترســناکەکانی هــەموو ئــادەمیزاد دادەپۆشن!! واتە: لەوەپێش باسی ئەم کارەساتەت بۆ نەهاتووە، ئـەوا ئێـستا بۆمـان ناردی باشیشیان گوێ لێ بگرەو لێی حاڵی بە. مەبەسـت بـەم ( اسـتفهام)ە مانـای پرسیار نیە. بەڵکوو ئامادە کردنی بیسەرە بۆ وەرگـرتنو گرنگـی پێـدانیو وابزانـێ ئـەوەی لـەوەدوا بـۆی بـاس دەکـرێ شـتێکی عەجیبـەو بەباشـی وەری بگـرێ بۆیـە پێغەمبەر(دخ) زۆری گرنگی بەم سورەتە دەدا، هەرکاتێ گوێی لێ دەبـوو وایـدەزانی یەکەمجارە گوێی لێ دەبێ. ئـەبو ئیـسحاق لـە عیمرانـی کـوڕی مەیمونـەوە ڕیوایـەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر(دخ) بەلای ئافرەتێکدا تێپـەڕی ﴿هَلْ أَتَاكَ حَـدِيثُ الْغَاشِـيَةِ﴾ی دەخوێنـدەوە، ئـیتر پێغەمبـەر(دخ) ڕاوەسـتاو فـەرمووی: (نعـم قـد جـاءنی) بـەڵێ هەواڵم پێ گەیشتووە.

ئەمجار وەزعو حاڵی ئادەمیزاد لـە ڕۆژی قیامەتـدا بـەیان دەکـاو دەیانکاتـە دوو تاقم: بەدبەختو بەختەوەر، سەرەتا باسی بەدبەختـەکان دەکـا، چونکە میحوەری سورەتەکە هەڕەشەو ترساندنە، تەنانەت ناوی سورەتەکەش: کە (الغاشية) یە ئاماژە بۆئەو هەڕەشەو ترساندنە دەکا. دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ، عَامِلَةٌ نَاصِبَةٌ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا چەند دەمو چاوێك ـ مەبەست کافرو ستەمکارەکانن ـ سەر شـۆڕو چاو بـەرەوژێرو ترسـاوو ڕەنـگ ڕەش هەڵگـەڕاو، ترسـی ئـەو عەزابـەیان هەیـە: کـە لەپێشیانە، ماندوو شـەکەتو زەنـدەق چوو، وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُو رُؤُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِـمْ﴾ الـسجدة/١٢ بێگومـان ئەوانـە لـەدونیادا کـردەوەی باشـیان زۆر کـردونو زۆریـان خۆمانـدو کـردوە، بـەڵام هـیچ پاداشـتێکیان نیـە چونکە ئیمانیـان نـەبووە. کـردەوەی بـاش بـەبێ هـەبوونی بـیرو بـاوەڕی ڕاسـت بـێ سـوودە. ئیمـان بـە خـوداو بـە پێغەمبـەر مەرجـە بـۆ قبوڵبـونی کردەوە. مەبەستی ئایەتەکە، کەشیشو بتپەرستو ڕەبەنـە دێرنـشینەکانو هـەموو

ئەوانەی پابەندی بیروباوەڕی ناپەسندن‌و لە چوارچێوەی ئایینی ئیسلامدا کار ناکەن. ﴿ تَصْلَى نَاراً حَامِيَةً﴾ ئەوانە دەچنە ناو ئاگرێکی زۆر گەرم‌و بەتینەوە ـ کە ئاگری دۆزەخە ـ تێیدا سزای سەخت دەچێژن ﴿تُسْقَى مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ﴾ کە تینوویان بێ ئاوی کوڵاتوویان دەرخوارد دەدرێ، بەو ئاوە گەرمە تینوایەتییان ناشکێ، بەڵکوو ناوسکیان پێی دادەپلۆخێ‌و عەزابەکەیان زیاتر دەبێ. ﴿لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلاَّ مِنْ ضَرِيعٍ﴾ ئەوانە خۆراکیان نادرێتێ جگە لەگیای حوشتر خۆرکە، تا بڵێی تاڵ‌و ناخۆشە. ئەم گیایە بەتەڕی پێی دەگوترێ (شیبرەق) ئەگەر وشك بووەوە پێی دەگوترێ (ضەریع) پیسترین‌و ناخۆشترین خۆراکە. بە وشکی حوشتریش بۆی ناخورێ.

﴿لا يُسْمِنُ وَلا يُغْنِي مِنْ جُوعٍ﴾ بە خواردنی ئەو خۆراکەیان نە قەڵەو دەبن‌و نە برسییایەتییان لادەچێ.

## وەزعو حاڵی موسوڵمانان لە بەهەشتدا

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاعِمَةٌ (٨) لِسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ (٩) فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ (١٠) لَا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً (١١) فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ (١٢) فِيهَا سُرُرٌ مَرْفُوعَةٌ (١٣) وَأَكْوَابٌ مَوْضُوعَةٌ (١٤) وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ (١٥) وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ (١٦) ﴾

لەوەپێش هەڕەشەی لە کافرەکان کردو وەزعو حاڵی ناو دۆزەخیانی باسکرد، ئەمجار ئەحواڵی موسوڵمانانی بەختەوەری روون کردەوە. پاداش‌و نازو نیعمەتی

نەبڕاوەی بەهەشتی ئەو بەختەوەرانەی بەیان کرد بۆ ئەوەی خوداپەرستان زیاتر لێ ببڕێن بۆ خوداپەرستیو پابەند بوون بەشەریعەتی ئیسلامەوە، دەفەرموێ:

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ﴾ زۆر دەمووچاو لەو ڕۆژەدا گەشو دەرەوشاوەن، دیاردەی خۆشیو بەختەوەرییان پێوە دیارە، کەیف خۆشو تەڕ دەماخن، ڕازین بە پاداشی خۆیان.

﴿لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ﴾ ڕازین لە کۆششو بەری کردەوەی خۆیان، ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ﴾ جێگیر دەبن لەناو بەهەشتی خۆشو دڵگیرو بەرزو پیرۆزدا دەگوزەرێنن.

﴿لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَاغِيَةً﴾ لەو بەهەشتەدا هیچ قسەیەکی پڕوپووچو لاقرتێو قەشمەریو جنێو نابیسرێ. هەرچی دەیبیسن سەلامو چاکو چۆنیو بەختەوەرییە. سوپاسو ستایشی خودایە، دەربڕینی ڕەزامەندییە لەسەرەنجامی خۆیان، هەمیشە دەم بە زەردەخەنەو پێکەنینن، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانایەی دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَامًا وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا - مريم/٦٢﴾ یان دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا، إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا - الواقعة/٢٥-٢٦﴾.

لەدوای ڕانواندنی ئەم بەهەرە گیانیانە دێتە سەرباسی خۆشیو لەززەتە ماددییەکانو دەفەرموێ: ﴿فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ﴾ لەبەهەشتدا سەرچاوەو کانیاوی هەڵقوڵاو هەن، جۆرەها خواردنەوەی بەلەززەتو صافو بێ خەوشیان لێ دەستەبەر دەبێ.

﴿فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ﴾ لەبەهەشتدا هەیە زۆر کورسیو قەنەفەی بەرزو شکۆمەند، کە لەدەوری ئەو کانیو جۆگاو جۆبارانە ڕیزکراون بۆ دانیشتن لەسەریان.

﴿وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ﴾ گەلێ پیاڵەو گڵاسو جامی جوانو ڕازاوەی ناو خواردنەوەو مەی خواردنەوەو شلەمەنی تر بەیدەستن.

﴿وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ﴾ زۆر پشتیو سەرینو گۆشەی ریزکراو لەسەریەك نراو لەسەر ئەو کورسیو قەنەفانە دانراون.

﴿وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ﴾ زۆر فەرشو مافووری لاکێشو چوارگۆشەی جۆراوجۆرو گوڵ گوڵیو رەنگاو رەنگو تووك نەرم کە بەسەیرکردنیان حەز دەکەی لەسەریان دانیشی! لەو بەهەشتەدا دەستەبەر دەبن.

## دەسەڵاتی خودا لەسەر هێنانی قیامەت

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾﴾

لەوەپێش پەروەردگار بڕیاری هاتنی قیامەتیدا، ئادەمیزادەکانی کردن بەدوو تاقم: بەدبەختو بەختەوەر، پاشان حاڵو وەزعی هەردوو تاقمی بەیان کردو بەڵگەی جۆراو جۆری هێنایەوە لەسەر تاكو تەنهایی خوداو قودرەتو دەسەڵاتی بێ سنوری، ئەمجار سەرەنجیان رادەکێشێ بۆ لای دیاردەکانی بوونەوەر، دەست دەکات بەڕانواندنی دیمەنی دروستکراوەکان لەدونیاداو دەیانکاتە بەڵگە لەسەر

بەتوانایی خودایەکی داناو زانا. داوایان لێ دەکا بۆ خۆیان لە بوونەوەر بڕوانن بەوردی سەرەنجی بدەنێ، دەفەرموێ:

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾ ئەوە بە چ عەقڵێك موشریکەکان ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن؟ وەلحاڵ ئەوانە ڕۆژانە حوشتر دەبینن، چونکە زۆربەی ئاژەڵیان بریتییە لەحوشترو گەورەترین ئاژەڵە لە بیئەی عەرەبدا، دەی با ئەو موشریکانە لەحوشتر وردببنەوە بزانن خودا چۆن ئەو گیانلەبەرە زەبەلاحەی دروستکردووە، جەستەی گەورەو خاوەن هێزو توانا بەصەبرو خۆڕاگر بۆ برسیایەتیو تینوایەتی، بارهەلگرو خۆشڕو گۆشتو شیری حوشتر چەند تایبەتمەندی تێدا هەن لەئاژەڵی تردا دەست ناکەون، وێڕای ئەوەی جەستەی گەورەیەو هێزو توانای زۆرە، کەچی گیانلەبەرێکی بەستەزمانو بێوەیو ژێربارە، بەمنداڵێك بار دەکرێو کاری پێ دەکرێ، پیرەمێردێکی بێ هێز یخی دەداو باری لێ بار دەکا. مەسرەفی کەمو بێ ئەرکە، بەدڕكو داڵو پوشو پەڵاش قەناعەت دەکا، ئەو گیاو گژەی ئەو دەیخوا ئاژەڵی تر کەمتر دەیخۆن. عەرەب بۆخۆیان پێی دەڵێن: کەشتی وشکانی، لەکۆمەڵگای عەرەبدا سامانی سەرەکی بووە، زۆربەی پێداویستی ژیانیان لەسەر بەخێو کردنی حوشتر بووە. لەبەر ئەم هۆیانەو هی تریش پەروەردگار سەرەنجی موشریکەکانی راکێشا بۆ ئەوەی لەو گیانلەبەرە زەبەلاحە بەسودە بێ ئەرکو مەسرەفە وردببنەوە. کەهەموو کات لەبەرچاویانە، بەشەوو ڕۆژ لەگەڵیدا دەژین، تێفکرینو لێ وردبوونەوە لێی پێویست بەماندوبوونو زانیاری ناکا.

﴿وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ﴾ بۆچی تەماشای ئاسمان ناکەن؟ چۆن بەبێ کۆڵەکە بەرز کراوەتەوە؟! بێگومان شیاوترین کەس کە سەرەنج لەئاسمان بدەن سارا نشینەکانن چونکە تێڕوانین لەئاسمانو وردبوونەوە لێی بۆ ئەوانە تامو لەزەتێکی تایبەتی هەیە. کاریگەرییەکی گرنگ لەسەر دڵو دەرونیان جێ دێڵێ، بەجۆرێك وا هەست دەکەن ئاسمان هەر لەسەر سارایەو بەس!

ئەم ئاسمانە بەرزو جوان‌و بەرفراوانە: کە لەسارادا بەدی دەکرێ‌و شیاوی ئەوەیە ئەوانە لێی وردببنەوە، دەی بۆچی سەیر ناکەن‌و بەدڵ لێی وردنابنەوە؟ کێیە ئەو ئاسمانەی بەبێ کۆڵەکە راگرتووە؟ کێ ئاوا بەرزی کردۆتەوە؟! کێ ئەو هەموو ئەستێرە لەهەژمار نەهاتووەی تێدا بڵاوکردۆتەوە؟! کێ ئەو جوانی شکۆمەندییەی پێ بەخشیوە؟ بێگومان خۆی خۆی بەرزنەکردۆتەوە؛ کەوابێ دەبێ بەدیهێنەرێك، هێزێکی لەبن نەهاتوو ئەو کارەی ئەنجام دابێ ئەوەش خودای باڵادەست‌و تاك‌و تەنهاو بێ هاوەڵ‌و کاربەجێیە!!

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ – ق/٦﴾. بۆ تەماشای ئاسمان ناکەن لەکاتی بەیانی‌و ئێوارەدا؟ لەکاتی خۆرهەڵاتن‌و خۆرئاوابووندا: کە هەریەکەیان بۆ خۆی کاریگەرییەکی چەشمەندازو دڵفرێنی هەیە. بۆ تەماشای ئاسمانی پان‌و بەرین ناکەن لەشەوێکی سایەقەو سامالْدا گوێچکەی دڵتان ناکەنەوە بۆ ئەو قسانەی ئەستێرەکان دەیچرپێنن بەگوێی دڵ‌و دەروونتانداو هەڵتان دەنێن بۆ خوداپەرستی.

﴿وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ﴾ ئەوە بۆ تەماشای کێوەکان ناکەن چۆن وەکوو سنگ داکوتراوە؟ بەناو زەویدا بۆ ئەوەی لەنگەر بەزەوی بگرن‌و نەهێڵن جموجوڵی نائاسایی بکاو زیندەوەرانی سەرخۆی فڕێ بدا.

بێگومان کێو پەناگاو هاودەم‌و هاوەڵی ئادەمیزاد، دیمەنی شاخ‌و کێوەکان جەلال‌و شکۆمەندییەك دەنوێنن ئادەمیزاد خۆی لەئاستیاندا بەزەبوون دێتە بەرچاو، ئادەمیزادی لەدوژمن ترساو لەباوەشی کێوەکاندا هەست بەئەمان‌و ئارامییەك دەکا لەشوێنی تردا هەستی پێ ناکا. لێ وردبوونەوە لەو کێوانە خودا وەبیر ئادەمیزاد دێنێتەوە. نەفسی ئادەمی لەباوەشی کێوەکاندا بەسروشت روو دەکاتە خوداو هەست دەکا بە لێ نزیك بوونەوە لەزاتی پاکی‌و خۆخستنە ناو پەناگەی ئەمینی ژێر دەسەڵاتی...

بێگومـان دیمـەنی چـەشمەندازی ئـەو ریـزە کێـو شـاخانە کـە دوورو نـزیکـیو بــەرزیو بڵنــدییان لەیەکـدی جــوداوازەو هەنــدێکیان گردۆڵــەو هەنــدێکیان مامناوەندیو برێکیشیان چیای سەرکەشو کەل کەلو لوتکە لوتکەی سەر بەبەفر داپۆشراوی زستانو خاڵخاڵبوونی کۆتایی وەرزی بەهارو سەرلەبەری وەرزی هاوینو سەرەتای وەرزی پایز، دیمەنێکە تـا لێی وردبیتـەوە چاو لێی تێـر نابێ، چەندێك بەرەو بەرزایی پێیاندا سەربکەوی ئاسۆیی بینینی بونەوەرت بۆ بـەرفراوان دەبێو دەسەڵاتو قودرەتی خودات پتر لەلا بەرجەستە دەبێ، چەندێکیش داپڕیە خوارەوە بۆ ناو قـوڵایی دۆڵو شـیوەکان هەسـت بـەزەبونی خـۆتو زەبـەلاحی شـاخو چـیاکان دەکەیو ناچار خۆت دەهاویە ناو پەناگای خودای باڵادەستو خاوەن دەسەڵاتەوە.

بـەکورتی سـەرەنجدان لەدیمـەنی چـەشمەندازی شـاخو چـیاکان حاڵـەتێکی بەخۆداچوونەوەو هەست کـردن بـەئاتاجی خـۆت بـۆ چاودێری خـودا لـەلا دروسـت دەبێ، بەجۆرێك دڵو دەروونت مشتو ماڵ دەبێو ئامادەی خوداناسـیو هەسـت بـە بەندایەتی کردنت پتر لەلا گەڵاڵە دەبێ. کەوابێ رێکەوتو بێهودە نـەبوو حـەزرەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) پـێش پێغەمبەرایـەتی وەگـری کێـوی (ثـور) بـوو بـوو لەئەشـکەوتی حـیراءدا بەتـەنیا دەمایـەوە. تـا لەسـەرەنجامدا لـەو چـۆڵەوانییە یەکەمجار نیگای بۆ هاتو کرا بە پێغەمبەر.

حـەزرەتی موسـاش (علیـه السلام) لەسـەر کێـوی (طـور) شـەرەفی ئاخـاوتنی لەگەڵ پەروەردگاری بوونەوەری پێ بەخشرا. لەفەراخ ئەو شیوەی بەتەنیشت کێوی (طور)ەوەیەو دۆڵەکە کەوتۆتـە دەسـتی راسـتی یەکـەمجار نیگـای بـۆ هـاتو کـرا بـە پێغەمبەر.

﴿وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾ بۆچی تەماشای زەوی ناکەنو تێی نافکرن چۆن راخـراوە؟ بـۆ لێـی وردنابنـەوە چـۆن درێـژکراوەو راخـراوە بـۆ ئـەوەی گیانلەبـەران بتـوانن بەئاسـانی لەسـەری بـژین سـود لـەخێرو فـەڕی وەربگـرن؟ بێگومـان پـێش ئەوەی ئەو ئادەمیزادانە بێنە گۆڕەپانی ژیانەوە ئەم زەوییە راخـراوەو ئامـادەکراوە

بۆ تێدا ژیان. دەی بۆ بیرناکەنەوە کێ رایخستووە، کێ ئامادەی کردووە بۆ لەسەر ژیان؟

بێگومان راخران و پان بوونەوەی زەوی بەرواڵەت و لەپێش چاوی تەماشاکەر وایە، ئەینا زەوی بەشێوەی گۆیەکی مەیلەو درێژە واتە: هێلکەییە، چونکە هەر گۆیەکی قەبارە گەورەی وەکوو زەوی، هەموو پارچەیەکی بەراخراو دێتە بەرچاو! بۆ نموونە گردۆلکەیەکی بچووك لەپێش چاوی ئێمەدا خڕە، وەلێ کە مێرولەیەك پێی هەڵدەگەرێ هەست بەو خڕیو هەورازییەی ناکا.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) دەکا کە ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بدا، دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾ ئەی موحەممەد! ئامۆژگاری مەردوم بکە، لەعەزابی خودا بیانترسێنەو موژدە بدە بەوانەی چاکەکارن، سەرنجیان رابکێشە بۆ تێفکرین لەو دیاردە کەونیانەی هەموویان بەڵگەن لەسەر دەسەڵات و باڵادەستی خودا بەسەر هەموو شتێکدا، تۆ هەر یادخستنەوەت لەسەرە بۆ راگەیاندن و ئامۆژگاریو ترساندن و موژدەدان رەوانە کراوی.

ئەتۆ دەسەڵاتی ئەوەت نییە بەزۆرەملێ و بەتۆپزی موسوڵمانیان بکەی. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ – ق/٤٥﴾.

ئەحمەدو موسلیم و تیرمیذیو نەسائی لەجابیرەوە ریوایەت دەکەن: دەڵێ: پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) فەرمووی: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ». فەرمانم پێکراوە کە لەگەڵ کافراندا بجەنگم تا ئیمان دەهێنن و بەرواڵەت موسوڵمان دەبن و دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) و دان بە پێغەمبەرایەتی مندا دەنێن، هەر

کاتێك شایەتومانیان هێنا ئیتر ماڵو خوێنیان لەدەستی من دەپارێزن، ئەوجا حیسابیان لەلای خوایە، خودا دەزانێ ئاخۆ ئیمان هێنانەکەیان بەدڵ بووە یان نا؟

﴿إِلَّا مَن تَوَلَّى وَكَفَرَ، فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ﴾ وەلێ کەسێك پشت لە ئامۆژگاری ئیسلامی هەڵبکا بەدڵو بەزوبان کافربێ ئەوە خودا لەقیامەتدا عەزابی گەورەی دەدا، بۆ هەتا هەتایە لەناو ئاگری دۆزەخدا دەیهێڵێتەوە، ئەمە جگە لەعەزابی دونیا کە بریتییە لەکوشتنو بەدیل گرتنو بەغەنیمەت گرتنی ماڵو سامانی، چونکە ئەگەر پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) دەسەڵاتی بەسەریاندا نەبێ ئەوە خودا دەسەڵاتی تەواوی بەسەریاندا هەیە، لەدەست رقو قاری خودا رزگاریان نابێ.

ئەمجار لەکۆتایی سورەتەکەدا جەخت لەسەر رابوونی قیامەتو زیندوبوونەوە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ﴾ بێگومان سەرەنجامو گەڕانەوەیان بۆلای ئێمەیە، ئێمە حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکەین، لەسەر کردەوەی چاك پاداشتیان دەدەینەوەو لەتۆڵەی خراپە سزایان دەدەین.

پەروەردگار وادەی داوەو وادەی خوداش دێتە جێ، واتە: خودا حیسابو لێکۆڵینەوەی لەسەر خۆی پێویست کردووەو بەگوێرەی حیکمەتو عەداڵەت خوازی خۆیەتی، چونکە ئەگەر لەسەر ستەمو کوفر تۆڵە لەستەمکارو کافر نەستێنێ، مانای ئەوە دەگەیەنێ کە خودا بۆخۆی رازی بێ بەکوفرو ستەمو خراپەکاری. پاكو مونەزەهی بۆ خودایەو هەرگیز رازی نیە بەستەمو کوفرو خراپە!

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الفجر)

ئەم سورەتە مەککیەو سی ئایەتە، ناونراوە بە سورەتی (الفجر) چونکە سەرەتا بە ئایەتی ﴿وَالْفَجْرِ وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ دەست پێ دەکا.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوە لەچەند رویەکەوەیە:**

١- سوێند خواردنی پەروەردگار لەسەرەتای ئەم سورەتەدا وەکوو بەڵگە وایە لەسەر کۆتایی سورەتی پێشوو کە فەرمووی: ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ﴾

٢- لەسورەتی پێشوودا ئادەمیزادی کردن بەدوو بەش: بەدبەختو بەختەوەر، لەم سورەتەشدا باسی چەند تاقمو گەلو نەتەوەیەکی ملهوڕو سەرڕەقی کرد، وەکوو گەلی عادو ثەموودو فیرعەونو داروەدەستەکەی، کە ئەمانە لە بەدبەختەکانن، هەروەها باسی کۆمەڵی خواپەرستو سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودای کرد، ئەمانەش لەپێڕو کۆمەڵی بەختەوەرانن.

## عەزابی خودا بۆ کافرەکان شتێکی حەتمییە

﴿وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِى

ٱلۡأَوۡتَادِ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ﴿١٤﴾

﴿وَالْفَجْرِ وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ سوێن بەبەیانی کاتێك روناکی بەکەناری ئاسماندا بڵاودەبێتەوە، ئاسۆ روناك دەکاتەوەو تاریکی شەو دەڕەوێنێ، مـوژدەی رۆژێکی تری تازەی پێیەو سەرلەنوێ جمەوجوڵی گیانلەبەران دەست پێ دەکاتەوەو هەریەکەیان دەچێتەوە سەر کاروباری خۆی‌و بەگوڕو تینێکی تازەوە دەست دەکەنەوە بەهەوڵ‌و تەقەللادان بۆ دابین کردنی پێداویستی ژیانیان.

﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾ سوێن بە (دە) رۆژی هەوەڵی مانگ، کە لەگەڵ شەبەقدا وەك یەك وان، لەم رووەوە کە شەبەق وردە وردە تاریکایی شەو کز دەکاو روناکی پەرەدەسێنێ، ئەو (دە) شەوەش لەسەرەتای شەوەوە بەهۆی روناکی مانگەوە تاریکایی شەو کز دەکەن، ئەمجار وردە وردە تاریکای شەو پەرەدەسێنێ، تا بەیەکجاری دونیا دەبێتە تاریکستان‌و دەق پێچەوانەی بەیانی دەوەستێ.

چەند ریوایەت هەن دەربارەی دیاری کردنی ئەو (دە) شەوە: هەندێکیان پێیان وایە: (دە) شەوی یەکەمی مانگی ذیلحیجەیە هەندێکیش دەڵێن: (دە) شەوی یەکەمی مانگی موحەڕەمە. کۆمەڵێکیش دەڵێن: (دە) شەوی سەرەتای مانگی رەمەزانن.

قورئان (دە) شەوەکەی دیاری نەکردووەو بەموتڵەقی هێناونی‌و بەم شێوە زیاتر لەدڵ‌و دەروونـدا کاریگەردەبێ. بەهەر حاڵ خودا سوێندی بەو (دە) شەوە خواردووە بۆ خۆی دەزانێ، بەنیسبەت ئێمەوە زانینیان گرنگ نییە، ئەگەر گرنگ بوایە خودا بۆخۆی دیاری دەکردن.

﴿وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ﴾ سوێن بەهەموو تاكو جوتێك بەم (دە) شەوەشەوە واتە: سوێند بەم (دە) شەوە بەسەریەكەوەو هەم بەجیاجیا. یان سوێند بەنوێژی تاكو جوت.

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾ سوێند بەشەو كە دێ و دەڕوا، بێگومان وەكوو چۆن لەڕۆیشتنی شەوو هاتنی ڕۆژدا سودو قازانجی بێ شومار هەیە، لەهاتنی شەویش سودو قازانجی بێ ئەندازە هەیە. چونكە شەو كاتی گونجاوە بۆ حەسانەوەو پشوودان، هەرچی ماندوێتیی و شەكەتییەك بەڕۆژ تووشی ئادەمیزادو باقی گیانلەبەرانی تر دەبێ، بەماندوو حەسانەوەی شەو لادەچێ و هێزو وزەی تازە دەبێتەوە بۆ ڕۆژێكی تر.

﴿هَلْ فِي ذَلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ﴾ ئایا سوێند خواردن بەو شتانەی باسكران سوێند خواردنی بتمانە پێكراو هەیە بۆ ئادەمیزادی عاقڵ و ژیر؟ واتە: ئایا ئەو شتانەی شیاوی سوێند پێ خواردنن بۆ ئادەمیزادی ژیر؟ وەڵامی سوێندەكەش لەنیازدایەو (مقدر)ە واتە: سوێند بەوشتانەی باسكران ئێوە زیندو دەكرێنەوەو سزاو پاداش وەردەگرنەوە.

ئەمجار پەروەردگار هەندێ سەرگوزشتەی گەل و نەتەوە ڕابووردوەكان بۆ پەند لێ وەرگرتن باس دەكاو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ، إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ، الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾ ئایا نازانی ئەی بیسەر! خودای تۆ چۆن هۆزی عادی یەكەمی لەناو برد؛ ئەو گەل و هۆزەی كە لەوەچەو نەوەی عادی كوڕی (حوص) كوڕی (إرم)ی كوڕی (سام)ی كوڕی نوح (عَلَيْهِ السَّلَام) بوون. (إرم) ناوە بۆ هۆزی عادی یەكەم.

وەكوو لەشوێنێكی تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ أَهْلَكَ عَادًا الْأُولَى – النجم/٥٠﴾.

ئـەم نەتـەوە بەدبەختـە هـەموویان خـاوەن هێـزو توانـاو بالآبـەرزو لەشـساغو بەهەڵمەت بوون، لەرۆژگاری خۆیاندا لەهـەموو کـەس بـەتواناترو بەدەسـەلآت تـرو بالآبەرزتر بوون، خانوو باڵەخانەکانیان زۆر قایەمو پتەوو بەرزو بەرەونـەق بـوون، لەهـەموو وڵاتـانی ئـەو رۆژگـارەدا شـارو گونـدێك نـەبوو بەئەنـدازەی شـاری ئـەوان تەلارسازیی تێدا بەرچاو گیرابێ، بۆ خۆشیان لەهەموو کەس بـەهێزترو بالآبـەرزتر بوون.

﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْـقِ بَـسْطَةً فَـاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ – الأعراف/٦٩﴾.

﴿وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾ هەروەها نازانی ئایا خودای تۆ چـی بەسـەر گەلی ئەموود هێنا؟ ئەم گەلە گەلێکی بـەهێزو توانـا بـوون لەناوچـەی (الحجـر) کـە کەوتۆتە نێوان وڵاتـی شـامو حیجازەوە لـەکێوو شـاخەکان خانوویـان داتاشـیبوونو تێیاندا نیشتەجێ بـوو بـوون. شـاخیان دەبـڕیو دایانـدەتاشیو دەیـانکردە خـانووی هەڵاش بەرزو بەرفراوان، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿وَكَانُواْ يَنْحِتُونَ مِـنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا آمِنِينَ – الحجر/٨٢﴾.

﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ﴾ هەروەها ئایا تۆ نازانیـت خـودای تـۆ چـی بـە فیرعـەون کرد؟ ئەو فیرعەونـەی فـەرمانڕەوایی میـصر بـوو خـاوەن بینـاو باڵەخانـەی بـەرزو چەشمەنداز بوو، هەندێك لەو بیناو باڵەخانانە ئەهرامـەکانن، کـە ئێـستاش وەکوو خۆیـان مـاون کـاتی خـۆی فیرعەونـەکان بەمەبەسـتی ئـەوە دروسـتیان کردبـوون بیانکەن بەقەبرو گۆڕی خۆیـان. بـەبێگاریو زۆرەملـێ ئـەو باڵەخانانـەیان بەڕەشـە خەڵکەکەو بۆرە پیاوەکانیان دروست دەکرد.

یـان ﴿ذِي الْأَوْتَـادِ﴾ بـەمانا ئەوەیـە: (خـاوەنی سـوپاو عەسـکەرێکی زۆربـوون، هــەموویان یاســاوڵ بــوونو پارێزگاریـیــان لەپاشــایەتی فیرعــەون دەکــرد).

بەڵام وا پێدەچێ مەبەست بە ﴿ذِي الأَوْتَادِ﴾ ئەهرامەکان بن: کەوەکوو مێخ بەزەویدا داکوتراون، لەبناغەدا پانو هەتا بەرزببنەوە چین بەچین تەسك بوونەوە، دەڵێی مێخی سەربەرەو خوار داکوتراون.

جۆرێکیش لەتەعزیبی فیرعەون بۆ نەیارەکانی ئەوە بو مێخەی دادەکوتان، وێدەچێ ﴿ذِي الأَوْتَادِ﴾ ئاماژە بۆ ئەو جۆرە تەعزیبە. کەوابێ ئەم سێ نەتەوە ستەمکارە (گەلی عادو گەلی ثەموودو گەلی فیرعەون) ﴿الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ﴾ ئەوانە بوون: کە هەریەکەیان لەوڵاتو رۆژگاری خۆیاندا لەستەمکاریدا سنوریان بەزاندبوو، یاخیو سەرکەش بوون، فەسادو ئاشوبیان لەوڵاتدا بەکوفرو ستەمکاری زۆر کردبوو. بەهێزو دەسەڵاتی خۆیان دەنازینو بوغرابوون. ﴿فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾ ئیتر خودای تۆ عەزابی سەختو دژواری بەسەر ئەو نەتەوە ستەمکارانەدا رشت، گورزی پۆڵایینی عەزابی لێدانو بەعەزابی ریشەکێشکەر لەناوی بردنو بوونە پەندو عیبرەتی رۆژگار. ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! لەکەمین دایە بۆ ستەمکاران، چاودێری کارو کردەوەی هەموو کەسێکە، هیچی لێ گوم نابێ، هیچ کردەوەیەك پاشگوێ ناخا، رۆژی قیامەت هەموو ئادەمیزادێك سزاو پاداشتی کردارو گوفتاری خۆی وەردەگرێتەوە.

## سەرزەنشتی کردنی ئادەمیزاد چونکە قیامەتی پاشگوێ خستووەو گرنگی بەدونیا داوە

﴿فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّاۖ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ

طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ﴿٢٠﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند: کە خۆی لەکەمین دایە بۆ ئادەمیزاد، هەموویان بەتەواوی چاودێری دەکرێن‌و هیچ کردەوەیەکیان لەخودا گوم نابێ. ئەمجار سەرزەنشتیان دەکا لەسەر ئەوە کە گرنگی بەقیامەت نادەن‌و باوەشیان بەدونیادا کردووە، واتە: خودا فەرمانیان پێ دەکا کە گرنگی بەقیامەت بدەن‌و توێشوی باش بۆ ئەو ژیانە جاویدانە پێش خۆیان بنێرن، کەچی ئەوان بەپێچەوانەوە دونیایان لەکۆڵ داوەو قیامەتیان پاشگوێ خستووە.

﴿فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ، وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ﴾ جا ئەگەر ئادەمیزاد تووشی خۆشی‌و بەختەوەری بوو دەڵێ: خودا ڕێزی لێ گرتووم، ئەگەر خۆشی لەکیس چوو، کەوتە نارەحەتیەوە، دەڵێ: خودا ڕیسوای کردووم. ئەمەیە بیروبۆچوونی ئادەمیزاد، کاتێك خوا تاقی دەکاتەوە، دەوڵەمەندی دەکا، یان هەژاری دەکا، نەخۆشی دەکا، یان لەشساغ دەبێ.

کاتێك خودا نازو نیعمەتی بەسەردا دەڕێژێ ماڵ‌و سامان‌و پلەو پایەی دەداتێ، هەست ناکا کە ئەوە تاقیکردنەوەیەو حیساب‌و لێکۆڵینەوەی بەدوادا دێ. وادەزانێ ئەو ڕزق‌و ڕۆژییە ئەو پلەو پایە نیشانەی ڕێزو نرخیەتی لای خوداو خودا هەڵی بژاردووە، کاتێکیش بەپێچەوانەوە بوو کەوتە ناخۆشی‌و تەنگانەوە بەڕیسوایی دەزانێ‌و پێی وایە لای خودا نرخی نییە بۆیە هەژارو نەخۆشە!!!

بێگومان ئەو لەهەردوو حاڵەکەدا هەڵەیە، بەڵکوو هەردوو حاڵەکە بۆ تاقیکردنەوەو لەبۆتە دانن، بۆ ئەوەیە دەربکەوێ ئاخۆ بەخۆشی‌و نازو نیعمەت لەخۆبایی دەبێ یان بەبەڵاو هەژاریی دەکەوێتە ناشوکری کردن‌و نائومێدی. یان صەبر دەگرێ بێگومان ئادەمیزاد کاتێ دڵی لە ئیمان خاڵی بوو، هەست بە

حیکمەتی بەخشین‌و لێگرتنەوە ناکا، نهێنی نازو نیعمەت پێدان‌و توشبوونی بەلاو ناخۆشی نازانێ...

ڕێزداریی لای خودا بۆ کەسێکە: کە طاعەت‌و خودا پەرستی بکاو بە دڵسۆزیی ئەرکی سەرشانی بەرامبەر بەخودا ئەنجام بدا، ڕیسواکردن‌و سەرکۆنە کردنی خودا بۆ کەسێکە لەخودا یاخی بێ‌و گوێ بە قیامەت نەدا.

﴿كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ، وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ نەخەیر وانییە وەزع‌و حاڵ وانیە: کە ئادەمیزادی بێ دین لێی حاڵی بووە، ڕزق‌و ڕۆزیی زۆرو نازو نیعمەت پێدان نیشانەی ڕێزداریی ئەو کەسە بێ لای خودا، هەر وەکوو چۆن هەژاری‌و نەخۆشی نیشانەی بێ ڕێزی نیە، بێگومان خودا ماڵ‌و سامان دەدا بەو کەسەی خۆشی دەوێ‌و بەو کەسەی خۆشی ناوێ، دەستکورتی‌و کەم دەرامەتی دەدا بەوانەی خۆشی دەوێن بەوانەی ناخۆشی دەوێن.

بەڵکوو خراپەی ئەوانە ئەوەیە خودا ڕزق‌و ڕۆزیی زۆرو زەوەندەی پێ بەخشیوون، کەچی مافی خودای لێ نادەن، ڕێز لەهەتیوو بێ نەوایان ناگرن، پێداویستیەکانیان بۆ دابین ناکەن، خۆیان‌و کەسانی دیکەش هەڵناسن بۆ خۆراك دابەشکردن بەسەر هەژاراندا، بەهانای فەقیرو بێ دەرەتانانەوە ناچن، زەکاتی ماڵی خۆیان دەرناکەن، خێرو خەیرات بە لێقەوماوان ناکەن.

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە (صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وسَلم) فەرمووده‌یەکی ڕیوایەت کردووە، دەفەرموێ: «خَيْرُ بَيْتٍ فِي الْمُسْلِمِينَ بَيْتٌ فِيهِ يَتِيمٌ يُحْسَنُ إِلَيْهِ وَشَرُّ بَيْتٍ فِي الْمُسْلِمِينَ بَيْتٌ فِيهِ يَتِيمٌ يُسَاءُ إِلَيْهِ، ثم قال بأصبعيه: أنا وكافل اليتيم فيرعون الجنة هكذا». باشترین ماڵ‌و خێزانێك لەناو کۆمەڵگای موسوڵمانانندا ماڵێکە هەتیوێکی تێدابێ چاکەی لەگەڵ بکرێ، خراپترین خێزانیش ئەو خێزانەیە هەتیوێکی تێدابێ خراپەی دەربارە بکرێ، پاشان بەدوو پەنجەی

خۆی ئامـاژەی کـردو فـەرمووی: (مـن‌و سەرپەرشـتیاری هـەتیو لـە بـەهەشـتدا ئـاوا جوتین‌و لێك نزیكین).

﴿وَتَـأْكُلُونَ التُّـرَاثَ أَكْلًا لَّمًّـا، وَتُحِبُّـونَ الْمَـالَ حُبًّـا جَمًّـا﴾ ئێـوە بەشـە میراتـی میراتگران بەنارِەوا دەخۆن، بەتایبەتی مافی ئافرەتان فەرامۆش دەكەن، هـەر لەبـەر بەشـە میراتەكـەیان مارمیـان دەكـەن بۆئـەوەی بەشـە میراتەكـەیان بخـۆن‌و مـاڵ‌و سامناتان خۆش دەوێ بەجۆرێك هەمیشە هەوڵ‌و تەقەلاَّ دەدەن بۆ مـاڵ كۆكردنـەوە بەهەر شێوەیەك بێ، كۆ لە حەلاڵ‌و حەرام ناكەن چاو چـنۆك‌و هەڵپـەكارن، خـوێن مژو بێ ویژدانن بەداگیركردن‌و بە سودو ریباو چەپاوكردن ماڵ كۆدەكەنەوە. گوێ نادەنە دادو نزای هەژاران‌و فرمێسكی هـەتیوان‌و هـات‌و هـاواری بـێ نـەوایان داتـان ناچـڵەكێنـێ: دونیاتـان لـەباوەش گرتـووەو قیامـەتتان پاشـگوێ خـستووە، ئەمـەش كارێكی خراپەو لەوە بەولاوە بۆتان دەردەكەوێ چەند خەسارەتمەندن.

## حاڵ‌و وەزعی ئادەمیزادە چاو چنۆكەكان‌و دونیا نەویستەكان لە رۆژی قیامەتدا

﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ﴿٢٢﴾ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۢ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ

﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي (٣٠)﴾

لەوەپێش پەروەردگار بیرو بۆچوونی ئادەمیزادەکانی دەربارەی دەوڵەمەندیی‌و هەژاری‌و لەشساغی‌و نەخۆشی‌و بەهەڵە لەقەڵەمدا، سەرزەنشتی کردن لەسەر گرنگیدان لەژیانی دونیاو پاش گوێ خستنی قیامەت، هەڵپە کردن بۆ ماڵ کۆکردنەوە بەشێوەی نائاسایی، ئەمجار هەواڵی قیامەت رادەگەیەنێ وە ئەوە روون دەکاتەوە کە ئەوانە پەشیمان دەبنەوە، بەڵام پەشیمانی سودی نیە، حاڵ‌و وەزعی موسوڵمانە خوداپەرستە دونیا نەویستەکان روون دەکاتەوەو ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئەوان لەپێڕی صاڵحاندا دەچنە ناو بەهەشتی رازاوەوە، دەفەرموێ:

﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الأَرْضُ دَكًّا دَكًّا﴾ ئەی خەڵکینە! واز لەو هەڵوێستی ناشیرین‌و کردەوەی بەد بێنن، نابێ سوربن لەسەر ئەو کردەوە خراپە دزێوانەتان، پێش ئەوەی رۆژێك بێ پەشیمان ببنەوە، ئەو کاتەی زەوی پارە پارە دەبێ‌و رادەتلەقێ‌و پێکدا دەدرێ، هەرچی کێوو شاخ‌و بەرزایی هەیە تێك دەروخێن‌و رووبەری زەوی دەبێتە سارایەکی کاکی بەکاکی‌و تەپ‌و تۆز بڵاو دەبێتەوە.

﴿وَجَاء رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ خودای تۆ دێ، واتە: فەرمانی خودا هاتە خوارەوە، خودای باڵادەست‌و خاوەن دەسەڵات خۆ دەنوێنێ بۆ دادگایی کردن‌و حیساب‌و لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەندەکانی، فەرمان‌و بڕیارەکانی خۆی ئاراستە دەکا، دیاردەکانی تواناو جەبەروتی خودا دەردەکەوێ. فریشتەکان کۆمەڵ کۆمەڵ هاتن‌و ریزیان بەست‌و کەوتنە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان.

﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ﴾ دۆزەخ دەرکەوت بۆ تەماشاکەران، دوای ئەوەی لێیان شاراوە بوو، یەکێك بوو لەغەیبیات، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَبُرِّزَتِ

الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ – الشعراء/٩١﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِمَن يَرَى – النازعات/٣٦﴾.

لە صەحیحی موسلیمدا فەرموودەیەك هەیە عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود ریوایەتی كردووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: «يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا»[1] ئەو رۆژە دۆزەخ دەهێنرێ حەفتا هەزار لەغاو (قفل)ی هەیە، هەر لەغاوێكی حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدایە رایدەكێشن.

ئەبو سەعیدی خودری دەفەرموێ: كاتێك ئایەتی ﴿وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ﴾ نازڵ بوو رەنگی روخساری پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) گۆڕا، بەئاشكرا دەمو چاوی رەنگی گۆڕانیان پێوە دیار بوو، بەجۆرێك هاوەڵانە كەوتنە ترسەوە لێی، پاشان فەرمووی: جوبرەئیل ئەم ئایەتانەی بۆ خوێندمەوە كە دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا، وَجَاء رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا، وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ﴾

ئیمامی عەلی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن چۆناهی دۆزەخ دەهێندرێ؟ لە وەڵامدا پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: (يؤتي بها تقاد بسبعين ألف زمام يقود بكلّ زمام سبعون ألف ملك، فتشرد شردة لو تركت لأحرقت أهل الجمع، ثمّ تعرض عليّ جهنم فتقول: مالي ولك يا محمد، إنّ الله قد حرّم لحمك عليّ)[1] ئیتر هەموو ئەهلی سارای مەحشەر ترس دایان دەگرێ دەكەونە گوتنی (نفسي نفسي)ییەوە جگە لە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) ئەو دەفەرموێ: (أمّتي أمّتي).

---

[1] رواه مسلم فیرعەون (٤٥) كتاب البرّ والصلة والآداب (١٣) باب فضل عيادة المريض (الحديث: ٢٥٦٩).

[1] رواه مسلم في كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها (١٣) باب شدة حر نار جهنم وبعد قعرها وما تأخذ من المعذبين (الحديث: ٢٨٤٢).

﴿يَوْمَئِـذٍ يَتَـذَكَّرُ الْإِنـسَانُ وَأَنَّـى لَـهُ الـذِّكْرَى﴾ جا لـەو رۆژە سـەختو دژوارەدا ئــادەمیزاد هەرچــیەکی ئــەنجامی دابــێ دێتــەوە یــادیو پەشــیمان دەبێتــەوە لەهەڵویستو بیروباوەڕو کاروکردەوەکانی دونیای، هەرچی پـێش خـۆی ناردویـەتی لەکوفرو تاوانو کردەوەی خراپ لێیان پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام کوا بیرکەوتنـەوەو پەشــیمان بوونــەوە ســوودی پــێ دەگەیــەنێ، کــات بەسەرچــووەو پەشــیمانیو تەوبەکردن دادی نـادەن، کاتـێ بەکـەڵکی دەهات کـەپێش مردنـی دونیـای پەشیمان بوویایەوە.

﴿يَقُـولُ يَـا لَيْتَنِـي قَـدَّمْتُ لِحَيَـاتِي﴾ لەوکاتـەدا کەپەشیمان بوونـەوە دادی نـادا، بەغەمو پەژارەوە دەڵێ: بریا لەژیانی دونیامدا بیروبـاوەڕی باشـم بوایـەو کـردەوەی چاکم پێش خۆم بخستایە، تازە هیچ شتێك دادم ناداو پەشیمان بوونەوە بێ سوودە.

﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ، وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ﴾ ئەو رۆژە کـەس سەرپەرشـتی سزادانی تاوانباران ناکا. خـودا بۆخـۆی جـۆری سـزایان بـۆ دیـاری دەکـا، هـیچ کـەس ناتوانێ وەکوو خودا سزای تاوانباران بدا، کەس وەکوو خودا ناتوانێ تاوانبـار کـۆتو زنجیر بکاو دەست بەملەوە شەتەکیان بدا.

ئــەمجار وەزعو حــاڵی ئەوانــە بــەیان دەکــا: کــە لــەژیانی دونیایانــدا گرنگـی بەقیامەت دەدەنو کردەوەی چاکە پێش خۆیـان دەنێـرن. وەکوو ﴿يَـا أَيَّتُهَـا الـنَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ، ارْجِعِي إِلَـى رَبِّـكِ رَاضِـيَةً مَّرْضِـيَّةً، فَـادْخُلِي فِـي عِبَـادِي، وَادْخُلِـي جَنَّتِـي﴾ پەروەردگار بۆ خۆی یان لەسەر زوبـانی فریـشتە بـە موسـوڵمانان دەفـەرموێ: ئـەی نەفسی بە ئـارام بـەهۆی ئیمـانو بـاوەڕی ڕاسـتەقینەوە بـەهۆی کـردەوەی باشـتەوە، بــەهۆی رازی بوونــت بەقــەزاو قــەدەری خــوداو پابەنــد بوونــت بەشــەریعەتی ئیـسلامەوە، ئـەتۆ ئـەی گیـانی پـاکی خوداپەرسـت رۆژی قیامـەت دێـی بـۆ سـارایی مەحشەرو بەدڵ ئارامیو بێ ترس.

دەتۆ بگەڕێوە بۆلای پاداشی خودای خۆت، بچۆرە ناو ئەو بەهەشتەی کە خودا پێی بەخشیوی، ئەتۆ رازی بە بەو پاداشتەو بەو بڕیارەی خودا بۆی داوی، خوداش لەتۆ رازییە. بچۆ ناو پێڕی بەندە راستاڵو رێزدارەکانمەوە، ببە بەیەکێك لەو کۆمەڵە بەختەوەرە، لەگەڵ ئەواندا بچۆرە ناو بەهەشتی رازاوەی منەوە. بێگومان ئەوە ئەو پەڕی بەختەوەرییە، موفەسسیرین دەڵێن: ئەم بانگکردنە لەکاتی گیان دەرچووندا دەبێ. یان پێش مردن بەچەند ساتێك دەبێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (البلد)

ئەم سورەتە مەککییە بیست ئایەتە ناونراوە سورەتی (البلد) چونکە پەروەردگار لەسەرەتای سورەتەکەدا سوێندی بەشاری مەککە خواردووە فەرموویەتی: ﴿لَا أُقْسِمُ بِهَٰذَا الْبَلَدِ﴾.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشوویەوە لەدوو لایەنەوەیە:**

١- لە سورەتی پێشوودا پەروەردگار سەرزەنشتی ئەوانەی کرد کەماڵی خەڵك دەخۆن‌و لەرێگەی نائاسییەوە ماڵو سامان کۆدەکەنەوەو یارمەتی بێ نەوایان‌و هەژاران نادەن. لەم سورەتەدا ئەو رەوشت‌و هەڵوێستانە باس دەکا کە پێویستە خاوەن ماڵو سامان پەیڕەوییان بکەن. وەکوو ئازاد کردنی کۆیلەو ماڵ بەخشین بەهەژاران بەتایبەتی لەرۆژانی برسییەتی‌و گرانیدا.

٢- کۆتایی سورەتی پێشووی بە روونکردنەوەی حاڵو وەزعی نەفسی بە ئارام‌و خودا پەرست هێنا. لەم سورەتەشدا رێگەی دڵ ئارام بوون روونەدەکاتەوە، بەندەکانی دەترسێنێ لە کوفرو بێ دینی‌و سەرپێچیکردنی فەرمانی خودا.

میحوەرو ناوەڕۆکی سورەتەکە بریتییە لە هۆکاری بەختەوەریی‌و بەدبەختی ئادەمیزاد، چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئادەمیزاد بۆ یەکێ لەو دوو رێبازە بەویستی

خـۆی. سەرزەنـشتی ئـادەمیزاد دەکـا لەسـەر لـەخۆبایی بـوونو بـەخۆ نـازینو ڕەتکردنەوەی پەیامی حەق، ئەمجار بڕێ لە نیعمەتەکانی خـودا: کـە بەخـشیوەتی بە ئادەمیزاد ڕادەنوێنێ، پاشان بڕێ لەو تەنگو چەڵەمانەی کـە تووشـی ئـادەمیزاد دەبێ لە قیامەتدا دەخاتە ڕوو.

## بە تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد بەتەنگو چەڵەمەو لەخۆبایی بوون

﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾﴾

﴿لَا أُقْسِمُ بِهَٰذَا الْبَلَدِ﴾ سوێند دەخۆم بەشاری مەککە کە شـارێکی ڕێـزدارە لای پەروەردگار ڕووگەی موسوڵمانانی تێدایە پێغەمبەری (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وسَلَّم) تێـیـدا لەدایك بووە، چرای ئیسلامەتی تێدا هەڵکراوە.

﴿وَأَنـتَ حِـلٌّ بِهَـٰذَا الْبَلَـدِ﴾ وەلحـاڵ ئـەتۆ، ئـەی محمـد! دانیـشتووی ئـەو شـارە پـیرۆزەی، یـان ئـازاردانی تـۆی تێـدا ڕێ دراوە لەلایـەن موشـریکەکانەوە، هەرکەسـێ بـچێتە نـاوی دڵنیـا دەبـێ: کـە کوشـتنو بڕینـی تـووش نابـێ، شـەڕو جـەنگی تێـدا یاساغە، بە نیشتەجێی تۆ لەو شارەدا ڕێزی زیادی کردووە.

لە فەرموودەی صحیحی پێغەمبەردا هاتووە فەرموویەتی: «إِنَّ هَذَا الْبَلَـدَ حَرَّمَـهُ اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَـةِ اللَّـهِ إِلَـى يَـوْمِ الْقِيَامَـةِ ، لاَ يُعْـضَدُ

شَوْكُهُ، وَلاَ يُخْتَلَى خَلاَهُ، وَإِنَّمَا أحلّت لِي إِلاّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وَقَدْ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالآمْسِ ، وَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ».

مەبەستەكە ئەوەیە شاری مەككە شارێكی رێزدارە لەهەموو كاتو زەمانێكدا، تەنانەت لەو حاڵەتەشدا كە موشریكەكان ئازاردانی تۆی پێغەمبەر بەرەوا دەزانن‌و هیچ رێزو نرخێكت بۆ دانانێن...

﴿وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ﴾ سوێند بەهەموو باوك‌و رۆڵەیەك لە ئادەمیزادو گیانلەبەرانی ترو شینایدا. ئەمەش ئاماژەیە بۆ گەورەیی‌و بەنرخی زاووزێ...

سوێند بەو شتانەی باسكران ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾ ئێمە ئادەمیزادمان دروست كردووە لە رەنج‌و كێشەو ماندوبوون، لەو رۆژەوە دێتە گۆڕەپانی ژیانەوە تا رۆژی مردن هەموو ژیانی بریتییە لە ماندوو بوون‌و رەنج كێشان، رەنجی پەروەردە بوون‌و پێ گرتن‌و پێ گەیشتن‌و قاڵ بوون‌و ئەرك كەوتنە سەرشان‌و خزمەت كردنی وڵات‌و ماڵ‌و منداڵ‌و گەل‌و نەتەوە. بەتایبەتی پیاوانی بەرپرسی باڵاو پێشەواو رابەرو هەڵكەوتووی گەل: كە دەیانەوێ خزمەتی گەل‌و وڵات بكەن، هەمیشە وەكوو مۆم دەسوتێن بۆ رووناككردنەوەی میللەتەكەیان‌و رزگاركردنی گەل‌و وڵاتیان لەتاریكە شەوی نەزانی.

هەر لەودەمەوە یەكەم خانەی تۆو لە منداڵداندا جێگیر دەبێ، هەوڵدان‌و خۆ چەسپاندن‌و پەلەقاژە بۆ بژێو دەست پێدەكاو بەردەوام دەبێ تا لەئاكامدا لە ئەنجامی ئێش‌و ئازارو ژاندا، لەدایك دەبێ‌و رووناكی جیهان دەبینێ، بەرواڵەت لەو تەنگانەو زەحمەتە رزگاری بووە بەڵام ئەمجار ئەرك‌و ماندوبوونی زیاتر دەبێ، بۆ یەكەمجار هەوایەك هەڵدەمژێ كە لەوەوپێش پێی ئاشنا نەبووە، دەم‌و سییەكانی دەكاتەوەو بۆ یەكەمجار دەنگی گریانی لێ بەرز دەبێتەوە. كە لەواقیعدا سەرەتایە بۆ دەست پێكردنی ئەرك‌و ماندوێتی ژیانی دونیا، ئیتر جیهازی هەرس‌و جیهازی خوێن سوڕان بەشێوەیەكی تازە دەكەونە كار ئەمجار ئەركی دابینكردنی بژێوو چۆنیەتی هەزمكردن‌و راهاتنی ریخۆڵەكانی بۆ لێوە دەرچوونی ئەو پیساییە.

ئیتر هەر جەو جوڵێکی کە دەیکا ماندوو بوونێکە، هەرساتێکی شەکەتو زەحمەتە. هەر لەودەمەوە دانی دەڕوێن دوایی پێ دەگرێ، دوایی کە فام دەکاتەوە خەمی خوێندنو بیرو ئەندێشەی لەلا پەیدادەبێ.

ئەمجار ئەرکو ماندوو بوون ڕێ ڕێ دەبن، ئەم دەکەوێتە هەوڵدان بەدەستو بازوو، ئەو بەبیرو ئەندێشە، یەکێکی تر بەگریان، ئەم دەیەوێ پاروە نانێک پەیدابکا، ئەو هەوڵ دەدا سەد بکا بە دووسەد، یەکێکی تر هەڵپەی کورسیو پلەو پایەیەتی، کابرایەکی تر خۆ ماندوو دەکا بۆ ناوو شۆرەت، یان لەپێناو عەقیدەو باوەڕدا خۆ ماندوو دەکا بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا، ئەم کاردەکا بۆ دۆزەخ ئەو بۆ بەهەشت، بەڵێ هەمیشە ئادەمیزاد لە ڕەنجدانو لە ماندوو بووندایە، تا دەگاتە لای خوداو حیسابی لەگەڵ دەکرێ جا ئەوکاتە یان دۆزەخییەو بۆ هەتا هەتایە دەکەوێتە ماندووبوونو ئازاری بێ وێنەوە، یان دەچێتە بەهەشتی ڕازاوەو دەکەوێتە خۆشیو کامەرانی بێ سنورەوە.

ژیانی دونیا هەمووی ئەرکو ماندووبوونە، هەموو کەس لە ڕەنجدانو ناڕەحەتیدایە. وەلێ خەسارەتمەند ئەو کەسەیە لەژیانی دونیادا خۆ ماندووبکا بۆئەوەی لەقیامەتدا بکەوێتە ژیانێکی پڕ ئازارترو ناخۆشییەکی نەبڕاوە. بەختەوەریش ئەو کەسەیە لەژیانی دونیادا خۆی ماندوو بکاو ڕێبازێك بگرێتەبەر بیگەیەنێ بە ڕەزامەندی خوداو لەو دونیاشدا ژیانی کامەرانی بۆ دەستەبەر ببێ.

﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ﴾ ئایا ئادەمیزاد پێی وایە کەس دەسەڵاتی بەسەردا ناشکێو کەس تۆڵەی تاوانەکانی لێ ناکاتەوە؟ نانا با وانەزانێ بێگومان خودا ئاگای لەهەموو جۆمو جوڵێکیەتیو تۆڵەی لێ دەستێنێو بەتوندی سزای دەدا.

ریوایەت کراوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی (أبي الأسد)ی کوڕی کەلدەی جومەحی نازڵ بووە، ئەم کابرایە چوارشانەو تێکسمڕاو بوو، زۆر بەهێزو توانای خۆی دەنازی زۆری دژایەتی پێغەمبەری (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) دەکرد.

﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا﴾ ئادەمیزاد رژدو چاو چنۆکە ئەگەر داوای لێ بکرێت یارمەتییەکی هەژاران بدا، دەڵێ: پارەو پولی زۆرم لەناو بردووە، ئیتر بەسەو هیچی تر نابەخشم، ئەمە چییە هەموو رۆژێ ئەم داوایەم لێ دەکرێ؟!

﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُ أَحَدٌ﴾ ئایا ئەو ئادەمیزادە پێی وایە کەس نەیبینیوە؟ وادەزانێ ئێمە ئاگامان لێی نەبووە چۆن ئەو ماڵو سامانەی پەیدا کردووەو لەچیدا خەرجی دەکا؟ لای وایە ئێمە رۆژی قیامەت حیسابو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ناکەینو سزای نادەینەوە؟

## ئادەمیزاد بۆ خۆی رێبازی خۆی هەڵدەبژێرێ

﴿ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ﴿١٤﴾ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ ﴿٢٠﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار سەرزەنشتی ئادەمیزادی کرد لەسەر هەڵوێستی ناشیرینی، بەڵگەی جۆراو جۆری هێنانەوە لەسەر بەتوانایی خودا بەسەر هەموو شتێکدا، برێك لەو بەڵگانە دروستکردنی چاوو زوبانو دوو لێوی ئادەمیزادە، پێ بەخشینی عەقڵو هۆشە: کە بەهۆیانەوە دەتوانێ ڕێبازی چاکەو خراپە لێك جیابکاتەوە، بۆ خۆی ڕێبازی ژیانی خۆی هەڵدەبژێرێ، کەوابوو پێویستە ئادەمیزاد لەسەر ئەو نیعمەتانە سوپاسی خودا بکا، ڕێبازی بەختەوەری هەڵبژێرێ کردەوەی چاك ئەنجام بدا، بۆئەوەی لەپێڕی بەهەشتیان بێ.

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ، وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ﴾ ئەرێ ئادەمیزاد بۆ لەخودا یاخی دەبێ بۆچی بەهێزو توانای خۆی لەخۆی بایی دەبێ؟ ئایا من دوو چاووم پێ نەبەخشیوون؟ هەموو شتێکی پێ دەبینێ، زوبانم بۆ دروست نەکردووە قسەی پێ بکا؟ دوو لێوم بۆ دروست نەکردوون هەتا ددانو پوکی داپۆشێو دەرگایەکی جوانو بەسوود بێ بۆ دەمی. یارمەتیدەری ددانو زوبانیەتی بۆ خواردنو قسەکردن؟ بەکورتی خودا دەفەرموێ: من توانای دیتنو قسەکردنو هەموو هەستو ئامێرو ئەندامی جەستەییمان بە ئادەمیزاد بەخشیووە.

﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ ئایا ئێمە ڕێگای خێرو شەڕمان بۆ روون نەکردوونەتەوە؟ واتە: ئێمە ئادەمیزادمان لەجوانترین شێوەو روخساردا دروست کردووە، ئامێری بیستنو دیتنو هەستو شعوری پێویستمان پێ بەخشیوە، عەقڵمان پێداوە ئەمجا ڕێگەی چاکەو خراپەمان بۆ روون کردۆتەوە، دەتوانێ بەو ئەندامو عەقڵو هەستو هۆشەی پێمان بەخشیووە ڕێبای باش بۆ خۆی هەڵبژێرێ!!

یاسای خوا وابووەو هەرواش دەبێ. هەرگیز زۆرە ملێ لە بەندەکانی ناکا بۆ گرتنەبەری ڕێبازێکی تایبەتی. بەڵکوو ئادەمیزاد بۆ خۆی ئازادو سەربەستە سەرپشك کراوە لەڕێگای چاکەو ڕێگای خراپە کامیان هەڵدەبژێرێ هەڵی بژێرێ، هەر لەسەر ئەم بنەماو بنەڕەتیە کە پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردوون بۆسەر گەلو نەتەوەکانیانو ڕێگای راستو حەقیان بۆ لەڕێگای چەوتو خوار لێك

جیابکەنـەوە، بـاش‌و خراپیـان بـۆ روون بکەنـەوە، واتـە: هەڵبـژاردنی ڕێبازێـك لـەو ڕێبازانەی خستوتە ئەستۆی مرۆڤەکە خۆی. هەرکەسـەو بەویـستی خـۆی ڕێبـازی ژیانی خۆی هەڵدەبژێرێ.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا – الإنسان/٣﴾، واتە: ئێمە ڕێبازی خێرو ڕێبازی شەڕمان پیشانی مـرۆڤ داوە، چـۆنیەتی هـەردوو ڕێبازەکـەمان روون کردۆتـەوە، ئـیتر خـۆی بـە ئارەزووی خۆی کامیان پەسەند دەکا با بیکا، وەکوو لـە ئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەم مانایە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَـاء فَلْيَكْفُـرْ – الكهف/٢٩﴾.

ئـیتر سـزاو پـاداش لەسـەر ئەوەیـە: کـە کـابرا بەویـستی خـۆی ڕێبازێـك هەڵدەبـژێرێ‌و پـەیڕەوی دەکـا. دەی بـا ئـادەمیزاد ڕێبـازی خێـرو چـاکە بۆخـۆی هەڵبـژێرێ سوپاسـی ئـەو خودایـە بکـا کـە دەسـت‌و قـاچ‌و چـاوو گوێـچکەو عـەقڵ‌و هۆشی پێ بەخشیووە، ڕێبازی چاکە بگرێ‌و هەموو هێزو توانای خۆی بخاتە گەڕ بۆ یارمەتیـدانی هـەژارو ئـازادکردنی کۆیلـەو هـەوڵی بەرزکردنـەوەی پلـەی زانیـاری‌و شارستانیەتی بدا، کۆسپ‌و تەگەرە لـەپێش لێقـەوماوان لابـەرێ‌و گرێـی ژیانیـان بـۆ بکاتەوە.

بەتایبـەتی تەنگـەژەی برسـیایەتی‌و کۆیلایـەتی: کـە دیاردەیـەکی هـەرە دزێـوی کۆمەڵگەی ئادەمیزادە لەمێژووداو پێش هاتنی ئیسلام ساڵەهای ساڵ بوو ئادەمیزاد بەدەستیەوە دەیناڵاند، نەیتوانی بوو بەسـەریدا زاڵ بـێ. بۆیـە ئـادەمیزاد هەڵدەنێ بـۆ هەوڵـدان‌و تێکۆشـان لـەپێناو رامـاڵینی ئـەو دوو کۆسـپە گرنگـەو رزگـارکردنی ئادەمیزاد لەدەستی ئەو دێوەزمە.

دەفەرموێ: ﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ﴾ هێشتا ئادەمیزاد کۆسپە ئەسـتەمەکانی دونیـای نەبڕیوە، بە لێبڕانەوە پەلاماری پلـەی سـەختی دونیـای نـەداوە بۆچـی خـۆی گـورج

ناکاتـەوە بـە وزەو نیـشاتی باشـەوە دەسـت ناکا بـە مـل ملانـێ لەگـەڵ ئـەو کۆسـپە گەورانەدا.

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ﴾ چی تۆی فێرکرد ئەو کۆسپە چییە، واتـە: تـۆ چـووزانی ئـەو کۆسـپە خەتەرناکـە چـییە، کـە ناهێڵـێ ئـادەمیزاد پـێش بکـەوێ‌و بەشـێوەی بەختەوەری بژی؟!

ئــەمجار دەستنیــشانی چــۆنیەتی بەگــژا چــوونەوەی ئــەو کۆســپانە دەکــاو دەفەرموێ: ﴿فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ ئازادکردنی کۆیلەیە، واتە راماڵینی کۆسپە دزێوەکانی سەر رێبـازی ژیـانی بەختـەوەری ئـازادکردنی کۆیلەیـە لـە زنجیرو کـۆتی کۆیلایـەتی کـە بەناڕەوا لەملی ئەم‌و ئەو شەتەك دراوە.

﴿أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ﴾ ناندانە بە هەژارو برسیی‌و لێ قەوماوان لەرۆژی برسێتیدا، ماڵ بەخشینە لەکاتی گرانی‌و نەهاتیدا، بیدا بەکێ؟

﴿يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ﴾ بە هەتیوی خـزم ﴿أَوْ مِـسْكِينًا ذَا مَتْرَبَـةٍ﴾ یـان بەهـەژارو بـێ نەوایەکی پەککەوتە: کە لەبەر بێ هێزی‌و کەفتەکاری لەسەر زەوی کەوتبێ، توانای کاسبی‌و وەدەستهێنانی بژێوی خۆی نەبێ.

بەڕاستی ئەم ئایەتە دروشمێکە کـە حـەق وایـە بـەئاوی ئـاڵتوون بنوسـرێتەوەو هـەموو ئـادەمیزاد لـەژێر ئـەو دروشمـەدا کاربکـەن‌و هـەوڵ بـدەن ئـەو کۆسـپ‌و تەگەرانە رابماڵن‌و رێبازی ژیان تـەخت بکەن بۆ بەندەکانی خودا.

جا ئەگـەر کۆیلـەبوونی تاکە کەسـێك لای خـودا ئەوەنـدە سـەخت‌و گـران بـێ، ئازادکردنی تاکە کەسێکی ئەوەندە بەلاوە مەبەست بـێ ئـەی دەبـێ چەوساندنەوەو کۆیلە کردنی گەل‌و نەتەوەیەکی چەند بەلاوە ناخۆش بێ، چەندی پێ نـاخۆش بـێ کە گەل‌و نەتەوەیەك یان چەند نەتەوەیەك ژێر دەستەو کۆیلە بن؟

بەڕاستی ئایینی ئیسلام زۆر خزمەتی مرۆڤی کردووە، یەکەم ئایینە کە هەوڵی داوە وردە وردە دیاردەی کۆیلایەتی قەلاچۆ بکا، چـەند هۆکـارو بیـانووی دانـاوە بـۆ

بنـەبڕکردنی کۆیلایـەتی، شـان بەشـانی ئـەو هەوڵـدانو هەڵتانـە بـۆ سـڕینەوەی ئاسـەواری کۆیلایـەتی، هـەوڵی داوە نەخۆشـی برسـێتی لـەناو کۆمـەڵگادا هـەڵبگرێ، دیاردەی هەژاری نەهێڵێ، زۆر یاساو هۆکاری داناون بۆ یارمەتیدانو یاربوو کردنـی هەژاران.

ئاشکرایە دیاردەی کۆیلایـەتیو دیـاردەی برسیایەتی دوو نەخۆشی ترسـناکنو لەهەر کۆمەڵگایەکدا هـەبن ئـەو کۆمەڵگایـە دادەوەشـێننو لـە پـەلو پـۆی دەخـەن، بۆیە قورئان ئەوەندەی گرنگی داوە بە بڕینی ئـەو دوو پلەیـەو بەکۆسـپی سـەختی داناون.

ئەمجار پێویستە ئادەمیزاد وێڕای بڕینی ئەو دوو پلە سەختە بڕوای پتەوی بە ئـایینی خـودا هـەبێ، پـشوو درێـژو خۆڕاگربـێ لەبەرامبـەر رووداوی رۆژگـاردا، بـە ورەیەکی بەرزو دڵێکی پڕ لە ئیمانو باوەڕەوە رەهنومایی مـەردووم بکاو نموونـەی موسوڵمانی مەردی لـەخۆ بـردووی ئـازاو خـۆڕاگر بـێ، پێشەواو سەرمەشق بـێ بـۆ کەسانی دیکە.

وەکوو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ پاشـان سـەرەڕای کـردەوەی بـاشو پەسەندی لەپێری خودا پەرستان بێ، بـڕوای بـەتاکو تـەنهایی خـودا هـەبێ، شـوێن پەیامی پێغەمبەر کەوتبێ، بـڕوای بەنامـە ئاسمانییـەکان هـەبێ؛ کە پوختـەی ئـەو نامانە لە قورئانی پیرۆزدا رەنگی داوەتـەوە، بـڕوای بـەهاتنی رۆژی قیامـەت هـەبێ، چونکە بـەبێ بڕوابـوون بـەو بنـەما سـەرەکیانەی ئـایین هـیچ کردەوەیـەك سـوودی نییە.

﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ ئـەمجار لەوانـەبێ کـە ئامۆژگـاری یـەکتریان کـردووە بـۆ ئەنجامدانی کاری باشو خۆڕاگری لەبەرامبەر رووداوو ئاستەنگی ژیاندا.

﴿وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ﴾ لەو پێڕو کۆمەڵە بێ کـە ئامۆژگـاری یـەکتریان کـردووە بە بەزەیی هاتنەوە بەیەکتردا، دڵ نەرمو میهرەبان بـێ لەگـەڵ بەنـدەکانی خـودادا،

پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: «الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ ارْحَمُوا أَهْلَ الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ»[1]. ئەوانەی بەزەییان بەبێ نەواياندا دێتەوەو صیلەی رەحم بەجێ دێنن، خودا رەحمیان پێ دەکا.

رەحم بەدانیشتوانی سەر زەوی بکەن خوداش رەحمتان پێ دەکا، صەبرو خۆڕاگری زۆر لایەنی هەیە: صەبرو پشوو درێژی لەسەر تاعەتو خودا پەرستی، خۆ گرتنەوەو خۆپارێزێ لەتاوان، خۆڕاگری لەسەر بەڵاو کارەسات، هەر کۆمەڵو تاقمێك ئامۆژگاری یەکتری بکەن بۆ صەبرو خۆڕاگریو بەزەیی هاتنەوە دەبنە کۆمەڵێکی تۆکمەو پتەوو لەبەرامبەر بەڵاو کارەساتدا ناڕوخێنو لەشکریان ناشکێ... لەناو خۆیان یەکترییان خۆش دەوێو بۆ یەکتری بەپەرۆش دەبن.

﴿أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ﴾ ئەوانەی کە ئەو رەوشتە بەرزانەیان تێدا هەن یارانی دەستە راستنو بەهەشت جێگایانە، کۆمەڵی بەختەوەرنو خۆزگەیان پێ دەخوازرێو بۆ هەتا هەتایە لەناو بەهەشتی رازاوەدا رادەبوێرن.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا﴾ ئەوانەی ئایەتی قورئان رەتدەکەنەوەو گوێ بۆ ئەو پەیامە پیرۆزە راناگرنو ئایەتە کەونیەکان ناکەنە بەڵگە لەسەر هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی لەزاتو لە صیفاتیدا، واتە: لە بونەوەر ورد نابنەوە تا دیاردەکانی بکەنە نیشانەی خودای بەدیهێنەرو خاوەن توانا.

﴿هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ﴾ ئەوانە یارانی دەستە چەپن، بەدبەختو چارە رەشن، ئەهلی دۆزەخن.

﴿عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌ﴾ ئاگرێکی دەرگا داخراو لەسەریانەو لەخۆی گرتوون، نە بڵێسەی دەردەچێ نە دووکەڵی دەردەچێ، ئاگرو دوکەڵو تاوانباران پەنگ دەخۆنەوە.

[1] رواه أحمد وأبو داود والترميذي والحاكم عن ابن عمر (رَضيَ اللهُ عنهُ).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی الشمس

ئەم سورەتە مەکییەو پانزە ئایەتە، ناوی نراوە (الشمس) چونکە لەسەرەتایدا خودا سوێندی بەخۆر خواردووەو فەرموویەتی: ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا...﴾.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشەوە لەم رووەوەیە:**

کە کۆتایی سورەتی پێشووی بەوە هێنا، کە تێکڕا ئادەمیزادی کردنە دوو تاقم ﴿أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ﴾ و ﴿أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ﴾ ئەمجار لەم سورەتەدا مەبەست لەهەردوو تاقمەکە باس دەکا، بەوە: کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾.

**میحوەرو ناوەڕۆکی سورەتەکە دوو سەرە باسی سەرەکین:**

١- سوێند خواردن بەدیاردەکانی بوونەوەر لەجیهانی بالاو پایین، دەست نیشانکردنی ئەوانەی بەختەوەرن و دیاری کردنی بەدبەختو چارە ڕەشەکان.

٢- بەنموونەوە بۆ پەندو عیبرەت لێ وەرگرتنە ئاماژە بەچیرۆکی قەومی سەمود دەکا: کە چۆن لەتۆڵەی تاوانەکانیان خودا لەناوی بردن.

بەکورتی مەبەستی سورەتەکە هەڵنانی ئادەمیزادە بۆ خوداپەرستی و ترساندنیانە لەئەنجامدانی تاوان.

## ئاکامی چاك پەروەردەکردنی نەفس و پاشکوێ خستنی

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴿١﴾ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴿٢﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴿٤﴾ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴿٥﴾ وَالْأَرْضِ وَمَا

طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا﴾ سوێند بەخۆرو روناکییەکەی کە هەمیشە روناکی دەبەخشێ و بوونەوەر روناک دەکاتەوە، هێزو وزە دەبەخشێ بەگیانلەبەران و رووەك و درەخت، خۆر ئەستێرەیەکی گەورەو زەبەللاح و سەرسوڕهێنەرە مەلایین ساڵە ئەم وزەیە دەبەخشێتە بوونەوەرو وزەی لێ نابڕێ و ساتەوەختێك نەوەستاوەو ناوەستێ تا دەگاتە ئەو کاتەی خودا دایناوە بۆ وەستان و کۆتای هاتنی تەمەنی.

﴿وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا﴾ سوێند بەمانگی خاوەن نورو ورشە کاتێك بە دوای خۆر دادێ، بەتایبەتی لەشەوانی سیانزە تا شانزە، کە لەم شەوانەدا مانگ خۆی تەواو دەکاو جوانی خۆی دەنوێنێ.

﴿وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا﴾ سوێند بەرۆژو روناکی لەکاتێکدا خۆر لەئاسۆ دەردەکەوێ و سروشت روناك دەبێتەوەو گیانلەبەران لەجەم و جوڵدان، سوێند دەخۆم بەشەو، کە بەتاریکایی خۆی خۆر دادەپۆشێ و روناکییەکەی ناهێڵێ، نیوە کورەی زەوی دەکەوێتە تاریکییەوەو نیوەکەی تری لەروناکیدا دەبێ، بەم گۆڕانکاری و ئاوابوون و هەڵاتنەی خۆرو مانگ، رەدی ئەو موشریکانە دەداتەوە، کە ئەستێرەیان بەخودا زانیوە، هەروەها رەدی ئەوانەش دەداتەوە کە دوو خودایان بەڕەوا دەزانی بۆ بونەوەر (خودای روناکی و خودای تاریکی) چونکە خودا نابێ گۆڕانی بەسەردا بێ و ئاوا ببێ و دەرکەوێ و ون بێتەوە...

﴿وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا﴾ سوێند بەئاسمان و ئەو کەسەی دروستی کردووە، ئاسمان ئەو دیمەنە شینە پان و پۆڕەیە لەژوور سەرمانەوە دەی بینین و نازانین چییە، بەهەزاران هەزار ملیۆن مانگ و خۆرو ئەستێرەی تێدا دێ و دەچن، تا ئێستا زانیاری مرۆڤ نەیتوانیوە ئەندازەی پان و پۆڕی ئاسمان و ژمارەی ئەستێرەکان

بزانێ، لەوە بەولاوەش ناتوانێ، چونکە قورئان دیاری نەکردووەو لەتوانای ئادەمیزادیشدا نیە ئەو زانیارییە وەدەست بێنێ. ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾.

پەروەردگار ئەم حەمکە ئەستێرەی لەو بۆشاییە بەرفراوانەدا بەهێزی کێشندە بەیەکەوە بەستۆتەوەو بۆ هەر یەکەیان شوێنو مەداری تایبەتی دیاری کردووە، مەلایین ساڵە لەهاتوچۆو هەڵسوڕاندانو هیچیان مەدارو ڕێڕەوی خۆی هەڵە ناکاو نزیکیو دووریان لەیەکتری نەگۆڕاوە. چرکەیەك هەڵاتنو ئاوابوونیان پاشو پێشی نەکردووە.

﴿وَالأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا﴾ سوێند بەزەوی، ئەو ئەستێرەی بووەتە شوێن تێدا ژیانی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تریش، خودا بەدەسەڵاتی خۆی رایخستووە، وای لێ کردووە بگونجێ بۆ تێدا ژیانو لەسەر ژیان، لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا – النازعات/٣٠﴾. وشەی (طحو، دحو) هەردووکیان بەمانا راخستنە، واتە: بەرواڵەت وادێتە بەرچاو راخرابێ، نەگینا لەراستیدا گۆی زەوی هێلکەییەو خڕە نەك راخراوە، لەبەر گەورەیی ئەوو بچووکی ئێمە، بەراخراوی دێتە بەرچاومان.

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا﴾ سوێند بەنەفسی ئادەمیزادو ئەو کەسەی ڕێکیخستووە، هێزو توانای داوەتێ پێداویستییەکانی خۆی دابین بکا، ئامێری بیستنو دیتنو عەقڵو هۆشی پێداون، ئەندامەکانی جەستەیانی ڕێكوپێك کردووەو هێزو توانای جۆراوجۆری پێ بەخشیونو ئەرکی هەر ئەندامێکی بۆ دیاری کردووە.

﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ ئەمجار پەروەردگار ڕێگای چاكو خراپی بۆ دیاری کردووە، لەو نەفسەی گەیاندووە ئەوە چاکەو ئەمە خراپە، ئەوە پەسەندەو ئەمە ناپەسەندە.

بۆ ئەوەی خێرو شەڕ لێك جیابكاتەوە، وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرمویێ: ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ – البلد/١٠﴾ واتە: فێرمان كردووە ڕێگای خێرو شەڕ بگرێتەبەر، بۆ خۆی بەویستی خۆی ڕێگایەكیان هەڵبژێرێ.

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ بێگومان رزگاری بوو بەختەوەر بوو ئەو نەفسەی خودا پاكی كردووە، بەپاكی دروستی كرد، ڕیسوا بوو ئەو نەفسەی خودا بەكافری دروستی كرد، یان هەموو ئاواتەكانی هاتنە دیو بەمراز گەیشت كەسێك نەفسی خۆی لەبێدینیو پاك كردەوەو بەتەقواو خوداپەرستی گەشەی پێ كرد، خەسارەتمەند بوو كەسێك نەفسی خۆی گومڕا كردو بەخراپی پەروەردەی كرد، ڕامی نەكرد بۆ خوداپەرستیو كردەوەی چاك.

تەبەرانی لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەكا دەفەرمویێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) هەركاتێ ئەم ئایەتەی بخوێندایە ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ ڕادەوەستاو دەیفەرموو: (اللهم آت نفسي تقواها أنت وليها ومولاها وخير من زكاها).

ئیبنو ئەبی حاتەمیش لە ئەبو هورەیرەوە هەمان ریوایەت دەكا. ئیمام ئەحمەد لە خاتوو عائیشەوە ریوایەت دەكا دەفەرمویێ: شەوێك پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) لەشوێنی نووستنیدا دیارنەبوو دەستم لێ گێڕا لە ژوورەكەدا دەستم لێی كەوت، لە سوژدەدا بوو، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (رب اعط نفسي تقواها، وزكها وأنت خير من زكاها، أنت وليها ومولاها).

ئیمام ئەحمەدو موسلیم لە زەیدی كوڕی ئەرقەمەوە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) ئەم دووعایەی دەكرد: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لاَ

تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا»[1]. زەید دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ علیهِ وسلم) ئەم وشانەی فێر دەکردین، ئێمەش فێری کەسانی دیکەمان دەکرد.

## پەند وەرگرتن لە سەرگوزشتەی گەلی ثەموود

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا ﴿١١﴾ إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا ﴿١٥﴾﴾

لەوەوپێش پەروەردگار سوێندی بە حەوت شتی بایەخدار خواردو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە: کە هەرکەسێك نەفسی خۆی جوان رام بکاو لە تاوان پاکی بکاتەوە بەمراز گەیشتووە، هەرکەسێك ئیهمالی بکاو جڵەوی بۆ بەرەڵلابکا خەسارەتمەندە.

ئەمجار پەروەردگار سەرگوزشتەی گەلی ثەمود دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی قورەیشییەکانو هەموو کەسێکی تر پەندی لێ وەربگرن بەتایبەتی کە شارو گوندە روخاوەکانی ئەو گەلە لەناوبراوە نزیك وڵاتی مەککەیە.

عەرەبەکان کە دەچوون بۆ کاروانو گەشت بەسەر کەلاوە روخاوەکانی ئەو گەلە بەدبەختەدا تێپەڕ دەبوون، قورەیشییەکان دەترسێنێ لەوە کە سەرپێچی پەیامی پێغەمبەر نەکەن نەبادا هەمان عەزابو کارەساتی بەسەر گەلی ثەمود هات

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج ٢٠٣٦/٤ طبعة دار الفکر ساڵی ١٤٢٠ھ.

بەسەر ئەوانیش بێ، ئەوەتا لەم کۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ کە گەلی ئەمود پێغەمبەری خۆیان بەدرۆ خستەوە، بەهۆی بوغرایی‌و سەرڕەقی خۆیان، دەفەرموێ:

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا، إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا﴾ هۆزی ئەمود پێغەمبەری خۆیان: کە حەزرەتی صالح بوو – بەدرۆیان خستەوە، بەهۆی بوغرایی‌و یاخی بوون‌و سەرڕەقی خۆیان زێدەڕەوییان کرد لەبەرەنگار بوونەوەی پێغەمبەرەکەیاندا. ئەمەش کاتێك تاوانبارترین کەسیان کە (قوداری کوڕی سالب) بوو پیاوێکی بێ عەقڵی قەومی ئەمود بوو، بە دەنە دەنەو هەڵنانی گەلەکەی حوشترەکەی سەربڕی؛ ئەو حوشترەی بە موعجیزە خودا خولقاندبووی. سەربڕینی ئەو حوشترەو رازی بوونی گەلەکە بەو کارە ناشیرینە نیشانەی ئەوە بوو کەهەموویان تاوانبارن‌و هەموویان حەزرەت (صالح)یان بەدرۆ خستەوە.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَى فَعَقَرَ – القمر/٢٩﴾. لەهەمان کاتدا نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی صالح بوو، چونکە ئەو عەزابەی هەڕەشەی پێ لێ کردن هاتەدی‌و لەناوی بردن.

وەکوو ریوایەتکراوە ئەم کابرا بەدبەختەی حوشترەکەی سەربڕی پیاوماقوڵی گەلەکەی بوو، لەبنەماڵەیەکی خانەدانی ئەو گەلە بوو، قسەرۆیشتوو خاوەن کەس‌وکار بوو.

بوخاری‌و موسلیم‌و تیرمیزی‌و نەسائی لە عەبدوڵڵای کوڕی زەمعەوە ریوایەتیان کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلّى اللهُ عَليهِ وسَلَم) وتاری دا، باسی حوشتری حەزرەتی صالحی کردو باسی ئەو تاوانبارەی کرد کە سەری بڕی، فەرمووی:

پیاوێـك هەڵـسا بـۆ سـەربڕینی حوشـترەکە پیاومـاقوڵ بـوو، خـاوەن قـسەو دەسـت ڕۆیشتوو بوو لەناو گەلەکەیدا[1].

﴿فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ: نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا﴾ پێغەمبەرەکەیان (حەزرەتی صالح) پێی فەرموون: واز لەو حوشترە بهێنن، دەستدرێژی نەکەنـە سـەر، لێـی بگـەڕێن بـا نۆبە ئاوی خۆی بخواتەوە، ئەگەر دەستدرێژی بکەنە سەر، خودا بەعـەزابی کۆکوژ لەناوتان دەبا.

﴿فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا﴾ پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستەوەو گوێیـان بەهەڕەشـەکەی نـەدا، تاوانبارتـرینیـان (قیـدار) بـە ڕەزامەنـدی هـەموو قەومەکـە حوشـترەکەی سەربڕی‌و گەورەترین تاوانی ئەنجام دا.

﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا، وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا﴾ خـودا عـەزابی سـەختی خۆی بەسەردا ڕشتن‌و لـەناوی بـردن، قـاری لێ گـرتن‌و بەتـەواوی بەعـەزابی کۆکوژ دایپۆشـین‌و وردو درشـتی تێکـڕا لـەناو بـردن‌و کەسـیان لێ قوتـار نـەبوو. خـوا لەسـەرەنجامی ئـەو تۆڵەسـتاندنە ناترسێ، چونکە خـودا هەرچـی بیکـا عەداڵەت‌و حیکمەتە، کەسێ ڕایەی ناکەوێ بڵێ بۆچی ئەوەت کرد ستەمکاریش نیـە تـا بترسێ لە ئاکامی ستەم، بێ دەسەڵاتیش نیە بترسێ کەسانی دیکە زیانی پێ بگەیەنن.

مانایـەکی تـریش هەڵـدەگرێ بـەم جـۆرە (فاعیـل)ی (یخـاف) قـوداری حوشـتر سـەربڕبێ. واتـە: پرکێـشی سـەربڕینی حوشـترەکەی کـرد بـەبێ ئـەوەی سـڵ لەهەڕەشەکانی حەزرەتی صالح بکاتەوەو ترسی سـەرەنجامی کـردەوە ناشـیرینەکەی خـۆی هـەبێ. بەچـاو نەترساوی‌و بـێ پـەروا، بـێ ئـەوەی ترسـی بـەهیلاك چوونی خۆی‌و گەلەکەی هەبێ حوشترەکەی سەربڕی.

[1] ریواه البخاری في (٦٥) کتـاب التفسیر (٩١) بـاب والـشمس وضـحاها الحـدیث (٤٩٤٢) وەکـوو لـە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ریواه موسلیم في (٥١) کتاب الجنة وظفـة نعیمهـا وأهلها (١٣) الحـدیث (٢٨٥٥).

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی اللیل

ئەم سورەتە مەککییەو بیستو یەك ئایەتە. ناونراوە سورەتی (لەیل) چونکە خودا لە سەرەتادا، سوێندی بە (اللیل) خواردووەو فەرموویەتی: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى﴾ سوێند بەشەو کاتێك بونەوەر دادەپۆشێ.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشەوە لەو رووەوە:**

کە لە سورەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ ئەمجار لەم سورەتەدا ئەو رەوشتانەی دیاری کردن: کە فەلاحو خەسارەتمەندییان لێ وەدی دێ... فەرمووی: ﴿فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى...﴾ ﴿وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى...﴾.

میحوەری سورەتەکەو ناوەڕۆکی بریتییە لە هەوڵو تێکۆشانی ئادەمیزادو سزاو پاداشتی.

## جوداوازی هەوڵو تێکۆشانی ئادەمیزاد

﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ٢ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ٣ إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ ٤ فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ٥ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ٨ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ١٠ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ١١ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ﴿فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى...﴾ ئیبنو جەریرو حاکم لە عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە ریوایەت دەکەن، دەڵێ: حەزرەتی ئەبوبەکر؛ لە مەککە هەرکەسێ کۆیلە بووایەو موسوڵمان بووایە دەیکڕی‌و ئازادی دەکردو، بە زۆری پیرو ئافرەتی ئازاد دەکردن کە ئیمانیان دەهێنا، ئەبو قوحافەی باوکی، وتی: رۆڵە! دەبینم پیرو پەککەوتە ئازاد دەکەی؟ بۆ پیاوی ئازاو گەنج‌و گورج‌و گۆڵ ناکڕی‌و ئازادیان ناکەی؟ تا دوایی یارمەتیت بدەن‌و بەرگریت لێ بکەن؟ حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی: من لەبەر خودا ئازادیان دەکەم.

ئیتر ئایەتی ﴿فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى...﴾ تا کۆتایی سورەتەکە نازڵ بوو. ئایەتی ﴿وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى﴾ دەرحەق بە ئومەیەی کوڕی خەلەف نازڵ بووە.

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى﴾ سوێند بەشەو کە بەتاریکی خۆی هەرچی روناکی هەیە دایدەپۆشێ‌و پەردە بەسەر بونەوەردا دەدا.

﴿وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى﴾ سوێند دەخۆم بەرۆژ هەرکاتێ دەرکەوت تاریکی نەماو بوونەوەر روناك بووەوە.

﴿وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى﴾ سوێند بەوکەسەی نێرو مێی لەهەموو رەگەزێك دروست کردووە، لە ئادەمیزادو هەموو گیانلەبەرانی ترو رووەك‌و شتی تریش، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا – النبأ/٨﴾.

ئەمجار وەڵامی سوێندەکە دەهێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى﴾ بێگومان هەوڵ‌و تێکۆشانتان جیا جیایە، هەتانە چاکە کارەو هەتانە خراپەکارە، بڕێکتان هیدایەت دراون‌و هەندێکتان گومڕان، کۆمەڵێکتان بەهەشتین‌و تاقمێکتان دۆزەخین، هەریەکەتان ئاواتێکی هەیەو بۆ مەبەستێك کاردەکا، هەرکەسە بیروباوەڕێکی هەیەو رێبازێکی هەڵبژاردووە، جا ﴿فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى﴾ کەسێك ماڵ‌و سامانی خۆی ببەخشێ لە رێگەی خێردا، خۆلەکاری حەرام بپارێزێ‌و توخنی ئەو شتانە نەکەوێ: کە خودا نەهی لێ

کردووە، بڕوای بەوادەی خودا هەبێ‌و چاوەڕوانی پاداشی کردەوەی چاکی خۆی بێ، ئەوە بادڵنیابێ؛ کە ئێمە هیدایەتی دەدەین بۆ ڕێبازی سەهل‌و ئاسان ئەو ئەرکانەی خراوەتە سەرشانی بە ئاسانی ئەنجامیان دەدا.

﴿وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى، وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى﴾ بەڵام ئەو کەسەی ڕژدی‌و چرووکی لە ماڵ‌و سامانی خۆیدا بکا، دڵی نەیە لێی ببەخشێ‌و یارمەتی هەژارانی لێ بدا، یا ماڵی خۆی لە ڕێگای ئارەزۆ بازیدا خەرج بکا، بەرابواردنی دونیاو خۆشی ژیان خۆی بەبێ ئاتاج بزانێ لەژیانی خۆشی قیامەت، بێ منەت بێ لەخوداو پاداشی بەهەشتی، رابوونی قیامەت‌و حیساب‌و لێکۆڵینەوە بەدرۆ بزانێ. ئەوە ڕێگای بۆ خۆش دەکەین بکەوێتە ناو تەنگ‌و چەڵەمەوە، تووشی مەینەتی‌و ناخۆشی ببێ، بەهیچ شێوەیەك ڕێگای خێر نەدۆزێتەوە دەستی نەچێتە کارێکی خێرەوە، تا تووشی دەبێ بە تووشی دۆزەخەوە، ئەمجار ئەوکاتە ماڵ‌و سامانی دونیای کەرژدی‌و چرووکی تێدا دەکرد هیچ فریای نەکەوێ، بەڵێ ئەوکاتەی تور دەدرێتە دۆزەخەوە هیچ شتێك فریای ناکەوێ، هەر لەوکاتەوە کە مەرگ یەخەی دەگرێ ئیتر هیچ شتێك دادی ناداو دەستی لەهەمبانەکە دەردەچێ.

بوخاری‌و موسلیم لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: لەگەڵ پێغەمبەردا بووین، لە گۆڕستانی بەقیع خەریکی ناشتنی تەرمێك بووین، لەوکاتەدا پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ» هیچ کەس نیە لەئێوە ئیللا شوێنی لە بەهەشتدا بۆ دیاری کراوەو لە دۆزەخیشدا شوێنی بۆ دیاری کراوە، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیتر بۆ پاڵی لێ نەدەینەوە؟ پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: (اعملوا فكل ميسر لما خلق له) تێبکۆشن، هەریەکەتان ڕێگەی بۆ

خۆش كراوه بۆ ئەو سەرەنجامەی بۆی دروستكراوه، ئەمجار ئایەتی ﴿فَأَمَّا مَن أَعْطَى... الذريات﴾ خوێندەوه[1]

## ئادەمیزاد بۆ خۆی بەرپرسیارە لەكردەوەكانی

﴿ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴿١٥﴾ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ﴿١٧﴾ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی راگەیاند: كە هەوڵو تێكۆشانی ئادەمیزادەكان جیا جیایە، هەر كەسەو ئامانجێكی تایبەتی خۆی هەیە؛ هەوڵی چاكە دەداو هەیە روو لەخراپە دەكا چاكەكار رێی بۆ خۆش دەكرێ بۆ زێدە كاری چاك وە خراپەكار رێبازی گومرایی بۆ خۆش دەكرێ، ئەمجار ئەو دەگەیەنێ كە پەروەردگار رێگای چاكو رێگای خراپی روون كردۆتەوە، هەڕەشەی لە خراپەكاران كردووەو مژدەی بەچاكەكاران داو، هەر خۆیشی خاوەنی دونیاو قیامەتەو لەهەموو كەس بێ ئاتاجە، ئەگەر هەمووشیان كافربن لەخودایەتی ئەو كەم نابێ.

---

[1] تەفسیری ابن كثیر ج ٢٠٣٩/٤ ئەم فەرمووده بەچەند ریوایەتێكی جۆراو جۆر هاتووه بەڵام هەموو ریوایەتەكان یەك مانایان هەیە رواه البخاري في (٦٥) كتاب التفسير (٩٢) الحديث (٤٩٤٨) ورواه مسلم في (٤٦) كتاب القدر (١) الحديث (٣٦٤٨).

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَى﴾ حیکمەتی خودایەتی ئێمە وا داخواز بوو، کە ڕێگەی هیدایەتو ڕێگەی گومڕایی بۆ بەندەکانما ڕوون بکەینەوە، حەڵاڵو حەرامیان بۆ دیاری بکەین، حەقو بەتاڵیان بۆ لێك جیابکەینەوە، ئەحکامی عیبادەتو بیروباوەڕو مامەڵەو بازرگانیو ئادابو ڕەوشتیان بۆ شی بکەینەوە.

﴿وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَى﴾ هەرچی لە قیامەتدایەو هەرچی لەدونیادایە هی، ئێمەیە، ملکایەتیو تەصەڕوف تێداکردنی بەدەست ئێمەیە چۆنمان بوێ ئاوا کارەکان هەڵدەسوڕێنین، هەرکەسێ داوایەکی هەیە، با لەئێمە داوابکا، چیمان بوێ پێی دەبەخشین، چەندێك ببەخشین لە گەنجینەمان کەم ناکا، ئەگەر هەموو ئادەمیزادو جندۆکە هیدایەت وەربگرن لە خودایەتی ئێمە زیاد نابێ، خۆ ئەگەر هەمووشیان کافربن لەخودایەتی ئێمە کەم نابێ، قازانجی خودا پەرستیو زیانی کوفرو بێدینی خۆیان بۆ خۆیانەو بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار بەندەکانی لە ئاگری دۆزەخ دەترسێنێو دەفەرموێ: ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّى﴾ ئەی ئادەمیزادینە! ئەمن ئێوەم ترساندووە لە عەزابی ئاگرێکی گەورە کە هەڵگیرساوەو لە کڵو گرفە گرف دایە، ئەویش ئاگری دۆزەخەو بێ ئامانە.

﴿لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى، الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾ ناچێتە ناو دۆزەخەوەو عەزابی سوتانو گەرماو هەڵاوی دۆزەخ ناچێژێ مەگەر ئەو کافرە بێ باوەڕە نەبێ: کە ئەو حەقەی پێغەمبەران هێناویانە بەدرۆی بزانێو پێغەمبەری ئیسلام بەدرۆ بخاتەوە، پشت لەئیمان هەڵبکاو شوێن پەیامی پیرۆزی خودا نەکەوێو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی شەریعەتی خودا نەبێ.

﴿وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى، الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى﴾ خۆ لە ئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوەو کەسێك خۆ لەکوفر دوور بگرێو بەهیچ شێوەیەك خۆ لەوبوارانە نزیك نەخاتەوە: کە بەلای کوفردا مەیلی هەیە. بەدڵسۆزی خوداپەرستی دەکاو

بەجیدی دەیەوێ خۆ لەعەزابی خودا بپارێزێ. ئەم تەقواکارە وێڕای خوداپەرستی ماڵو سامانیشی دەبەخشێ لەبواری خێردا، بۆ ئەوەی لەچڵکی تاوان پاك بێتەوە، ماڵبەخشینەکەی بۆ ڕیابازی نیە، بۆ ئەوە نیە ماڵ پێ بەخشراوەکان سوپاسی بکەن.

ئەحمەدو بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە کە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) فەرمووی: «كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ ، إِلاَّ مَنْ أَبَى، قَالُوا وَمَنْ يَأْبَى يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى». هەموو ئومەتی من دەچنە بەهەشتەوە مەگەر کەسێك یاخی بێ، هاوەڵان وتیان: کێ یاخی دەبێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: کەسێك پابەندی شەریعەتم بێ دەچێتە بەهەشتەوە، کەسێك سەرپێچی فەرمانەکانم بێ ئەوە یاخییە.

﴿وَمَا لأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَى، إِلَّا ابْتِغَاء وَجْهِ رَبِّهِ الأَعْلَى، وَلَسَوْفَ يَرْضَى﴾ ئەو ماڵو سامانەی دەیبەخشێ بۆ ئەوە نیە پیاوەتی کەسانی دیکەی بەسەرەوە بێو پاداشتیان بداتەوە، بەڵکوو ئەو ماڵبەخشینەی تەنها بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودایە، دەیەوێ خودا لەخۆی ڕازی بکا، بێگومان لەوە بەولاوە لەقیامەتدا خودا ئەوەندەی نازو نیعمەت پێ دەبەخشێ کەڕازیبێ.

ئیمام ئەحمەدو ئیبنو ماجەو ئیبنو مەردەویهی لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت دەکەن: کە دەڵێ: پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) فەرمووی: ناچێتە ناو دۆزەخەوە مەگەر کەسێك بەدبەخت بێ، وترا: کێ شەقیو بەدبەختە؟ فەرمووی: کەسێك تاعەتی خودا نەکا، کارێك نەکا مەبەستی نەکردنەکەی بەندایەتی کردنی خودابێ، واز لەتاوانێك نەهێنێ لەبەر خاتری خودا. واتە: تاوانکار بێ خۆ ئەگەر خۆی لەتاوان پاراستو خۆپاراستنەکەی لەبەر خودا نەبێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی الضحی

ئەم سورەتە مەککییەو یازدە ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی (الضحی) چونکە لەسەرەتای سورەتەکەدا خودا سوێندی بە (الضحی - چێشتەنگاو) خواردووە، سورەتەکە دەربارەی حاڵو وەزعی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) نازڵ بووە، بۆیە سەرەتاکەی بەسوێند خواردن بەو کاتە رووناکو گرنگە دەست پێ دەکا.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشوویەوە لەدوو رووەوەیە:**

١- سورەتی (اللیل) کۆتایی پێ هاتووە بەوە: کە خودا وادەی بەتەقواکاران داوە کە بەفەزڵو نیعمەتی خۆی رازییان بکا لەسورەتی (والضحی)شدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەوە بەولاوە خودا بەنازو نیعمەتی مادیو مەعنەوی پێغەمبەر رازی دەکا. دەفەرموێ: ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ﴾.

٢- لەسورەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى﴾ لەو سورەتەشدا نیعمەتەکانی خۆی باس دەکا کە بە پێغەمبەری بەخشیوون. ئەو پێغەمبەرەی کە سەرداری تەقواکارانە.

ناوەڕۆکی سورەتەکە بریتیە لەباسکردنی کەسایەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم)و واقعی وەزعو حاڵی ئەو ئادەمیزادە بەڕێزەو چۆنیەتی پەروەردە بوونیو سەرەنجامی ژیانو پەیامی.

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: سوننەتە دوای سورەتی (والضحی) (الله أكبر) بکرێ، واتە: بگوترێ: (الله أكبر: لا اله الا الله والله أكبر) هەروەها تاکۆتایی قورئان لە ئاخری هەموو سورەتەکاندا سوننەتە ئەو تەکبیرە بکرێ، زانایانی ئیسلام لەم بارەوە فەرموویانە:

یەکەمجار کە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَیهِ وسَلم) سروشى بۆ هات لەئەشکەوتى (حیراء) زۆر ترسا. لەرز دایگرتوو گەڕایەوە بۆ ماڵو دایان پۆشى، ماوەیەك بەدەم بێدارىو نوستوییدا مایەوە، تا سروشێکى ترى ئاڕاستەکراو هێندەى تر ترسو سامى لێ نیشت، سروشەکە نیشانەى ئەوەى تێدابوو کە ئەرکێکى قورسى دەخرێتە سەرشانو ماندوو بوونى زۆرى گەرەکە... ئەمجار ماوەیەکى زۆرى پێ چوو نیگاو سروش لە پێغەمبەر بڕا، وردە وردە سامو هەیبەت لە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَیهِ وسَلم) ڕەوییەوەو حەزى لێ بوو سروشى بۆ بێ، بەڕۆژ دەچوو بۆ ئەشکەوتى (حیراء) چاوەڕوانى نیگا بوو، بەڵام نیگا دواکەوتو پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَیهِ وسَلم) بێ هیوا بوو، واى زانى خودا دەستبەردارى بووە، دڵى تەنگ بوو، غەمو خەفەت دایگرت، ئەمجار پەروەردگار ویستى ئەو چاوەڕوانییەى پێغەمبەر بەکۆتا بێنێو سورەتى (والضحى)ى بۆ نارد، ئیتر پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَیهِ وسَلم) هێندەى پێ خۆشبوو لەخۆشیاندا تەکبیرى کرد...

## نیعمەتەکانى خودا بەسەر پێغەمبەردا

﴿ وَالضُّحَىٰ (١) وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ (٢) مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ (٣) وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ (٤) وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ (٥) أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ (٦) وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَىٰ (٧) وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَىٰ (٨) فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ (٩) وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ (١٠) وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ (١١) ﴾

موسلیمو بوخاری له جوندوبەوه ریوایەت دەكەن: دەڵێ: پێغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم) ئازارێكی هەبوو شەوێك یان دوو شەو لەجێگادا كەوتو هەڵنەستا ئافرەتێك هات بۆ لای وتی: ئەی محمد! ئەوە چیتە، دەڵێی شەیتانەكەت وازی لێ هێناوی؟

ئیتر پەروەردگار سورەتی ﴿وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ی بۆنازڵ كرد.

دەفەرموێ: ﴿وَالضُّحَى﴾ سوێند بەكاتی چێشتنگاو: كە جوانترین كاتەو خۆربەتیشكی خۆی بونەوەر دەڕازێنێتەوە، هەموو كونو قوژبنێك روناك دەكاتەوە هەڕەتی جمەوجوڵو دەست بەكاربوونی گیانلەبەرانو ئادەمیزادە بۆ وەدەستهێنانی بژێوو سەرەتای ئێشو جوڵانەوەیە بۆ ژیانێكی تازەو لەڕۆژێكی تازەدا.

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى﴾ سوێند بەشەو كاتێك دەزرنگێتەوەو بەتاریكی خۆی روناكی رۆژ دادەپۆشێ وەكوو چۆن ئادەمی بەلێفەو بەتانی خۆ دادەپۆشێ! ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ خودای تۆ دەستبەردارت نەبووەو وازی لێ نەهێناوی، نیگای لێ نەبڕیوی، رقی لێت هەڵنەساوەو خەشمو قاری لێ هەڵنەگرتووی.

ئەمجار مزگێنی بە پێغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم) دەداو دەفەرموێ: ﴿وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَى﴾ بەتەئكید داهاتووت باشتر دەبێ لەڕابوردوت، قیامەتت باشترە لەدونیات، رۆژبە رۆژ لەبەرزیو شكۆمەندیدا دەبێ.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیزیو ئیبنو ماجە لە ئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت دەكەن دەفەرموێ: پێغەمبەرم بینی لەسەر حەسیرێك راكشابوو چاڵو چوێڵی حەسیرەكە بەلاپەراسوودیەوە دیار بوو شوێنی لێ كردبوو، جا كە بەخەبەر هات دەستم لەپەراسووەكانی داو سێ جار دەستم پێدا هێنا، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆ رێگەنادەی لەسەر حەسیرەكەوە شتێكی نەرمت بۆ رابخەین؟ پێغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم) فەرمووی: ئەوەندەم دونیا مەبەست نیە، نموونەی

منو دونیا وەكوو سوارێكی ڕێبوار وایە، تاوێك لادەداتە بن سێبەری درەختێكو دوای دەڕواو بەجێی دێڵێ.

﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى﴾ لەوە بەو لاوە خودا بەفەزڵو گەورەیی خۆی پلەو پایەو نازو نیعمەتت ئەوەندە پی دەبەخشێ ڕازی بی. لەدونیادا باڵادەستو سەركەوتوت دەكا بەسەر دوژمنەكانتدا لەقیامەتیشدا پاداشو پلەی بەرزت پی دەبەخشێ، حەوزی كەوسەرت خەڵات دەكا، دەبیتە شەفاعەتكار بۆ ئوممەتەكەتو تكات وەردەگرێ. لەدونیادا ئاینەكەت باڵادەست دەبێو ڕێزو قەدرت زیاد دەكا.

ئەمجار پەروەردگار نیعمەتەكانی خۆی كە پێش پێغەمبەرێتی بە حەزرەتی موحەممەدی بەخشیون رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى﴾ ئەی محمد! ئایا خودای تۆ تۆی نەبینی بەهەتیویو حەواندیتیەوە؟؟ تۆ هێشتا لەسكی داكتدا بووی باوكت لەدونیا دەرچوو، ئیتر خودا شوێنی حەوانەوەو پەروەردەكردنی بۆ ڕەخساندی، لەماڵی عەبدولموتەلیبی باپیرت داو ماڵی ئەبو تالیبی مامتدا پێگەیشتی. ئەوەبوو هێشتا پێغەمبەر لەسكی دایكیدا بوو باوكی لەدونیا دەرچوو، پاشان (خاتو ئامینە)ی دایكی لەدونیا دەرچوو، ئەوكاتە پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) تەمەنی شەش ساڵ بوو. ئەمجار كەوتە ژێر سەرپەرشتی عەبدولموتەلیبی باپیری.

هێشتا پێغەمبەر تەمەنی هەشت ساڵ بوو: كە باپیریشی لەدونیا دەرچوو، ئەمجار ئەبوتالیبی مامی لەخۆی گرتو بەردەوام بوو لە یارمەتیدانی تا تەمەنی گەیشتە چڵ ساڵیو بووبە بە پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم).

﴿وَوَجَدَكَ ضَالاًّ فَهَدَى﴾ ئەی محمد! خودای تۆ، تۆی بینی بی ئاگابووی لەئەحكامە شەرعیەكانو نەتدەزانی بیروباوەڕی ڕاستو حەق چیە، ئیتر خودا هیدایەتی دایو پەیامی پیرۆزی ئیسلامی بۆ ناردی.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا – الشورى/٥٢﴾.

﴿وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى﴾ ئەتۆی بینی هەژارو بێ ماڵو سامان بووی دەوڵەمەندی کرد بەقازانجی مامەڵەو بازرگانی کردن بەماڵی خاتو خەدیجە، هەروەها بەهۆی ئەو خێرو فەڕەی خستبوویە ناو ماڵو سامانتەوە، بەهۆی ئەو دڵفراوانیو قەناعەتەوە کە خودا پێی بەخشیبووی.

هەردوو پیری فەرمووده (بوخاریو مەسلیم) فەرمووده‌یەکیان لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ علَيهِ وسَلم) فەرموویەتی: «لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ». دەوڵەمەندی بەزۆری کاڵا نیە، بەڵکوو دەوڵەمەندی ئەوەیە دڵو دەروون دەوڵەمەند بێ، هەر لە صەحیحی موسلیمدا فەرمووده‌یەك هەیە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ علَيهِ وسَلم) فەرمووی: «قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ وَرُزِقَ كَفَافًا وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ». بێگومان ڕزگار بووە، کەسێك موسوڵمان بێو بژیوێکی مام ناوەندیی پێ درابێ، خودا قەناعەتی پێ بەخشیبێو ڕازی بێ بە بەشی خۆی.

ئەمجار خودا فەرمانی پێ دەکا بەچەند ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتیو ویژدانی فەرمانی پێ دەکا کە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودا بێ. فەرمووی: ﴿فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلا تَقْهَرْ﴾ جا کە خودا تۆی بەهەتیوی پێ گەیاندو حەواندیتیەوە، ئەتۆش دڵی هەتیو مەشکێنە، سوکایەتی پێ مەکە، بەزەییت پێدا بێتەوە، مافی خۆی بدەیە، چاکەی لەگەڵ بکە، بەنەرمو نیانی لەگەڵیدا بجوڵێرەوە، هەموو کات یادی هەتیویی خۆت بکەرەوە، بۆیە پێغەمبەر (صَلى اللهُ علَيهِ وسَلم) زۆر چاکەی لەگەڵ هەتیوان دەکرد، فەرمانیشی بەهاوەڵانی دەکرد کە چاکە لەگەڵ هەتیوان بکەن.

﴿وَأَمَّا السَّائِلَ فَلا تَنْهَرْ﴾ لەپاساوی ئەوەیە کە لەپێشدا سەر لێ شێوا بووی‌و خودا هیدایەتی دای، لەسوالکەر تورە مەبە بەرِوگرژی‌و توڕبوونەوە دەست بەڕووی ئەو کەسانەوە مەنێ کە داوای زانیاریەکت لێ دەکەن، یان داوای شتێك دەکەن پێیان ببەخشی، بەڵکوو هەر داوایەکیان لێ کردی بەشێوەیەکی جوان‌و نەرم‌و نیان وەڵامیان بدەرەوە. ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ باسی ئەو نیعمەتانە بکە؛ کە خودا پێی بەخشیبووی، شوکرو سوپاسی پەروەردگارت بکە لەسەر نیعمەتی پێغەمبەرایەتی‌و پەیامی قورئان، هەمیشە نیعمەتەکانی خودا بخەرە بەرچاوت‌و باسیان بکەو سوپاسی خودا بکە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الإنشراح)

مەککییەو هەشت ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی (الشرح) یان (الإنشراح) چونکە سەرەتا بەباسی دڵ رۆشنکردنی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) دەست پێ دەکا.

### پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوە:

پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشەوە زۆر ئاشکراو نمایانە، چونکە ناوەرۆك‌و ڕستەکانیان لێك دەچن، هەردووکیان رانواندنی نیعمەتەکانی خودا کە بە پێغەمبەری بەخشیون لەخۆ گرتوون، بۆیە هەندێ لەزانایانی سەلەف پێیان وایە: هەردوو سورەتەکە یەك سورەتن، نابێ لەناویان (بسم الله الرحمن الرحيم) هەبێ، بەڵام جەماوەری زانایان پێیان وایە دوو سورەتن.

﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا

﴿إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝٦ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ۝٧ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ۝٨﴾

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ ئایا ئێمە دڵو دەرونمان فراوانو رۆشن نەکردی؟ واتە: بێگومان سنگو دڵو دەرونی تۆمان فراوان کردووە بۆ ئەوەی نوری پێغەمبەرێتی تێوە بچێو تێیدا جێ بێتەوەو بتوانێ ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵگرێ. نیگاو سروش حیفز بکا. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ – الأنعام/١٢٥﴾.

جا وەکوو خودا دڵی فراوان کردووە، شەریعەتەکەشی بەرفراوانو ئاسان کردووە، بۆ هەموو کاتێك گونجاوەو بەکەڵکی هەموو گەلو نەتەوەیەك دێ.

هەندێك پێیان وایە: مەبەست بەو گوشاد کردنەوەی سنگی پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) ئەو روداو گۆڕانکارییانەن کە شەوی میعراج بەسەر دڵو دەروونی پێغەمبەردا هێنران لەهەموو روویەکەوە، لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە ئەنەسی کوڕی مالیك لەمالیکی کوڕی صەعصەعەوە ریوایەت دەکا دەڵێ پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) فەرمووی:

(لەکاتێکدا من لەلای کەعبەوە چاوم چووبووە بیرە خەو، لەناکاوێك گوێم لێ بوو یەکێکیان دەیگوت: یەکێ لەو سیانەیە کە لەنێوان دوو پیاودایە، ئیتر تەشتێکی زێڕینیان هێنا، ئاوی زەمزەمی تێدا بوو، سنگیان شەق کردم لێرەوە تا ئەوێ) قەتادە دەڵێ: مەبەست لە(لێرەوە تا ئەوێ) چیە؟ فەرمووی: واتە: تا خوار سکمەوە. ئیتر دڵیان دەرهێنام بەئاوی زەمزەم شتیان ئەمجار خستیانەوە شوێنی خۆی. پاشان پڕ کرا لەئیمانو حیکمەت.

پوختەی فەرموودەی (شەقکردنی سینگ) ئەومیە هێشتا پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) منداڵ بووە، حەزرەتی جوبرائیل هاتووە سینگی شەق کردووەو دڵی

دەرهێناوەو شتویەتیو پاکی کردۆتەوە، پاشان پڕی کردووە لەزانیاریو ئیمانو خستویەتیەوە شوێنی خۆی.

هەندێ لە زانایان ڕەخنەیان لەم ڕیوایەتە گرتووە، دەڵێن: ئەم ڕووداوە لەکاتی منداڵی پێغەمبەردا بووە، ئەمە موعجیزەیەو نابێ پێش پێغەمبەرێتی بێ، پێویستە موعجیزە دوای بوون بە پێغەمبەری بێ.

لەلایەکی ترەوە کاریگەری شتن بەئاو بۆ لابردنی چڵکی جەستەیە، خۆ تاوان قەبارەی نیەو شتێکی مەعنەوییە شتن کاریگەری تێدا نیە، ئەمجار دڵ پڕناکرێ لەزانیاری بەڵکوو خودا زانیاری تێدا دروست دەکا.

ئیمام (فخرالدین)ی رازی لەوەڵامی ئەم ڕەخنەیەدا دەفەرموێ: ئەوە جۆرێکە لەمزگێنیو ئیرهاصات ڕێخۆشکەرەو پێشەتای فەیزی پێغەمبەرایەتین، ئەم جۆرە موژدەو سەرەتاو ڕێخۆشکەرانە بۆ پێغەمبەری ئیسلام زۆرن، دوریش نیە کە شتنی دڵی پێغەمبەرو لابردنی ئەو خوێنە ڕەشە لێی بۆ ئەوە بێ مەیلی تاوان نەکا. نیشانەی ئەوەبێ: کە دوورە لەتاوانو مەعصوومەوە. لەلایەکی ترەوە ئەوە کاری خودایەو چی بوێ بیکا دەیکا.

﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ، الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ﴾ هەڵمان گرت لەسەرت ئەو ئەرکە گرانەی پشتی ماندو کردبووی‌و برستی لێ بڕیبووی؟ ئەو شتانەی پێت وابوو تاوانو ئەنجامت دابوونو پێیان خەفەتبار بوو بووی، لەسەر شانمان لابردی، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وسَلم) ئەوەندە پایەی بەرز بووە، زۆر کارو کردەوە کە بۆ کەسانی دیکە موباح بووە، بۆ ئەو بەتاوانۆکە (خلاف الأولى) حیساب کراوە، خودا عیتابی لێ گرتووە، بۆ نموونە: روخسەتدانی بۆ هەندێ لە دووڕووەکان کە هاوبەشی غەزای تەبوك نەکەن، فیدیە وەرگرتن لەدیلەکانی جەنگی بەدر، روگرژ کردن لەڕوی عەبدوڵلای کوڕی ئوممی مەکتومدا ئەمانەو چەند شتی تری لەو جۆرە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وسَلم) ئەنجامی دانو خودا ڕەخنەی لێ گرت،

پێغەمبـەر (صلى الله عليـه وسلم) دوایـی خەفـەتبار بـوو، چـونکە لەسـەر خـۆی بـەتاوانی لەقەڵەم دانو بـۆی دەرکـەوت نـەدەبوو ئـەو جـۆرە هەڵسوکەوتانـە بکـا، چونکە دەیتوانی کاری لەوە باشتر بکا، بەڵام خودا لێی خۆش بوو، باری شانی سوک کرد، یان دەگونجێ ماناکە بەم جۆرە بێ، قورسایی ئەرکی پێغەمبەرایەتیمان لەسەر شان سوک کردیو وزەو توانایەکمان پێ بەخشیت بتوانی ئەنجامی بدەی.

﴿وَرَفَعْنَا لَـكَ ذِكْـرَكَ﴾ نـاوی تۆمـان بـەرز کـردەوە، لـەدونیاو لەقیامەتـدا نـاوت بەرزو پیرۆزە بەهۆی روتبەی پێغەمبەرێتیو سەرمۆرکردنی زنجیرەی پێغەمبـەران بەڕەوانــە کردنــی تــۆ، بویتــە ســەرداری پێغەمبــەرانو پــەیامی هــەموو نامــە ئاسمانییەکان لەپەیامی تۆدا ڕەنگی داوەتەوە.

دەبێ چ پلەو پایەیـەك لـەوە بـەرزتر بـێ. لەهـەموو چرکەو ساتێکی مێـژوودا ناوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لـەدوا نـاوی خـوداوە دەهێنـرێو بەسـەرزاری ملیۆنەها موسوڵمانەوە لەبانگو قامەتو تـەحیاتی نوێـژو ویردەکانـدا دەگـوترێو دەگوترێتەوە. بانگدەرو وتار خوێنو نوێژکەر، ڕۆژانە ڕسـتەی (أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أن محمد رسول الله) دووبارەو سێ بارەی دەکەنەوە.

دەبێ چ ناوێك لەوە بەرزتر بێ: کە خودا پێویستی کردووە لەسەر موسـوڵمانان ڕۆژانــە پێــنج فــەرزە لەنوێــژەکانیان لــەبانگو قامەتــدا دوا نــاوی خــودا نــاوی پێغەمبەریش بهێنرێ؟

بەڕاسـتی ئەمــەش موعجیزەیـەکی تـری قورئانــە ئـەوە هـەزارو چـوار سـەدو بیستو پێنج ساڵە ئەم ئایەتـە نـازڵ بـووە، سـاڵ دوای سـاڵو سـات دوای سـات نـاوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەدوا ناوی خودا لەناوی هـەموو کەسـێکی تـر پـتر بەسەر دەمو زوبانی ئادەمیزادانەوەیە.

هـیچ چـرکەیەك لـەژیانی ئـادەمیزاد تێناپـەڕێ ئـیللا بەسـەدان جـار نـاوی پێغەمبەر (صلى الله عليـه وسلم) دەگـوترێو دەبیـسترێ، بـەڕێزەوە نـاوی دەبـرێو

ناوهێنانو شایەتیدان لەسەر پێغەمبەرێتی ئەو زاتە پیرۆزە پێناسەی موسوڵمانانە، هەرکەسێ لەشایەتوماندا لەبانگو قامەتدا لەنوێژو وتاری ئاینیدا، ناوی پێغەمبەر نەهێنێو شایەتی خۆی لەسەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (صَلى اللهُ عَليْهِ وسَلم) تازە نەکاتەوە، تاعەتەکەی قبوڵ نیە، بە موسوڵمان حسێب ناکرێ. بەڵکوو ناوهێنانیو سەڵاوەتدان لێی بەخواپەرستی لەقەڵەم دەدرێ.

نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو ناوی پیرۆزی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليْهِ وسَلم) لەعالەمی باڵاشدا بەرز راگرتووە؛ لە لەوحولەحفوزدا بەرز کراوەتەوە، لەسەر زوبانی فریشتەکان سەڵاواتی لێ دەدرێو ناوی پیرۆزی دەهێنرێ.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّـهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا – الأحزاب/٥٦﴾. دەی دەبێ چ بەرزییەك بگاتە ئەو بەرزییەی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليْهِ وسَلم) پێی گەیشتووە؟ بێگومان پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليْهِ وسَلم) (سيد الخلق)ە خۆشەویسترین مەخلووقە لای خودا ناوی بەرزترین ناوە لای خودا، زۆرترین ناوێك کە بەسەر دەمو زوبانی ئادەمیزاددا بێ ناوی (موحەممەد)ە (صَلى اللهُ عَليْهِ وسَلم).

دوای ڕانواندنو بیرخستنەوەی ئەو نیعمەتانە، پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە ئەو گۆڕانکارییەی لەژیاندا ڕوودەدەن خۆشی دواناخۆشیو فەرەحی دواتەنگانە، هەمووی بەگوێرەی دابو نەریتی پەروەردگارە لەبونەوەردا، بۆیە بۆ دەمکوتکردنی موشریکەکان: کە پێغەمبەریان بەوە لەککەدار دەکرد کە هەژارە فەرمووی: ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴾ بێگومان لەگەڵ خۆشی ئەو تەنگانەو ناخۆشیانەی لەوەپێش هاتوونە ڕێت فەرەحیو خۆشی هەیە، لەدوا تەنگانە، ئازادیو خۆشی هەیە. بێگومان لەدوا ناخۆشی خۆشی هەیە.

ئەمەش دڵدانەوەو تەسەللا دانەوەی پێغەمبەرە، مزگێنیە بۆی کە لەوە بەولاوە خودا حاڵو وەزعی لەهەژارییەوە دەگۆڕێ بۆ دەوڵەمەندی، لەبێ هێزییەوە بۆ بەهێزی، دژایەتی گەلەکەی بۆ دەکاتە خۆشەویستیو تەبایی.

هەرچەندە خیتابەکە بۆ پێغەمبەرە (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) بەلام وادەکە بۆ هەموو ئوممەتەکەیەتی لەهەموو چاخو رۆژگارێکدا؛ ئەمە یاوی پەروەردگارە لە جیهاندا، هەرحاڵەتێك لەتەنگانەو هەژاریی، لەترسو خۆفو ئاارامی، لەزەبوونیو نەفامی، تووشی هەر گەلو نەتەوەیەك بێ بەتاكو كۆیانەوە، بەتایبەتی کە ئەو گەلە دوژمنەکانی بەهێزو لەخۆشیدا بن.

ئەمجار ئەو گەلە کۆس کەوتووە بیەوێ خۆ لەو تەنگانە ڕزگار بکا، بیربکاتەوەو پلان دانێو هەوڵو تەقەللا بداو کۆڵ نەدا، پشتیشی بەخودا بەهێز بێ، وێڕای هەوڵو تێکۆشانی خۆی، تەوەککولی بەخودا بێ، حەتمەن سەرەنجامی تێکۆشانیان بەردار دەبێو لەو تەنگانەو ناخۆشیو ژێر دەستەییو چەوساندنەوەیە ڕزگاریان دەبێ.

ئەمجار کە سەرکەوتنو ڕزگاریان بوو، پێویستە سوپاسی خودا بکەنو هەوڵ بدەن لەو نازو نیعمەتە زیاد بکەن، شانی بەربدەنو بە بزوڵی چاو دەستکەوتەکانیان بپارێزن، بەدڵسۆزیو خوداپەرستی، بەشوکرانە زمێری رۆژ بەرۆژ هەوڵ بدەن زیاتر خودا لەخۆیان ڕازی بکەنو وڵاتو گەلیان بەرەو پێشکەوتنو سەربەرزی بەرن. نەك سپڵەو پێنەزان بنو خودایان لەبیر بچێتەوە، سەرتەپۆڵو گەلۆر بنو پاڵی لێ بدەنەوە، کاتێك بەخۆیان بزانن بەرەیان لەژێر پێ دەرهێندراوەو کەلەپورو میراتی بنیات نراوی باوكو باپیرانیان لەدەست داوەو خودایان لێ ڕەنجاوەو کەوتوونە پەراوێزی مێژووەوە کەس حیسابیان بۆ ناکا. خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بوون.

هەر وەکوو چۆن ناوەچاخزادەیەك کەرێز لەبنەماڵەکەی خۆی نەگرێو پابەندی دابو نەریتی باوكو باپیری نەبێ. هەر لەگەڵ باوکی مردو دەسەلاتی

کەوتە دەست، لەماوەیەکی کەمدا سەروەت و سامانی بۆ بەجێماوی لەدەست دەداو خۆی و خێزان و بنەماڵەکەی دەخاتە سەر ساجی عەلی. ئەمجار بۆخۆی دەستەوەستان دابنیشێ و نەتوانێ خۆی بەخێو بکاو دەست لەخەڵك پان بکاتەوە، یان ببێتە رەنجبەرو خزمەتکاری ئەوانەی کاتی خۆی خزمەتکاری باوکی ئەو بوون.

بەڕاستی ئەم ئایەتە گەورەترین ئامۆژگاری و پەندو عیبرەتە بۆ موسوڵمانان چونکە ئایینی ئیسلام ئایینی هەڵبژاردەی پەروەردگارە، قورئان بەرنامەو پەیڕەو پرۆگرامیەتی.

هەر لەو رۆژەوە ئەم ئایینە بلاّو بۆتەوە، لایەنگرو پابەندبوانی پەیدا بوون، وەکوو یاسایەکی هەمیشەیی و نەگۆڕ، چەندێك موسوڵمانان پابەندی بەرنامەی ئایین بوون و دەستیان بە قورئان گرتبێ، ئەوەندە خودا عەزیزو بالاّدەستی کردوون، چەندێك قورئانیان پاشگوێ خستبێ و لە ئیسلام دوورکەوتبنەوە ئەوەندە زەلیل و ژێر دەستە بوون.

هەرکاتێك موسوڵمانان وەهۆش خۆ هاتبنەوەو بەلای ئیسلامدا بایان دابێتەوەو بەپێی دەستووری قورئان جولاّبنەوە، خودا رکێفی فەرمانڕەوایی پێ داونەوەو سەروەرییان بەدەست هێناوەتەوە. لەتەنگانەو ژێردەستەیی رزگاریان بووە. ئەگەر سەیری مێژووی ئیسلام بکەین زۆر نموونەی ئاشکراو زەق لەسەرکەوتن و ژێرکەوتنی موسوڵمانان دەبینین ئەوە مێژوو بیخوێننەوە!!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم) دەکا کە ئەو کارانە ئەنجام بدا: کە شایەنی پلەو پایەی ئەوە، دەفەرموێ:

﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ﴾ هەرکاتێك لەراگەیاندنی بانگەوازی بویتەوە، یان جیهادو تێکۆشان و کاروباری خۆت ئەنجام دا، رووبکەرە عیبادەت کردن و لەخودا پاڕانەوەو داوا لەخودا بکە کارەکانت بۆ هەڵسوڕێنێ، بەڕاستاڵی و دڵسۆزی رووبکەرە خوداو نیازو مەبەستت پاك و خاوێن بکەرەوە، هەمیشە لەخودا بپارێرەوە، تۆفیقت

بدا بۆ كاری خێرو بەردەوام بوون لەسەر خوداپەرستی. كاتی خۆت لەلا بەنرخ بێ‌و مەهێڵە ساتەوەختێك لەژیانت بەفیڕۆ بڕوا، ڕێگە مەدە هەلت لەكیس بچێ، پەروەردگار بەندەی بێ ئیشی خۆش ناوێ!! ﴿وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴾ ڕووبكەرە خوداو هەموو نیازو مەبەستێكت ئاڕاستەی خودای خۆت بكە، نزا بۆ خودا بكەو لێی بپاڕێرەوە ترست لە دۆزەخ بێ‌و بەتەما بەهەشتی ڕازاوە بە، پاداشی ماندوبوون‌و هەوڵ‌و تەقەلاَّی بەردەوامت هەر لەخودا داوا بكە، هەر خودا شیاوی ئەوەیە ڕووی تێبكەی‌و لێی بپاڕێیتەوەو پشتی پێ ببەستی‌و بەندایەتی بكەی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی التين

ئەم سورەتە مەككییەو هەشت ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی (التين) چونكە پەروەردگار لەسەرەتای سورەتەكەوە سوێندی بە (التين)و (الزيتون) خواردووەو گرنگی بەم دوو درەختە بەرداره داوە، لەم ڕووەوە كەخێرو فەڕیان زۆرەو بەسودن...

**ناوەرۆكی ئەم سورەتە مەككییە بریتیە لەسێ شتی پەیوەست بە ئادەمیزادو بیروباوەڕەكەی:**

١- ڕێزگرتن لە ئادەمیزاد لەم ڕووەوە: كە خودا لەجوانترین شێوەو ڕوخساردا خوڵقاندویەتی، قەدو باڵای ڕاست‌و جوان، ئەندامی ڕێك‌وپێك!

٢- وێڕای بەڵگەی جۆراوجۆر لەسەر هەبوونی خودا لەخودی بوونەوەردا. ئەگەر لێیان وردبیتەوە، كەچی ئادەمیزاد خۆیان لێ گێل دەكاو لەئاستی ئادەمیزادیی خۆی دادەبەزێ‌و خۆی گیرۆدەی دۆزەخ دەكا. بەهۆی ئەوەوە بڕوای بەخوداو بە پێغەمبەری خودا نیە، ئینكاری زیندوبوونەوەو حیساب‌و لێكۆڵینەوە دەكا.

٣- خاڵی سێیەم ڕاگەیاندنی بنەمای عەداڵەتکاری پەروەردگارە دەربارەی بەندەکانی، کەبەگوێرەی ئەو عەداڵەتکارییە ڕەهایەی پاداشی خواپەرستان دەداتەوەو سزای تاوانباران دەدا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ (١) وَطُورِ سِينِينَ (٢) وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ (٣) لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤) ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ (٥) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ (٦) فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ (٧) أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ (٨) ﴾

دەفەرموێ: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾ سوێند بەهەنجیر: کە میوەیەکی خۆشەو ئادەمیزاد دەیخۆن، سوێند بەزەیتون کە دەیگوشن زەیتی لێ دەردەهێنن‌و بۆ زۆر شتی تریش سودی لێ دەبینن.

ئیبنو عەبباس لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمووی: هەنجیر ئەو هەنجیرەیە کە دەیزانن، زەیتون ئەو زەیتونەیە کە دەزانن.

ناوهێنانی ئەو دوو بەروميوەیە درکەو ئاماژەیە بۆ خاکی پیرۆزی قودس‌و دەوروبەری کە بەو دوو درەختە ناوبانگی دەرکردووە. پەروەردگار سوێندی بەهەنجیر خوارد، چونکە بژێوو میوەو دەرمانە، خواردەمەنییەکی بەتام‌و لەزەتە، زوو هەزم دەبێ لەگەدەدا، تەبیاتی ئادەمیزاد نەرم دەکا، بەڵغەم کەم دەکاتەوە،

گورچیلە پاك دەكاتەوە، زیخو بەردوچكەی میزەڵان لادەبا، جەستە قەڵەو دەكا، كونوچكەكانی جەرگو سپڵ دەكاتەوە، بۆ زۆر نەخۆشی بەسودە.

زەیتونیش میوەیەو بژێوەو دەرمانە، دەیگوشن رۆن زیتی لێ دەردێننو دەكرێتە ناو زۆر خواردەمەنییەوە، تێكەڵ بەزۆر دەمان دەكرێو بەتەنیاش دەرمانی زۆر دەردانە.

﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾ سوێند بەو كێوەی پەروەردگار لەنزیكەوە ئاخاوتنی لەگەڵ موسادا كردو كردی بە پێغەمبەرو بەیامی پیرۆزی ئاڕاستە كرد.

﴿وَهَذَا الْبَلَدِ الآمِينِ﴾ سوێند بەو شارە ئارامەی كە شاری مەككەی پیرۆزە، شوێنی لەدایكبوونی پێغەمبەرە، شارێكە بانگەوازی ئیسلامی تێدا سەری هەڵداوە. شارێكە هەركەسێ بچێتە ناوی دڵنیا دەبێ لە دەستدرێژی كردن بۆ سەری. وەكوو لە ئایەتێكی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا – آل عمران/٩٧﴾.

**پەروەردگار لەم ئایەتانەدا سوێندی بەچوار شت خوارد:**

﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾ و ﴿الْبَلَدِ الآمِينِ﴾ ئاشكرایە یەكەمیان: ئەو كێوەیە خودا لەنزیكەوە ئاخاوتنی لەگەڵ حەزرەتی موسادا ئەنجام دا، دووەمیان: شاری مەككەی پیرۆزە، بەڵام مەبەست بە (التين)و (زيتون) لێرەدا چیە؟ ئەمە جێگای قسەیەو زۆر ریوایەتی جۆراوجۆر دەربارەیان هەن:

هەندێك دەڵێن: (التين) ئاماژەیە بۆ (طوری تەنیا): كەلە تەنیشت دیمەشقەوە، هەندێكی تر وتویانە ئاماژەیە بۆ ئەو دار هەنجیرەی كە ئادەمو حەوا لەكاتی دەركەوتنی شەرمگایاندا گەڵاكەیان لێ كردەوەو شەرمگای خۆیانیان پێ داپۆشی. برێكی تر پێیان وایە: مەبەست ئەو شوێنەیە كە درەختی هەنجیری لێ رواوە لەسەر ئەو كێوەی كەشتییەكەی حەزرەتی نوح لەنگەری گرت.

مەبەست بەزەیتون ئاماژەیە بۆ (طوری زەینا) لە بەیتولمەقدیس هەندێك

پێیان وایە مەبەست خودی بەیتولمەقدیسە، بڕێکی تر پێیان وایە: ئاماژەیە بۆ ئەو لقە زەیتونەی کە ئەو کۆترەی حەزرەتی نوح لە کەشتییەکەوە هەڵیفڕان بۆ ئەوەی بزانێ حاڵەتی تۆفان بەچ گەیشتووە. جا کە کۆترەکە گەڕایەوە لقێکی داری زەیتونی پێ بوو، ئیتر بەوە زاندرا: کە لافاوەکە نیشتۆتەوەو زەوی دەرکەوتۆتەوە.

مامۆستا – سەیید – دەفەرموێ: نزیکترین مانا لەڕاستییەوە ئەوەیە بڵێین: مەبەست بە هەنجیرو زەیتون ئاماژەیە بۆ ئەو شوێن و بیروەریانەی پەیوەندییان بە ئاینەوە هەیە کە کێوی طورو بەیتولمەقدیس و مەککەی پیرۆزن.

پەروەردگار سوێندی بەوسێ شوێنە خوارد چونکە شوێنی نازڵبوونی نیگاو سروشن لە خوداوە بۆ سەردڵی پێغەمبەرە ئولولعەزمەکان، لەم جێگایانەدا چرای هیدایەت بۆ ئادەمیزاد هەڵکرا. لە کۆتایی تەوراتدا هاتووە دەڵێ: پەروەردگار پورتەویدا لە طوری سەیناء واتە: لەوێ نیگای بۆ حەزرەتی موسا کرد. پاشان لەشاخی ساعیر روناکی دایەوە، واتە: ئەو کێوەی خودای مەزن حەزرەتی عیسای تێداکردە پێغەمبەر، دوایی ئەو نوورەی لەسەر کێوەکانی فاران ئیعلان کرد، واتە کێوەکانی مەککە: کە پێغەمبەری ئیسلامی تێداکراوە بە پێغەمبەر، پێدەچێ ئەمە موژدەدان بێ بە موسوڵمانان: کە لەدوا رۆژێکی نزیکدا ئەو شوێنانە دەکەونە ژێر دەستیان و خۆیان تێیاندا باڵا دەست دەبن، بەو سوێند خواردنە پێیان، ئاماژە بۆ گرنگی و پیرۆزی ئەو شوێنانە دەکاو موسوڵمانان هەڵدەنێ: کە پارێزگارییان بکەن و نەهێڵن لەدەستیان دەربچن.

گرنگی ئەم شوێنانەش لەڕوی جوگرافیاوە، لەڕوی سەربازییەوە، لەڕوی بازرگانییەوە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە ناوجەرگەی وڵاتی ئیسلامەو بەتایبەتی بۆ پارێزگاری لە مەککەی پیرۆز: کە ڕوگەی موسوڵمانانە، هەر لەبەر گرنگی و پیرۆزی فەلەستینە: کە قودس کراوە بە شوێنی شەوڕەوی پێغەمبەری ئیسلام (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَم)! هەڵبەتە موسوڵمانان هەستیان بەم گرنگییە کردووەو لەم ئاماژەپێکردن و سوێند خواردنەی خودا بەو شوێنانە حاڵی بوون، خۆشەویستی

فەلەستین‌و بەتایبەتی شاری قودسیان لەدڵدا جێگیر بووە، هەرکاتێ هێرش کرابێتە سەری‌و دوژمن ویستبێتی داگیری بکا، موسوڵمانان بەسەرو ماڵ بەرگرییان لێ کردووە.

ساڵی (١٥)ی کۆچی (٦٣٦)ی زاینی کە موسوڵمانەکان گەمارۆی بەیتولمەقدیسیاندا، ڕۆمەکان ناچار بوون خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەڵام مەرجیان دانا کە دەبێ فەرمانڕەوای موسوڵمانان بێ‌و لەسەر دەستی ئەو خۆیان تەسلیم دەکەن، ئیتر فەرماندەی لەشکری ئیسلام؛ کە ئەبو عوبەیدەی جەڕاح بوو، هەواڵی نارد بۆ خەلیفەی موسوڵمانان (ئیمامی عومەر)و داوای لێ کرد؛ کە تەشریفی بچێ بۆ فەلەستین، حەزرەتی عومەر لەمەدینەوە چوو بۆ فەلەستین‌و لەسەر دەستی ئەو فەلەکان خۆیان تەسلیم کرد حەزرەتی عومەر ئەوپەڕی ڕێزی لێ گرتن‌و هیچ خراپەیەکی لەگەڵ نەکردن.

هەر لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ فەلەستین بووەتە هۆکارێکی سەرەکی کێ بڕکێی نێوان هێزی حەق‌و هێزی بەتاڵ، هەرکە موسوڵمانان لە قورئانەکەیان دوورکەوتنەوەو بێ هێزبوون، هێزی کوفر شاڵاویان هێناوەو قودسیان لە موسوڵمانان داگیر کردەوە، خاچپەرستەکان کە قودسیان گرتەوە چی موسوڵمانی تێدا بوو بەردەستیان کەوتن سەریان بڕین، جوولەکەکانیش کاتێ چوونە قودسەوە موسوڵمانەکانیان سوتاند.

ئەگەر مێژووی گرتنەوەی قودس لەلایەن خاچ پەرستانەوە سەیر بکەین ڕووداوی وا دەبینی؛ کە ئەو کافرانە دژی موسوڵمانان ئەنجامیان داوە سەرت سوڕدەمێنێ، ئەمانە چ دڕندەیەك بوون، چ ڕق‌و کینەیەکیان بەرامبەر موسوڵمانان هەبووە، کەچی کە دوایی سوڵتان (صلاح الدین)ی ئەیوبی پەلاماری دان‌و لەهەموو شەڕو نەبەردەکاندا بەسەریاندا زاڵ بوو، بە ئەوپەڕی پیاوەتی‌و مەردانە ڕەفتاریان لەگەڵ کردن، هێندەی پیاوەتی لەگەڵ کردن، ئەوەندە بەعەداڵەتکاری لەگەڵیان جووڵایەوە، مێژوونوسەکانیان بەشەرمەوە تۆماریان کردووە، لەنامەردی

خاچپەرستانو پیاوەتی (صلاح الدین)و دەستەو ایەرەکەی سەریان سوڕماوە.

بەڵام بەداخەوە بەلاوازبوونی خەلافەتی عوسمانیو گەندەڵبوونی فەرمانڕەواییەکەیانو دوای ڕوخانی خەلافەت بەتەواویو پارچە پارچە بوونی عالەمی ئیسلامیو دوورکەوتنەوەی موسوڵمانان لە ئایینەکەیان، بە تەحدید دوای شەڕی دووەمی جیهانی، ساڵی (١٩٤٨)ی زایینی هێزی کوفر لەسەر خاکی پیرۆزی فەلەستین دەوڵەتی ئیسرائیلیان دروست کردو کردویانە بەسەنگەرێکی ستراتیجی خۆیان دژی عالەمی ئیسلامیو بەردەوام تیری ژەهراوی خۆیان ئاڕاستەی موسوڵمانان دەکەن، ئەوەندەیان فیتنەو ئاشوب لەنێوانیاندا نراونەوەو هێندە لە ئیسلام دوورکەوتنەوە مەگەر خودا (صلاح الدین)ێکی تر بڕەخسێنێو جارێکی تر سوپای کوردان ڕێك بخاتەوە، لەژێر ئاڵای ئیسلامدا قودس ڕزگار بکاتەوە، ئەگینا تازە فەلەستین لەدەست موسوڵمانان دەرچووە!! بەبانگەشەی عوروبەو عەقلەقییەتو دیموکراتیەتو شیوعیەت... هتد. فەلەستین وەرناگیرێتەوە!!!

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ سوێند بەو سێ شوێنانەی لەوەوپێش باسکران ئێمە ئادەمیزادمان لەجوانترین شێوەو شکڵو ڕوخساردا دروست کردووە، قەدو باڵا ڕاستو شۆخو شەنگ، ئەندامو جەستەی ڕێكوپێك، شێوەی نانخواردنو خواردنەوەو خەوتنو دانیشتنو ڕاوەستانو ڕۆیشتن... هتد. لەوپەڕی جوانیو شیرینیدا، جوداوازی لە گیانلەبەرانی تر لەبارەی زانستو بیرکردنەوەو قسەکردنو نەخشەکێشان بۆ ژیانو حیکمەتو دانایی لەهەڵسوکەوتیدا، بەجۆرێك گونجاوە ببێتە جێنشین لەسەر زەوی.

دەگێڕنەوە لە ڕۆژگاری خەلیفە مەنصوری عەباسیدا، کابرایەك کەناوی عیسای کوڕی موسای (الهاشمی) بوو زۆری خێزانەکەی خۆشدەویست، ڕۆژێك بەژنەکەی خۆی گوت: ئەگەر لەمانگ جوانتر نەبی تەڵاقت بکەوێ سێ بەسێ. ژنەکە خێرا لای هەڵساو ڕۆییو خۆی لە مێردەکەی گوم کرد. وتی: مێردەکەم تەڵاقی داوم، ئەو شەوە بەناڕەحەتیو ناخۆشی ڕۆژی کردەوە، کە ڕۆژی لێ بووەوە

چوو بۆ بارەگای خەلیفە مەنصورو هەواڵی ڕووداوی بۆ گێڕایەوەو زۆر ناڕەحەتیو خەفەتی خۆی بۆ خەلیفە هەڵڕشت، خەلیفە فەرمانی دا شەرعزانان کۆببوونەوەو داوای فتوایان لەم بارەوە لیٚ‌کرا، هەموو زاناکان وتیان تەڵاقی کەوتووە، جگە لەقوتابیەکی ئەبو حەنیفە کە بێدەنگ بوو.

خەلیفە مەنصور وتی: ئەوە تۆ بۆ بێدەنگی؟ کابرا هاتە قسەو لەسەرتاوە بۆ کۆتای سورەتی (التين)ی خوێندەوە، ئەمجار وتی: ئەی فەرمانڕەوایی موسوڵمانان! ئادەمیزاد جوانترین مەخلووقی خودایە، هیچ شتێك نیە لە ئادەمیزاد جوانتربێ، مەنصور بە عیسای کوڕی موسای گوت: قسەی ئەم زانایە ڕاستەو باشی بۆ چووە، خێزانی خۆت بێنەوە لای خۆتو تەڵاقت نەکەوتووە، ئەمجار خەلیفە مەنصور ناردی بۆلای ئافرەتەکەو ڕایسپارد کە بچێتەوە لای مێردەکەیو تەڵاقی نەکەوتووە[1].

﴿ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ﴾ پاشان هەندێ ئادەمیزادمان گێڕاومەتەوە بۆ تەمەنی پیریو بێ هێزیو خەڕەفاوی، پشتی دەکۆمێتەوە، چاوی نابینێ، گوێی نابیستێ، عەقڵو هۆشی لەدەست دەدا! ئەمە تەفسیری ئیبنو عەبباسو عیکریمەو ضەحاكو نەخەعییە...

یان پاشان گێڕاومانەتەوە بۆ ناو ئاگر، بۆ قوڵایی دۆزەخ، چونکە بەگوێرەی هەستو شعورو عەقڵو بیرو زانیاری خۆی هەڵسوکەوتی نەکردووە، بەدڵی کراوەو چاوی ڕونەوە لەنیشانەکانی هەبوونی خوداورد نەبۆتەوەو تێی نەڕوانیون، پابەندی فەرمانی خودا نەبووەو شوێن پەیامی پێغەمبەر نەکەوتووە، ئەمە ڕای حەسەنو موجاهیدو ئەبولعالیەو ئیبنو زەیدو قەتادەیە.

جا بەگوێرەی تەفسیری ئیبنو عەبباسو جەماعەتەکەی جەرت (استثناء)ەکەی دوایی (منقطع)ە. بەگوێرەی تەفسیری حەسەنو جەماعەتەکەی

---

[1] تەفسیری طەبەری ج ١٠/٥٤٩٨ (٨٢).

(استثناء)ەكە (متصل)ە.

جا ئەگەر بڵێین: (استثناء)ەكە مونقەطیعە ئەو كات، مانای ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ بەم جۆرەیە: وەلێ ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو تاعەتكارو خوداپەرستن ئەوە خودا پاداشتی نەبڕاومیان دەداتەوە، دەیانخاتە ناو بەهەشتی جوان و ڕازاوەوە، چونكە بە ئارام بوون لەسەر بەلاو ناخۆشیو حاڵەتی پیری، بەردەوام بوون لەسەر تاعەتو خوداپەرستی، بەگوێرەی توانا خوداپەرستی خۆیان ئەنجام داوە، واتە: هەرچەندە خوداپەرستانیش جاری وا دەبێ دەكەونە حاڵەتی پیریو زەبونیەوە، بەڵام پاداشتی بەردەوامیان هەیە لەسەر كردەوەكانیان.

ئالوسی دەفەرموێ:[1] سیاقی ئایەتەكان ئەوەیان لێ وەردەگیرێ كە مەبەست بە ﴿ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ﴾ حاڵو وەزعی كافرەكان بێ لەقیامەتدا، چونكە لەو ڕۆژەدا ئەو بەدبەختانە لەسەر ناشیرینترین شێوە دەبن، دوای ئەوەی لەدونیا جوانترین شێوەو ڕوخساریان هەبووە، چونكە سوپاسی نیعمەتەكانی خودایان نەكردووە، ئەندامی جەستەی خۆیان لەخودا پەرستیدا ماندوو نەكردووە.

ئەحمەدو بوخاریو ئیبنو حیبان لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ڕیوایەتیان كردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَيهِ وسلم) فەرمووی: «إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ ، كُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ صَحِيحًا مُقِيمًا» هەركاتێ بەندەی خودا نەخۆش كەوت، یان سەفەری كرد، خوا خێرو پاداشی ئەو تاعەتانەی بۆ دەنوسێ كە بەلەشساغیو لەحاڵەتی ئاسایی لەماڵەوە كردونی.

ئیبنو ئەبو حاتەم لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەكا: كە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: هەركاتێ ئادەمیزاد پیرو لاواز بو نەیتوانی ئەو كردارە چاكانەی بەگەنجی دەیكردن بیانكا، خودا پاداشی كردەوەی حاڵەتی گەنجی بۆ

---

[1] تەفسیری روح المعانی (ج٣/٤٧٦).

دەنووسێ.

﴿فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ﴾ وێڕای ئەم هەمووە بەڵگەو دەلیلانە لەسەر دەسەڵاتی خودا بەسەر هەموو شتێكدا، چی وا لەتۆ دەكا ئەی ئادەمیزاد كە هاتنی قیامەت بەدرۆ بخەیەوە؟ ئەی ئادەمیزاد ئەتۆ بەچاوی خۆت دەبینی سەرەتای ئادەمیزاد چۆنەو چۆن پێ دەگاو هێزو توانا پەیدا دەكاو دوایی چۆن پیر دەبێ‌و هێزو توانای نامێنێ، دەی كەسێك بتوانی ئادەمیزاد لەنەبونەوە بێنێتە وجودو ئەو هەموو گۆڕانكارییانە بەسەر ژیانیدا بێنێ، بێگومان دەتوانێ دوای مردنیشی جارێكی تر زیندوی بكاتەوەو كێشی بكا بۆ سارای مەحشەرو حیسابو لێكۆڵینەوەی لەگەڵ بكا، كەوابێ دەبێ چ شتێك هەبێ تۆ هەڵنێ بۆ ئەوەی بڕوا بەڕابوونی قیامەت نەكەی؟

﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ ئایا خودا باشترین‌و دادوەرترین حاكم نیە؟ بڕیارو حوكمەكانی هەموو عەدالەتكاری نین؟

دەی عەدالەتكاری خودا داخوازی ئەوەیە كە قیامەت بێنێ بۆ ئەوەی تۆڵەی ستەم لێكراو لە ستەمكار بسێنێ!! هەموو كەس سزاو پاداشی خۆی وەربگرێتەوە.

تیرمیزی فەرموودەیەكی لە ئەبو هورەیرەوە بە (مەرفوعی) ڕیوایەت كردووە دەڵێ: هەریەكێ لەئێوە سورەتی (التين)ی خوێندەو گەیشتە كۆتایی سورەتەكە با بڵێ: (بلى وأنا على ذلك من الشاهدين).

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (العلق)

ئەم سورەتە مەككيەو نۆزدە ئايەتە، ناونراوە سورەتی (عەلەق) يان (إقرأ) يان سورەتی (قەلەم).

**پەيوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوە لەم ڕووەوەيە:**

لەسورەتی پێشوودا ئەوەی بەيان كرد كە پەروەردگار ئادەميزادی لەجوانترين شێوەو ڕوخساردا دروست كردووە، لەم سورەتەشدا ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە ئادەميزادی دروست كردووە لەخوێنپارە، واتە: لە سورەتی پێشوودا شێوەو ڕوخساری بەيان كرد، لەم سورەتەشدا ئەو مادەيەی بەيان كرد كە ئادەميزادی لێ دروست دەبێ.

سەرەتای ئەم سورەتە يەكەم شتێكە كە لە قورئان نازڵ بووە. واتە: لەسەرەتای سورەتەكەوە تا دەگاتە ﴿مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ يەكەم وەجبەی قورئانی نازڵ كراوە. بەڵام بەشەكانی تری سورەتەكە لەوەدوا هاتوونەتە خوارێ.

ئيمام ئەحمەدو هەردوو پيری فەرمووده (موسليم‌و بوخاری) لەخاتو عائيشەوە ڕيوايەت دەكەن دەفەرموێ: سەرەتای دەست پێكردنی ناردنی نيگای خودا بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لەشێوەی خەون بينينی باش بوو، هەر خەونێكی بديبايە وەك دوخ ڕاست دەردەچوو، بەرەنگی سپيايی بەيان دەدرەوشايەوە پاشان پێغەمبەر حەزی لە گۆشەنشينی‌و دابڕان لە كۆمەڵ دەكرد، ڕۆژانە بەتەنيا دەچوو بۆ ئەشكەوتی (حەڕا) توێشووی لەگەڵ خۆی دەبرد، وادەبوو چەند شەوێك دەمايەوە، خوداپەرستی دەكرد، كە توێشەكەی تەواو دەبوو دەهاتەوە بۆ ماڵ‌و هەندێكی تری دەبردەوە.

هەتا ڕۆژێك بۆ يەكەمجارو لەناكاو نيگای بۆ هات. فريشتەی نيگا لە ئەشكەوتی حەڕادا هاتە لای‌و فەرمووی: (اقْرَأْ) بخوێنە. پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ

وسلم) دەفەرموێ: بە فریشتەی نیگام وت: من خوێندەوار نیم. ئیتر فریشتەکە بەخۆیەوە گوشیم بە جۆرێك زۆرم تین پێ بگەیەنێ. ئەمجار بەرەڵای کردمو وتی: بخوێنە. وتم: خوێندەوار نیم، دووبارە جارێکی تر بەخۆیەوە گوشیمو بەتەواوی تینم بۆ هات، ئەمجار بەرەڵای کردمەوەو وتی: بخوێنە، وتم: خوێندەوار نیم. بۆ جاری سێیەم بەخۆیەوە گوشیمو پاشان بەرەڵای کردمو وتی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ،خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ،اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ ،الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ،عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾.

ئیتر پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) بەتاساویو ترساوی گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو بە خەدیجەی خێزانی فەرموو: داممپۆشن، دایانپۆشیو وردە وردە ترسەکەی لێ ڕەوییەوە، دوایی فەرمووی: ئەی خەدیجە! دەبێ چیم بێو چیم لێ ڕودرا بێ؟ ئیتر ڕوداوەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: تەنانەت لەگیانی خۆم ترسامو بەتەمای خۆم نەمام.

خەدیجە کەوتە دڵخۆشی دانەوەیو وتی: نەخەیر مەترسەو موژدەت لێ بێ خودا تۆ ریسوا ناکا. ئەتۆ سیلەی ڕەحم بەجێ دێنی، ڕاستگۆی یارمەتی بێ نەوایان دەدەی، میوانداری میوان دەکەی، یارمەتیدری حەقو ڕاستی.

ئەمجارخەدیجە پێغەمبەری برد بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی ئەسەدی: کە کوڕی مامی خەدیجە بوو، لەکاتی خۆیدا ئایینی مەسیحی وەرگرتبوو لەنووسینی عەرەبیدا بەهرەدار بوو، زۆر نوسخەی (ئینجیل)ی نووسیبونەوە. پیر بوو بوو چاوی لەدەست دابوو، خەدیجە وتی: ئەی ئامۆزای خۆم! گوێ ڕابگرە برازاکەت چی بەسەر هاتووە. وەرەقە وتی: دەی برازای خۆم بزانم چیت بەسەر هاتووە، ئیتر پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) بەسەرهاتی خۆی بۆ وەرەقە گێڕایەوە.

وەرەقە وتی: ئەوەی تۆدیوتەو هاتۆتەلات فریشتەی نیگا هێنە بۆ پێغەمبەران، بۆ سەر موساو عیسا، خۆزگە ئەو کاتەی نەتەوەکەت دەرت دەکەن من

زیندو بوومایە یارمەتیم بدایتایە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئایا ئەوان من دەردەکەن؟

وەرەقــە وتــی: بــەڵێ: هــەرپیاوێك بانگــەوازی وەکــوو بانگــەوازی تــۆی بڵاوکردبێتەوە پەیامی وەکوو پەیامی تۆی هێنابێ ئیللا دژایـەتی کراوە، وەڵلاهی ئەگەر نەمرم و بگەمە ئەو ڕۆژە بەهەموو هێزو توانایەکم یارمـەتیت دەدەم. بـەڵام هێندەی پێ نەچوو وەرەقە لەدونیا دەرچوو نیگایش وەستا فریـشتەی نیگا هێنـان پێی لێ بڕیو نەهات بۆلای.

ئیتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەم سەرلێ نـەدانو نـەهاتنی نیگا بـۆی زۆر بێ تاقەت بوو، چونکە لەلایەکەوە دەیزانی بووتە پێغەمبەرو دەبێ شان بداتـە بەر ئەو بارە گرانە، لەلایەکی ترەوە نیگای لێ براوەو هیچ پەیك و پەیامێك نابینێ. ئەوەنـدە خەفـەتبارو غـەمگین بـوو دەیویـست بـچێتە سـەر شـاخێکی بـەرزو خـۆی هەڵدێرێو لەم مەینەتیو نارەحەتیە ڕزگاری ببـێ، هەرکـە خـەیاڵێکی لـەو جـۆرەی بەدڵدا دەهات، خێرا جوبرائیل خۆی پیشان دەداو پێی دەفەرموو: ئەی محمد! ئەتۆ پێغەمبـەری خودایـت، ئـیتر پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) بـەوە فەرامۆشـی دەهاتو وازی لە خەیاڵەکەی خۆی دەهێنا.

ئـیتر ئـەم ماوەیـە (مـاوەی لێ بڕانـی نیگـا) کـەمی خایانـد یـان زۆر، ڕۆژێـك جوبرائیـل هـاتو سـورەتی (والـضحى)ی بـۆ هێنـا...! وەکـوو ڕیوایـەتکراوە دەڵـێن: لەکاتی وەستانی نیگا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موشـریکەکانی قـوڕەیش وتیان: موحەممەد خوداکەی لێی توڕە بووە، وازی لێ هێنـاوە، پـەروەردگار سـورەتی (والضحى)ی بۆ ناردو دڵنیای کرد کە خودا لێی تـوڕە نـەبووەو وازی لێ نـەهێناوەو پاشـەڕۆژێکی ڕەوشـەنو پـیرۆز چاوەڕوانی دەکـا، پێـی دەفـەرموێ: خـودا ئەوەنـدە نیعمـەتی گـەورەو بـەنرخت پـێ دەدا، بـەئارەزوی خـۆت ڕازیـت دەکـا. ئـیتر لـەوە

بەولاوە نیگا هاتن بۆ پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَیهِ وسَلم) بەردەوام بوو، بەگوێرەی پێویستو ڕوداو وەجبە وەجبە لەماوەی (٢٣) ساڵدا سەرجەم قورئان نازڵ بووە.

لەڕاستیدا وەکوو مامۆستا سەید دەفەرموێ: ئەم ماوەی (٢٣) ساڵەی هاتنی نیگا بۆ پێغەمبەری ئیسلام ماوەیەکی زۆر گرنگو گەورەیە، فەترەیەکە لە مێژووی ئادەمیزاددا جارێکی تر دووبارە نابێتەوە، ئەو دەمەی یەکەمجار نیگا هاتن بۆ پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَیهِ وسَلم) دەستی پێکرد گەورەترینو بەنرخترین کات بوو؛ کەبەسەر زەویو مێژووی ئادەمیزاددا تێپەڕی، ڕوداوەکە گەورەو بەنرخە، چونکە ئەوەی تێدا نیشان دراو گەیەندرا گەورەو بەنرخ بوو.

بەڵێ خودای پەروەردگار؛ خاوەنی بوونەوەرو باڵادەست بەسەر هەموو شتێکدا، بێ نیازو بێ ئاتاج لەهەموو شتێك، ڕوی ڕەحمو بەزەیی خۆی کردە ئادەمیزاد: کە لەبەشێکی بوونەوەردا ژیان بەسەر دەبا، ڕێزی لێنا بەوە: کە یەکێکی هەڵبژارد بۆ ئەوەی نیگای خۆی ئاراستە بکاو ببێتە جێگای تیشكو ڕوناکی خودای میهرەبان، ببێ بەکانو گەنجینەی حیکمەتو دانایی خۆی، ببێتە مەرکەزی فەرموودەو فەرمانی خودا بۆ جیهانییان، هەڵیبژارد بۆ ئەوەی بیکاتە پێغەمبەرو فروستادەی خۆیو ڕاگەیاندنی بڕیارو فەرمانو نیازی خودا بۆ دانیشتوانی سەرزەوی.

هەر لەم ساتە وەختەوە ئیتر دانیشتوانی سەرزەوی؛ ئەوانەی کە حەقیقەتی ئەم نیگاو سروشە لەگیانو کیانیاندا جێگیر بوو، ژیانیان گۆڕا، هەمیشە پەیوەست بوون بەخوداوە، هەستیان کرد: کەهەموو هەڵسوکەوتێکیان لەژێر چاودێری خودادایەو وایان دەزانی دەستی قودرەت بە پشتیانەوەیەو هەنگاو بەهەنگاو بەرەو سەرفرازیو بەختەوەری دەیانبا.

هەموو ساتەوەختێك لەماوەی ئەو بیستو سێ ساڵەدا بەشەوو بەڕۆژ چاوەڕوانی دابەزینی نیگا بوون، بۆ یەکالا کردنەوەی موشکیلەو ڕووداوەکان، بەڕاستی سەردەم ڕۆژگارێکی سەیرو بەرزو پیرۆز بوو، فەترەیەك بوو،

ئادەمیزادەکـان پەیوەسـت بـوون بەعالـەمی بـاڵاوە، سـەردەمێك بـوو چـێژی حەقیقەتەکەی ناکا مەگەر ئەوانەی تێیدا ژیاون، ئاگایان لەسەرەتاو کۆتاییەکەی بووە، لەزەزمەتی ئەم پەیوەست بوونەیان چەشتووە، ئازاری نەمانەکەیان بینیوە بە لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم).

ئەنەس دەگێڕێتەوە دەڵێ: دوای لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) ئەبوبەکر بە عومەری فەرموو: بابچین دیدەنی (أم أيمن) بکەین وەکوو چۆن پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) لەژیانیدا سەردانی دەکرد، کە هاتن بۆلای ئوممو ئەیمەن دەستی کرد بەگریان، ئەبوبەکرو عومەر وتیان بۆچی دەگری ئەی نازانی ئەوەی لای خودایە خۆشترە بۆ پێغەمبەر؟! وتی بەڵێ دەزانم: کە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) ئەو ژیانەی لەژیانی دونیا خۆشترە، وەڵێ من بۆ بڕانەوەی نیگا دەگریم، ئیتر لەئاسمانەوە سروش نایەتە خوارێ، ئیتر وای لێ کردن هەردووکیان دەستیان کرد بەگریان[1].

بەڵێ ئەو (٢٣) ساڵە سەردەمێك بوو بەسەر ئادەمیزاددا هاتوو تێپەڕی و دووبارە نابێتەوە، بەڵام تا دونیا دونیایە کاریگەری خۆی لەژیانی ئادەمیزادو جندۆکەدا هەیەو کۆمەڵێك لەبەندەکانی خودا ئەو ڕێبازە حەق و ڕاستە دەگرنە بەرو پەیڕەوی دەکەن، شوێنکەوتووی قورئان دەبن و ئەو پەیامە پیرۆزە لەهەڵس وکەوت و ئاکارو ڕەفتاریاندا ڕەنگ دەداتەوە.

[1] اخرجه مسلم

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ﴿٨﴾ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ﴿٩﴾ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ﴿١٢﴾ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ﴿١٦﴾ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ۩ ﴿١٩﴾ ﴾

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ ئەی محمد! بخوێنە بەناوی خودای خۆت، ئەو خودایەی هەموو شتێکی بەدی هێناوە، هەموو شتێکی دروست کردووە، لەم ئایەتەدا پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر دەکا: کە ببێتە خوێندەوار، هەرچەندە لەوەپێش خوێندنەوەو نووسینی نەزانیوە، کەسێ بوونەوەری دروست کردبێ، دەتوانێ ڕەوشتی خوێندەواری لە پێغەمبەردا بەدی بهێنێ.

﴿خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ ئادەمیزادی دروست کردووە لەخوێنی توندبوو (خوێنپارە) مەبەستی ئەوەیە بڵێ: خودایەك بتوانێ لەخوێنپارە ئادەمی زیرەك و عاقڵ و خاوەن بیر و ژیر دروست بکا، ئەو ئادەمیزادە لێهاتوویی بگاتە ئاستێك زۆر شتی ناو ئاسمان و زەوی بۆخۆی ڕام بکا و سودیان لێ وەربگرێ، چۆن ناتوانێ ئادەمیزادێکی لێهاتووی وەکوو حەزرەتی موحەممەد بکاتە خوێندەوار و وای لێ بکا هەرچی بەسەریدا خوێندرایەوە یەکسەر لەبەری بکا!

بێگومان قوناغی خوێنپارەیی، قۆناغێکە بەسەر کۆرپەلەدا تێپەڕ دەبێ، سەرەتا کۆرپەلە دڵۆپە تۆماوێکە، حەیوانێکی مەنەوییە ماوەیەك لەمنداڵدانەدا دەمێنێتەوە، پاشان بەقودرەتی خودا دەبێتە خوێنپارە، پاشان دەبێتە گۆشتپارە، ئەمجار دەچێتە قۆناغی ئێسقانەوە، واتە: پەیکەری ئێسقانی پێك دێ ئەمجار بەگۆشت دادەپۆشرێ و ئیتر جەستەی ئادەمیزادی تێدا بەرجەستە دەبێ.

﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ﴾ ئەوەی فەرمانت پێ کراوە لە خوێندنەوە ئەنجامی بدە، خودای تۆ: کە فەرمانی پی کردووی بەخوێندنەوە لەهەموو کەسێك بەخشندەترە، بەخشندەیەکی وەهایە ئەتۆ وا لێ دەکا بتوانی قورئان بخوێنیتەوە، هەرچەندە لەوەپێش تۆ نەخوێندەوار بووی.

﴿الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ﴾ خودایەکی وەهایە بەهۆی قەڵەمێکی بێ گیانی ڕەق و تەقەوە ئادەمیزادی فێری خوێندەواری کردووە، واتە: خودایەك بتوانێ قەڵەمێکی بێ گیانی وشك بکاتە هۆی تێگەیاندن و فێربوون لەناو ئادەمیزاددا، چۆن ناتوانێ تۆ بکات بەخوێندەوار؟!

لەڕاستیدا فێربوونی ئادەمیزاد بۆ نووسین بەقەڵەم نیعمەتێکی فرەمەزنە و خودا بە بەندەکانی بەخشیوە، نووسین بەقەڵەم هۆکاری لێك تێگەیشتن و بیروڕا گۆڕینەوەیە و وەکوو زوبان بیروڕای پێ دەردەبڕێ، ئەگەر نوسین نەبوایە زۆر زانست و زانیاری دەفەوتان، زۆر دەقی ئایینی و شتی تر بەئێمە نەدەگەیشت و لێیان بێ ئاگا دەبووین، ژیان بەڕێوە نەدەچوو، یاسا پایەدار نەدەبوو...

بەکورتی نووسین: زانیاری‌و زانست زنجیر دەکاو ناهێڵێ پەرتەوازە بێ هۆکاری کۆنترۆڵکردنی هەواڵی ڕوداوی ڕابردووانەو ئامێرێکی گرنگو بەرچاوە بۆ گواستنەوەی زانیاری‌و زانستەکان لەنێوان نەتەوەکاندا، بەنووسین زانیارییەکان دەچەسپێندرێن‌و لێیان زیاد دەکرێ، پەیتا پەیتا زانیاری تازە دەخرێتە سەر زانیاری پێشوو سات دوای سات گەشە دەکات، ئیتر ژیارەکان‌و بیروبۆچوون‌و تیۆرەکان نەش‌و نما دەکەن، ئایینەکان پارێزگاری دەکرێن‌و هیدایەت‌و ڕێنمایی کردنی ئادەمیزاد بڵاودەبێتەوە.

بەڕاستی جێگای سەرنجە کە یەکەم ئایەتی نازڵبووی قورئان فەرمان بە خوێندنەوەو نووسین دەکا، ئادەمیزادەکان هەڵنێ بۆ هەوڵدان‌و تێکۆشان لەپێناو وەدەستهێنانی خوێندن‌و نوسیندا، لایەنێ لەڕەحمەتی خودا بە بەندەکانی ئەوەیە: کە موعجیزەی حەزرەتی موحەممەد (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) قورئانێك بێ بخوێندرێتەوەو نامەیەك بێ بنوسرێتەوە، بەمەرجێك لەوەوپێش ئەو پێغەمبەرە نەخوێندنی زانیوە نەنووسین! ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە بەهۆی کاریگەری پەیامی پیرۆزییەوە ئوممەتەکەی لەحاڵەتی نەخوێندەوارییەوە گواستەوە بۆ ناو ڕۆشنایی زانست‌و زانیاری، شان بەشانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بەناو وڵاتاندا زانست‌و زانیاری‌و نوسین‌و خوێندنەوەش بڵاوبووەوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ – الجمعة/٢﴾.

پەروەردگار خودایەکی وەهایە ﴿عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ ئادەمیزادی فێری بڕێ لە ئەو شتانە کردووە: کە لەوەپێش نەیدەزانین، کەواتە ئەو خودایەی کەبڕیاری داوە تۆ ببیتە خوێندەوار، هەر ئەو خودایەیە کە ئادەمیزادی لەحاڵەتی هیچ نەزانینەوە گواستۆتەوە بۆ حاڵەتی زانین‌و زانیاری، دوای ئەوەی هیچی نەزانیوە فێری ئەو شتانەی کردووە لەدونیادا پێداویستییەکانی خۆی دابین بکاو

سروشت بۆ خۆی رام بکاو سودی لێ وەربگرێ، دەی کەوابێ بەدووری مەزانە ئەو خودایە تۆ فێری خوێندنەوە بکا!

﴿كَلاَّ﴾ ئەی ئادەمیزادا واز لە سەرڕەقیو سپڵەیی بێنە، ئەوە لەگەڵ سروشتی تۆدا ناگونجێ، ﴿إِنَّ الإِنسَانَ لَيَطْغَى، أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى﴾ بێگومان ئادەمیزاد لەخۆی بایی دەبێو یاخی دەبێ، بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا کافرو سپڵەیە، لەتاوانکاریدا زیادەڕەوی دەکا، ئەمەش هەرکاتێ خۆی بەهەبوو بێ ئاتاج زانی.

یان وشەی ﴿كَلاَّ﴾ بۆ ڕەدع نەبێ، بەڵکوو بەمانا (حقا) بێ، ئەو کاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەکرێ: بەڕاستی ئیشو کارو هەڵوێستی ئادەمیزاد سەیرو سەمەرەیە، لەکاتی زەبونیو لێقەماندا دەست دەکا بەلالانەوەو دەپاڕێتەوە، کاتێکیش هەستی بەتواناو دەسەڵاتی خۆی کردو خۆی بەبێ ئاتاج زانی، ئیتر بوغرا دەبێو لەخۆی بایی دەبێو لوتبەرزو فیزەون خۆی دەنوێنێ، ئەوەی خودا پێی ناخۆش بێ ئەنجامی دەدا.

زۆربەی موفەسیرین پێیان وایە: ئەم ئایەتە دەرهەق بە ئەبو جەهلو هاو وێنەکانی نازڵ بووە، بەڵام هەرکەسێ ئەو ڕەوشتانەی تێدا بن دەیگرێتەوە، چونکە عیبرەت بە (عموم)ی لەفظە نەك بە (خصوص)ی سەبەب.

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی توند لە ئادەمیزاد دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى﴾ بێگومان سەرەنجامو گەڕانەوەی هەموو ئادەمیزاد بۆلای خودایە، ئەو حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکا، هەموو کەسێك پرسیاری لێ دەکرێ چۆن ماڵو سامانی کۆکردۆتەوەو لەچیدا خەرجی کردووە!

ئیبنو ئەبی حاتەم لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: دوو چڵێس تێر ناخۆن، عەوداڵ بەدوای زانیاریداو عەوداڵ بەدوای دونیادا، بەڵام ئەم دوو پێرە چوون یەك نین، چونکە عەوداڵی زانیاری سات دوای سات ڕەزامەندی خودا بەدەست دێنێ. بەڵام دونیا ویست پتر سەرکەشو گومڕا دەبێ.

ئەمجار پەروەردگار چەند حاڵەتێکی ناشیرین و دزێوی ملهوڕو لەخودا یاخی بووان ڕادەنوێنێ و دەفەرموێ: ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى، عَبْداً إِذَا صَلَّى﴾ هەواڵم پێ بدە دەربارەی حاڵ و وەزعی ئەو ملهوڕە ستەمکارە: کە ئەبو جەهل و هاو وێنەکانیەتی پێم بڵێ: چۆن جورئەت دەکا ڕێگری لە بەندەیەکی خۆشەویستی من بکا کە موحەممەدەو دەیەوێ نوێژ بکا؟ چۆن پرکێشی ئەوە دەکا نەهێڵێ پێغەمبەرو شوێنکەوتوانی نوێژ بکەن؟ ڕێگری خوداپەرستیان لێ دەکاو دەیەوێ بتپەرستی بکەن!.

ئای: کە تاوانێکی گەورەیە، کە نەفامییەکی کەم وێنەیە؟! ڕێگری نوێژکردن لەکەسێك بکەی کە لەهەموو کەس زیاتر پابەندی نوێژکردن بێ و فێنکایی چاوی لەنوێژکردندا بۆ دەستەبەربێ، نوێژکردنی پێ لە هەموو شتێك خۆشتر بێ! ڕیوایەتکراوە ئیمامی عەلی کۆمەڵێکی موسوڵمانی بینی لە پێش نوێژی جەژندا نوێژی سوننەتیان دەکرد، وتی: من نەمدیوە پێغەمبەر شتی وای کردبێ، پێیان گوت: ئەی بۆ جڵەوگیریان لێ ناکەی؟ وتی دەترسم بەر ئەو ئایەتە بکەوم کە دەفەرموێ: ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى، عَبْداً إِذَا صَلَّى﴾.

بەکورتی: ئەی پێغەمبەر! بڕوانە ئەو جۆرە کەسانە، کە بەماڵ و سامان و لەشساغی لەخۆیان بایی دەبن و لەخودا یاخی دەبن، تەنانەت جڵەوگیری نوێژکردن و خوداپەرستی لە موسوڵمانانیش دەکەن، بۆ ئەوەی بزانێ کە چەند دڵڕەق و ستەمکارن بەرامبەر خوداپەرستان و چەند خراپ و خائین و داخ لەدڵن...!!

هەڵبەتە ئەم ئایەتە گشتیەو هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە مزگەوتەکان کۆنترۆڵ دەکەن و جۆرەها لەمپەرو ڕێگری لەبەردەم نوێژکەراندا دروست دەکەن، بەبیانووی جیاجیاوە زۆربەی کات دەرگای مزگەوتەکان دادەخەن، دەرس گوتنەوەی ئایینی لە مزگەوتەکاندا مەنع دەکەن، شەو نوێژو قورئان خوێندن لە مزگەوتەکاندا یاساغ دەکەن، بۆ هەموو ئەو مەنع کردن و یاساغکردنەش بیانوویان هەن و بیانوو دەدۆزنەوە. بانێکەو دوو هەوایە!!

﴿أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى﴾ هەواڵم بدەرێ‌و پێم بڵێ: ئەو یاخی بووەو ستەمکارەئەگەر لەسەر ڕێبازی چاکە بوایە.

﴿أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى﴾ یان ئامۆژگاری ئادەمیزادانی بکردایە بۆ خوداپەرستی، ئایا ئەو حاڵەی باشتر نەبوو لەو حاڵەی، کە ئێستا تێیدایەو نایەڵێ بەندەی ڕاستاڵی خودا نوێژ بکا.

یان پێدەچێ خیطابەکە ئاڕاستەی کابرای کافرو ستەمکار کرابێ، واتە: ئەی بابای کافر، ئایا پێم ناڵێی: ئەگەر نوێژی ئەو بەندەیەی کە ناهێڵی نوێژەکەی بکا هیدایەت بێ‌و بانگەوازی یەکەی فەرمانکردن بەتەقوا بێ، ئایا هەر جڵەوگیری نوێـژکردنی لێ دەکەی؟ ئەمە تەصویرەکەی بەمجۆرەیە: ستەمکارو ستەملێکراو هەردووکیان لای حاکم ئامادە کرابن، ئەمجار دادوەر هەرجارەو خیطاب ئاڕاستەی یەکێکیان بکا!!

﴿أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾ ئایا تۆ نابینی ئەی محمد! واتە: هەواڵم بدەرێ دەربارەی حاڵ‌و ومزعی ئەو کافرە: کە ئەبو جەهل‌و هاو وێنەکانی، ئەگەر بەڵگەو نیشانەکانی تاک‌و تەنهایی خوداو دیاردەکانی تواناو دەسەڵاتی سەرسوڕهێنەری بەدرۆ بخاتەوە، پەیامی پێغەمبەرەکەی ڕەت بکاتەوەو پشت لە ئیمان هێنان بەخوداو بە پێغەمبەر هەڵبکا.

﴿أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى﴾ ئایا ئەو کافرە نازانێ: کە خودا دەیبینێ‌و ئاگای لەهەڵس‌وکەوتیەتی‌و نیازو مەبەستی دەزانێ‌و لەوەو دوا پڕاو پڕ سزای دەداتەوە؟ دەی چۆن جورئەتی ئەوە دەکاو بە چ عەقڵێك هەڵوێستی ئاوا دەنوێنێ؟

﴿كَلَّا﴾ با ئەو بێ بڕوا ستەمکارە دڵڕەقە واز لەو هەڵوێستە دزێوو ناشیرنانەی خۆی بێنێ! با چیتر جڵەوگیری لە بەندەی خۆشەویستی خودا نەکا: کە نوێژ دەکا.

﴿لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ، نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ سوێند بەخودا ئەگەر واز لەهەڵوێستی بەدکارانەی خۆی نەهێنێ‌و بەردەوام بێ لەسەر ئەزیەتدانی

پێغەمبەرو شوێنکەوتووانی، ناوچەوانی دەگرین، واتە: بەقژی پێشەسەری کێشی دەکەین بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، ناو چەوانێك کە خاوەنەکەی درۆزنو تاوانبارە، گاڵتەی بە تاوانکردن دێو بەشتێکی ئاسایی دەزانێ.

با بانگی ئەهلی نادیو خزمو عەشیرەتی بکا بۆ یارمەتیدانیو رزگار کردنی لە عەزابی خودا، ئێمەش فریشتە زەبر بەدەستو توڕەو رق ئەستورەکانی دۆزەخ بانگ دەکەین بۆئەوەی باڵبەستی بکەنو بەقژی پێشە سەری بەرەو دۆزەخ رایکێشن.

ئەمجار بابزاندرێ کام لایەنیان سەرکەوتوو دەبن؟!

بوخاریو تیرمیزیو نەسائیو ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکەن، دەفەرموێ کە ئەبو جەهل وتی: ئەگەر موحەممەد ببینم نوێژ بکا، قاچم دەخەمە سەر گێرەرەی ملی. ئەم قسەیە بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم) گەیشتەوە، فەرمووی: ئەگەر وابکا فریشتە دەیگرنو دەی پێچنەوە.

﴿كَلَّا، لا تُطِعْهُ، وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ﴾ ئەی محمد! نەکەی کارسازی لەگەل ئەو کافرە دڵڕەقە بکەی، نەکەی گوێی بۆ رابگرێو بەقسەی بکەی، ئەوە دوژمنو ناحەزتە، پابەندی فەرمانی خودابەو هەوڵ بدە بە تاعەتو بەندایەتی خۆت لەخودا نزیك بکەیتەوە، ئەوە دەبێتە هۆی شکۆمەندیو سەربەرزی تۆ لە دونیاو قیامەتدا، چەندێك خۆت لەخودا نزیك بکەیەوە سامو هەیبەتت لەدڵی دوژمنەکانتدا زیاد دەبێ، عیبادەتو خوداپەرستی شورای پۆڵایینو رێبازی رزگار بوونن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سورەتی (القدر)

ئەم سورەتە مەککییەو پێنج ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی (القدر) بەناوی ئەو شەوە ڕێزدارەی: کە قورئانی تێدا نازڵ کراوە. لەم سورەتە پیرۆزە مەککییەدا مێژووی سەرەتای نازڵبوونی قورئان باس دەکا، باسی ڕێزو پیرۆزی شەوی قەدر دەکا، کە شەوێکی گەورەو ڕێزدارە، لەباقی شەوو ڕۆژەکانی ساڵ پیرۆزترە، چونکە ئەو شەوە فریشتەو جوبرائیل قورئانیان هێناوەتە خوار، جۆرەها نورو ڕەحمەتو بەرەکەت، خێرو فەڕ نازڵ بوونو نازڵ دەبنە سەر زەوی. ڕەحمەت بەندە موسوڵمانەکانی خودا دادەپۆشێ. ئەوەی ئاشکراو چەسپاوە ئەوەیە: قورئانوەجبە وەجبە لەماوەی بیستو سێ ساڵدا نازڵ بووە، کەواتە: کە دەفەرموێ: قورئانمان لەشەوی قەدردا نازڵ کردووە، مەبەستەکە ئەوەیە سەرەتای نازڵبوونی قورئان لەو شەوە پیرۆزەدا هاتۆتە خوارێ، چونکە حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) لەمانگی ڕەمەزاندا پلەی پێغەمبەرێتی پێ بەخشراوە. هەندێك پێیان وایە: لەشەوی قەدردا قورئان هەمووی نازڵ کراوە بۆ ئاسمانی دونیا، ئەمجار لەوێوە بەگوێرەی پێویست لەماوەی بیستو سێ ساڵدا نازڵ کراوە بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم).

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ۝٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ۝٣ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ۝٤ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ۝٥﴾

دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ ئێمە لەشەوی قەدردا دەستمان کردووە

بەناردنی قورئان، شەوی قەدر شەوێکی پڕ فەڕو بەرەکەتە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مباركة – الدخان/٣﴾ هەڵبەتە ئەو شەوە پیرۆزە لەمانگی رەمەزاندایە، ئاماژە بەوە: کە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ – البقرة/١٨٥﴾ واتە: لەشەوی قەدردا لە رەمەزان سەرەتای نازڵکردنی قورئانمان دەست پێکرد، ئەمجار بەگوێرەی رووداوو پێویست لەماوەی (٢٣) ساڵدا پارچە پارچە ئایەت ئایەتو سورەت سورەت هەموو قورئانمان بۆ پێغەمبەر ناردۆتە خوارێ.

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿حم: وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ، إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ، فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ – الدخان/١-٤﴾.

ئەمجار پەروەردگار رێزو نرخی ئەو شەوە پیرۆزە بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ، لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ – القدر/٢-٣﴾ ئەتۆ چوزانی شەوی قەدر چییە؟ چوزانی ئەو شەوە چەند گەورەو رێزدارە لەلای پەروەردگار، شەوی قەدر کردەوەی چاکو عیبادەتکردن تێیدا لە تاعەتو عیبادەتی هەزار مانگ باشترە کە شەوی قەدریان تێدانەبێ.

ناوی قەدری لێ نراوە، چونکە پەروەردگار لەو شەوەدا هەموو شتێك تا ساڵێکی تر مەزەندە دەکا، تەمەنو رزقو رۆژی هەموو گیانلەبەرێك لەماوەی ئەو ساڵەدا، هەروەها هەموو ڕوداوو جموجوڵێك دیاری دەکا...

یان ناوی قەدری لێ نراوە لەبەر ڕێزو نرخو فەڕو بەرەکەتی، زومەخشەری دەفەرموێ: مانای شەوی قەدر واتە: شەوی مەزەندە کردنی کاروبارو ڕوداو، ئاماژە بەوە کە قورئان لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ – الدخان/٤﴾

وێدەچێ مەزەندە کردن تێیدا ئەوەبێ: کە تاعەتکردن تێیدا باشترە لەتاعەتکردنی هەزار مانگ.

ئیمام ئەحمەدو نەسائی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: کە مانگی رەمەزان هات پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيْهِ وسَلم) فەرمووی: ئەوە مانگی رەمەزان هات مانگێکی پیرۆزە، خودا لەسەری پێویست کردوون رۆژەکانی بەرۆژو بن. دەرگاکانی بەهەشتی تێدا دەکرێتەوە، دەرگاکانی دۆزەخی تێدا دادەخرێن. شەیاتینی تێدا زنجیر دەکرێت، لە شەوێکی پڕ فەڕو بەرەکەتدا کە لە هەزار مانگ باشترە، کەسێك لەو خێرو بێرە بێ بەش بکرێ ئەوە بێ بەش کراوە.

لە صەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرموودەیەك هەیە ئەبو هورەیرە ریوایەتی کردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيْهِ وسَلم) فەرمووی: «مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ» کەسێك شەوی قەدر خەریکی عیبادەتو خوداپەرستی بێ، بڕوای بە پاداشو سزا هەبێو بەتەمای ئەوەبێ خودا پاداشی دەداتەوە، لەتاوانی رابردوی چاوپۆشی دەکرێ.

﴿تَنَزَّلُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ﴾ لەو شەوە پیرۆزەدا فریشتەکانو جوبرائیلیش لەگەڵیاندا لە ئاسمانەکانەوە دادەبەزنە سەر زەوی، هەرچی بڕیارو کاروبارێکی دونیا هەیە تا ساڵی داهاتوو، لەگەڵ خۆیان دەیهێنن.

پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيْهِ وسَلم) فەرموویەتی: «ان الله يقدر المقدر في ليلة البراءة فاذا كان ليلة القدر يسلمها إلى أربابها» پەروەردگار لەشەوی بەراتدا شتەکان مەزندە دەکا، کە شەوی قەدر هات ئیتر فەرمانو بڕیارەکانی دەدا بە فریشتە بەرپرسەکان، هەر فریشتەیەو ئەرکی خۆی پێ دەسپێردرێ، چونکە بەبێ ئیزنی خودا هیچ کارێك ئەنجام نادەن. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ – مریم/٦٤﴾.

مەبەست بەوشەی (الروح) لە ئایەتەکەدا حەزرەتی جوبرائیلە، هێنانی ناوی ئەو بەدوا ناوهێنانی فریشتەکاندا (عەطفی خاصە بۆ سەر عام)و جۆرە رێزدانێکە بەو فریشتە پایە بەرزە، سودی نازڵبوونی فریشتەکان بە جوبرائیلیشەوە لەو

شەوەدا لە ئاسمانەکانەوە بۆ سەر زەوی، ئەوەیە ئەوان لەو شەوەدا جۆرەها تاعەتو خوداپەرستی ئادەمیزادەکان دەبینن، گوێیان لەجۆرەها نـزاو پاڕانـەوەی تاوانبـارانی تـۆ بـەکار دەبـێ، کـە ئـەو جـۆرە پاڕانـەوە لای خـودا لـە تەسـبیحاتی فریـشتەکان خۆشـترە، دەڵـێن: وەرن ئـەم دەنگـە ببیـستن کـەلای خـودا لـە تەسـبیحاتی ئێمـە خۆشترە.

﴿سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾ ئـەو شـەوە پیرۆزە پـڕ خێـرو فـەڕە هـەمووی ئـەمن و ئاسایش و خێـرو بێـرە، هـەر لـە خۆرئاوابوونـەوە تـا دەرکـەوتنی سـپێدەی بەرەبەیان بەرەکـەتو ڕەحمـەت دەبـارێ، فریـشتەکان پـۆل پـۆل دێنـە خـوارێ، لـەو شەوەدا خودا هەر خێر دەبارێنێ، هەر خێرو فەڕو ڕەحمەت مـەزندە دەکا بەسـەر خوداپەرستاندا، شەوێکە شـەیاتینی دەسـەڵاتو تواناپـان بەسـەر موسـوڵمانانـدا نیـە، شەوێکە هەمووی پیرۆزە، ڕەحمەتە، ئاساییشە، سودو قازانجی دین و دونیای تێدایە.

هەندێك پێیان وایە: شەوی قەدر تەصادوفی شەوی بیستو حەوتی ڕەمـەزان دەکا، هەندێك دەڵێن: شـەوی بیـستو یەکـە، هەنـدێکی تـر دەڵـێن: دەکەوێتـە (دە) ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان.

هەنـدێکیش دەڵـێن: لـەمانگی ڕەمەزاندایـەو بـەرەهایی هێـشتوویانەتەوە. حیکمەت لەنهێنی کردنی شەوی قەدرو دیاری نەکردنی، دەق وەکوو نهێنـی کردنـی کاتی مـردن و کاتی ڕابوونی قیامەتە، بۆ ئەوەیە بەندەکان زۆر خوداپەرستی بکـەن و هەمیشە لەهەوڵو تێکۆشاندا بن و هیچ کاتێك لەخودا غافڵ نـەبن، فێـری تەمبـەڵی نەبن و پاڵی لێ نەدەنەوە، ئەگـەر ئـادەمیزاد هـەوڵی دا ئـەو شـەوانە زینـدو بکاتـەوە کـەپێی وایـە تەصـادوفی شـەوی قـەدەر دەکـەن، پـەروەردگار شـانازی دەکـا بەسـەر فریشتەکانیداو پێیان دەفەرموێ: ئاها سەیر بکەن ئادەمیزادەکان چۆن سـەرگەرمی خوداپەرستین لەکاتێکا دڵنیاش نین کە ئەو شەوە شەوی قەدرە، دەبی ئەگـەر دڵنیـا بوونایە کە ئەو شەوە قەدرە چییان بکردایە؟ ئەم بەندانەم ئەوانەن کە کاتی خـۆی ئێوە دەربارەیان گوتتان: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ – البقرة/ ٣٠﴾.

شـەوی قـەدر ئەوەنـدە بـەرزو پـیرۆزو بەنرخـە، زانیـاری ئـادەمیزاد دەرکـی حەقیقەتی ناکا، شەوێکە گەورەو پیرۆز بووە بـەوە خـودا هەڵیبـژاردووە بـۆ ئـەوەی ببێتـە کـاتی سـەرەتای نـازڵبوونی قورئـانو ڕژانـی ئـەو فـەضڵو بەرەکـەت بەسـەر زەویدا، ناردنە خوارەوەی ئاشتیو ئاسایش، کە لەڕۆحی خوداوە ڕژایە سەر ویژدانی ئادەمیزاد.

بەداخەوە ئادەمیزاد بەگشتی لەبەر نەزانیو نەفامی خۆی لە ڕێزو گـەورەیی شـەوی قـەدر بـێ ئاگـابوون، حەقیقـەتی ئـەو ڕوداوە گەورەیـەی لـەو شـەوەدا ڕویـدا پاشگوێی خستووە.

بەڕاستی لەو کاتەوە ئادەمیزاد ناوەڕۆکی ئەو حەقیقەتەی پاشگوێ خـستووە، پیرۆزتـرینو گەورەترین نیعمەتی خودایان لەکیس چووە، ئاشتیو ئارامی لەدەستدا، ئاشتیو ویژدانو ئاشتی تاكو کۆمەڵو ئاشـتی خێـزانو ئاشـتی ئـادەمیزاد بەگـشتی لەدەستداوەو خەسارەتمەندی دونیـاو قیامـەت بـوون. هـیچ کامێـك لـە پێـشکەوتنی مادیو زیاریو بیناسازی...هتد. قەرەبووی ئەو زیانەی نەکردنەوە.

چـەندێك ئـادەمیزاد ئەمڕۆشـی لەگەڵـدا بـێ لـەبواری ماددیـدا پێـشکەوتنی بەدەست هێناوەو هەنگاوی سەرسوڕهێنەری ناوەو قۆناغی بەرچاوی بڕیـوە. بـەڵام چـونکە بەرنامـەی خـودای پاشـگوێ خـستووە تووشـی تـەنگو چـەڵەمەو ئاشـوبو قەلەقو دڵەڕاوکێ بووە ژیانی شیرینی لێ تاڵ بووەو خۆشی لەژیانی دونیای نابینیو قیامەتیشی لەکیس چووە!!

ئێمەی موسوڵمان نابێ ئەو ڕوداوە گەورەیەی لەشەوی قەدردا ڕویـدا پاشـگوێ بخەین. پێویستە هەموو کاتێ ئەو یادە بکەینەوە بەڕێزەوە لێی بڕوانین، بەتایبەتی کە حەزرەتی پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَیهِ وسَلم) ڕێگای ئاسانی بۆ دیاری کردووین بـۆ زیندو کردنەوەی ئەو یادە پیرۆزە لەناخماندا بۆ ئـەوەی گیانـەکانمان پەیوەسـت بـن بەناوەڕۆکی ئەو ڕوداوە گەورەوە کە لەشەوی قەدردا ڕویدا ئەوەتا پێغەمبەر (صَلی

الله عليه وسلم) هەڵمان دەنێ بۆ ئەوەی هەموو ساڵێك لە (دە) شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا لەشەوی قەدر بکۆڵینەوەو خوداپەرستی زۆری تێدا بکەین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (البینة)

ئەم سورەتە مەدەنییەو هەشت ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی (البینة) چونکە بە ئایەتی ﴿لَمْ يَكُنْ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّى تَأْتِيَهُمْ الْبَيِّنَةُ﴾ دەستی پێ کراوە.

دەگوترێ: ئەم سورەتە وەکوو هۆکار (العلة) وایە بۆ سورەتی پێشوو، لەم ڕووەوە: کە لەسورەتی پێشوودا فەرمووی: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ وەکوو بڵێ گوتراوە بۆچی قورئانی نازڵ کردووە؟ دەفەرموێ: چونکە کافرەکان واز لە کوفرو بێدینی خۆیان ناهێنن هەتا بەڵگەی ئاشکرایان بۆ نەیە. کەوابێ سەرەتای ئەم سورەتە وەکوو عیللەتو بابیس وایە بۆ سەرەتای سورەتی پێشوو.

زۆر فەرموودەو ڕیوایەت هەن دەربارەی گەورەیی ئەم سورەتە، لەوانە: ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو تیرمیزی نەسائی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرموو: (ان الله أمرني ان اقرأ عليك: ﴿لَمْ يَكُنْ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ ئوبەی وتی: بۆچی بەتایبەت خودا ناوی منی هێنا؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەڵێ، ئیتر ئوبەی دەستی کرد بەگریان[1].

ئیمام ئەحمەد لە مالیکی کوڕی عەمری کوڕی ثابیتی ئەنصارییەوە بەهەمان مانا فەرموودەیەکی تری ڕیوایەت کردووە. وێڕای خوێندنەوەی سورەتەکە،

[1] رواه مسلم في (٦) كتاب صلاة المسافرين، باب استحباب قراءة القرآن على أهل الفضل (حديث ٧٧٩) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە.

پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) ئەمەشی فەرمووە: ئەگەر ئادەمیزاد پڕ بەشیوێك ماڵو سامانی بدرێتێ داوای شیوێکی تر دەکا، ئەگەر شیوی دووەمی بدرێتێ داوای شیوێکی تر دەکا، گڵ نەبێ هیچی تر ئادەمیزاد تێر ناکا. هەرکەسێ تۆبە بکا خودا تۆبەی لێ وەردەگرێ.

ئایینی ڕاست لای خودا ئایینی یەکتاپەرستیو خاوێنە، ئایینێکە هاوەڵی تێدا بەرەوا نەزانرێ بۆ خودا، ئایینی جوولەکەو مەسیحی نەبێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ جَزَآؤُهُمْ

عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَكُنْ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّى تَأْتِيَهُمْ الْبَيِّنَةُ﴾ ئەوانە بێ بڕوابوون لە ئەهلی کیتابو بتپەرستەکان، جیانەبوونەوەو وازیان لە بیروباوەڕی بەتاڵی خۆیان نەهێنا تا بەڵگەی ئاشکرایان بۆ نەهات: کەبریتی بوو لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەر یان نازڵکردنی قورئانی پیرۆز.

واتە: کافرەکان وازیان لە کوفرو شیرکی خۆیان نەهێنا هەتا پێغەمبەر هاتە سەریان و گومڕاییو سەرلێ شێواوی خۆیانی بۆ ڕوون کردنەوە بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنانو خوداپەرستی.

ئەمجار مەبەست لە (البينة) دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿رَسُولٌ مِنْ اللَّهِ يَتْلُوا صُحُفاً مُطَهَّرَةً، فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ﴾ ئەو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایە پێغەمبەرێکە لەخوداوە ڕەوانە کراوە بۆ سەر هەموو ئادەمیزادو جندۆکە، ڕەحمەتو هیدایەتە بۆیان، ئایەتی قورئانیان بۆ دەخوێنێتەوە، قورئانێك: کە پاكو خاوێنە لەهەموو عەیبو نەقصێك، هیچ درۆو شوبهەی لەخۆ نەگرتوون، گۆڕانکاریو تێکەڵاویو وتەی بێ سەروبەرو بێ مانای تێدا نین، بەڵکوو حەقو ڕاستی لەخۆ گرتووە، ڕێبازی ڕاستو حەق نیشانی موشریکەکانو خاوەن نامەکان دەدا، ئەوەی لێیان شێواوەو سەریان لێ تێکچووە بۆیان ڕاست دەکاتەوە، ئەحکامو بڕیاری موحکەمو پڕ فەڕو قازانج بۆ دینو دونیایان بۆ ڕوون دەکاتەوە. بێگومان پێش ناردنی پێغەمبەری ئیسلام سەر زەوی تەوپەڕی پێویستی هەبوو بەپەیامێکی تری ئاسمانی، ئاشوبو فیتنەو فەسادو داوەشان هەموو سەر زەوی داگیر کردبوو، نەتەوەیەك نەبوو ئایینێکی ڕاستی هەبێ، کۆمەڵێك نەدەبینرا ڕێبازێکی خوداپەرستی گرتبێتە بەر، فەرمانڕەوایەك نەبوو لەسەر بنەمای دادو خوداناسی

دروست بووبێ...

دژایەتیو دوژمنایەتی لەناو دڵی ئادەمیزادەکاندا ڕوابوو، خوێنی خەڵك بە ناڕەوا دەڕژێنرا، ماڵی ئەمو ئەو بەخۆڕایی دەبراو دەخورا، کەس لەتاوان نەدەگەڕایەوە، هەرچی دەستی بڕۆیشتایە کۆی لەستەم نەدەکرد، چاوەڕوان نەدەکرا بەبێ ناردنی پێغەمبەرێکی وەکوو پێغەمبەری ئیسلامو پەیامێکی تری وەکوو پەیامی قورئان چارەسەری ئەو هەموو فەسادو خراپەکارییانە بکرێ، کوفرو بێدینی چووبووە ناخو دەروونی هەموو کەسێکەوە.

خاوەن نامە ئاسمانییەکانیش ئایینەکەیان لێ گۆڕابوو یەکتاپەرستی نەدەکرا، ئایینی حەقو ڕاستی ئاسمانیی لەیادی خەڵکەکە چووبووەوە، بتپەرستی لەنیوە دورگەی عەرەبیو دەرەوەیدا ڕەگی داکوتابوو، بەجۆرێك تەصەور نەدەکرا ئەوانە واز لەکوفرو بێدینی خۆیان بهێنن ئیللا بەم پەیامە تازە نەبێ: کە پەیامی ئیسلامەو دەبوایە لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرەی: کە قورئان پەیامیەتیو ناو نیشانەی ئاشکراو نمایانە بەکۆتا بێ...

بۆیە ئەو پێغەمبەرە سەرداره بەرێزە لەکاتی خۆیدا رەوانە کراو قورئان لەکاتی پێویستی خۆیدا نازڵ بوو، بۆ ئەوەی کاریگەری خۆی لە زەویدا بنوێنێو ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، کاریگەریو ڕۆڵێك کە بەو جۆرە نەبوایە سەر زەوی ئیصلاح نەدەبوو.

بێگومان سەدەی شەشەمو حەوتەمی زایینی دارزاوترین ڕۆژگارو خراپترین سەردەم بووە، مرۆڤایەتی چەند سەدەیەك بەرەو دواوە گەڕابووەوە، ڕۆژ بەڕۆژیش بەرەو ڕوخانو تێداچوون هەنگاوی دەنا.

هێزێکی مەعنەوی نەبوو بتوانێ بەرگری لەتێکڕوخانی مرۆڤایەتی بکا، بەڵکوو ڕۆژگار بەپەلە ئادەمیزادی بەرەو هەڵدێر دەبردو خەمخۆرکە لەهەموو لایەکەوە کنەی لێ دەکردن، ئادەمیزاد لەو کاتو سەردەمانەدا خودایان لەبیر چووبووەوە، خۆشیان لەبیر چووبووەوەو نەیان دەزانی بەرەو کوێ دەڕۆن، کەس

چاك‌و خراپی خۆی نەدەزانی‌و نەیدەتوانی خێرو شەڕ لێك هەڵاوێرێ‌و جوداوازی بخاتە نێوان پەسەندو ناپەسەندەوە...

زەمانێك بوو بانگەوازی پێغەمبەران كپ بووبوون، ڕوناكی چرا داگیرساوەكانی كوژابوونەوە، یان تروسكایەكی كەم‌و بێ هێزیان مابوو، دڵەكانی ڕوناك نەدەكردەوە، چ جایی بتوانن ناوماڵەكانیان ڕوناك بكاتەوە.

پیاوە ئایینیەكان گۆڕەپانی بانگەوازی‌و خەباتیان چۆڵ كردبوو، پەنایان بردووە بەر دێرو كڵێسەو خەڵوەتگاو چۆڵاوانییەكان، بۆ ئەوەی بتوانن پارێزگاری ئایینی خۆیان بكەن‌و خۆیان لە فیتنەو ئاشوب بدزنەوە، یان حەزیان لەتێكۆشان‌و بانگەوازی بۆ دین نەمابوو، حەزیان لەتەمبەڵی‌و پاڵدانەوە بوو، نەیاندەتوانی لەگەڵ ژیانەكە هەڵبكەن یان بڵێ: لەبواری جیهادو تێكۆشان‌و ڕوبەڕو بوونەوەدا شكستیان هێنا بوو، نەیانتوانی پەروەردەی جەستەو گیان بەیەكەوە بكەن، گیان‌و ماددەیان لێك جیاكردبووەوە، بەخەیاڵی خۆیان وازیان لەماددە پەرستی هێنابوو، خەریكی پەروەردەی گیانیان بوون، خۆیان كردبووە رەبەن‌و خەڵوەكێش!!

هەندێكیش لەپیاوە ئایینیەكان كە لەناو كۆمەڵگاكەدا مابوونەوەو كەنارگیر نەبووبوون لەگەڵ پاشاو فەرمانڕەواو دەرەبەگ‌و دونیاویستەكاندا تێكەڵاو بووبوون، یارمەتیدەریان بوون بۆ دەستدرێژی‌و ستەمكاری‌و ماڵ خواردنی خەڵك بەناحەق.

ئایینە ئاسمانییەكان بووبوونە گاڵتەجاڕی كاربەدەست‌و دام‌و دەزگاكانی قەیصەرو پاشاكان، تاوانباران بەئارەزوی خۆیان دەستكاریان دەكردن، هەتا وای لێهاتبوو ناوەڕۆكی ئایینەكان نەمابوو.، بەڵكوو پەیكەرو شێوازیشیان شێوێندرا بوو، ئەگەر هەڵگرانی پێشووی ئایینەكان زیندو بكرانایەوە هیچیان نەیان دەزانی كامە ئایینەكەیانە.

مەركەزو پایتەختی ژیارو رۆشنبیری‌و فەرمانڕەوایی‌و ڕامیاری بووبوونە شانۆی ئاشوب‌و فیتنەو دارزان‌و داوەشان‌و نائارامی‌و پشێوی‌و فەساد، وەها

بەخۆیانەوە هەڵەوگێر بووبوون نەیاندەتوانی چاکسازی ناو خۆیان بکەن چ جایی دەوروبەر چاك بکەن، لەبواری مەعنەویدا ئیفلاسیان کردبوو، سەرچاوی گیانیان وشك بووبوو، شەریعەتێکی ئاسمانی نەمابوو بەصافیو بێگەردی، ڕژێمێکی یاساپەروەر لەسەر زەوی نەبوو. ئەمەبوو حاڵو وەزعی مرۆڤایەتیو ئایینە ئاسمانیەکانو پیاوە ئایینیەکان لەپێش ڕەوانکردنی حەزرەتی موحەممەددا.

بۆیە فەزڵ ڕەحمەتی خودا داخوازی ئەوەبوو پێغەمبەرێك بنێرێ بۆ ڕزگار کردنی ئادەمیزاد لەو سەرلێ شێواویو گومڕاییەی تێی کەوتبوو، تا بینە ڤاڤای نغرۆ بووبوو، حیکمەتی خوداوابوو ئەو پێغەمبەرە پەیامەکەی قورئانی پیرۆز بێ، بۆ ئەوەی بتوانێ خاوەن نامەکانو بتپەرستەکان واڵێ بکا واز لەبیروباوەڕی خۆیان بێننو باوەش بەئایینی ئیسلامدا بکەن.

﴿وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلاَّ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَةُ﴾ خاوەن نامەکان لەگاورو جوولەکە جوداوازیان تێ نەکەوت مەگەر کاتێ نەبێ کەبەڵگەیان بۆ هاتو حەقو ڕاستییان بۆ دەرکەوت، پەرتەوازەییو ڕا جیاییان لەبەر ئەوە نەبوو سەری لێ بشێوێو ڕاستیان لێ گوم ببێ، بەڵکوو کاتێ تەفرەقەیان تێکەوت: کە حەقیان بۆ دەرکەوت، پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە کرا: کە موحەممەدە، قورئانێکی بۆ نازڵ کراوە: کە لەگەڵ دەقی نامەکانی ئەوان یەك دەگرێتەوە، ناونیشانی پێغەمبەریش لەنامەکانی ئەواندا دیاری کراوە، کەچی کاتێ ئەو پێغەمبەرە بەو ناونیشانە ئاشکرایانەوە هاتە سەریانو بانگەوازی کردن، هەندێکیان بڕوایان پێ کردو هەندێکیان پەیامەکەیان ڕەت کردەوە.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ – آل عمران/١٠٥﴾، یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ – الشورى/١٤﴾.

فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَیهِ وسَلَم) هەیە بەچەند جۆرێك‌و لەچەن زنجیرەیەکەوە ریوایەت کراوە، یەکێ لەو ریوایەتانە ئەوەیە: دەفەرموێ: (ان الیهود اختلفوا علی احدی وسبعین فرقة، وان النصاری اختلفوا علی ثنتین وسبعین فرقة، وستفترق هذه الأمة علی ثلاث وسبعین فرقة، کلها في النار الا واحدة، قالوا، منهم یا رسول الله؟ قال ما أنا علیه وأصحابي)[1].

سەیرە ئەهلی کیتاب پێش رەوانە کردنی پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَیهِ وسَلَم) هەموویان کۆك بوون لەسەر ئیمان پێ هێنانی، کەچی کە رەوانە کرا بۆ سەریان تەفرەقەو جوداوازییان تێکەوت.

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾ ئەوانەی دوای ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلام تەفرەقەیان تێکەوت بوونە گرۆ گرۆ، لەحاڵێکدا ئەوانە لەتەورات‌و ئینجیلدا یان لە قورئاندا فەرمانیان پێ نەکراوە بە عیبادەتکردن بۆ هیچ کەسێك ئیللا بۆ خودا نەبێ.

فەرمانیان پێ کراوە بەیەکتاپەرستی ڕاستەقینەو دڵسۆزانە، هاوەڵی بۆ بڕەوا نەزانن، واز لەهەموو ئایین‌و بیروباوەڕێك بهێنن بۆ ئایینی ئیسلام، نوێژەکانیان بە بەردەوامی‌و بەدڵسۆزی لەکاتی خۆیاندا ئەنجام بدەن، زەکاتی ماڵی خۆیان دەرکەن بۆ ئەوانەی شیاوی زەکات پێدانن. ئەمەی فەرمانیان پێ کراوە داخوازی یەکێتی‌و تەباییە، نەك دژایەتی‌و پەرتەوازەیی.

لەگەڵ دووبارەکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە پەیامی حەزرەتی موحەممەد (صَلی اللهُ عَلَیهِ وسَلَم) بریتییە لەناوەڕۆکی پەیامی پێغەمبەرەکانی پێشوو پەیڕەوو پرۆگرامی موحەممەد دەق پەیڕەوو پرۆگرامی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمە، ئەو ئیبراهیمەی دوورەپەرێزو گۆشەگیر بوو لەهەموو جۆرە بتپەرستییەکانی ڕۆژگاری

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر جوولەکە ٢٠٨٥/٤.

خۆی‌و لێبڕاوانه ڕوی کرده خواپەرستی‌و یەکتاپەرستی دڵسۆزانه عیبادەتی خودای دەکرد.

وەکوو له ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا – النحل/١٢٣﴾.

ئا ئەو دڵسۆزی کردنە لە عیبادەتداو وازهێنان لەهەموو بیروباوەڕێك بۆ ئایینی ئیسلام‌و ئەنجامدانی نوێژەکان لەکاتی خۆیانداو زەکات دەرکردن لە ماڵ‌و سامان ئایینی ڕاستەقینەی ئیسلامەو خودا هەر بەو ئایینە ڕازییە.

دوای بەیانکردنی هەڵوێستی کافرو موشریکەکان بەرامبەر بانگەوازی حەزرەت موحەممەد (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وسَلَم) هەڕەشە لە کافرەکان دەکاو وادە بەخودا پەرستان دەدا، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ بێگومان ئەوانەی کافرو بێ بڕوا بوون لە ئەهلی کیتاب، پشتیان لەنامە ئاسمانییەکان هەڵکردووە، بانگەوازی پێغەمبەرانیان ڕەتکردۆتەوە، لە خاوەن نامەکان – جوولەکەو فەلەو بتپەرستەکان - ئەوانە هەموویان سەرەنجامیان لەڕۆژی قیامەتدا ئاگری دۆزەخە، تووڕ دەدرێنە ناوی‌و بۆ هەتا هەتایێ تێیدا دەمێننەوەو لێی دەرناچن، ئەوان خراپترین‌و بەدبەخترین کۆمەڵی مەخلوقاتن چونکە بە ئەنقەست‌و لەڕووی حەسوودی‌و دەروون ئەخۆشییەوە شوێن پەیامی پێغەمبەر نەکەوتوون.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ﴾ بێگومان ئەوانەی بەدڵ ئیمانیان بەخودا هێناوە، بڕوایان بەنامە ئاسمانییەکان‌و پێغەمبەران‌و ڕۆژی قیامەت هێناوە، کردەوەی باشیان ئەنجام داوەو بە زوبانیش ئەو بڕوایە دەردەبڕن. ئەوانە باشترین مەخلووقاتن لە ئێستاو لە داهاتوودا.

ئەبو هورەيرەو كۆمەڵێك لە زانايانى ئيسلام ئەم ئايەتـەيان كـردەوە بـە بەڵگە لەسەر ئەوە: كە موسـوڵمانە دڵسۆزەكان لاى خـودا لـە فريـشتە بـەرێزترن، چـونكە پەروەردگار دەربارەى موسوڵمانە دڵسۆزەكان دەفـەرموێ: ﴿هُـمْ خَيْـرُ الْبَرِيَّـةِ﴾ واتـە: باشترين مەخلووقاتن.

﴿جَزَاؤُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَـا أَبَـداً رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْـهُ، ذَلِـكَ لِمَـنْ خَـشِيَ رَبَّـهُ﴾ پاداشـى ئـەو موسـوڵمانە دڵسۆزانە لـەرۆژى قيامەتـدا لاى خـودا خۆيـان لـە پاداشـتى ئيمـانو كـردەوەى باشـيان بـاخو باخـاتى بەهەشـتى رازاوەيـە، كـە بـەژێر درەختـى باخەكانـداو بـەژێر باڵەخانـەو خانووەكانياندا جۆگاو جۆبار دەبەخشێ. بۆ هەتا هەتايە تێياندا دەمێننەوەو لێيان وەرزنـابنو لێيـان دەرناچـن بـەڵكوو بـەردەوام لـەززەت وەردەگـرنو لـەو خۆشـييەدا رادەبوێرن.

ئەوانە خودا لێيان رازييە، چونكە لەژيانى دونيادا پابەنـدى فـەرمانى خـودا بوون بەگوێرەى شەريعەتو ياساى ئەو هەڵسو كەوتيان كردووە، ئەوانيش لـەخودا رازيـن چونكە پاداشـى داونـەوەو خۆشـىو لـەززەتى لـەرادە بـەدەرى بـۆ دەسـتەبەر كردوون. نازو نيعمەتێكى پێداون نەچاو بينيويەتى، نـە گوێـچكە بيـستوويەتى، نـە بەسەر دڵى ئادەميزادا تێپەڕيوە. ئەم پاداشو رەزامەندييـە بـۆ كەسـێكە بەتـەواوى لەخودا بترسێ، وەها بەندايەتى خودا بكاو وابزانێ خودا دەبينێ، خۆ ئەگـەر ئـەو خودا نەبينێ ئەوە بێگومان خودا ئەو دەبينێ.

ئايەتەكە بەئاشـكرا هەرەشـەيە لەوانـەى لەغـەيرى خـودا دەترسـن، هەرەشـەيە لەوانەى هاوەڵ بۆ خـودا دادەنـێن، هـەڵئانى ئـادەميزادى تێدايـە بـۆ خوداپەرسـتىو ترسان لەخودا، هەتا واى لێ دێ هەموو كردەوەيەكى بۆ خوداو لەبەر خـاترى خـودا ئـەنجام دەدا. ئامـاژەى ئەوەشـى تێدايـە كـە مـەرجى ئەنجامـدانى عيبـادەت وەكـوو نوێژو رۆژوو ترسان لەخودايە، خوداپەرستى بەبێ تـرسو خوشوع لـەخودا كـەڵكى نيە!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورتی (الزلزلة)

ئەم سورەتە مەدەنییەو هەشت ئایەتە، بەگوێرەی هەندێ ریوایەتی تر مەككیە، ئوسلوبی سورەتەكەو ناوەڕۆكی سورەتەكە پشتگیری ئەوە دەكەن كە مەككی بێ. ئەم سورەتە ناوی نراوە سورەتی (الزلزلة) چونكە سەرەتای سورەتەكە بە هەواڵی رودانی راشڵەقاندنی زەوی دەستی پێ كردووە، لەسورەتی پێشوودا هەڕەشەی لە كافرەكان كردو وادەی بەخودا پەرستان دا، سزای كافرەكانی بە دۆزەخ دیاری كردو پاداشی خودا پەرستەكانی بە بەهەشتو باخو باخاتی رازاوەی دەست نیشان كرد ئەمجار لەو سورەتەدا كاتی ئەو سزاو پاداشەی دیاری كرد، وەكوو ئەوە بڵێن: گوتراوە: كەی ئەو سزاو پاداشە دەدرێتەوە؟

لە وەڵامدا دەفەرموێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتْ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ كافرەكان زۆریان پرسیار لە پێغەمبەر (صلى اللهُ عليهِ وسلم) دەكرد، كەی قیامەت رادەبێ؟ دەیانگوت: ﴿أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ – القيامة/٦﴾.یان دەیانگوت: ﴿مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ؟ – الملك/٢٥﴾. زۆر پرسیاری تری لەم جۆرە. پەروەردگار لەم سورەتەدا نیشانەكانی قیامەتی دیاری كردن، بۆئەوەی دڵنیابن: كە زانیاری ئەوە لای خودایەو بەس، جگە لەخودا كەس نازانێ كەی قیامەت رادەبێ.

﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ

ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْاْ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

دهفهرموێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتْ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾ كاتێك زهوی راتلهقاو وشهقه تۆڵه كهوتو بهتوندی كهوته جونبوشو لهرزه، بهجۆرێكی وا، كه ههرچی وا بهسهریهوه تێك برۆخێو تێك بشكێو هیچ شتێك لهشوێنی خۆی نهمێنێ.

﴿وَأَخْرَجَتْ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ زهوی ههرچی تێیدا بوو لهمردوو گهنجو جهواهیرات دهری هاویشتو خۆی خاڵی كرد.

وهكوو له ئایهتێكی تردا دهفهرموێ: ﴿وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ، وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ – الإنشقاق/٣-٤﴾.

موسلیمو تیرمیزی له ئهبو هورهیرهوه ریوایهتیان كردووه دهفهرموێ: پێغهمبهر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فهرمووی: «تَقِيءُ الْأَرْضُ أَفْلاَذَ كَبِدِهَا أَمْثَالَ الْأُسْطُوَانِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ فَيَجِيءُ الْقَاتِلُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قَتَلْتُ . وَيَجِيءُ الْقَاطِعُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِي. وَيَجِيءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قُطِعَتْ يَدِي ثُمَّ يَدَعُونَهُ فَلاَ يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا»[1].

زهوی ناوسكی خۆی دههێنێتهوه، گهنجو جهواهیراتی ناوخۆی فرێ دهداته دهر له زێرو زیو، ههمووی لهو دهشته دهكهوێ پیاو كوژ دهڵێ: لهپێناو ئهوهدا من ئادهمیزادم كوشت، میراتگری بهشهڕ هاتوو دێ دهڵێ: من لهپێناو ئهوهدا صیلهی

[1] رواه مسلم (١٢) كتاب الزكاة (١٨) باب الترغيب في الصدقة الحديث ٦٢/١٠١٣ ورواه الترمذي في (٥٤) كتاب الفتن (٣٦) الحديث (٢٢٠٨).

ڕەحمم بڕێوە، دز دێ دەڵێ: من لەسەر ئەوە دەستم بڕا، پاشان هەموویان جێی دێڵن‌و کەس دەست بۆ ئەو زێڕو زیوە نابا.

﴿وَقَالَ الإِنسَانُ مَا لَهَا؟﴾ هەموو کەسێك لەدیمەنی زەوی سەرسام دەبێ‌و دەڵێ: ئەوە زەوی چییەتی؟ بۆچی وا بەشەقەتۆڵە کەوتووەو زێڕو جەواهیراتی ناوخۆی فڕێ دەداتە دەرەوە؟

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ لەو ڕۆژەدا: کە ئەوپەڕی تەنگانەو ترس‌و سام‌و پشێوی هەموو کون‌و قوژبنێکی گرتۆتەوەو زەوی بە شەقاتۆڵە کەوتووە، زەوی هەواڵی خۆی دەگێڕێتەوە، ڕاستی دەڵێ: دەربارەی هەر کردەوەیەکی لەسەری ئەنجام درابێ بەخێرو شەڕیەوە، پەروەردگار وەزوبانی دێنێ‌و شایەتی لەسەر بەندەکان دەدا.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیذی‌و نەسائی (واللفظ له) لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت دەکەن، دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾ دوایی فەرمووی: دەزانن هەواڵدانی زەوی چیە؟ هاوەڵان وتیان: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن. ئەمجار پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) فەرمووی: «فَإِنَّ أَخْبَارَهَا أَنْ تَشْهَدَ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ بِمَا عَمِلَ عَلَى ظَهْرِهَا أَنْ تَقُولَ عَمِلَ كَذَا وَكَذَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا قَالَ فَهَذِهِ أَخْبَارُهَا»[1].

هۆی ئەو هەواڵ‌و شایەتیدانە لەسەر بەندەکانی لەلایەن زەوییەوە ﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا﴾ بە فەرمان‌و نیگای خودای تۆیە، پەروەردگار ئیزنی داوە: کە شایەتی بدا.

یان مانای ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا﴾ لەو ڕۆژەدا زەوی بەزمانی حاڵ سەرگورشتەی خۆی بۆ ئادەمیزاد دەگێڕێتەوە، هۆی وەشەقەتۆڵە

---

[1] رواه الترمذي في (٣٨) كتاب صفة القيامة والرقائق والورع (٧) باب ماجاء في العرض الحديث (٢٤٢٩) عن ابي هريرة.

هاتنی خۆی بۆ مەردوم باس دەکاو تێی دەگەیەنێ، کە ئەو جمو‌جوڵە نائاساییەی سەرەتای دونیا وێرانبوونە، هۆی وێرانبوونەکەشی ئەوەیە خودای تۆ وای سروش بۆ کردووە: کە وێران ببێ، هۆی وێرانبوونی بۆ رەخساندووە، کە ئەمانی هێزی کێشندەیە.

﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتاً لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ﴾ لەو رۆژەدا: کە دونیا بەتەواوی وێران دەبێو هەموو دیاردەیەکی بونەوەر تێك دەچێ، ئادەمیزاد لە گۆڕەکانیان رادەبنو بەرەو سارای مەحشەری دەکشێن بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵیان، رەنگو روخسارو حاڵو وەزعیان جیا جیایە، هەندێکیان دڵنیانو بەرچاو روونن، هەندێکیان ترس دایگرتوون، بڕێکیان رەنگی بەهەشتییانیان پێوە دیارە، هەندێکیان رەنگی دۆزەخیان لێ نیشتووە.

هەموو ئەو پێڕو کۆمەڵە جیا جیایانە بەرەو دەشتی مەحشەر دەبرێن بۆئەوەی کردەوەکانی خۆیان ببینن. ئەمە ئەگەر مانای ﴿يَصْدُرُ النَّاسُ﴾ رۆیشتنی ئادەمیزادەکان بێ بۆ سارای مەحشەر.

ئیبنو کەثیرو هەندێ موفەسرینی تر مانای ﴿يَصْدُرُ النَّاسُ﴾ بەوە دەکەن: کە ئادەمیزادەکان لە سارای مەحشەر دەگەڕێنەوە، واتە: لەو رۆژەدا مەردومان لە سارای مەحشەر دەگەڕێنەوە بە پەرشو بڵاوی، کۆمەڵ کۆمەڵو پێڕ پێڕ، هەندێکیان بەختەوەرن، هەندێکیان بەدبەختو چارە رەشن، بڕێکیان فەرمانیان پێ کراوە بچنە بەهەشتەوە، هەشیانە فەرمانی پێ کراوە بچێتە ناو دۆزەخ، بۆئەوەی هەموو کەسێك پاداشو سزای کردەوەی لەخێرو لەشەڕ وەربگرێتەوە.

جا ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَه، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَه﴾ هەرکەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك کاری باشی ئەنجام دابێ، بێگومان رۆژی قیامەت لەنامەی ئەعمالیدا دەی بینێتەوەو پاداشی لەسەر وەردەگرێتەوە،

هەرکەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك خراپەی ئەنجام دابێ، لەو ڕۆژەدا لەنامەی ئەعمالیدا دەی بینێتەوەو سزای عادڵانەی لەسەر وەردەگرێتەوە.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ – الأنبياء/٤٧﴾.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (العاديات)

ئەم سورەتە مەککییەو یانزە ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی (العاديات) چونکە پەروەردگار لەسەرەتایدا سوێندی بە (العاديات) خواردووە.

عادیات: بەمانای ئەو ئەسپانەن: کە جەنگاوەران تاویان دەدەن و بەگورجی لە گۆڕەپانی جەنگ لەگەڵ دوژمندا دێن و دەچن.

﴿ وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ۞ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٩﴾ وَحُصِّلَ مَا فِى ٱلصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌۢ ﴿١١﴾ ﴾

دەفـەرموێ: ﴿وَالْعَادِيَـاتِ ضَـبْحاً﴾ سـوێند بـەو ئەسـپانەی کـە جـەنگاوەران هـەلینگیان دەدەن لـە گۆڕەپـانی جەنگـدا بـەتاو دێـن وەدەچـن‌و دەپـرمێنن، هانکـە هانکییانـە ﴿فَالْمُورِيَـاتِ قَـدْحاً﴾ سـوێند بـەو ئەسـپانەی کـە بڵێسـەی ئـاگر لـەژێر سمیانەوە دەردەچێ کاتێ بەپرتاو غـار دەدەن‌و نـاڵ‌و بزمـاری ژێـر سمیـان لەبـەردو شتی ڕەق دەخشێ.

﴿فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحاً﴾ هەڵمـەت بـەرن بۆسـەر دوژمـن لەبەرەبەیانـدا ﴿فَـأَثَرْنَ بِـهِ نَقْعاً﴾ بەو هەڵمەت‌و غاردانە لەبەرەبەیاندا تەپ‌و تۆزیان بـەرپا کـردووە گۆڕەپـانی جەنگیان پڕکردووە لە تەپ‌و تۆزو...

﴿فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعاً﴾ ئەمجار بە هەڵمەت‌و پرتاو خۆیان هەڵداوەتە نـاو کۆمـەڵی دوژمنـەوەو ریـزو کۆمـەڵی دوژمنیـان تـارو مـارو پەرتـەوازە کـردووە، پـەروەردگار سـوێندی بـە ئەسـپ خـواردووە، چـونکە لـەناو پێرۆیانـدا چـەند ڕەوشـت‌و خـووی تایبـەتی تێـدان، ناوچـەوانی خێـرو بەرەکـەتی پێوەیـە، پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَم) فەرموویەتی: «الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَـوْمِ الْقِيَامَـةِ» – رواه احمـد والشيخان.

سوێندی بە ئەو ئەسـپانە خـواردووە: کـە ئـەوە ڕەوشـت‌و خیـصاڵیان بـێ‌و ئـەو کردەوانەیان کردبێ، بەم سوێند پێ خواردنـە لـەپێش چاوی موسـوڵمانان بـەرزیان دەکاتەوەو گرنگیان پێ دەدا.

بۆئـەوەی پـەروەردەیان بکـەن‌و گرنگـی بـدەن بـەڕاگرتن‌و بـەخێوکردن‌و سـوار بوونیان، خۆیان بەسواری ڕابێنن‌و سوار چاکی‌و ڕمبازیی فێـربن. فێـری هەڵمـەت بردن‌و غافڵگیری‌و شـەبەیخۆنکردنی دوژمـن بـبن، ڕابـێن لەسـەر چوسـت‌و چالاکی‌و گورج‌و گۆڵی، بۆئەوەی بتوانن لەڕۆژی تەنگانەداو لەکاتی هێرش هێنانی دوژمناندا بەرگری لە نیشتمان‌و ناموسی خۆیان بکەن‌و بەرپەرچی دوژمنان بدەنەوە، فێـری ڕەوشتی بەرزبین بەژیانی زبر ڕابێن.

بەخۆڕایی نییە پەروەردگار لێرەدا سوێندی بە ئەسپ خواردووەو لە سورەتی (ئەنفال)یش فەرمان بەڕاگرتنی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ – الأنفال/٦٠﴾.

هەڵبەتە ئایینی ئیسلام گرنگی زۆری داوە بە ئەسپ راگرتنو بەخێوکردنیو فێربوونی سوارچاکیو رمبازی کردنو وەرزشکاری، بۆئەوەی موسوڵمانان بە پیرو جوانو ژنو پیاوو دەوڵەمەندو هەژارو خوێندەوارو نەخوێندەواریانەوە هەموویان تێکڕا چوستو چالاکو لەشساغو وەرزشکاربن.

داخی بەجەرگم لەکاتێکدا: کە قورئان ئاوا فەرمانمان پێ دەکا بۆ گرنگی دان بە ئەسپو بەخێوکردنو بەکارهێنانی، لای موسوڵمانان بەگشتیو لای کوردی موسوڵمان بەتایبەتی سواربوونی ولاخە بەرزەو بەخێوکردنو راگرتنی بێ بایەخ بووەو چە گرنگییەکی پێ نادرێ، دیمەنی ئەسپی رەسەنو سواربوونی، مەگەر لە فیلمو شاشەی تەلەفیزیۆندا ببینن، ئەویش بەبایەخەوە تێی نافکرینو سەرنجی نادەینێ، کوردی ئێمە ئەوەندەی گرنگی بەکۆتر بازیو سەگ بەخێوکردن دەدەن نیو ئەوەندە بایەخ بە راگرتنی ئەسپو سواربوونی نادەن، بەڵکوو ئێستا: کەس گرنگی بەسوار چاکی ناداو بیر لە ئەسپ بەخێوکردن ناکاتەوە. ئەوانەی سوار چاکیشیان دەزانی لەبیریان چۆتەوە، وەکوو فۆلکلۆریش وەبیر خۆیانی ناهێننەوە.

﴿إِنَّ الإِنسَانَ لِرَبِّهِ لَكَنُودٌ﴾ بێگومان ئادەمیزاد بەشتی بەرامبەر بە نیعمەتەکانی خودا سپڵەو کافرە، زۆر ئینکارییان دەکا. لەپاساوی ئەو هەموو نیعمەتانەدا: کە خودا پێی بەخشیوە هیچ سوپاسی خودا ناکا، ملکەچی شەرعو یاسا نابێ، بیر لەبونەوەر ناکاتەوە، خودای بیر نایەتەوە، مەگەر کەسانێك نەبێ کە جیهاد لەگەڵ نەفسی خۆیان دەکەنو دونیاو دین بەرچاو دەگرن، ئیتر رودەکەنە خوداپەرستیو ئەنجامدانی کاری باشو خۆیان لەتاوانو خراپەکاری دەپارێزن.

﴿وَإِنَّهُ عَلَى ذَلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ ئادەمیزاد بۆخۆی شایەتە لەسەر کوفرو سپلەیی خۆی، واتە: بەزمانی حاڵ شایەتی لەکوفری خۆی دەدا، لەقسەو کردەوەکانیشیدا

بەئاشکرا کوفرو بێدینی پێوە دیارە، زۆربەی زۆری ئادەمیزاد لەگەڵ کەوتنە خۆشییەوەو خۆی بەبێ ئاتاج زانی بوغرا دەبێو پاشەڕۆژی لەبیر دەچێتەوە، مل لەڕابواردن دەنێ، کردەوەکانی نیشانەی بێدینیو سپڵەیی، وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَاجِدَ الله شَاهِدِينَ عَلَى أَنفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ – التوبة/١٧﴾.

هەندێ لە موفەسیرین لەوانە (قەتادەو سەفیانی ئەوری) دەڵێن: مانای ئایەتی ﴿وَإِنَّهُ عَلَى ذَلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ خودا شایەتە بەسەر سپڵەییو کوفرو خراپەکاری ئادەمیزادەوە ﴿وَإِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾ بێگومان ئادەمیزاد بەهۆی ئەوەوە: کە زۆری ماڵو سامانی خۆش دەوێ رژدو چروکە، هەڵپە بۆ کۆکردنەوەی دەکاو دڵی نایە لێی ببەخشێ، ئاتاجانی لێ بێ بەش دەکا.

﴿أَفَلا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ، وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ، إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَخَبِيرٌ﴾ ئایا ئەوە ئەو ئادەمیزادە بێدینو سپڵەو پێنەزانە نازانێ کاتێك مردوی ناو گۆڕەکان زیندو کرانەوە، ڕازو نیازو مەبەستی شاراوەی ناو دڵەکان ئاشکرا کرا بێگومان پەروەردگاری ئەو مردووە زیندوکراوانە ئاگاداری حاڵو وەزعیانە، هیچی لەباوەڕو کرداری ئەوانە لێ گوم نابێ، بەگوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداشتیان دەداتەوە، بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش ستەمیان لێ ناکا. جا کە ئادەمیزاد ئەم ڕاستییەی زانی پێویستە: کە ماڵو سامان بێ ئاگای نەکا لەسوپاسگوزاری پەروەردگار، تاعەتو خوداپەرستییان لەبیر نەچێتەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (القارعة)

ئەم سورەتە مەککییەو یانزە ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی (القارعة) چونکە بەو وشەیە دەستی پێ کراوە، قاریعە ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت. بەمانا کوتانی دڵەکانە بەتوندی چونکە کارەساتەکانی ڕۆژی قیامەت دڵەکان دەکوتی‌و وەئاگایان دێنێتەوە. دایان دەچڵەکێنێ. هەموو دڵ‌و دەرونێك لەو ڕۆژەدا دەکەوێتە گورە گورو وێرە وێر.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾ قاریعە ناوێکە لەناوەکانی ڕۆژی قیامەت وەکوو (الحاقة)و (الطامة)و (الغاشية...) هتد. وەجهە تەسمییەی قیامەت بەم ناوە لەو

ڕووەوەیە هەرچی دڵ هەیە لەو ڕۆژەدا دادەچڵەکێ.

﴿مَا الْقَارِعَـةُ﴾ دەبێ ئـەو ڕۆژە ڕۆژێـك بـێ؟ ئـاخۆ کارەساتەکانی چۆن بـن؟ واتە: ئەوەندە ڕۆژێکی سامناكو پڕ کارەساتە جگە لەخودا کەس نازانێ چۆنە.

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾ ئەتۆ چوزانی ئـەو ڕۆژە چ ڕۆژێکە؟ واتـە: تـا نـەیبینی نازانی چیە، کە دەشی بینی ئەوەندە سامناکە هەست بەکەمێکی دەکەی.

﴿يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ﴾ ئـەو ڕۆژەی ئادەمیزادەکـان لـەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، بەبێ ئامانجو مەبەست دەسوڕێنەوە، هەریەکەیان ڕوله لایـەك دەکـاو بـەرەو شـوێنێك دەڕوا، دەڵێـی پەپولـەی بڵاوەبـوون، یـان دەڵێـی مێـشولەو کوللـەی پەرشو بڵاون، هەریەکەیان ڕوو لەشوێنێك دەکاو دێنو دەچن سەرگەردانو سـەرلێ شێواوە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ – القمر/٧﴾.

زومەحشەری دەفـەرموێ: خـودا لـەم ئایەتـەدا، ئادەمیزادەکانی شـوبهاندون بـە پەپوله لەزۆریو زەبوونیو زەلیلیـدا لەبڵاوبوونـدا بـۆ هـەموو لایـەك وەکوو چۆن پەپوله بۆلای ئاگر دەفڕێ.

﴿وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ﴾ کێوەکان وەکوو خوری کراوەو بـە شـەکراوو شیکراوەیان لێ دێ بە وزە بایەك بەحەوادا بڵاو دەبێتەوە. وەکوو لە ئایەتێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ – التكوير/٣﴾ یان دەفـەرموێ: ﴿وَالْجِبَـالُ وَكَانَـتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا – الزمل/١٤﴾.

ئـەمجار دوای ڕانوانـدنی ئـەم دوو دیمەنـە سـامناکانە بەمەبەسـتی ترسـاندنی ئادەمیزاد باسی پاداشو سزای یەکە یەکـەیان دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿فَأَمَّـا مَـنْ ثَقُلَـتْ مَوَازِينُـهُ، فَهُـوَ فِـي عِيـشَةٍ رَاضِـيَةٍ﴾ جـا هەرکەسـێك لەتـەرازوی ئەعمالـدا کـردەوە چاکەکانی زۆرترن لەکردەوە خراپـەکانی، ئـەوە دەکەوێتـە ژیـانێکی خۆشـەوە وەهـا لێی ڕازیە هیچ ناگوزریەکی لێی نیە.

﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ، فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ، نَارٌ حَامِيَةٌ﴾ كەسێكیش لەتەرازوی ئەعمالدا خراپەكانی لە چاكەكانی گرانتربن یان كردەوەی چاكی نەبێ، یان شتێكی وای نەبێ بەشت حیساب بێ ئەوە شوێنی حەوانەوەی دۆزەخە، كەشوێنێكی بەهیلاكبەرە، قوڵو گەرمو ئاگردانە، ئەتۆ چوزانی ئەو ئاگرە سامناكەی دۆزەخ چۆنە؟ ئەوە ئاگرێكی زۆر گەرمو لەڕادەبەدەر سوتێنەرە. بڵێسەدارو ترسناكە، لەهەموو ئاگرێكی تر گەرم ترە. زۆر فەرموودە دەربارەی گەرمی ئاگری دۆزەخ ریوایەت كراون.

مالیكو بوخاریو موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەكەن، دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: «نَار بَنِي آدَمَ الَّتِي تُوقِدُون جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نار جحيم». هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ ئەم گەرمییەی ئێستا بەس نییە بۆ سزادان؟ پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: «إِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا». بێگومان ئاگری دۆزەخ نەوەدو نۆ پلە لە ئاگری دۆزەخ گەرمترە.

ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) ریوایەت دەكا، كە دەفەرموێ: «هَذِهِ النَّارُ جُزْءٌ مِنْ مِئَةِ جُزْءٍ مِنْ جَهَنَّمَ». ئەم ئاگرەی ئێوە بەشێكە لەسەد بەشی ئاگری دۆزەخ.

هەر ئیمام ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: «ان أَهْوَنُ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً: مَن لَه نَعْلاَنِ، يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ». سوكترین ئەهلی دۆزەخ لەرووی عەزابەوە كەسێكە دوو نەعلی ئاگری لەپێ كراون مێشكی دەكوڵێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (التكاثر)

ئەم سورەتە مەككییەو هەشت ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی (التكاثر) چونكە لەسەرەتایەوە دەفەرموێ: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ﴾ لەم سورەتەدا پەروەردگار هەندێ روداوو دیمەنی سامناكی رۆژی قیامەت رادەنوێنێ، پاداشی بەختەوەران‌و سزای بەدبەختان دیاری دەكا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ، حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ﴾ شانازی كردن بە ماڵ‌و منداڵ‌و دارو دەستەی زۆرتان ئێوەی بێ ئاگا كرد لەخودا پەرستی، هەڵێنان بۆ هەڵپەكردن بۆ كۆكردنەوەی ماڵ‌و سامان‌و هەبوونی خێزان‌و منداڵ‌و پەیداكردنی دارودەستە، ئێوەی لە بەندایەتیكردن بۆ خودا غافڵ كرد، هەتا مردن لەنكاوی یەخەی گرتن تێكیەوە پێچان‌و بەرەو گۆڕستان رۆیشتن.

بوخاریو موسلیمو تیرمیزیو نەسائی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (صلی اللهُ علیهِ وسلم) فەرمووی: «يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثَـةٌ ، فَيَرْجِـعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ ، يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ ، وَيَبْقَى عَمَلُهُ».

زیارەتکردنی گۆڕستان دەرمانێکی کاریگەرە بۆ دڵە ڕەقەکان. چونکە قیامەت بیر ئادەمیزاد دەخاتەوە، دونیا لەپێش چاو بێ بایەخ دەکا. لەڕوانگەی ئاینییەوە زیارەتکردنی گۆڕستان موباحە بەمەرجێك دیدەنی کردنەکە بەگوێرەی شەرع بێ؛ بەم ڕەنگە: کەدەچی بۆ دیدەنی لای سەری گۆڕەکە راوەستێو سڵاو لە مردوەکە بکە، ئەمجار روبکاتە قیبلەو لەخودا بپاڕێتەوە داوای لێخۆشبوون بۆ مردووەکەو بۆ خۆیو موسوڵمانان بکا.

زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە کە زیارەتکردنی گۆڕستان بۆ پیاوان حەڵاڵە: بەڵام دەربارەی ئافرەت کەوتوونە راجیاییەوە: بۆ ئافرەتی گەنج یاساغە، بۆ پیرە ژنو ئافرەتی بەساڵاچوو موباحە. ئەگەر ئافرەت چ گەنجو چ بەساڵاچوو بۆ خۆیان بەبێ ئەوەی تێکەڵاوی پیاوی نامەحرەم بن بچن بۆ دیدەنی گۆڕستان قەیناکا. ئەگەر ترسی فیتنەیان بوو لە تێکەڵاو بوونیان بە پیاوان ئەوە دەرچوونی ئافرەت بۆ گۆڕستان حەرامە.

ئیبنو ماجە لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (صلی اللهُ علیهِ وسلم) فەرمووی: «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوا الْقُبُورَ فَإِنَّهَا تُزَهِّـدُ فِـي الدُّنْيَا وَتُذَكِّرُ الآخِرَةَ»[١].

حاکم لە صەحیحەکەیدا لە ئەنەسەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (صلی اللهُ علیهِ وسلم) فەرمووی: «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، إلا فَزُورُوهَا، فَإِنَّهَا تُرِقُّ الْقَلْبِ وَتُدْمِعُ الْعَيْنَ وَتُذَكِّرُ الآخِرَةَ، وَلاَ تَقُولُوا هُجْرًا».

[١] رواه ابن ماجة في (٦) كتاب الجنائز (٤٧) باب ماجاء في زيارة القبور (الحديث: ١٥٧١) .

ئەم حەدیثانە بەڵگەن لەسەر ئەوە: کە هەرکاتێ دیدەنی کردنی ئافرەتان بۆ گۆڕستان فیتنەیێ لێ چاوەڕوان دەکرا، بەم جۆرە شینو شەپۆڕی تێدابوو، یان پیاوو ئافرەت تێکەڵاو دەبوون ئەوە زیارەتەکە حەرامە[٢].

﴿كَلاَّ سَوْفَ تَعْلَمُونَ، ثُمَّ كَلاَّ سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ وانیە، ئێوە بەهەڵە چوون، نەدەبوو ئەوەندە کۆڵ بە دونیاوە هەڵبگرن ئەو هەڵپە بکەن بۆ ماڵ کۆکردنەوەو خۆ دەوڵەمەندکردنو لێ نەبەخشینی، کە ئەوە سەردەکێشێ بۆ لێك دابڕانو رق لێك بوونو دژایەتی کردنی یەکتریو لەبیرچوونەوەی قیامەتو سەرەنجام خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت دەبن، ئێوە سەرەنجامی ئەو هەڵوێستو کردەوانەتان رۆژی قیامەت بۆ دەردەکەوێ، پاشان جارێکی تر پێتان دەڵێین: وانیەو ئێوە بەهەڵەچوون لەوە بەولاوە رۆژی قیامەت دەزانن.

﴿كَلاَّ لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ﴾ واز لەو حاڵەتە بێ ئاگاییو خۆ غافل کردنە بێنن، بێگومان ئەگەر ئێوە بەدڵنیایی بزانن بۆ کوێ دەچنو چیتان بەسەردێ، دونیاتان پاشگوێ دەخستو گرنگیتان بەقیامەت دەداو وازتان لەماڵ کۆکردنەوەو هەڵپەکردن بۆ زۆرکردنو سەریەکنانی دەهێنا.

﴿لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ﴾ بێگومان ئێوە لەقیامەتدا ئاگری دۆزەخ دەبینن سزای بەئێشی دەچێژن. ئاگرێکتان چاو پێ دەکەوێ: کە هەرکاتێ نرکەو ناڵەیەکی لێ دێ هەموو فریشتە نزیکەکانی بارەگای ئەقدەسو هەموو پێغەمبەرەکان بەچۆکا دێن لە ترسو سامو دیمەنی ئەو دۆزەخە: کە ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی.

﴿ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ﴾ پاشان بە تەئکید ئێوە دۆزەخ بەچاوی یەقین دەبینن، هیچ شكو گومانتان تێیدا نابێ، دەی خۆتانی لێ بپارێزن، هەڵوێستێك مەنوێننو کارێك مەکەن شیاوی ئەو دۆزەخەبن، بەدەستی خۆتان خۆتان تووشی ئەو شوێنە مەکەن.

---

[٢] تەفسیری طەبەری ج ١٠/١٢٣ (٥٥٣٩) طبعة دار الفكر.

﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ بێگومـان ئێـوه لـەوەدوا پرسـیارتان لێ دەكـرێ دەربارەی ئەو نازو نیعمەتەی لـە قیامـەتی بـێ ئاگا كـردوون پرسـیارتان لێ دەكـرێ دەربارەی هەموو نازو نیعمەتێكی پێتان دراوە وەكوو لەشساغیو ئارامیو خـواردنو خواردنەوەی خۆشو هەموو نازو نیعمەتێكی تر.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەوانەی پرسیاریان لێ دەكرێ كافرەكانن هەندێكی تر دەڵێن: پرسیارەكە ئاراستەی موسوڵمانانو كافرە دەكرێو هەموو كەس دەگرێتـەوە. بەڵگەیان ئەو فەرموودەیە لە عومەرەوە ریوایەت كراوە: كە پرسیاری لە پێغەمبـەر كرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەچ نازو نیعمەتێك پرسیارمان لێ دەكرێ ئەوەتا ئێمە لە ماڵو حاڵی خۆمان دەركراوین، پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَیْهِ وسَلم) فەرمووی: سێبەری خانوو سێبەری درەختو خێمە: كە لەسـەرماو گـەرما دەتانپـارێزن، ئـاوی سارد لەرۆژی گەرمادا.

لە صەحیحی بوخاریو سونەنی تیرمیزیو نەسائیو ئیبنـو ماجە، لـە ئیبنـو عەباسەوە ریوایەت دەكەن، دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلَیْهِ وسَلم) فـەرمووی: «نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ ، الصِّحَّةُ وَالْفَـرَاغُ». دوو نیعمـەت هـەن زۆربـەی ئـادەمیزاد تێیانـدا خەسـارەتمەندن، لەشـساغیو دەسـت بـەتاڵی، واتـە: ئـادەمیزاد بەرامبـەریان كەمتەرخـەمن، ئـەركی سەرشـانی خۆیانیـان تێـدا بـەجێ نـاهێنن، ئەوكاتـە زێرینـەی لەبـەر دەسـتیاندایەو ئـەو لەشـساغییەی خـودا پێـی داون لـە تاعەتو خودا پەرستی دا بەكاری ناهێنن، كەواتە زەرەرمەندن.

تیرمیزی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبـەر (صَلی اللهُ عَلَیْـهِ وسَلم) فەرمووی: «لاَ تَزُولُ قَدَمَا العبد يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أربَع، عَنْ عُمْـرِهِ فِـيمَ أَفْنَاهُ وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَعَنْ عَمَلَـه مَـاذا عَمِـلَ به». رۆژی قیامەت دوو پێی ئـادەمیزاد لەشـوێنی خـۆی ناجوڵـێ هـەتا لەچوار شت

پرسیاری لێ نەکرێ. لەتەمەنی لەچیدا سەرفی کردووەو لەچیدا خەرجی کردووە، لەزانیاری خۆی چۆنی کار پێ کردووە.

له فەرموودەیەکی تردا بوخاریو تیرمیزیو ئیبنو ماجە له عوبەیدوڵلای کوڕی موحصین ریوایەتیان کردووە، دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: «مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا بحذافيرها». کەسێك لەنێوە بەیانی لێ بووەوە لەناو خاوو خێزانی خۆیدا دڵ ئارام بوو، لەشساغ بوو، بژێوی ئەو رۆژەی هەبووە ئەوە بابزانێ دونیا هەمووی هی ئەوە...

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (العصر)

ئەم سورەتە مەککییەو سێ ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی (العصر) چونکە لەسەرەتاکەیدا سوێندی بە (العصر) خواردووە. کە بریتییە لەڕۆژگار، واتە: زەمان بەگشتی کەپڕە لەرووداوی عەجائیبو سەرسوڕهێنەرو هەموویان نیشانەی دەسەڵاتو کار دروستی پەروەردگارن.

﴿وَٱلْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِي خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿وَالْعَصْرِ، إنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾ سوێند بە رۆژگار کە بەسەر ئادەمیزاددا تێپەڕ دەکاو پڕە لەرووداوو گۆڕانکاریو هەڵەوگێڕ کردنن گۆڕانی شەو رۆژ، هاتنی تاریکیو نەمانی روناکیو بە پێچەوانەوە، گۆڕانی روداوو هەڵوێستو

حـاڵو ئـەوزاعی فـەرمانڕەواو دەسـەڵاتی پاشـاو فـەرمانڕەواکان، کـە هـەموویان نیشانەی هەبوونی خودای تاکو تـەنهاو خـاوەن دەسـەڵاتی رەهاو بـێ سنورن. یـان سوێند بەکاتی عەصر کە کاتێکی پیرۆزە.

پەروەردگار سوێندی بەکات خوارد، چونکە کـات لەهـەموو شـتێك بـەنرخترە، بەڵکوو ژیان خۆی زنجیرەیەکە لەکات، هەرکەسێك کات بـەفیڕۆ بـدا خەسـارەتمەندە، ئەوەی هەل لەکیسی خۆی نەدا سەرکەوتوو بەختەوەرە، هەر ساتەوەختێك لـەژیان تێدەپەڕێ گەڕانەوەی نیە، عاقڵ ئەو کەسەیە نەهێڵێ کاتی بەفیڕۆ بڕوا کاری باشی تێدا ئەنجام بداو سود بەخۆیو گەلو وڵاتی بگەیەنێ.

زۆرجار واڕێ دەکەوێ هەوڵدانی تاکە کەسێك یـان کۆمـەڵێك دەبێتـە خێـرو بێـر بـۆ گـەلو وڵاتو جـەماوەرێکی زۆرو بـەرفراوان لـە سـێبەریا دەحەسـێتەوە، بەپێچەوانەشەوە کەمتەرخەمی لێپرسـراوو زانایـەك یـان کۆمـەڵێك دەبێتـە مایـەی نەگبەتیو لەدەستدانی خێرو بێرێکی زۆر بۆ گەلو وڵات، دوایی دەریایەك خـوێنو ئـارەقی بـۆ دەرێـژرێ تـا بـەنیوە چـڵی دەسـت دەکەوێتـەوە، کوردی واتـەنی بـەردێ نەزان بیخاتە گۆمەوە بەسەد زانا دەرناهێنرێتەوە.

بەکورتی کـات زۆر بەنرخـەو بـەفیڕۆدانی تاوانـە، هـەموو شـتێك کـە لـەکیس چـوو قـەرەبوو دەکرێتـەوە جگـە لـەکات؛ کـە لـەکیس چـوو ناگەڕێتـەوە لەبـەر ئـەو گرنگیو بەنرخییەی کاتە؛ کەخودا سوێندی پـێ خـواردووەو جـەختی لەسـەر ئـەوە کردۆتەوە؛ کەهەموو ئادەمیزاد بەگشتی لە خەسارەتمەندیو گومڕاییو فەوتان دان، خەریکی هەڵپـەی مـاڵ کۆکردنـەوەو دونیـا خـواردنن، بـەدونیاوە هەڵەوگیر بـوونو پشتیان لەقیامەت کردووە.

﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَـوْا بِـالْحَقِّ وَتَوَاصَـوْا بِالـصَّبْرِ﴾ مەگـەر ئەوانەیان نەبێ: کە خاوەنی بڕوای پتەوو کردەوەی چاکن، وێڕای ئیمانی دامەزراو، کـرداری چـاکیش دەکـەن، ئەوانـە خەسـارەتمەند نـین، چـونکە ئەوانـە دونیایـان بەکارهێناوە بـۆ قیامـەت، ئـەوازیان لـەدونیا هێنـاوە ئەپـشتیان لەقیامـەت کـردووە،

هەروەها ئەوانەش کە ئامۆژگاری یەکتر دەکەن: کە بەردەوامن لەسەر حەقو حەقخوازی کە بریتییە لە یەکتاپەرستیو پابەندبوون بە شەریعەتی خوداو دوورە پەرێزی لەهەرشتێك نەی لێ کراوە، بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیانو خۆپاراستن لە حەرام.

هەروەها ئەوانەش کە هەندێکیان ئامۆژگاری هەندێکی تریان دەکەن، بە بەردەوامبوون لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارانەی خودا لەسەری فەرزکردوونو خۆپاراستنو دوورکەوتنەوە لە تاوانو سەرپێچی کردنی فەرمانی پەروەردگار، صەبرگرتن لەسەر ئەنجامدانی تاعەتو خوداپەرستیو پشوو درێژی بەرامبەر بەلاو موصیبەت. خۆڕاگری بەرامبەر ئەوانەی بەگژیاندا دەچنەوە لەسەر فەرمان بە چاکەو نەهی لەخراپە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الهمزة)

ئەم سورەتە مەکییەو نۆ ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی (الهمـزة) چونکە سەرەتای سورەتەکە بە ئایەتی ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ﴾ دەستی پێ کردووە، (الهمـزة) بەو کەسە دەڵێن: پاشملە غەیبەتی ئادەمیزادێك یان کۆمەڵێك بکا، بەقسە یان بە کردەوە یان بەئاماژە تانەیان لێ بدا (الهمـزة) بەو کەسە دەگوترێ: بە ئاماژەکردن بەچاو یان برۆ ڕەخنە لەکەسێکی تر بگرێ.

موقاتیل دەڵێ: ئەم سورەتە دەربارەی (الولیـد)ی کوڕی (المغیرة) نازڵ بووە، چونکە زۆری پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسلم) ناخۆشدەویست، بەئاشکراو بەنهێنی غەیبەتی دەکرد، هەندێکی تر دەڵێن: دەربارەی ئوبەی کوڕی خەلەف نازڵ بووە، چونکە ئەویش هەڵوێستی (الولید)ی هەبووە.

(السدی) دەڵێت: دەربارەی ئەخنەسی کوڕی شورەیق نازڵ بووە، ئەوەبوو ئەم ملۆزمە سەر ڕەقە پاشملە غەیبەتی پێغەمبەری دەکردو بەچاوو برۆ تانەی لێ دەدا، هەندێکی تر دەڵێن: دەربارەی کەسانی دیکە نازڵ بووە، دەتوانین بڵێین: دەربارەی هەموو کەسێك نازڵ بووە، کە ئەو ڕەوشتانەی تێدابن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ٢ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ٣ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ٤ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ٥ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ٦ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ٧ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ٨ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ٩﴾

﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ﴾ ریسوایی‌و عەزابی دۆزەخ بۆ هەموو ئەوانەی پاشملە باسی ئادەمیزادانی تر دەکەن بەشێوەیەکی ناشیرین‌و لەڕێز داگرتنیان، یان ڕوبەڕوو تانەیان لێ دەدەن، موقاتیل دەفەرموێ: (الهمزة) ئەو کەسەیە پاشملە تانەو تەشەر لەکەسانی دیکە دەدا، (لمزة) ئەو کەسەیە ڕوبەڕوو تانەو تەشەر لەخەڵك دەدا.

﴿الَّذِي جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ﴾ ئەو تانەو تەشەردەرەی گاڵتە بەخەڵکی دی دەکاو خۆی بەسەریاندا هەڵدەنێتەوەو بەخۆی دەنازێ‌و شانازی بەوەدەکا: کە ماڵ‌و

سامانی کۆکردۆتەوەو دەیژمێریّو لێکی دەداتەوەو پێکی دەگریّ، پێی وایە: ڕێزو نرخی لەکەسانی دیکە زیاترە چونکە دەوڵەمەندە.

﴿أَيَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ﴾ پێی وایە: ئەو ماڵو سامانەی کۆی کردۆتەوەو سەریەکی ناوە نەمری دەکاو مردنی لیّ دوور دەخاتەوە؟ ئەوەندەی دڵ بەماڵو سامانەکەی خۆشە هەرگیز بیر لەمردن ناکاتەوە، ﴿كَلَّا﴾ نەخەیر با وانەزانیّ، با وازبێنیّ لەو بیروباوەڕو هەڵوێستەی.

﴿لَيُنْبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ﴾ بە تەئکید ئەو دەم شڕو دل پیسە دونیا ویستە ماڵ کۆکەرەوەیە تووڕ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە خۆیو ماڵو سامانی فڕیّ دەدرێتە ناو ئاگرەوە، ئاگرێك هەرچی تێی فڕیّ دریّ وردوخاش دەبیّو بەسەریەکدا دەترشیّ.

﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ﴾ ئەتۆ چوزانی (حوطەمە) چییە؟ کەی تۆ دەزانی ئەو ئاگرە وردوخاشکەرە چیەو چۆنە؟

﴿نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ﴾ ئەوە ئاگرێکە بەفەرمانی خودا هەڵگیرساوە، هەرگیز کوژانەوەی نیەو قەت دانامرکیّ، شیاوی ئەو خۆ بەزلزانو لوتبەرزانەیە، ئەو ئاگرە ئاگرێکە جوداوازە لە ئاگری ئاساییو هەرچی تێی فڕیّ دری دەیهاڕیّ.

﴿الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ﴾ ئاگرێکی وەهایە هێرش دەباتە سەر دڵەکان، ئەو دڵانە دادەپۆشیّ: کە کانگای کوفرو فیزو چروکین، بەزیندوویی دڵەکان دەسوتێنیّ، بەتایبەتی ناوی دڵەکانی هێنا چونکە شوێنی بیروباوەڕی فاسیدو نیازی پیسو کانی ڕەوشتی ناشیرینو کردەوەی خراپن، هەروەها چونکە ئەندامێکی زۆر ناسکو حەساسە لەجەستەی ئادەمیزاددا بەپچوکترین ئازار ئێشی زۆری پیّ دەگا.

﴿إِنَّهَا عَلَيْهِمْ مُؤْصَدَةٌ﴾ ئەو ئاگرە بەسەریاندا زاڵەو لەناوخۆی گرتوون، دەرگاکانی دۆزەخیان لەسەر گاڵ دراوە، هیچ پەنجەرەو کونو کەلەبەریان لەسەر ناکرێتەوە، بەهیچ جۆرێك دەرەتانی ڕزگاربونیان نیە.

وەكوو لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌ - البلد/٢٠﴾ یان دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا - الحج/٢٢﴾.

وێڕای ئەوەش هەموویان شەتەك دەدرێن بەچەند كۆڵەكەیەكی درێژ كراوەوە؛ لەهەموو لایەكەوە بەو كۆڵەكە ئاگرینانە دەورە دراون.

موقاتیل دەڵێ: ئەو بەدبەختانە دەرگای دۆزەخیان لەسەر دادەخرێن ئەمجار بە كوتو زنجیری ئاسنین دەبەسترێنەوە، نە دەرگایان لێ دەكرێتەوە، نە هەوایان بۆ دێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الفیل)

ئەم سورەتە مەككیەو پێنج ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی (الفیل) چونكە لەسەرەتای سورەتەكەدا باسی چیرۆكی ئەصحابولفیل دەكا.

### رونكردنەوەیەكی مێژوویی:

هەمیشە مەككە رێزو نرخێكی بەرچاوی لای عەرەبەكان هەبوو، چونكە ساڵانە عەرەبەكان لەهەموو لایەكەوە بەناوی حەجكردنی كابە زیارەتی مەككەیان دەكرد، ئەوشارە بوو بووە قیبلەی عەرەبەكان بەگشتی، رۆڵێكی گرنگی هەبوو لەبەرزكردنەوەی باری ئابووریو رامیاری عەرەبە قورەیشیەكان بەرێزەوە سەیریان دەكرد، ئەم دیاردە سەرنجی زۆر كەسی راكێشاو كەوتنە بیركردنەوە بۆئەوەی هۆیەك رێك بخەن ئەو خەڵكە لە مەككە بتەكێننەوەو بۆلای خۆیانی كێش بكەن. لەم روانگەوە غەساسینەكان لەوڵاتی (حیرة) خانوویێكیان بنیات نا بۆئەوەی بیكەنە جێگای حەجكردنو زۆر چاوەڕوانیشیان بۆ كرد بەڵام كەس گوێی پێ نەدا.

لەو رۆژگارەدا یەمەن لەژێر دەستی حەبەشیەكاندا بوو، سەركردەیەكی حەبەشی كە ناوی (ئەبرەهە) بوو لەلایەن نەجاشیەوە نێردرابوو بۆ

فەرمانڕەوایی‌و بەڕێوەبردنی وڵاتی یەمەن، ئەبرەهە هەستی بە گرنگی کەعبە کردو زانی کە قورەیشییەکان بەهۆی ئەم حەج‌و کۆبوونەوەی ساڵانە، لەڕوی ئایینی‌و ئابووری‌و رامیاری... هتد. ڕێزو نرخێکی بەرچاویان دەست دەکەوێ. ئەمەش تەواو ئەبرەهەی تەنگەتاو کرد، بۆیە ویستی ئەم شکۆمەندییە هەمەلایەنە لە قورەیشییەکان داگیر بکا.

ئەوەبوو کەنیسەیەکی گەورەو سەرنج ڕاکێشی لە یەمەن بنیات نا، ویستی سەرنجی عەرەبەکان لە کەعبە لابداو رویان پێ بکاتە کەنیسەی تازە بنیات نراو وابکا ساڵانە لەجیاتی حەجکردن بۆ کابە، حەجی کەنیسەی یەمەن بکەن، زۆری پڕوپاگەندە بۆ کرد بەڵام بێ سوود بوو، عەرەبەکان بەگشتی‌و عەرەبەکانی یەمەنیش ڕویان نەکردە کەنیسەکەی ئەبرەهە، وتیان: کەعبە دروستکراوی باوو باپیرانیانەو دەست بەرداری نابن، وەکوو لەهەندێ داستاندا هاتووە یەکێك لەعەرەبەکان بەدزیەوە چووە ناو کەنیسەکەو پیسای تێ کرد.

گوێ پێنەدانی عەرەبەکان بە کەنیسەکەی یەمەن‌و پیسای تێکردنی کابرای عەرەب، کاری کردە سەر دڵ‌و دەرونی ئەبرەهەو بڕیاریدا سوپایەکی بێ شومار کۆبکاتەوەو بچێتە سەر مەککەو کابە بڕوخێنێ، سوپایەکی گەورەی ڕێکخست‌و کۆمەڵێ (فیل)یشی خستنە پاڵ سوپاکە، بۆ خۆیشی سواری یەکێ لە فیلەکان بوو بەرەو مەککە سوپای خستەڕێ، بیستنی ئەم هەواڵە بوو بەکابوسێك‌و جیهانی عەرەبی داگرت، بەتایبەتی قورەیشییەکانی خستە بارودۆخێکی ناهەموارەوە، ترسی ئەوەیان لێ نیشت: کە ئەو ڕێزو نرخەی بەهۆی کابەوە هەیانە لەکیسیان بچێ (امتیازات) پێشوویان نەمێنێ!

(ذونفر): کە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی عەرەب، لەیەمەندا بەناو عەرەبەکاندا گەڕاو دەستی کرد بەهاندانیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئەبرەهە، بەڵام چونکە سوپای ئەبرەهە زۆرو بێ شمار بوو چییان بۆ لەگەڵ نەکرا نەفیلی کوڕی حەبیبی خوثعەمی: کە ئەمیش یەکێك بوو لە پیاو ماقوڵانی عەرەب،

لەشـكرێكی پێكـەوەنا بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی ئەبرەهـە، بـەڵام ئـەمیش خـۆی بـۆ نەگیراو لەشكرەكەی شكاو بۆ خۆشی بەدیل گیرا، پاشان بوو بەچاو ساغی لەشكری ئەبرەهە.

سوپای ئەبرەهە هات گەیشتە (مەغمەس) لـەنزیك مەككە، مەفرەزەیـەكی نـارد ئـاژەڵی قـورەیش‌و تیرەكـانی تریـان كـۆكردەوەو هێنایـان دووسـەد حوشـتری عەبدولموتەلیب بـەر ئـەم چەپاوكردنە كەوتن. لەهەمان كاتـدا ئەبرەهـە پیـاوێكی خۆی نارد بۆلای قورەیشییەكان تێیان بگەیەنێ: كە بۆ شەڕ نـەهاتوون، تـەنها كابـە دەروخێنن‌و دەگەڕێنەوە، با خۆیان تووشی مەینەتی‌و خوێن ڕێژی نەكەن.

پاش راوێژو لێكۆڵینەوە قورەیشییەكان بەسەرۆكایەتی عەبدولموتەلیب هاتنـە سـەرئەوە كـە بـەرەنگاری ئەبرەهـە نەبنـەوە، عەبدولموتـەلیب لەگـەڵ پیاوەكـەی ئەبرەهـەدا رۆیـی بـۆلای ئەبرەهـە زۆر ڕێـزی لـە عەبدولموتـەلیب گـرت‌و وتـی: چ داوایەكت هەیە؟ ئەویش وتی: حوشترەكانم بدەنەوە ئەبرەهە وتـی: كـە چـاوم پێـت كەوت زۆر بەگەورە هاتیە بەرچاوم. بەڵام بەم داوایـەت پـێش چـاوم كـەوتی، ئـەمن هـاتووم كەعبـە بـڕوخێنم كـە رەمـزی شـكۆمەندی‌و جێگـەی بیروبـاوەڕی خۆتـان‌و باوك‌و باپیرانتانە، كەچی داوای مەرەخەسكردنی چەند حوشترێكم لێ دەكەی پێتان بدەمـەوە؟ عەبدولموتـەلیب وتـی: بـەڵێ مـن خـاوەنی حوشـترەكانی خـۆمم‌و داوایـان دەكەمـەوە، كەعبـە خـاوەنێكی هەیـە دەیپـارێزێ، ئـیتر حوشـترەكانیان پێدانـەوەو گەڕانەوە بـۆ مەككـە، دەنـگ‌و باسیان بـۆ دانیـشتوانی مەككـە گێڕایـەوە، داوایـان لێ كردن شار چۆڵ بكەن‌و ماڵ‌و منداڵ‌و خۆیان لەو ئاگرە بەدوور بگرن.

قورەیشییەكان ماڵ‌و منـداڵیان لـە مەككـە دورخـستنەوەو خۆیـان قـایم كـرد، ئەبرەهەش هێرشی خۆی دەست پێ كردو فیلەكانیان خستە پێشەوە، بەرەو كەعبە كەوتنـە رێ. فیلـە گـەورەكانیان كـە پێـشەنگیان بـوو، مـانی گـرت‌و خـۆی كوتـا بـە زەویدا، هەرچی هەوڵیان لەگەڵدا بێ سود بوو، رویان پـێ لەمەككە وەرگێـڕا كەوتـە رۆیشتن، رویان پێ لەكەعبە كردەوە مانی گرتـەوە سـوپا حـەوق بـوو پێـشڕەوی بـۆ

نەکرا، بەڵام هەر سور بوو لەسەر ڕوخاندنی کەعبەو چاوەڕێی ئەوەبوون فیلەکە بکەوێتە ڕێو واز لەمانگرتنەکە بێنێ.

ئالەم کاتەدا خەشمو قینی خودا کەوتە کارو گیاندارێکی بێ هێزو لاوازی بەکارهێنا بۆ لەناوبردنیان، پۆل پۆل باڵندەی (ئەبابیلە)ی ناردە سەریانو بەردی تێکەڵاو لە (گڵو بەرد)یان بەدەنووکەوە بوو پەیتا پەیتا بەردەبارانیان کردن، ئەو سوپا زۆرەی ئەبرەههەیان تارومار کردو وایان لێ کردوەکوو کای خوراوو گەڵای داری وشکی کونکونیان لێ هات، هەموویان لەناو چوونو کەسیان لێ قوتار نەبوو. ئەبرەهە بۆخۆی بریندار بوو بە پەرێشانی بردیانەوە بۆ یەمەن، بەڵام جەستەی پیسی بەرەبەرە دەڕزیو پارچە پارچە هەڵدەوەری، هەتا گەیاندیانە (صەنعا) لەوێ پێش ئەوەی گیانی دەربچێ سنگی لەت بوو جەرگو دڵی هاتنە دەرەوە، بەم تێشکانو تێداچوونەی سوپای ئەبرەهە کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەمێژووی عەرەبدا، ئەوەندەی تر قورەیشییەکان ڕێزیان پەیدا کرد، وتیان: ئەوانە خودایان لەگەڵەو خودا دوژمنەکانی لەناو بردن، هێندەی تر کەعبەیان لەلا پیرۆز بوو، پەروەردگار ویستی بەم ڕوداوە کابە لەبەرچاوی عەرەبەکانو دونیا گەورە بکا، ڕێ خۆش بکا بۆ ناردنی حەزرەتی موحەممەد لەناویانداو بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لەسەر دەستی ئەوان...

ئەم ڕوداوە گرنگە هاوزەمان بوو لەگەڵ لەدایکبوونی حەزرەتی موحەممەد (د.خ) ساڵی (٥٧٠)ی زاینی واتە: ماوەی نێوان ساڵی فیلو ناردنی نیگا بۆ پێغەمبەری ئیسلام چل ساڵ بوو، ئەو دەمەی حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) پەیامی خۆی ڕاگەیاند زۆرێك لەو قورەیشییانە لەژیاندا بوون، کە بەچاوی خۆیان ڕوداوی (فیل)یان دیبوو، بەچاوی خۆیان ئەو باڵندانەیان دیبوو یان بەتەواتورو شێوەیەکی بەربڵاو بیستبوویان هەربۆیە کە ئەو سورەتە نازڵ بوو عەرەبەکان هیچ لەو بارەوە ڕەخنەیان نەبوو خۆ ئەگەر تۆزقاڵێك ڕێگەیان ببوایەو کاتی خۆی ئەو باڵندانەیان نەبینینایە، دونیایان پڕ دەکرد لە گاڵە گاڵ دژی

پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم)و جۆرەها ڕەدو بەرهەڵستكاری پێغەمبەریان دەكردو لێیان دەكردە هەڵلاو دەیانگوت: باڵندەی چیو بەردی (سجيل) چی؟

بەڵام لەم بارەوە نەزۆرو نەكەم قورەیشییەكان نقەیان لێ نەهاتووە، ئەمجار ئەم لەناو بردنەی سوپای ئەبرەههیە باڵندەبوو بێ بەردبارانیان كردبن، یان بەهۆی میكرۆبو ئاوەڵەبوونی وەكوو هەندێ لەموفەسیرینی تازە نووسیویانە، هەر موعجیزەیەو خودا شاری مەككەو كەعبەی پیرۆزی لەدەستی ئەو ستەمكارە پاراستو دوژمنانی ماڵی خۆی تەفروتونا كردن دەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ۝١ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ۝٢ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ۝٥﴾

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ﴾ ئەتۆ نازانی ئەی محمد! بەزانینێكی تەواوو بێ پەردە وەكوو ئەوە بۆ خۆت ئاگاداری ڕوداوەكە بووبی، خودای تۆ چی بە ئەبرەههەو لەشكری زۆرو بێ شماری كرد كە برێ فیلیان پێ بوو بۆ ڕوخاندنی كابە. نازانی چۆن تارومارى كردنو كەعبەی پاراست لەنیازو مەبەستی ئەبرەههەو لەشكرەكەی؟

﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ﴾ ئایا پیلانو نەخشەكەیانی هەڵنەوەشاندنەوە؟ واتە: ئەتۆ نازانی كە خودای تۆ مەكرو پیلانی ئەبرەههەو سوپاكەی بۆ ڕوخاندنی

کابەو چەوساندنەوەی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری پووچ کردەوەو ئەوەی دەیانویست بۆیان نەهاتە جێ، نەیانتوانی بگەنە کەعبەو بیڕوخێنن، بەڵکوو خودا تارومارى کردن‌و ئاسەوارى بڕینەوە.

دەی گەلەکەی تۆ ئەی محمد! کە ئەمە دەزانن ئاگایان لەهەواڵ‌و بەسەرهاتی ئەبرەهەو لەشکرەکەی هەیە با بترسن لەوەی کە خودا بەسزایەکی هاوچەشن ئەوانیش لەناو بەرێ ئەگەر سەرپێچی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بکەن.

﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْراً أَبَابِيلَ، تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ﴾ ئەوەبوو پەروەردگار چەند پۆلە باڵندەیەکی ڕەشە ڕەشەی، لەلای دەریاوە ڕەخساند، کۆمەڵ کۆمەڵ هێرشیان هێنایە سەر سوپای ئەبرەهە، هەریەکێك لەو باڵندانە سێ بەردی هەڵگرتبوو دانەیەك بەدەنوکی‌و دوو دانەشی بەقاچەکانیان، بەچڕی بەردەبارانیان کردن، هەربەردێك کە پێیان دەکەوت یەکسەری لەتەوقی سەریانەوە تا ناوسکیان دادەڕزاو دادەوەشا!

ئەو بەردانەی باڵندەکان بەردەبارانی سوپای ئەبرەهەیان پێ کرد، قوڕی ڕەقەڵاتو بوو، بە ئەندازەی نۆك‌و لە نیسك گەورەتر بوون، ڕێی هەر کەسێك بکەوتنایە جەستەیان دادەڕزاو گیانیان دەدا!!

﴿فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَأْكُولٍ﴾ پەروەردگار وەکوو کای خوراوی لێ کردن، وەکوو خۆراکی ئاژەڵ کە هەزمی کردبێ‌و دەری دابێتەوە.

مامۆستا سەید دەفەرموێ: ڕیوایاتی جۆراوجۆر هەن دەربارەی دیاری کردنی ئەم پۆل پۆلە باڵندانەو شکڵ‌و قەبارەیان‌و قەبارەی ئەو بەردانەی بەکاریان هێناو جۆری بەردەکان‌و کاریگەرییان، هەروەکوو چۆن هەندێ ڕیوایەت هەن ئەوە دەگەیەنن کە ئاوڵەو خڕوێلکە لەو ساڵەدا لەمەککەدا پەیدابوون، ئەوانەی دەیانەوێ چوارچێوەی خاریقەو غەیبیات تەسك بکەنەوەو هەموو شتێك لەو جۆرە غەیبیات‌و خاریقولعادانە بگێڕنەوە بۆ باوو یاسا کەونییەکان کە خودا لەم بوونەوەرە دایناوە، ئەوانە دەیانەوێ تەفسیری ڕوداوەکە بەوە بکەن کە نەخۆشی

ئاوڵەو خڕۆیلکە لەناو سوپای ئەبرەهەدا بڵاوبۆتەوەو ئەو باڵندانەی ئایەتە کە باسیان دەکا بریتی بوون لەومێشو مێشولانەی میکرۆبەکانیان هەڵگرتووە بۆ ناو سوپاکەو بڵاوکردۆتەوە، هەرشتێك بفڕێ باڵندەیە، مێش بێ یان باڵندەی تر.

ئەمجار مامۆستا سەید دەڵێ: مامۆستا شێخ موحەممەدی عەبدە لەتەفسیری جزمی (عـم)مدا دەڵێ: لەڕۆژی دووەمدا نەخۆشی ئاوڵەو خڕۆیلکە لەناو سوپای ئەبرەهەدا بڵاوبۆوە، عیکریمە دەڵێ: ئەوە یەکەمجار بوو کە لەولاتی عەرەبدا نەخۆشی ئاوڵە سەر هەڵبدا.

یەعقوبی کوڕی عوتبە دەڵێ: بێگومان یەکەمجار کە دیاردەی نەخۆشی ئاوڵەو خڕۆیلکە لەوڵاتی عەرەبدا بینرا لەو ساڵەدا بوو، ئەو نەخۆشیو تاعوونە کارێکی بەجەستەی ئەوانە کرد: کەنموونەی کەم بێ، ئەوەبوو هەرچی ئەو نەخۆشییەی تووش دەبوو جەستەی دادەرزاو گۆشتی لەشی هەڵدەوەری، ئیتر ترسێك لەناو دڵی سوپاکەی ئەبرەهەدا پەیدا بوو، هیچ چاریان نەما هەڵاتن نەبێ، سوپا هەمووی تووشی ئەو نەخۆشیە بوو ئەبرەهە بۆخۆی جەستەی داوەشاو پارچە پارچە گۆشتی لەشی کەوتە خوارەوە، هەتا سینگی دوولەت بوو لەصەنعا مرد.

ئەم تەفسیرە هەموو ڕیوایەتەکان لەسەری کۆکن‌و بڕوا پێ کردنی صەحیحە. ئەم سورەتە پیرۆزەش ئەوەی بۆ ڕونکردینەوە کە ئەو نەخۆشیو ئاوڵەو خڕۆیلکە لەو بەردە وشکانەوە بڵاوبووەوە کە بەسەر سوپاکەدا بارێندران بەهۆی پۆل پۆلی باڵندەی زۆر کە خودا لەگەڵ ڕەشەبادا دیان نێری.

کەواتە دروستە: کەبڕوامان وابێ ئەو باڵندانە لەجۆری ئەو مێشوولەو مێشو مەگەزانە بووبن: کە میکرۆبی بڕێ نەخۆشی دەگوێزنەوە، ئەو بەردە وردانەش بەردی ژەهراوی بووبن کە (با) هەڵی دەگرێو دەینوسێنێ بەقاچی ئەو مێش‌و مەگەزانەوە، جا کە ڕێی جەستەی ئادەمیزادەکان کەوتن‌و چوبنە ناو لەشیانەوەو ئەو نەخۆشیە سامناکەیان تێدا پەیدا بووبێ‌و بەو جۆرە گۆشتی لەشیان هەڵوەریبێ.

بێگومان زۆر لەو باڵندە لاوازانە بەگەورەترین لەشکری خودا دەژمێردرێن بۆ لەناوبردنی ئەوانەی خودا بیەوێ لەناویان بەرێ.

ئەم گیاندارە بچکۆلەی ئێستا پێی دەگوترێ میکرۆب، جۆرێکە لەو لەشکرانەی پەروەردگار ئەوەندە زۆرو هەمە جۆرن هەر خودا ژمارەیان دەزانێ، دەرکەوتنی دەسەڵاتو بەتوانایی خودا بۆ لەناوبردنی سەرپێچیکارو یاخی بووانو ملهوڕان نەبەستراوە بەوە ئاخۆ ئەو باڵندە بەقەد کێوێ زەبەللاح بێ یان جۆرێك بێ لەو باڵندەی کەس نەدیوو ناوازە، یان ڕەنگو قەبارەیەکی تایبەتییان هەبێ!

هەرچی هێزێکی ناو بوونەوەر هەیە، هەمووی ملکەچی دەسەڵاتی خودایە، ئەم ملهوڕەی ویستی ماڵی خودا بڕوخێنێ، خودا جۆرێکی لەباڵندە بۆ نادر کە میکرۆبی ئاوڵەو خرۆیلکەی پێ بگەیەننو خۆیو سوپاکەی بەو دەردە بەرێ. کە بەسەری هێنانو بیانکاتە پەند بۆ ڕۆژگار، ئەمەش نیعمەتێکە خودا دانیشتوانی مەککەی پێ بەهرەمەند کرد – هەرچەندە خۆیان بتپەرست بوون – بەڵام خودا پارێزگاری لەماڵی خۆی کرد، بۆ ئەوەی لەوەودوا کەسێکی بۆ بڕوخسێنێ بانگەوازی بۆ ئایینی خودا بکاو لەبت پەرستی تێیدا پاکی بکاتەوە، ئەمە بەڵاو سزایەکی خودایی بوو بەسەر ئەوانەیدا ڕشت: کە ویستیان بەناڕەوا ماڵی خودا بڕوخێنن.

(ئەم جۆرە تەفسیر کردنە دروستەو ڕەوایە پشتی پێ ببەسترێ لەشیکردنەوەی ئەم سورەتەدا، جگە لەم تەفسیرە تەفسیری تر بەتەئویل نەبێ وەرناگیرێ، هەر لە دیاردەی گەورەیی‌و بەتوانایی خودایە: ئەو کەسەی بەفیل دەنازێ کە گەورەترین گیانلەبەر بە بچوکترین گیاندار لەناو بچێ: کە میکرۆبە؛ تەنانەت بەچاویش نابینرێ، گومانیشی تێدا نیە لای ئادەمیزادی دانا ئەم شێوە لەناو بردنە بەو زیندەوەرە بچووکە زۆر گرنگ ترو سەرسوڕهێنەرە).

مامۆستا سەیید ئەو شێوە تەفسیرەی مامۆستا (محەممەد عەبدە)ی پێ پەسەند نیەو دەفەرموێ: ئێمە وانازانین ئەو دیمەنەی مامۆستا شێخ موحەممەد عەبدە، دەیخاتە ڕوو باشتر دەسەڵاتی خودا دەربخا لەو دیمەنەی ڕیوایەتە جۆراو جۆرەکان

دەینوێنن، بۆ دەسەڵاتی خودا ئەو باڵندەیەی ئایەتەکە باسی دەکا باڵندەیەکی چۆلەکە ئاسای بێ‌و سێ بەرد هەڵبگرێ‌و پۆل پۆل بەچڕی بەردبارانی سوپای ئەبرەهە بکەن‌و هەر بەردێك ڕێی سەری یەکێ لەپیاوانی سوپاکە کەوتبێ‌و جەستەی داوەشاندبێ، لەگەڵ ئەوەدا ئەو باڵندە بریتی بێ لەمیکرۆب‌و نەخۆشی ئاوڵەو خرۆیلکە بلاوبکەنەوە چون یەکە، هەردوو جۆرەکە بۆ دەسەڵاتی خوداوەکوو یەك وان‌و ڕوودانیان مومکینە.

بێگومان داب‌و نەریتی خودا لەبوونەوەردا هەر ئەوە نیە: کە ئادەمیزاد پێی ڕاهاتوون‌و دەیزانن، ئەوەی دەرکەوتووە بۆ ئادەمیزاد لەداب‌و نەریتی خودا لەبوونەوەردا بەشێکی زۆر کەمە، خودا بەگوێرەی ئامادەباشی ئادەمیزاد بۆ وەرگرتنی ئەو داب‌و نەریتە، کەمە کەمە بۆیان دەردەخابە ئەندازەی ئەزموون‌و تێگەیشتنی ئادەمیزادەکان بەدرێژایی ژیانیان لایەك لەسوننەتی خۆی لەبوونەوەردا دەردەخا.

ئەو ڕووداوە خاریقولعادانەی لێرەو لەوێ‌و دوێنێ‌و ئەمڕۆ بینراون‌و دەبیندرێن، هەموویان سوننەتی خودان‌و بەویستی ئەو دێنە کایەوە، وەلێ کە بە خاریقولعادەیان دەزانین، هۆیەکەی پێوە ڕاهاتن‌و ناسین‌و نەناسینە، ئەگینا بۆ خودا هەموو کارێك ئاسانەو هەموویان بەگوێرەی داب‌و نەریتی ئەوە.

هەڵهاتنی خۆرو ئاوابوونی کە هەموو ڕۆژێك دەیبینین‌و پێوەی ڕاهاتووین بەنیسبەت دەسەڵاتی ئادەمیزادەوە خاریقولعادەیە لەدایکبوونی هەر منداڵێك کە لەدایك دەبێ خاریقولعادەیەو هەموو ساتە وەختێك دووبارە دەبێتەوە، ئەو بار پێوەگرتن‌و وەرگری بوونەو زۆر دووبارە بوونەوەیان وای لەئێمە کردووە بەکارێکی ئاساییان بزانین‌و بەخاریقولعادەیان لەقەڵەم نەدەین.

بەکورتی مامۆستا سەیید پێی وایە، ئەو ڕوداوە ڕوداوێکی نائاسایی بووەو ئادەمیزاد پێی ئاشنا نەبوون، ڕیوایەتەکان بەپەسەند دەزانێ‌و دەبارەیان دوو دڵ نیەو هیچ تەئویلێك ئەنجام نادا، بەگوێرەی دەقی ڕیوایەتەکان لەو سەروبەندەدا؛

كه ئەبرەهە دەیەوێت هێرش بەرێتە سەر کابەو بیڕوخێنێ، پەروەردگار (تەیری ئەبابیلی) ناردەسەریان‌و هەریەکەیان سێ بەردی پێ بووە بە ئەندازەی دەنکە نۆك‌و لەنیسك گەورەتر‌و لەشکرەکەیان بەردباران کرد، ئەو کارەساتەیان بەسەر لەشکری ئەبرەهە هێنا.

هەرکەسێ دەیەوێ بەتەواوی بیروبۆچوونی مامۆستا شێخ موحەممەد عەبدەو رەتدانەوەی سەیید قوتب لەسەری‌و پاساو هێنانەوە بۆ تەفسیرکردنەکەی بەو جۆرە بزانێ با سەیری (في ظلال القرآن) (ج٨/٦٦٧ - ٦٧٥) بکا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (قریش)

ئەم سورەتە مەککییەو چوار ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی قورەیش، چونکە لەسەرەتای سورەتەکەدا نیعمەتی خۆی بەسەر قورەیشییەکاندا رادەنوێنێ.

### پەیوەندی ئەم سورەتە بە سورەتی پێشەوە:

پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوە زۆرپتەوە، چونکە هەردوو سورەتەکە نیعمەتەکانی خوداوەبیر دانیشتوانی مەککە دەهێنێتەوە، سورەتی فیل رووداوی بەهیلاکبردنی ئەو دوژمنەیان رادەنوێنێ کە هاتبوو کابە بڕوخێنێ‌و بناغەی شکۆمەندی‌و پیاوەتیان لەبێخ هەڵکەنێ.

ئەم سورەتەش نیعمەتێکی تری پەروەردگاریان وەبیر دێنێتەوە: کە بڕبڕەی پشتی کۆمەڵگای بەختەوەرە، ئەوەیان بەگوێدا دەدا: کە خودا ئولفەت‌و خۆشەویستی خستۆتە نێوانیانەو نیعمەتی ئاسایش‌و ئارامی بەسەردا ڕشتوون‌و لەناو مەککەدا ترسیان لەکەس نیە، هەروا نیعمەتی دەوڵەمەندی پێداون‌و جڵەوی بازرگانی وڵاتی حیجازیان بەدەستەوەیە، هاوینان قافڵەیان دەچێ بۆشام‌و زستان بۆ

یەمەن، لەڕێگادا کەس ڕێگرییان ناکاو سامو هەیبەتێکی تایبەتییان پێ دراوەو لەو وڵاتانەی بازرگانییان لەگەڵ دەکەن ڕێزو شکۆمەندییان هەیە.

ئەم سورەتە ئەوەندە بە سورەتی پێشووەوە پەیوەندی بەهێزە تەنانەت دەگوترێ: (جارو مەجروری) سەرەتای سورەتەکە پەیوەستە بەکۆتایی سورەتی پێشووەوە کە ﴿فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَأْكُولٍ﴾ە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ﴿٣﴾ الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ ﴿٤﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ، إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ، فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ﴾. پەروەردگار لەشکری ئەبرەهەی لەناوبرد بۆ ئەوەی قورەیشییەکان لەناو خۆیاندا پێکەوە ئولفەت بگرنو یەکیەتیو تەبایی بکەوێتە ناویانەوە، وەگری ئەو خاكو دەڤەرە ببن، هۆگرییان بۆ دەستەبەر ببێ بەهۆی هاتووچۆیان زستان بۆ یەمەنو هاوین بۆ شام، بۆ ئەوەی ڕێزی کەعبە پایەداربێو ئەوان لەو ڕێزوشکۆمەندییە بەهرەمەند ببن.

پەروەردگار نزاو پاڕانەوەکەی حەزرەتی ئیبراهیمی (علیه السلآم) قبوڵ کرد، کاتێ لەبنیاتنانی کابە بووەوە پاکی کردەوە، وتی: ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ – البقرة/١٢٦﴾.

هەر لەو ڕۆژگارەدا خودا کابەی پیرۆزی لە دەستدرێژی خراپەکاران پاراستووە، ڕزگاری کردووە لەدەسەڵاتی ملهوڕانهیچ تاغوتێك دەستی خراپەکاری بۆ نابا،

هەرکەسێ بێتە ناوی لەترس‌و بیمی خراپەکاران ئەمین دەبێ، تەنانەت ئەوکاتەش کە دانیشتوانەکەی لەئایینی ئیبراهیم لایانداوە دەستیان کرد بە بتپەرستی، خودا ئەو بەهرەیەی لێ نەستاندنەوە، چونکە خودا بۆخۆی دەیزانی لەدوارۆژ کەعبە دەبێتە مەڵبەندی خوداپەرستی.

کە ئەبرەهە سوپای پێکەوەنا بۆ ڕوخاندنی کەعبە، خودا ماڵی خۆی پاراست‌و ئەوەی بەسەر لەشکری ئەبرەهە هێنا کەهێنای، بەهۆی ڕێزی کەعبەوە قورەیشییەکان لەئەمن‌و ئاسایشدا بوون، مامەڵەو بازاڕیان بەردەوام بوو بەزستان قافڵەکانیان بەرەو یەمەن دەچوو بەهاوین بۆ شام، لەم سەفەرانەدا شتی خۆیان دەبرد بۆ ئەو شوێنانەو دەیانفرۆشت‌و کاڵای پێویستیان دەکڕی‌و دەیانهێنایەوە بۆ بازاڕی مەککەو بەم ڕەنگە جڵەوی بازرگانی مەککەیان بەدەستەوە گرتبوو ژیانێکی ئارام‌و پڕ نازو نیعمەتیان بەسەر دەبرد، بەڵام خەڵکانی دەوروبەریان هەمیشە لەشەڕو ناخۆشی‌و تاڵانکردن‌و یەکتر فڕاندن بوون، وەکوو قورئان دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ – العنكبوت/٦٧﴾.

بێگومان ڕووداوی فیل‌و سەرەنجامی لەشکری ئەبرەهە ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لەزێدە ڕێزگرتنی کابەو شاری مەککەو قورەیشییەکان لەلایەن کۆمەڵگای عەرەبی بەگشتی، بۆیە قورەیشییەکان بەڕاشکاوی بەناو وڵاتەکاندا دەگەڕان‌و کەس دەستدرێژی نەدەکردنە سەر، بەڵکوو بۆ هەر شوێنێك بچونایە پێشوازییان لێ دەکراو ڕێزی تایبەتییان دەگیرا، ئەمەش هەڵێنان کە ڕوبکەنە بواری بازرگانی‌و دوو کەناڵی کاریگەر بدۆزنەوە بۆ تیجارەت کە بریتی بوو لە چوونی کاروانیان بەزستان بۆ یەمەن‌و هاوین بۆ شام، ئەمەش دەرگای رزق‌و رۆزییەکی زۆرو زەبەندەی لێ کردبوونەوە.

رزق‌و رۆزی زۆرو دڵنیایی لەسەرو ماڵیان، ئا ئەمە ئەو منەتەی خودا بەسەریاندا دەکاو پێیان دەفەرموێ: ئەو ڕێزو شکۆمەندییەی بۆ ئێوەم دەستەبەر

کردووەو ئەو رزق‌و رۆزییەی بەسەرمدا ڕشتوون ئێوە عیبادەتی خودای ئەم ماڵە پیرۆزە بکەن، بەو کەم دەستی‌و بێ هێزییەتان‌و لەناو ئەو هەموو شەڕو هەرایەی کە دەوروبەرتان بەرپا دەبێ‌و تاڵان‌و برۆیەی لەناو خێڵەکاندا دەکرێ، خودا پاراستنی‌و لەشکری بێ شوماری ئەبرەهەی بۆ تارومار کردن‌و پارێزگاری کابەی پیرۆزی لەئەستۆ گرتووە بەدڵنیاییەوە لەماڵی خۆتان دانیشتوون.

وێڕای ئەوەی هەرێمەکەتان ناوچەیەکی ڕەقەن‌و کرێن‌و بێ کشتوکاڵ‌و بەروبوومە: کە بەگوێرەی سروشتی وڵاتەکە دەبوایە هەموو کاتێ قات‌و قڕی پێوە دیار بوایە، بەڵام خودا ڕزق‌و رۆزییەکی بەرفراوانی بەسەردا ڕشتوون‌و بەتێرو تەسەلی ژیان بەسەر دەبەن.

بەکورتی ئەوەتا خودا دوو نیعمەتی زۆر گەورەی بەسەردا ڕشتوون، نیعمەتی تارومار کردنی سوپای ئەبرەهەو نیعمەتی جێگیربوونتان لەپەنا کابەی پیرۆزو هۆگریتان بەیەکتری تێیدا، ئەگەر هیچ نیعمەتێکی تری خوداتان لەبەرچاو نەبێ، لەپاساوی ئەو دوو نیعمەتەدا عیبادەتی خودا بکەن، کە خاوەنی کابەیەو ڕێزو شکۆمەندی پێداوەو ئێوەش لەپەنایدا حەساونەوە.

ئەمجار هەندێ نیعمەتی تری خۆیان بەیان دەکا: کە بە قورەیشییەکانی بەخشیون دەفەرموێ: ﴿الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ﴾ بەندایەتی بۆ ئەو خودایە بکەن: کەبەهۆی هاتووچۆتان بۆ یەمەن‌و شام خواردەمەنی پێداون‌و ڕزق‌و رۆزی بۆ زۆر کردن‌و قات‌و قڕیتان بەخۆوە نەبینیوە، لەبرسێتی ڕزگاری کردوون.

﴿وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ﴾ بەفەزڵ‌و ئیحسانی خۆی ئارامی‌و دڵنیایی بۆ ڕەخساندوون، ترسی دەستدرێژیکارو هێرشبەرانتان نیەو دڵنیان لەسەلامەتی گیان‌و ماڵ‌و سامانتان، کەواتە ئێوە تەنیا ئەو خودایە بناسن‌و عیبادەت هەر بۆ ئەو بکەن، بت‌و صەنەم مەکەنە هاوەڵ‌و هاوبەش، دڵسۆزانە یەکتاپەرستی بکەن‌و لەناخەوە ملکەچی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الماعون)

ئەم سورەتە بەقسەی ئیبنو عەبباس‌و قەتادە مەدەنییەو حەوت ئایەتە جەماوەری زانایان فەرموویانە: مەککییە واتە: پێش کۆچکردنی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم) بۆ مەدینە نازڵ بووە (هبة الله) کە موفەسیرێکی نابینابووە دەڵێ: نیوەی لە مەککە نازڵ بووە، دەربارەی عاصی کوڕی وائیل‌و نیوەکەی تری لە مەدینە نازڵ بووە دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دوڕوو.

ناوی نراوە سورەتی (الماعون) چونکە لەکۆتایی سورەتەکەدا پەروەردگار سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کە ئامێری پێویست لەدراوسێ‌و هاووڵاتیان قەدەغە دەکەن، وشەی (ماعون) هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە: کە دراوسێ لە دراوسێی دەخوازێ وەکوو ئامێری خواردن دروستکردن، ئامێری کشت‌و کاڵ‌و ئامێری جل دروون‌و ئەو جۆرە شتانە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ﴾ ئایا زانیوتەو دەیناسی کێیە ئەو

کەسەی ڕۆژی قیامەت بەدرۆ دەزانێو بڕوای بەحیساب‌و لێکۆڵینەوە نیە؟ ئەگەر نایزانی با پێت بڵێم:

﴿فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ﴾ ئەوە کەسێکە هەتیو دەردەکاتو پیا هەڵئەشاخێو بەناوی ناشیرین لەگەڵیدا دەدوێ، بەتوڕەییو قسەی ڕەق پاڵی پێوە دەنێ، ستەمی لێ دەکاو مافی خۆی ناداتێ، لەمیرات بێ بەشی دەکا.

﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ هانە هانەی خۆیو ماڵو منداڵی نادات بۆ بەخشینی خۆراك بەهەژارو هەتیوانو یارمەتیدانو بەخێوکردنی هەتیو بەشێوەیەکی جوان.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ، وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ – سورة الفجر/١٧-١٨﴾. دیارە کەسێك کەسانی دیکە هەڵنەنێ بۆ بەخشینی ماڵ، هێندە چرۆك بێ دڵی نەیە لەسەر کیسەی خەڵك ماڵ ببەخشرێ، لەکیسەی خۆی هەر نابەخشێ.

﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ، الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ شیوی (وەیل) کە شیوێکە لەدۆزەخ، یان ڕیسواییو عەزابی سەخت بۆ ئەو دووڕووانەی بەڕواڵەت نوێژ دەکەنو هەر بۆ ئەوەیە لەڕیزی موسوڵمانان حسێب بکرێنو خۆیان بپارێزن، ئەوانەی لەنوێژەکانیان بێ ئاگانو هیچ گرنگی پێ نادەن، ئەگەر نوێژیش دەکەن بەتەمای پاداش نین، لەسزای ڕۆژی قیامەت ناترسن، لەوە ناترسن ئەگەر نوێژ نەکەن خودا سزایان دەدا، ئەگەر لەگەڵ موسوڵمانان بنو کورتە نامووس بیانگرێ بەڕواڵەت نوێژ دەکەن، ئەگەر نا هەر نایکەن، یان ئەگەر بیشیکەن دوای دەخەنو بەبێ موبالاتی ئەنجامی دەدەن.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا ئاماژە بەم مانەیە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ، يُرَاءُونَ النَّاسَ – النساء/١٤٢﴾.

ئەمجار ڕەوشتێکی تریان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ﴾ ئەو

دوو رووانـه، کـه گرنگـی نـادەن بـه نوێـژەکانیان‌و ئەگـەر ئەنجامیـشیان دەن بـەبێ موبالاتی دەیانکەن.

هیچ دڵی نادەنێ، مەبەستیانە خەڵك بیانبینێ؛ کەوا نوێـژ دەکەن، یـان هـەر کارێکی باش دەکەن دەیانەوێ خەڵك پێیان بزانێ: کە ئـەو کارانـە دەکـەن‌و پێیانـدا هەڵبڵێن، بە پیاوی چاك‌و مرۆڤ دۆست ناویان بەرن.

ئیمام ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليهِ وسلم) فەرمووی: «مَنْ سَمَّعَ النَّاسَ بِعَمَلِهِ، سَمَّعَ اللَّـهُ بِـهِ سَـامِعَ خَلْقِـهِ، وَصَغَّرَهُ وَحَقَّرَهُ». کەسێك هەوڵ بدا کەسانی دیکە بەکردەوە باشـەکانی بـزانن، بۆیـه کاری باش بکا تا لەپێش چاوی خەڵك بەباش بناسرێ‌و مەدحی بکەن خودا ریسوای دەکاو لەپێش چاوی خەڵك بێ رێزی دەکا.

﴿وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ﴾ ئەوانە حاجات لە دراوسێ مەنع دەکەن، هیچ پیاوەتێکیان لەدەست هەڵناوەرێ، (ماعون) بەو شتانە دەگوترێ: کـە خێزانـەکان لـەناو خۆیانـدا لەیەکتری دەخوازن، هەر کۆمەڵگایەك بەگوێرەی داب‌و نەریتی خۆیـان‌و بـەگوێرەی رۆژگـار بـۆ پێداویـستی کـاتی هەنـدێ شـت لەیـەکتری دەخـوازن‌و دوایـی بۆیـان دەگێڕنەوە، جا ئەو دوو ڕووانە نە بەجوانی خوداپەرستی دەکەن، نە چاکە لەگـەڵ خەڵکدا دەکـەن، تەنانـەت ئـامێری ناومالّیـان بەئەمانـەت‌و بـۆ کـاتێکی دیـاری کـراو نادەنـــە دراوســـێکانیان، ئـــیتر ئـــەوە خێـــرو خێراتـــی تـــر هـــەر ناکـــەن!

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الكوثر)

ئـەم سـورەتە بـەڕای جـەماوەری زانایـانی ئیـسلام مەككییـەو سـێ ئایەتـە، حەسەنو عیكریمەو قەتادە دەڵێن: مەدەنییە، ئیبنو كەسـیریش ئـەم ڕایـەی بـەلاوە پەسەندە.

ناوی نراوە سورەتی (كـەوثـەر) چونكە لەسـەرەتای سـورەتەكەدا پـەروەردگار خیطاب ئاڕاستەی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَـاكَ الْكَوْثَرَ﴾.

دەربارەی گـەورەیی ئـەم سـورەتە ئیمام ئەحمـەد لەئەنەسـی كـوڕی مالیكـەوە ڕیوایەت دەكا: كە دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليـهِ وسَلم) جـۆرە وەنـەوزێكی بەسەردا هاتو پاشان سەری بەرز كردەوە زەردەخەنەیەكی هاتـێ، جـا یـان هـاوەڵان عـەرزیان كـرد ئـەو پێكەنینـە چـی بـوو؟ یـان بـۆ خـۆی فـەرمووی: دەزانـن بۆچـی زەردەخەنەم هاتێ؟

پاشان فەرمووی: پێش ئێستا سورەتێكم بـۆ سـەر نـازڵ بـووە ئـیتر دەسـتی كـرد بەخوێنـدنی: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ ﴿إِنَّـا أَعْطَيْنَـاكَ الْكَـوْثَرَ...﴾ تـا كۆتـایی سورەتەكە، ئەمجار فەرمووی: دەزانن كەوثەر چیە؟ هـاوەڵان عـەرزیان كـرد خـوداو پێغەمبـەری خـودا دەزانـن. فـەرمووی: كـەوثـەر چۆمێكە لەبەهەشـتدا خـودا پێـی بەخشیوم، خێروبێرێكی زۆری لەسـەرە، ڕۆژی قیامـەت ئوممەتەكـەم دێنـە سـەری، پیاڵەو پەرداخـەكانی بەئەنـدازەی ئەسـتێرەكانە، هەنـدێ كەسـیان لێ وەلا دەنـرێو هەڵدەهاوێردرێن منیش دەڵێم: ئەی خودایە! ئەوانە لـە ئوممـەتی مـنن، دەگـوترێ: ئەتۆ نازانی دوای تۆ چییان كردووەو چییان داهێناوە.

ئیمـامی موسـلیمو ئـەبو داوودو نەسـائی لەئەنەسـی كـوڕی مالیكـەوە هـەمان

فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە بەبڕی جیاوازی لە وشەدا.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە (السدی)یەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: لەناو قوڕەیشدا وا باو بوو: ئەگەر یەکێك کوڕی بمردایە دەیانگوت ئەوە فلانەکەس دوابڕاوو وەجاخ کوێر بوو، جا کە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) کوڕەکەی (القاسم) مرد (العاصی) کوڕی وائیل وتی: ئەوە (محمد) دوابڕوا بوو، ئیتر ئەم سورەتە نازڵ بوو، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) هەرکە کوڕێکی بمردایە قوڕەیشییەکان دەیانگوت: ئەوە موحەممەد وەجاخی بڕایەوە، ئیتر هەرکاتێ بۆ خۆشی مرد دوا بڕاو دەبێ.

ئەوان نەمانی کوڕیان بۆ پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) بەنەنگی دەزانی، هەژاریو بێ دەسەڵاتی موسوڵمانەکانیشیان بە نەنگی دادەنا، گاڵتەیان پێ دەکردنو دەیانگوت ئەگەر ئایینەکەیان ڕاست بوایە دەبوایە بەهێزو دەوڵەمەند بوونایە، لەڕوانگەی ماددییەوە دەیانڕوانییە پێغەمبەرو موسوڵمانەکان، موسوڵمانەکانیش تازە موسوڵمان بوو بوونو هەر تەنگانەیەکیان بهاتایە پێش دڵتەنگ دەبوونو نائومێدیو ڕەشبینی ڕووی تێ دەکردن، ئیتر پەروەردگار ئەم سورەتەی نازڵ کرد بۆ دڵدانەوەی موسوڵمانەکانو زیاتر دڵنیابوونی پێغەمبەر بە پەیامەکەیو ئاماژەی کرد بۆ ئەوە: کە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) بەهێزو سەرکەوتووە، شوێنکەوتوانی باڵادەست دەبن، مردنی کوڕەکانی پێغەمبەر (القاسم) لەمەککەو (ئیبراهیم) لەمەدینە لەڕێزی پێغەمبەر کەم ناکاتەوەو دوژمنەکانی دوابڕاوو وەجاخ کوێرنو ناوو شۆرەتیان دەبڕێتەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ﴾ ئێمە ئەی محمد! خێروفەرێكی زۆرمان پێ بەخشیوی‌و لەبڕانەوە نایە بڕێ لەو خێرو فەرە حەوزی كەوثەرە، خودا كردوویەتی بەنیشانەی شكۆمەندی‌و ڕێزلێنانی پێغەمبەرو ئوممەتەكەی، ئەمەش ڕەتدانەوەی موشریكەكانی مەككەیە كە دژایەتی پێغەمبەریان دەكردو بەچاوی سوك لێیان دەڕوانی‌و پێیان وابوو بەدبەختو چارەڕەشە...

بەشێكی تر لەو خێرە زۆرو بێ سنوورە پێغەمبەرێتی‌و ئیسلامەتییە، كە پلەو پایەیەكی ئێجگار گەورەو سەرمایەیەكی زۆرو نەبڕاوەیە بۆ دونیاو قیامەت.

دەبێ چ پلەو پایەیەك بگاتە پلەو پایەی پێغەمبەرێتی: كە هەمیشە لەگەل خودای بونەوەردا پەیوەندی هەیە؟ چی لەوە گەورەترە بەندەیەك لەسەر زەوی‌و خودا لەعالەمی بالاوە بەفروستادەی خۆیدا پەیامی بۆ بنێرێ‌و ئەركی هیدایەتدانی مەردومی بخاتە ئەستۆ؟

چی لەوە گەورەترە هەمیشە لە شایەتوماندا بەبێ ناوی پێغەمبەر ناوی خودا نەبرێ، هەتا دوابەدوای ناوی خودا ناوی پێغەمبەر نەهێنرێ شایەتو ماناكە تەواو نەبێ؟.

دەبێ چ ڕێزو ناوو شۆرەتێك لەوە گەورەتر بێ: كە ڕۆژانە لەهەموو ساتو چركەیەكی ئەم جیهانەدا بەهەزاران ملیۆن جار ناوی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَم) بەگوێی گێتیدا بدرێ‌و شایەتی بدرێ كە فروستادەی خودایەو ڕەهبەری ئادەمیزادو جندۆكەیە، لەڕاستیدا ئەم خێرو فەرەی بە پێغەمبەر بەخشراوە نە بەزمان دەگوترێ‌و نە بەقەلەم دەنووسرێ، بۆیە پەروەردگار بە ڕەهایی باسی كردو سنووورداری نەكرد، هەتا ئاماژەی بێ بۆ ئەوە: كە بڕانەوەی نیە، كەوابێ لەپاساوی ئەم بەهرەو خێروفەرە بێ سنوورەی خودا پێی بەخشیوی.

﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ بەردەوامبە لەسەر ئەنجامدانی نوێژە فەرزەكان‌و سوننەتەكان، بەدڵسۆزی بۆ پەروەردگاریان ئەنجام بدە، بۆ ڕواڵەتو ڕییا مەیانكە، بەردەوامبە لەسەر یەكتاپەرستی، قوربانی هەر بۆ خودا سەر ببڕە، هەر ناوی

خودای لەسەر بڵێ: قوربانیو نوێژ بەشێکن لەعیبادەت، عیبادەت هەر دەبێ بۆ خودا ئەنجام بدرێ.

وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ – سورة الأنعام/١٦٢–١٦٣﴾.

ئەمەش بە پێچەوانەی کرداری موشریکەکانە: کە نوێژیان بۆ بتو صەنەم دەکرد، قوربانیان بۆ بتەکانیان سەر دەبڕی. دووڕووەکانیش بەڕواڵەت عیبادەت دەکەنو مەبەستیان غەیری خوایە.

ئەمجار موفەسیرین ڕا جیاییان هەیە لەوەدا ئایا مەبەست بە: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ چیە؟

١- قەتادەو عەطاو عیکریمە دەفەرموون: مەبەست نوێژی جەژنو سەربڕینی قوربانییە.

٢- ئیبنو جەریر لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دوای ئەوەی هەندێ ڕای هێناون دەڵێ ڕای پەسەند ئەوەیە: مەبەست هەموو نوێژێکو هەموو ئاژەڵ سەربڕینێك بێ، واتە: هەموو نوێژێك بۆ خودا ئەنجام بدەو مەبەستت بەندایەتی کردنی ئەو بێ.

هەر ئاژەڵێك سەردەبڕی مەبەستت ڕەزامەندی خودا بێو تەنها ناوی خودای لەسەر بێنە، سوپاسی خودا بکە لەسەر ئەو هەموو نیعمەتانەی پێی بەخشیوی.

﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾ بێگومان ئەو کەسەی ڕقو کینەی لەتۆیە ئەی محمد! ڕقی لەپەیامو بەرنامەی تۆیە، ئەوە دوابڕاوو وەجاخ کوێرو بێ خێروبێرە، ئەو بێ ڕێزو ناوو شۆرەتە نەك تۆ!!

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الكافرون)

ئەم سورەتە مەککییەو شەش ئایەتە. ناوی نراوە سورەتی (الكافرون) چونکە پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) کردووە: کە خیطاب ئاڕاستەی کافرەکان بکا: کە عیبادەتی ئەو خودا درۆزنانەی ئەوان ناکاو بتو صەنەم ناپەرستێ، پێشی دەگوترێ: سورەتی (المنابذة)و سورەتی (الإخلاص)و سورەتی (المشقشقة).

ئەم سورەتە مەککییە لەڕاستیدا سورەتی جودابوونەوەو دەست لەیەك بەردانە لەنێوان پێغەمبەرو موشریکەکاندا. پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) بەئاشکرا ڕایدەگەیەنێ: کە تەنها عیبادەت بۆ خودا دەکاو بەهیچ شێوەیەك بتو صەنەم ناپەرستێ، موشریکەکان بێ هیوا دەکا لەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) عیبادەت بۆ بتو صەنەمەکان بکا.

دوای ئەوەی قوڕەیشییەکان پێشنیاریان بۆ پێغەمبەر کرد کە ساڵێك ئەو عیبادەتی بتەکانیان بکاو ئەوانیش ساڵێك عیبادەتی خودا بکەن، ئەم سورەتە نازڵ بوو قوڕەیشییەکانی هیوا بڕاو کردو دڵنیای کردن کە بەهیچ جۆرێك ئەو ئاواتە پیسو بۆگەنەیان نایەتەدی...

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم سورەتە ڕیوایاتی جۆراوجۆر هەن هەموویان ئەوە دەگەیەنن: کە قوڕەیشییەکان داوایان لە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) کردووە: کە ساڵێك ئەو بتپەرستی بکاو ئەوانیش ساڵێك خودا بپەرستن، ئیتر ئەم سورەتە نازڵ بووە.

وەکوو ئاشکرایەو قورئان ئاماژەی پێ کردووە عەرەبەکان ئینکاری هەبوونی خودایان نەدەکرد، وەڵێ دانیان بەتاكو تەنهایی ئەو زاتەدا نەدەنا، وەکوو پێویست خودایان نەدەناسیو وەکوو پێویست عیبادەتیان نەدەکرد، ئەوەبوو بتو صەنەمیان

دەكــردە هــاوەڵی خــوداو پەرســتــشيان بــۆ دەكــردن بــۆ ئــەوەی لــەخودايان نزيــك بكەنەوە...

وەكوو لە سورەتی (الزمر)دا ئاماژە بەوە دەكاو لەسـەر زمـانی قورەيـشييەكان دەفـەرموێ: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَـا إِلَـى اللَّـهِ زُلْفَـى – الزمـر/٣﴾. لەلايـەكی تـرەوە ئـەوان بڕوايـان وابـوو: كـە بەديهێنـەری ئاسمانـەكانو زەوی خودايـەو هـەر ئـەو بـەديهێناون، هـەر ئـەو بوونـەوەر هەڵدەسـوڕێنیو خـۆرو مـانگو ئەسـتێرەكانی رامكردوون، وەكوو لەسورەتی (العنكبوت)دا ئامـاژە بـەوە دەكـاو دەفـەرموێ: ﴿وَلَـئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُـونَ﴾ يان ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾.

لەسـوێند خواردنيـشياندا نـاوی خودايـان دەهێنـاو دەيـانگوت: (والله)، (بـالله)، (تالله). لەپاڕانەوەدا دەيانگوت: (اللهم).

بەڵام وێڕای ئەم بیروباوەڕیان هاوەڵيان بۆ خودا دادەنا، بتپەرستی باڵی ڕەشی كێشابوو بەسەر وڵاتيانـدا، دڵو دەروونيـان قفـڵ بـوو بـوو، بیروبۆچوونيان هەموو شێواوو گومڕايی بوو!

لەكـشتوكاڵياندا ئـاژەڵو بەروبوومیانـدا بەشـێكيان بـۆ بتـەكانيان تـەرخان دەكردو هەندێكيشی بۆ خودا، دوايی چەند فـرتو فێڵيـان ئـەنجام دەدان بـۆ ئـەوەی لەو بەشەی بۆ خودايان دادەنا بيدزنەوە بيخەنە سەر بەشی بتەكانيان.

عەرەبـەكان خۆيـان بـە شـوێنكەوتووی حـەزرەتی ئيـبراهيم (عَلَيْـهِ السَّلَام) دەزانیو پێيان وابوو ئەوان لەسەر هيدايەتنو لەئەهلی كيتاب زياتر لەسەر حـەقن، جوولەكە پێيان وابوو عوزەير كوڕی خودايـە، فەلـەكانيش عيسايان بـەكوڕی خـودا دەزانـی. هەنـدێ لـە عەرەبـەكانيش فريـشتەيان دەپەرسـتو بڕێكيـشيان جنۆكـە پەرست بوون، وايان دەزانی ڕێبـازی ئـەوان پەسـەندترە، چونكە بەخـەياڵی خۆيـان

بیروباوەڕی ئەوە کە فریشتەو جندۆکە منداڵی خودابن زۆر وێچووترە لەوەی، کە عوزەیرەو عیسا کوڕی خودابن!

کە حەزرەتی موحەممەد (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) بانگەوازی خۆی ڕاگەیاند وتیان: ئێمە لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیمین‌و چ پێویستیمان بەوە نیە شوێن موحەممەد بکەوین، لەهەمان کاتدا هەوڵیان دەدا لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێك بکەون‌و ڕێبازێکی مامناوەندی بگرنەبەر، بۆیە پێشنیاری ئەوەیان بۆ پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) کرد: کە ئەو سوژدە بۆ بتەکانیان بەرێ‌و ئەوانیش سوژدە بۆ خودا بەرن. هەروەها پێغەمبەر بەخراپە باسی خوداکانی ئەوان نەکاو ڕخنەیان لێ نەگرێ ئەمانیش ڕێگە لە پێغەمبەر نەگرن لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی.

ئیتر بۆ یەکالا کردنەوەی ئەم پێشنیارەی قورەیشییەکان‌و ڕێگە گرتن لەو هەوڵ‌و تەقەللادانەی کافرەکان جوداکردنەوەی کوفرو ئیمان‌و یەکتاپەرستی‌و بتپەرستی ئەم سورەتە بەو شێوە جەزمی‌و حەسمە نازڵ بوو، بەربەستێکی تۆکمەی لەنێوان پێغەمبەرو قورەیشییەکان دانا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦﴾

فەرمووی: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ ئەی محمد! بەکافرەکانی

قورەیش بڵێ: ئەی بێ بڕوایینە، ئەی هاوبەش دانەران بۆ خودا، من هەرگیزاو هەرگیز عیبادەتی ئەو بتو صەنەمانە ناکەم: کە ئێوە دەیانپەرستن، بەهیچ شێوەیەك بەندایەتی ئەو خودا درۆزنانە ناکەم!

ئایەتەکە تایبەت نیە بەکافرەکانی قورەیشییەوە بەڵکوو هەموو کافرێکی سەر زەوی دەگرێتەوە... ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە ئەوە فەرمانی خودایەو موساوەمەی تێدا ناکرێ، خودا فەرمانی پێ کردووەو هەڵوەشانەوەی نیەو ناکرێ تەنفیز نەکرێ!

﴿وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ ئێوەش تا بەردەوام بن لەسەر شیرك‌و بێ بڕوایی خۆتان، پەرستشی ئەو خودایە ناکەن: کە من دەیپەرستم. پەرستراوی من جوداوازە لە پەرستراوی ئێوە، ئەمن خودای تاك‌و تەنهاو خاوەن صیفاتی خودایەتی دەپەرستم، هەموو صیفاتی کەمال‌و جەمالی بەرەهایی تێدان، خودا درۆزنەکانی ئێوە بەردو داری بێ گیانن، هیچیان لەدەست نایە.

﴿وَلا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ، وَلا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ ئەمن ئەو خوداپەرستییە ناکەم: کە ئێوە دەیکەن، چونکە خوداپەرستی من یەکتاپەرستییە، کەسی تر ناکەم بەهاوەڵ‌و هاوشانی خودا، ئێوەش ئەو خوداپەرستییە ناکەن کە من دەیکەم، چونکە خوداپەرستی ئێوە هاوبەشی پەیداکردنە، چەند بت‌و صەنەمێکتان داناوە کردووتانن بەهاوشانی خودا.

بەهیچ جۆرێك من‌و ئێوە یەکتر ناگرینەوە، خاڵی هاوبەشمان نیە، کەوابێ ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ئایینی خۆتان بۆ خۆتانەو هیچ پەیوەندییەکی بەمنەوە نیەو نابێ. ئایینی خۆم بۆ خۆم‌و هیچ پەیوەست بەئایینی ئێوەوە نیە، وا مەزانن کە ئایینەکەتان حەقەو من بڕوام پێیەتی!!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سوره‌تی (النصر)

ئه‌م سوره‌ته مه‌ده‌نییه‌و سێ ئایه‌ته، ناوی نراوه سوره‌تی (النصر) چونكه به‌رسته‌ی ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ﴾ ده‌ستی پێ كردووه، به‌ئاشكرا ئاماژه بۆ فه‌تحی مه‌كه ده‌كاو مه‌به‌ستی سه‌ركه‌وتنی پێغه‌مبه‌رو موسوڵمانانه به‌سه‌ر قوڕه‌یشییه موشریكه‌كاندا، موژده‌ی بڵاوبوونه‌وه‌ی ئایینی ئیسلامی پیرۆزی تێدایه، له‌هه‌موو كون‌و قوژبنی نیوه دورگه‌ی عه‌ره‌بی‌و راماڵینی تاریكی كوفرو سته‌مه تێیدا، له‌هه‌مان كاتدا هه‌واڵی نزیك بوونه‌وه‌ی له‌دونیا ده‌رچوونی پێغه‌مبه‌ریش ده‌گه‌یه‌نێ، فه‌رمانی پی ده‌كا به‌ته‌سبیح‌و ته‌قدیسی خوداو داوای لێ خۆشبوون.

**كاتی نازڵبوونی ئه‌م سووره‌ته راجیایی زانایانی ئیسلامی تێدایه:**

١- هه‌ندێك پێیان وایه ڕزگاركردنی مه‌ككه ساڵی هه‌شته‌می كۆچی بووه ئه‌م سوره‌ته ساڵی ده‌یه‌می كۆچی نازڵ بووه، پێغه‌مبه‌ر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) دوای نازڵبوونی ئه‌م سوره‌ته حه‌فتا ڕۆژ ژیاوه، له‌مانگی ره‌بیعول ئه‌وه‌ڵی ساڵی ده‌یه‌می كۆچیدا وه‌فاتی كردووه، بۆیه له‌هه‌ندێك ڕیوایه‌تدا هاتووه ئه‌م سوره‌ته ناوی سوره‌تی (التوديع)ه، سوره‌تی خوداحافیزی.

٢- كۆمه‌ڵێكی تر پێیان وایه: ئه‌م سوره‌ته له‌پێش ڕزگار كردنی مه‌ككه‌دا نازڵ بووه، خوداواده‌ی به پێغه‌مبه‌ر داوه: كه به‌سه‌ر قوڕه‌یشییه‌كاندا بالاده‌ستی ده‌كاو شاری مه‌ككه ده‌كه‌وێته ژێر ركێفی پێغه‌مبه‌ره‌وه‌و، موژده‌یه‌كه‌و پێشوه‌خت پێی دراوه.

نموونه‌ی ئه‌م ئایه‌ته ئایه‌تی ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ – القصص/٨٥﴾. له‌لایه‌كی تره‌وه وشه‌ی ﴿إِذَا﴾ له سوره‌ته‌كه‌دا داخوازی ئه‌وه‌یه سه‌ركه‌وتن‌و ڕزگاركردنه كه له داهاتوودا بێ نه‌ك ڕابوردبێ. به‌گوێره‌ی ئه‌م ڕایه

هەوڵدان لەڕزگارکردنی مەککە هەواڵی نهێنییەو خودا بە پێغەمبەری خۆی ڕاگەیاندووەو جۆرێکە لە موعجیزە.

بەڵام بەگوێرەی ڕیوایەتەکەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) ڕای یەکەم پەسەندە، عەبدوڵلا دەفەرموێ: ئەم سورەتە لەمینا لە حەجیماڵئاوایدا نازڵبووە، پاشان ئایەتی ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي – المائدة/٣﴾. نازڵ بووە، پێغەمبەر دوای نازڵبوونی ئەم ئایەتە هەشتا ڕۆژ ژیاوە، پاشان ئایەتی ﴿الْكَلاَلَةِ﴾ی کۆتایی سورەتی (النساء) نازڵ بووە، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) دوای نازڵبوونی پەنجا ڕۆژ ژیاوە، ئەمجار ئایەتی ﴿لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ – التوبة/١٨٢﴾. نازڵ بووە، پاش ئەوە سی‌و پێنج ڕۆژ ژیاوە، ئەمجار ئایەتی ﴿وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ – البقرة/٢٨١﴾. نازڵ بووە، دوای نازڵبوونی ئەم ئایەتە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) بیست‌و یەك ڕۆژ ژیاوە، موقاتیل دەڵێ: حەوت ڕۆژ ژیاوە.

ئیمام ئەحمەدو بەیهەقی‌و نەسائی لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکەن دەڵێ: کە سورەتی ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ...﴾ نازڵ بوو پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَلَيهِ وسَلم) فەرمووی: هەواڵی مەرگی خۆم ڕادەگەیەنم، ئا لەم ساڵەدا دەمرم!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ﴿٣﴾﴾

دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ﴾ ئەی محمد! هەرکاتێ بەسەر دوژمنە قورەیشییەکانتدا زاڵ بووی‌و یارمەتیدانی خودات بۆ دەستەبەر بوو، شاری مەککەت بۆ ڕزگار کراو بالادەست بووی.

﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجاً﴾ ئادەمیزادی بەرەگەز عەرەب‌و ناعەرەبت بینین پۆل پۆل دەهاتنە ژێر خێوەتی ئیسلامەوەو موسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، ئەوە ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّاباً﴾ لەپاساوی ئەو نیعمەتە گەورەیەدا ئەتۆ شوکرو سوپاسی خودا بکە، نوێژەکانت بەرێك‌و پێکی ئەنجام بدە، بەردەوام بە لەسەر یەکتاپەرستی‌و هەر شتێك بۆخودا نەشێ پاڵی مەدەو لێی دوور بخەرەوە، حەمدو سەناو تەسبیحی خودا بکە، داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، بۆ ئەوەی ئوممەتەکەت چاوت لێ بکاو داوای لێ خۆشبوونی خودا بکە، هەروەها داوای چاوپۆشی لەتاوانی موسوڵمانانیش بکە، چونکە خودا بەزۆری لەتاوان‌و هەڵەی تۆبەکاران خۆش دەبێ!

هەموو نیعمەتێکی خودا شیاوی ئەوەیە سوپاس‌و حەمدی خودای لەسەر بکرێ، یەکێك لە نیعمەتە گەورەکانی خودا بەسەر پێغەمبەرو موسوڵماناندا بالادەستبوونی پێغەمبەرە بەسەر دوژمنەکانیدا، ڕزگار کردنی مەککەیە، قیبلەی موسوڵمانان مەڵبەندی کابەی پیرۆز. وێڕای ئەم نیعمەتە گەورەو پیرۆزە، خودا نیعمەتێکی تری گەورەی بە پێغەمبەر بەخشی، ئەویش بریتی بوو لە موسوڵمان بوونی عەرەبەکان پۆل پۆل‌و کۆمەڵ کۆمەڵ بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام بەناو نیوەدورگەی عەرەبدا، بۆیە لەکۆتای سورەتەکەدا پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەکا: کە زۆر سوپاسی خودا بکەن‌و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن، هەرچەندە فەرمانەکە ڕاستەوخۆ ئاراستەی پێغەمبەر کراوە، وەلێ لەکاتێکدا ئەو لەگەڵ ئەوەدا مەعصوومەو بەدەقی قورئان خودا لەهەموو تاوانێکی خۆش بووە ئەگەر هەیبێ، فەرمان بەو بکرێ بۆ تۆبەکردن دیارە ئوممەتەکەی زیاتر پێویستە تۆبەو ئیستیغفار بکەن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# سورەتی (المسد)

ئەم سورەتە مەککییەو پێنج ئایەتە، ناوی نراوە سورەتی (المسد) چونکە لەکۆتایی سورەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ﴾ ناوەڕۆکی ئەم سورەتە بریتییە لەدیاری کردنی سەرەنجامی ئەبو لەهەب (عبدالعزى بن عبدالمطلب) مامی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) هەروەها سەرەنجامی ژنەکەشی (أم جميل) کەناوی (ئەروا)ی کچی (حەرب)ە خوشکی ئەبوسوفیانە ئەم ژنو مێردە زۆریان ئەزیەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) داوە، زۆریان دژایەتی کردوو گەلێك هەوڵیاندا کەسانی دیکە مەنع بکەن لەئیمان هێنان...

لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا هاتووە لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموێ: کە ئایەتی ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ – الشعراء/٢١٤﴾. نازڵ بوو پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) چووە سەر کێوی صەفاو بەدەنگی بەرز فەرمووی: (یا صباحاه!)و هاواری کرد، خەڵکەکە وتیان: ئەو هاتو هاوارە چیە؟ وتیان ئەوە موحەممەدە، ئیتر قوڕەیش لێی کۆبونەوە.

ئەمجار فەرمووی: ئەی خێڵی فلان، ئەی هۆزی فیسار، ئەی بنەماڵەی فلان، ئەی نەوەی (عبد المناف) ئەی نەوەی (عبدالمطلب) هەموو گوێ قوڵاخبوون جاخۆ دەڵێ چی؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر من پێتان بڵێم: ئەوە دوژمن بەهێزی تەیارەوە وا لەپشت ئەو کێوەوە خۆی ئامادە کردووە بۆ هێرشکردن بۆ سەرتان، ئایا بڕوام پێ دەکەن؟ هەموویان وتیان: تا ئێستا درۆمان لێ نەبینیوی، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فەرمووی: «فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ» ئەبو لەهەب وتی: دەك داوەشێی ئەوە بۆ ئەمە ئێمەت کۆکردۆتەوە؟ ئیتر سورەتی ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ...﴾ نازڵ بوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ٣ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ٤ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ٥﴾

دەفەرموێ: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ دەك لەناو بچێ دوو دەستی ئەبو لەهەبو برزن، واتە: بەهیلاك بچێو بفەوتێ ئەبو لەهەب، خۆ فەوتاو لەناو چوو، خەسارەتمەندی دوونیاو قیامەت بوو، لەهەردوو دونیادا بەدبەختو چارەڕەش بوو.

﴿مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ﴾ ماڵو سامانو ناوو شۆرەت، ڕۆژی قیامەت فریاری نەکەوت لەعەزابی خودا نەیپاراست، فەوتانی مسۆگەر بوو بۆیە بە (کرداری ڕابوردو) تەعبیری لێ دایەوە، ئەوەبوو لەدوای جەنگی بەدر بەچەند ڕۆژێك دەردێکی پیسی تووش بوو بە گەڕۆڵی مرد!

ئەبو لەهەب هێندەی ڕق لە پێغەمبەر بوو، پێش ئەوەی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وسلم) نیگای بۆ بێ، ئەبو لەهەب دوو کچی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وسلم) کە (رقية)و (أم كلثوم) بوون بۆ دوو کوڕی خۆی خواستبوونی بوکی بوون.

کە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وسلم) بانگەوازی ئیسلامی ئاشکرا کرد، ئەبو لەهەب زەختی لەکوڕەکانی کرد: کە کچەکانی پێغەمبەر تەلاق بدەن، بۆ ئەوەی پێغەمبەر (صَلى اللهُ عليهِ وسلم) پێی دڵتەنگ بێو پتر زەختی بکەوێتە سەر!

﴿سَيَصْلَى نَاراً ذَاتَ لَهَبٍ﴾ لەقیامەتدا ئەبو لەهەب دەچێتە ناو ئاگری بڵێسەدارو هەڵگیرساو.

﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ ژنەکەشی کە ناوی (أم جمیل)ە لەگەڵ ئەبو لەھەبدا دەچێتە ناو دۆزەخەوە، لەواقیعدا ھەڵگری چاوگی فیتنەو ئاشووبە، فیتنەو دوو زوبانێکە ھەمیشە لەھەوڵو تەقەڵلادایە بۆ ئاشوب نانەوە لەنێوان پێغەمبەرو مەردومدا.

یان ﴿حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە درِكو چقڵی لەکۆڵی خۆی دەداو بەشەو دەچوو لەسەر رێگای پێغەمبەر (صَلی اللهُ علیهِ وسلم) بڵاوی دەکردەوە.

﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ﴾ گوریسێکی ئەستوری بادراو لەپوشی خورما وا لەملیاو ھەمیشە کۆڵەداری فیتنەیی‌و ئاشوبی بەکۆڵەوەیەو دێو دەچێ بۆ نانەوەی ئاژاوەو خۆش کردنی ئاگری فیتنەیی.

یان چۆن لەدونیادا ئەو ژنە ھەڵزگو درِكو چقڵ ھەڵدەگرێو دەچێ لەسەر رێگای پێغەمبەر بڵاویان دەکاتەوە بۆ ھەڵگیرساندنی ئاگری فیتنەیی، رِۆژی قیامەت زنجیری ئاگرینی لەمل دەکرێو بەو جۆرە سزا دەدرێ، چونکە ھەموو تاوانبارێك رِۆژی قیامەت بەشتێك سزا دەدرێن: کە لەگەڵ تاوانەکەیاندا بگونجێ لەجۆری تاوانەکەیان بێ.

مانایەکی تریش ھەڵدەگرێ، ئەوەیش ئەوەیە: دەفەرموێ: ئەو ژنە بەدبەختە زۆر خۆی ماندوو دەکا بۆ ئاشوب نانەوەو دوو زوبانیو ھەڵگیرسانی ئاگری فیتنەیی، بەم شێوەیەی دەڵێی گوریسێکی ئەستووری بادراوی ناشیرینی لەملدایەو کۆڵێك ھەلیزگو چقڵی لەکۆڵی خۆی شەتەك داوە بۆ ھەڵگیرساندنی ئاگری فیتنەیی، ئەمجار دیمەنی ئەو کۆڵ ھەڵگرە گوریس لەملە چەند ناشیرینە بەتایبەتی ئەگەر ئافرەت بێ ئەو ژنەی ئەبو لەھەبیش لەدووزمانیو فیتنە نانەوەدا ئەوەندە دیمەنی ناشیرینو قیزەونە.

زانایانی ئیسلام فەرموویانە ئەم سورەتە موعجیزەیەکی گەورەیەو نیشانەی

ڕاستی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەدە. چونکە لەو کاتەوە ئەم سورەتە نازڵ بووە هەواڵی لە بەدبەختی ئەبو لەهەبو ژنەکەی داو ئەوەی ڕاگەیاند: کە ئەوان ئیمان ناهێنن، هیچ کامێ لەم ژنو مێردە، یان هەردووکیان نە بە ئاشکراو نە بەنهێنی ئیمانیان نەهێناو بەکافری سەریان نایەوە، قسەکەی قورئان ڕاست دەرچوو تەعبیر بوو لەواقیع.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الإخلاص)

ئەم سورەتە مەککییەو چوار ئایەتە، زۆر ناوی لێ نراون: بەناوبانگترینیان (سورة الإخلاص)ە هەروەها پێی دەگوترێ: (سورة التفريد) یان (سورة التجريد) یان (سورة التوحيد) یان (سورة النجاة) یان (سورة الولاية) یان (سورة الأساس).

ئەم سورەتە کورتە هاوسەنگی سێیەکی قورئانە، وەکوو لەڕیوایەتی صەحیحدا هاتووە، ئیمامی بوخاری لەئەبو سەعدەوە فەرموودەیەك ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: پیاوێك گوێی لە پیاوێك دەبێ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێنێ‌و دووبارەی دەکاتەوە، کە ڕۆژ دەبێتەوە دێتە خزمەت پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) باسی ئەوەی بۆ دەکا: کە گوێی لێ بووە کابرایەك شەو ئەم سورەتەی دەخوێندەوەو دووبارەو سێ بارەی کردۆتەوە، کابرا بەشتێکی کەمی دەزانی، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرآنِ» سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەو سورەتە هاوتای سێیەکی قورئانە!

ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نیە سورەتێکی وا بچکۆلە هاوتای سێیەکی قورئان بێ. چونکە بێگومان ئەو یەکتاپەرستییەی تێیدا فەرمان بە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) کراوە ڕایگەیەنێ، ئەو یەکتاییەی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ ئاماژەی پێ دەکا، یەکتاییە لە بیروباوەڕدا، تەفسیرە بۆ بوونەوەر، قانونو یاسایە بۆ

ژیان، کەواتە ئەم سورەتە پانترین هێڵی سەرەکی دەربارەی حەقیقەتی ئیسلام ڕا دەنوێنێ. ئەوە دەچەسپێنێ کە هیچ خودایەك حەق نیە زاتی خودا نەبێ، کەس هاوشانی نیەو کەس لەوێنەی نیە. هیچ حەقیقەتێك نیە جگە لەحەقیقەتی خودا، هیچ بونێك نیە جگە لە بوونی حەقیقەتی خودا، هەموو هەبوویەکی تر هەبوونەکەی لەهەبونی خوداوە وەردەگرێ هەر ئەو بکەری حەقیقییەو ئەو بەڕێوەبەرو بەدیهێنەری بوونەوەرە هەموو وجودێك، هەموو بکەرێك لەزاتی پاکی خوداوە سەرچاوە دەگرێو هێزو توانا لەو وەردەگرێ. هەر ئەو شیاوی پەرستنو روتێکردنو هانا بۆ بردنە لە خۆشیو ناخۆشیدا بە ئاشکراو بەنهێنی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾﴾

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ ئەی محمد! بەو کەسانە بڵێ: کە پرسیارت لێ دەکەن خودای تۆ چۆنەو چیە؟ بڵێ: خەبەری ڕاستو واقیع ئەوەیە ئەو خودایە کە (واجب الوجود)ە، بوونی پێویستەو نەبوونی نابێ، ناوی (الله)یەو تاكو تەنهایە لەزاتو سیفاتیدا، کەس هاوەڵی نیەو بێ نموونەو هاوشانە، واتە: ئەو خودایەی ئێوە دەیناسنو دان بەوەدا دەنێن، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە ئێوەشی بەدیهێناوە یەکەو تاكو تەنهایە لەخودایەتیدا. کەس هاوشانی نیە لەخودایەتیدا، لەهەموو رویەکەوە تاكو تەنهایە!!

﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ هەر ئەڵلا داوای لێ دەکرێ بۆ دابین کردنی پێویستی، بۆ هەموو

کارێك داوا لەو دەکرێ، چونکە هەر ئەو دەتوانێ بەهانای ئاتاجانەوە بێ، واتە: (الله) ئەو خودایەیە هەموو دروستکراوێك پەنای بۆ دەبا، کەس بێ ئەو ناتوانێ ببێو بژی، هەموو کەس موحتاجی ئەوە، ئەویش هیچ پێویستی بە ئەوان نیە، بوونی مەخلوقات لەخودایەتی ئەو زیاد ناکا نەبوونیشیان لەخودایەتی ئەو کەم ناکا.

ئیبنو عەبباس لەمانای (الصمد)دا دەفەرموێ: واتە: ئەو کەسەی هەموو مەخلوقات داوای لێ دەکەن بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستیەکانیان، گەورەیە کە لەو ئەوپەڕی گەورەیدایە، ڕێزدارێکە ڕێزی بێ سنورە، شکۆمەندێکە لەنیهایەتی شکۆمەندیدایە، لەرەوشتی حیلمو عیلمدا فەردی موتلەقە، خودایەکە هەرچی صیفەتی کەمالو جەمالو جەلال هەیە هەیەتی، لەهەموو عەیبو خەوشێك پاكو مونەززەهە. ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ مندالی لێ نەبووە، لەکەسیش نەبووە، نە مندالی هەیە نە باوكو دایکی هەیە، چونکە زاتێکە لەکەس ناچێ، قەدیمەو سەرەتای بوونی نیە، کاتێك نەبووە ئەو نەبووبێ، قەبارەو مادە نیە، لەهیچ شتێك ناکاو کەس لەو ناکا، بەمەش رەدی ئەوانەی دایەوە کە دەڵێن: فریشتە کچی خودان، هەروەها رەتدانەوەی بیروباوەڕی جوولەکەکانە: کە دەیانگوت: عوزەیر کوڕی خودایە، یان مەسیحییەکان کە دەڵێن: عیسا کوڕی خودایە، بەڵکوو رەدی هەموو بیروباوەڕە پوچو بەتاڵەکانی دایەوە. ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾ کەس نیە هاوشانی ئەو بێ، نە لەحەقیقەتی بوونیدا، نە لەحەقیقەتی فەرمانو کردەوەیدا، خودایەکە بەبێ ئیزنو مەشیئەتی ئەو هیچ کارێك ئەنجام نادرێ، هەر ئەو گەورەیەو گەورەی تر نین، هەر ئەو خودایەو ئادەمیزادو جندۆکەو فریشتە هەموویان بەندەی ئەون، حەقیقەتی خودا پایەدارو ئەزەلیو ئەبەدییە، هەر بووەو هەر دەبێ، گۆڕانی بەسەردا نایە، خوایەکە تاكو تەنهاو بێ هاوەڵو بێ منداڵو بێ خێزانو بێ هاوسەرە!!

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الفلق)

ئەم سورەتە پێنج ئایەتە بەلای (الحسن)و عەطاو عیکریمەو جابیرەوە مەککییە، جەماوەری زانایانیش هەر پێیان وایە، ئیبنو عەبباسو قەتادەو کۆمەڵێکی تر دەفەرموون مەدەنییە، ناوی نراوە سورەتی (الفلق) چونکە سەرەتاکەی بە ئایەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ دەستی پێ کراوە، فەلەق: لەتبوونو لێ جیابوونەوەی شتێکە لەشتێك، دانەوێڵە: کە لەژێر خاکدا شەق دەبێ، بادامو فستەق کە دەم دەکەنەوە، ئاو لەکێو هەڵدەقوڵێ، باران کە لەهەور دێتە خوار، منداڵ کە لەدایك دەبێ... هتد. وشەی (فلق) دەیانگرێتەوە.

سورەتەکە خۆ پەناگرتنی بەخودا لەخۆگرتووە لەشەڕو نەگبەتی مەخلووقات، بەتایبەتی بەڵاو موصیبەتی ناو تاریکایی شەو، فرتو فێڵی جادوگەرو فیتنە جۆیانو دڵ پیسو حەسوودو چاو پیسەکان، فەرمان دەکا بەوەی ئادەمیزاد پەنا بگرن بەخودا لەو نەخۆشییە دەروونیانەی زیان دەگەیەنن.

داوای پارێزگاری لەخودا بکەن لەو گیانلەبەرە ژەهراوییانەی زیان دەگەیەنن، پەنا بگرن بەخودا لەشەڕی تاریکی: کە بوونەوەر دادەپۆشێ بەتایبەتی لە بیابانو کێوو کەژدا، چونکە زۆرجار کارەساتی جۆراو جۆری تێدا دێنە دی.

بوخاریو خاوەنانی سونەن لەباسی داواکردنی شیفا بەم سێ سورەتە (الإخلاص)و (المعوذتين) لەخاتو عائیشەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وسَلَم) هەموو شەوێ کەدەچووە سەرجێگا بۆ نووستن، هەردوو دەستی دەکردنەوەو دەپاڕایەوە، پاشان فووی لەناو دەستەکانی دەکردو ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ی دەخوێندو ئەمجار بەهەردوو دەستی سێجار دەموچاوی سەرو شانو ملو سنگی خۆی مەسح دەکرد، ئەمجار رادەکشا!

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾﴾

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ من پەنا دەگرم بەو خودایەی پەردەی نەبوونی لەت کردو بوونەوەری لێ دەرهێنا، یان پەنا دەگرم بەخودای بەیانی، کە بەو نوورو روناکییەی ئارامی دەخاتەوەو ترس‌و خۆفی تاریکی لادەبا، یان پەنا دەگرم بەخودایەك بەدیهێنەری هەموو بوونەوەرە، پەنا دەگرم بەزاتی پاکی لەشەڕو نەگبەتی هەرچی دروست کردووە، بەهەموو جۆرێك‌و هەموو کاتێك پەنا دەگرم لەشەڕی مەخلووقاتی خودا، چونکە مەخلووقات لەکاتی بەیەك گەیشتن‌و لێك نزیکبوونەوەدا هەندێ جار زیان بەیەکتر دەگەیەنن، هەر وەکوو چۆن لە حاڵاتی تردا خێرو بێریان بۆ یەکتر هەیە.

پەناگرتن بەخودا لێرەدا بۆ ئەوەیە شەڕ لابەرێ‌و خێر بێنێ، شەڕ لاداو خێر دەستەبەر بکا، حاڵ‌و وەزعەکان وابگۆڕێ خێریان تێدابێ‌و لەشەڕ دووربن.

﴿وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾ پەنابگرە لەشەڕو نەگبەتی شەو کە بەتاریکی خۆی بەسەر بوونەوەردا دەکشێ‌و مەردووم دادەپۆشێ بەرەنگێك، کە رزگاربوونی لێ ناکرێ‌و دەبێتە مایەی ترس‌و بیمێکی زۆر، چونکە کاتێك شەو رووی زەوی دادەپۆشێ لەگەڵ خۆیدا ترس دێنێ، لەماڵدا بێ ترسی ئەوەت هەیە دوژمنت فرسەتت لێ بێنێ‌و زیانت پێ بگەیەنێ، ئەگەر لەرێگاو بانای ترسی رێ گومکردنت هەیە، ترسی هەڵەنگوتن‌و هەڵدێران‌و پێوەدانی مارو دووپشك‌و پەلاماردانی

چەتەو پیاوی ڕێگرت هەیە، هەروا خەیاڵو بیرۆکەی ترسناك کە لەهەموو لایەکەوە لێت کۆدەبنەوە، ختوکەی شەیتانو وەسوەسەی شەیاتینیو شەهوەتو ئارەزۆو گەلێ شتی تر کە بەهۆی تاریکی شەوەوە پەیدادەبن.

﴿وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ﴾ پەنا بگرە لەزیانی ئەو دوو ڕوو دوو زمانانەی بەردەوام خەریکی تێکدانی نێوان باوكو فەرزەندەو ژنو مێردو خزمو کەسوکارو برادەرانن، دڵیان لەیەکتر کرمێ دەکەن، فێڵ لەهەستو شعوری ئەمو ئەو دەکەنو لەخشتەیان دەبەن؟ بەڕواڵەت جادوبازی دەکەن، گرێ لەداوە دەزوو دەسەسڕ دەدەنو فووی پێدادەکەنو لاسایی ساحیرەکان دەکەنەوەو پەیڕەوی دابو نەریتی ئەوان دەکەن.

لەڕاستیدا سیحر سروشتی شتەکان ناگۆڕێو حەقیقەتێکی تر بۆ ئەو شتە دروست ناکا، بەڵام هەستەکان وا لێ دەکا گەردنکەچی ویستی ساحیرەکە بن، چاو بەستەکی لەسیحر لێکراو دەکرێو ڕاستییەکانی لێ دەگۆڕێنو حاڵەتە بینراوەکەی لێ دەبێتە حەقیقەتو ڕاستیو تەسلیمیان دەبێ.

تەنانەت حەزرەتی موسا (عَلَيْهِ السَّلاَم) وێڕای پلەی پێغەمبەرایەتی کە مارە درۆزنەکانی ساحیرەکانی بینی خەیاڵی بۆ ئەوە چوو کە ماری ڕاستینو لەدڵی خۆیدا ترسی لێ پەیدا بوو!

وەکوو قورئان ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَالُوا يَا مُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى، قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى، فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُوسَى، قُلْنَا لا تَخَفْ إِنَّكَ أَنْتَ الأَعْلَى، وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى – طه/٦٥-٦٩﴾.

بێگومان گوریسو گۆچانەکانیان نەبوو بوونە ماری ڕاستی، وەلێ حاڵەتێکیان دروست کرد تەماشاکەرانو موساش لەگەڵیان وایان زانی ماری زیندوون ئەو جەمو

جوڵەیان حەقیقەتە، بەجۆرێك حەزرەتی موسا ترسی لێ پەیدابوو، ئیتر خوا پشتگیری کردوو نەیهێشت ئەو حاڵەتەی بەردەوام بێ، پاشان راستی دەرکەوت کاتێك عەصای موسا بوو بەماری راستەقینەو مارە درۆزنەکانی ئەوانی هەڵلووشین.

بەڵێ ئەومیە سروشتی سیحرو پشت بەکاراماییو دەست سووکیو چاو بەستەکی دەبەستێو فێڵ لە بینەران دەکرێ، پێویستە ئاوا لەسیحر حاڵی بینو بەو جۆرە بڕوامان پێی هەبێ...

چەند ریوایەتێك هەن دەربارەی ئەوە: گوایە لەبیدی کوڕی (الاعصم)ی جولەکە سیحری لە پێغەمبەر کردبێ، ریوایەتەکە موسلیمو بوخاریش لە عائیشەوە ریوایەتیان کردووە[1].

بەڵام ئەو ریوایەتانە لەگەل پلەو پایەی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەدا رێك ناکەون، چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسلَّم) هەموو وتەو کردەومیەکی تەشریعەو دەبێ پەیرەو بکرێ، دەی ئەگەر پێغەمبەر سیحری لێ کرابێو برێ جار شتێکی نەکردبێ وای زانیبێ کردوویەتیو بە پێچەوانەشەوە، چۆن وتەو کردەوەی ئەم حاڵەی بەکەڵکی ئەوەدێن ببنە تەشریع!

لەلایەکی ترەوە: کە موشریکەکان دەیانگوت: پێغەمبەر سیحری لێ کراوەو (مسحور)ە قورئان بەتوندی ئەم بۆچوونەی قورەیشییەکانی رەتکردەوە، بۆیە دەبێ ئەو ریوایەتانە بەدوور لەواقیع بزانینو هەوڵ بدەین تەئویلو پێچو پەنایان بۆ بدۆزینەوە، (حدیث آحاد)یش لەبواری عەقیدەدا پشتی پێ نابەسترێ، ئەو ریوایەتانە هیچیان نەگەیشتوونە پلەی تەواتور. ئەمجار ئەگەر سورەتەکە مەککی بێ وەکوو جەماوەری زانایان ئاماژەیان پێ کردووە، ئەوە ئەوەندەی تر بناغەی ریوایەتەکان بن هەڵۆڵ دەبێ.

---

[1] سەیری بوخاری (٥٩) کتاب بدء الخلق (١١) باب صفة أبليس وجنوده (الحديث: ٣٢٦٨) بکە هەروەها سەیری صەحیحی موسلیم (٣٩) کتاب السلام (١٧) باب السحر الحديث (٢١٨٩/٤٣) بکە.

﴿وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ پەنا بگرە لەشەڕی هەموو حەسوودێك كە حەسوودی بەمەردومان دەبا ئاواتەخوازی ئەوەیە نازو نیعمەتێك كەخودا بەخشیویەتی بەكەسانی دیكە لەدەستیان دەرچێ و نەمێنێ.

حەسوود كەسێكە حەسوودی بەكەسانی دیكە دەباو ئاواتەخوازی ئەوەیە ئەو نازو نیعمەتەی هەیانە لەكیسیان بچێ، جا بكەوێتە دەست حەسوودەكە خۆی، یان نا! ئەمە رەوشتێكی ناشیرین و قێزلێكراوە، پێویستە موسوڵمان خۆی لێ بپارێزێ، هەوڵ بدا لەدڵ و دەروونی خۆیدا نەیان هێڵێ.

غیبطة: بریتییە لەوە ئاواتەخوازبی ئەو نازو نیعمەتەی كەسانی دیكە هەیانە تۆش هەتبێ، بەبێ ئەوەی لەكیس ئەوان بچێ، ئەمە دروستە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فەرموویەتی: (المؤمن يغبط والمنافق يحسد) موسوڵمان غیبطەی هەیە پێی خۆشە خوداوەكوو خاوەن نیعمەتەكان نیعمەتی پێ بدا، دووڕوو حەسوود پێی خۆشە خودا نیعمەتەكانی لەكەسانی دی وەربگرێتەوە، دڵی بەوە تەنگ دەبێ كە دەبینی كەسانی دی لەخۆشیدان.

زانایان دەفەرموون حەسوود هەتا حەسوودییەكەی بەكردەوە یان بەقسە دەرنەخا زیانی نابێ، بەم جۆرە حەسوودییەكەی وای لێ بكا بەكردەوە زیان بەو كەسە بگەیەنێ كە نیعمەتەكەی هەیە.

هەندێكی تر لەزانایان فەرموویانە سیحرو چاوەزارو حەسوودی بەبێ ئیزنی خودا زیان ناگەیەنن، چونكە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُمْ بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ – البقره/١٠٢﴾.

وەلێ لەڕووی شەرعەوە پێویستە خۆپارێزیان لێ بكەین، چونكە حەزرەتی عومەرو هاوەڵان هەرچەندە بڕوایان وابوو كە هیچ شتێك بەبێ ئیزنی خودا نابێ، وەلێ بەڕواڵەت لە تاعوونی عەمواسدا قورەتینەیان داناو خۆپارێزییان لێ كرد.

هەروەها چونكە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فەرمانی كرد كە خۆپارێزی

لەچاو پیس بکرێ، هەروەها لەترسی گول بەراکردن هەڵیی.

زۆربەی زۆری زانایانی ئیسلام پێیان وایە: دروستە پشت بەدووعاو پاڕانەوە ببەسترێ بۆ نەخۆش، چونکە پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) ئازاری هەبوو حەزرەتی جوبرائیل ئەم دووعایەی بەسەردا خوێند فەرمووی: (بسم الله أرقيك، من كل شئ يؤذي من شر حاسد وعين والله يشفيك)[1].

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) فێری دەکردین: کە لەکاتی ئێش‌و ئازاری جەستەمانداو لەکاتی لەرزو تادا ئەم دووعایە بخوێنین (أعوذ بالله العظيم من شر كل عرق نعار ومن شر حر النار).

هەر پێغەمبەر لە فەرموودەیەکی تریدا دەفەرموێ: هەرکەسێك چووە لای نەخۆش، ئەم دووعایە حەوت جار بخوێنێ‌و بڵێ: (أسأل الله العظيم رب العرش العظيم ان يشفيك) بەمەرجێ نەخۆشی مردنی نەبێ شیفای دێ.

عوسمانی کوڕی ئەبولعاصی ئەقەفی دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) ئازارێکم هەبوو خەریك بوو تێك بچم پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) فەرمووی: دەستی راستت لەسەر شوێنی ئازارەکە دابنێ‌و حەوت جار بڵێ: (بسم الله أعوذ بعزة الله وقدرته من شر ما أجد) منیش وام کرد، ئیتر خودا شیفای دام.

ئیمام عەلی دەڵێ: پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) کە دەچوو بۆلای نەخۆشێك ئەم دووعایەی دەفەرموو: (اذهب البأس رب الناس، إشف انت الشافي، لا شافي الا أنت).

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) دووعای بەسەر حەسەن‌و حوسەیندا دەخوێندو دەیفەرموو: (أعيذكما بكلمات الله التامة، من كل شيطان وهامة، ومن كل عين لامة).

هەروەها ریوایەت کراوە هەرکاتێ پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) بچوبایە

---

[1] رواه الإمام أحمد في مسنده الحديث (٢٢٨٢٤ ج٨).

بۆ شوێنێك، دەیفەرموو: ئەی زەوییەكە خودای منو خودای تۆ (الله)یە پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕی خۆتو شەڕی ئەو شتانەی تێتدایە، لەشەڕی ئەوەی لێت دەردەچێ، لەشەڕی ئەو شتانەی بەسەرتدا دێنو دەڕۆن، پەنا دەگرم لەشێرو دڕندەو مارو دووپشك، لەشەڕی دانیشتوانی ئەم هەرێمە...[١].

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## سورەتی (الناس)

ئەم سورەتە شەش ئایەتە، بەلای زۆربەی زانایانەوە مەككییەو بەلای هەندێكی ترەوە مەدەنییە، وەكوو سورەتی (فەلەق). ئەم سورەتە دوا سورەتە لە تەرتیبی قورئاندا، یەكەم سورەتیشی سورەتی فاتیحایە، سورەتی فاتیحە بە پیتی (ب) دەست پێ دەكاو سورەتی (الناس)یش بە پیتی (س) كۆتایی دێ، ئەم دوو پیتە بخەرە پەنایەكەوە وشەی (بس) پێك دێنن وێدەچێ ئاماژەبێ بۆ ئەو راستیە: كە ناو دووتوێی ئەم قورئانەی سەرەتای (ب)یو كۆتایی (س)ە كیفایەتە بۆ بەرنامەی ژیانو هەركەسێ پابەندی بێ بەسیەتیو حەوێجەی بەهیچی تر نیە.

﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾

[١] هەركەسێ بیەوێ زیاتر لەم بارەیەوە قوڵ بێتەوە با بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەكانی وەك تەفسیر طەبەری ج ١٠/١٨٥ — ١٩١ تەفسیری رازی ج ٣٢/١٨٩ — ١٩٠.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ ئەی محمد! بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری ئادەمیزاد، بەچاودێرو بەخێوکەریان.

﴿مَلِكِ النَّاسِ﴾ بە خاوەنو پاشای ئادەمیزاد ئەو کەسەی دەسەلاتی تەواوو رەهای هەیە، ﴿إِلَهِ النَّاسِ﴾ بە پەرستراوی ئادەمیزاد، کە هەر ئەو شیاوی بەندایەتی بۆ کردنو پەرستنە، هەر ئەو پەروەردگاری ئادەمیزادە، پاشای ئادەمیزادە، خوداو پەرستراوی ئادەمیزادە هەموو بوونەوەر دروستکراوی ئەوە، ملکی ئەوە، بەندەی ئەوە، بڵێ: من پەنا دەگرم بەو خوایەی خاوەنی ئەو صیفەتو رەوشتانەیە.

﴿مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ﴾ لەشەڕو زوبانی شەیتانی ختوکەدەر، ئەو شەیتانەی سەرەتاتکە لە ئادەمیزاد دەکا، دێتە پێشەوەو دەچێتە دواوە، خۆ لە ئادەمیزاد نزیك دەکاتەوە بۆئەوەی تاوانی پێ ئەنجام بدا، کە ناوی خودای هێنا دەکشێتەوە بۆ دواوە. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: شەیتان لەسەر دڵی ئادەمیزاد مۆتەکەی داوە، هەر کە ئادەمیزادەکە غافڵ بوو خودای لەبیرچووە، ختوکەی دڵی دەداو لەخشتەی دەبا، کەناوی خودای هێنا دەکشێتە دواوە.

ئادەمیزادی رەفتار شەیتانیش هەمان هەڵسو کەوتی هەیە، بۆ نموونە ئەگەر فیتنەو دوو زمانێك بیەوێ لای یەکێك مەبەستی پیسی خۆی ئەنجام بدا، ئەگەر ئەم بابایە بڕوای پی نەکردو دایەوە بەدەمیاو تەریقی کردەوە، خێرا ئەوکەسە پەشیمان دەبێتەوەو قسەکەی خۆی سەحب دەکاتەوەو دەکەوێتە گۆڕینی قسەکانیو دەیەوێ پاشەکشە بکا.

خۆ ئەگەر گوێی بۆ کلۆر کردو بە قسەی فیتنە ئامێزەکانی هەڵپەڕی ئەوە درێژە بە بوختانو دوو زمانییەکەی دەداو شوێنی لێ هەڵدەکێشێ.

پێویستە ئادەمیزاد بەرامبەر (خەنناس) چ شەیتان بێ یان ئادەمیزادی رەفتار شەیتان بێ، مەردانە بەرامبەریان بوەستێ، چونکە شەیتان کاتێك دەتوانێ کاریگەری خراپی خۆی بەرامبەر ئادەمیزاد بنوێنێ، ئەگەر ئەو ئادەمیزادە لەخودا

غافل بێ، خۆی نەخستبێتە ژێر حیمایەی پەروەردگار، هەروەها بەنیسبەت دوو زمانو بوختانکەرانەوە، ئەگەر تۆزێك پیاوانە هەڵوێست بنوێنێو بەگژیاندا بچێتەوە زوو پەشیمان دەبنەوە، هەوڵ دەدەن قسەکانیان قووت بدەنەوە.

بێگومان خودا شەیتانی بالاّ دەست کردووە بەسەر ئادەمیزاددا – مەگەر کەسێك نەبێ کەخودا پاراستبێتی – ئەمەش بۆ تاقیکردنەوەو لەبۆتەدانە، لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرموویەتی: هیچ کەسێ نییە لەئێوە ئیللا شەیتانێکی بۆ دیاری کراوە، هاوەڵان وتیان: ئەتۆش ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: بەڵێ منیش، وەڵێ ئەوەندە هەیە خودا منی بەسەر ئەودا زاڵ کردووە، موسوڵمان بووە، هەر بۆ کاری چاك هەڵم دەنێ.

لە صەحیحی موسلیمو بوخاریدا فەرموودەیەك ریوایەت کراوە، لە ئەنەسەوە دەڵێ: پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) (اعتكاف)ی گرتبوو (صفية)ی خێزانی سەردانی کردبوو، چونکە کاتەکە شەو بوو پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) لەگەڵی هاتبووە دەرەوە بۆئەوەی بیگەیەنێتەوە ماڵ، لەوکاتەدا دوو پیاو لە ئەنصارەکان پێغەمبەریان بینی ئیتر خێرا بەپەلە ویستیان تێپەڕن، پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) بانگی کردن، فەرمووی: لەسەرخۆ وەرن، بزانن ئەو ئافرەتەی لەگەڵمدایە (صفية)ی کچی (حیی) خێزانمە. دوو پیاوەکە وتیان: (سبحان الله) ئەی پێغەمبەری خودا! کێ خەیاڵی خراپ لەتۆ دەکا؟ پێغەمبەر (صَلى اللهُ عَليهِ وسَلم) فەرمووی: شەیتان وەکوو خوێن بەناو جەستەی ئادەمیزاد دەگەڕێ ترسام شتێك چووبێتە دڵتانەوە.

کەواتە پێویستە پەنا بگرن بەخودا لەزیانی بوختانکەرو دوو زوبانو شەیتان ﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ﴾ ئەوەی خەیاڵو وەسوەسەی خراپ دەخاتە ناو دڵی ئادەمیزادەوە هانە هانەی دەدا بۆ ئەنجامدانی کاری خراپ یان نەکردنی کاری باش، یان دوو زمانیو بوختان دەکا بۆئەوەی دڵی دوو کەس یان دوو کۆمەڵ

لەیەکتر کرمێ بکا.

﴿مِنْ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ﴾ ئەو وەسواسکەرە یان شەیتانی جندۆکەیە، یان شەیتانی ئادەمیزادە، خەیاڵو خەتەرە دەخەنە دڵو دەروونی ئادەمیزادەوە، دڵی بێ ئاگاو خاڵی پڕ دەکەن لە رقو کینە، دوو زمانیو بوختانی جۆراو جۆر هەڵدەبەستن، ئادەمیزادی فیتنەو دوو زمان خۆی دەکاتە دڵسۆزو دەست دەکا بە هەڵڕشتنی درۆو دەلەسە، دڵی کابرای بێ ئاگا پڕدەکا. دەبێ رۆژانە لەم سەر زەوییەدا چەند راپۆرتی درۆو دەلەسە لە شەیاتینی ئادەمیزادەوە بنووسرێ دژی بێ خەتایان!.

دەبێ چەند کەس بەڵکوو چەند خێزانو بنەماڵەو هۆزو عەشیرەتو گەلو نەتەوە ببنە قووچی قوربانی قسەی بێ بناغەو راپۆرتی بەدرۆ هەڵبەستراوی ئادەمیزادی رەفتار شەیتانی؟

چەند ژنو مێرد لێک جیاببنەوەو لانەی خێزانیان لێ تێک بچێ؟ چەند دۆستو برادەر ببنە دوژمنو براکوشتەی یەکتری؟ چەند دراوسێو هاوەڵ دڵیان لەیەکتر کرمێ ببێ؟!

خودایە بەدورمانکەی لە بەڵاو ناخۆشی دونیاو قیامەت، بمانپارێزی لە دەستی دوژمنان، لە بوختانی بوختانکەران لە قەڵەمی لەرزۆکو، زمانی پیسی راپۆرت نووسان، لەنیازی پیسی ئادەمیزادانی رەفتار شەیاتینیو دووڕوو و هەل پەرستو دڵپیسو سپڵەو پێنەزان.

خودایە بە کەرەمو رەحمەتی خۆت بۆ خاتری ناوە جوانەکانت لە تاوانەکانم خۆشبەو قەڵەمی عەفوویان پێدا بێنە لە گوناهی باوکو دایکم خۆشبە، روحم بە مامۆستاکانم بکە، ئەرکو ماندووبوونو شەونخونیم بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە پیرۆزە بکەرە توێشووی قیامەتمو پێناسەی رزگاریو سەرفرازیم (یاربَ العالمین).

**٢٠٠٣/٤/٩**

**مەلا محمود أحمد**

## کۆتـایـی

بەیارمـەتی خـودا لەنووسـینو پاکنووسـی ئـەم تەفـسیرە پـیرۆزە بوومـەوەو پاکنووسـی جزمـی کۆتـاییم کـرد، لـە سـەردەمو رۆژگـارێکی گـرنگو پـڕ کارەسـاتی سـەیرو سـەمەرەو دڵتـەزێن لەڕوویەکـەوەو دڵخۆشـکەر لەچـەند روویەکـەوە. رووداوەکـان پەیوەنـدییان هـەبوو بـە گۆڕانکـاریی لـە عێراقـداو روخـانی دەسـەڵاتی حیزبی بەعسی عەفلەقی فاشیو ریشە کێشکردنی دامو دەزگاکانی رژیمـی (صـدام حـسین)ی فیرعـەون رەفتـاری خۆسـەپێنەری دژ بـە ئیـسلامو موسـوڵمانانو گـەلی عێراق بەگشتی.

لێبوونـەوەم لـەم تەفـسیرە پـیرۆزە هاوکـات بـوو لەگـەڵ روخانـدنی دەسـەڵاتی (صدام حسین) ئەو دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەی کە زیاد لە (٣٥) سیو پێنج ساڵ وەکوو مۆتەکـە سـواری سەرشـانو ملـی گـەلی عێـراق بـوو بـوو، بـە ئـاگرو ئاسـن بـەردەوام خەریکی قەڵاچۆکردنی کۆمەڵانی عێراق بوو بەهەموو چینو توێژەکانیەوە. چەند دەزگای سەرکوتکەری دامەزراندبوون بۆ کوشتنو بـڕینو ئەشـکەنجەدانی رۆڵـەکانی عێراق، سێدارەو فەلاقـەو زینـدانی تاریـکو ژێرزەمینـی سامناکو دادگایی کردنـی رۆتینیو ئیعلامی درۆو دەلەسەو چاوڕاو رۆژ دوای رۆژ لەپەرەسەندندا بوون!!

یاسـاوڵو جـەللادی بـێ ویـژدانو درنـدە ئاسـای بەردابوونـە هاوڵاتیـانو دۆزەخێکی بۆ داخستبوون تەڕو وشکی پێکەوە دەسووتاند!

## کۆتـایـی

لەڕاستیدا رژێمی (صدام حسین) رژێمێك بوو چەندێك باسی درندەیی بکرێ‌و چەندێکی لەسەر بنووسرێ‌و بگوترێ قەترە بەدەریایەو پوشکە بژاردنە لەکایەو هەرگیز لەبن نایە.

رژێمێك بوو دڵی بە فرمێسك‌و خوێن دەگەشایەوە، بەناهو ناڵەی بێ نەوایان بزەی دەهاتێ حەزی لەخوێن رشتن‌و وڵات وێران کردن‌و تۆقاندن بوو!

لەشەڕێك تەواو نەدەبوو پیلانی بۆ شەڕێکی تر دادەڕشت! ئەوەتا لەماوەی تەمەنی (٣٥) ساڵەی ئەم رژێمەدا چوار جەنگی کاولکاریی‌و شووم روبەڕووی گەلی عێراق بووەوە. دەریایەك خوێن‌و فرمێسکی لێ کەوتەوە.

شەڕی ساڵی (١٩٧٤)ی زاینی لەگەڵ شۆڕشی ئەیلولی پیرۆزدا کە بەهەموو جۆرە چەکێك لەگەلی کوردی بێ کەسیدا. ماوەی دوانزە مانگ عەمبارەکانی چەك‌و تەقەمەنی خۆی لەگەلی بێ دیفاعی کورددا بەتاقی کردەوە!

ئەمجار کەهەر زانی کورد چۆك داناداو تۆپ‌و تەیارە کاری تێ ناکا پیلانی نێو دەوڵەتی لە شۆڕشی کورد کردو پەیمانی شوومی جەزائیری مۆرکرد، سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولی پیرۆزو بارزانی نەمر (رێبەری کوردان) لەبەر بەرژەوەندی گەل‌و نەتەوە ناچار بوو بەکۆتا هاتنی شۆڕش لەو بارودۆخەدا رابگەیەنێ‌و بۆ ماوەیەك شۆڕش بلاوە پێ بکا.

خۆ ئەگەر سەرکردایەتی کورد لەوکاتەدا بلاوەکردنی شۆڕشی رانەگەیاندایە، کارەسات بەسەر گەلی کورددا دەهات‌و ئەوکاتە، زۆربەی رۆڵەکانی ئەنفال دەکران! بەڵێ سەرکردایەتی کورد وای بەباش زانی بەشێوەیەکی کاتی شۆڕش رابگرێ، راگرتنەکەش لەبەرژەوەندی گەلی کورد بوو، پەیمانی جەزائیری لەجێدا پوچاندەوە! ساڵێکی پێ نەچوو شۆڕش دامەزرایەوە بەڵام کاریگەری ئەوتۆی لەسەر رژێم دروست نەکرد، بارودۆخە نێو دەوڵەتییەکەش لەبەرژەوەندی شۆڕشەکەی نەبوو، بەڵام هەر هیوایەك بوو بۆ کورد دڵی پێ خۆش دەکرا.

## کۆتـایـی

ساڵ تێومرسوڕانەوە ڕۆژگاری ئابی (١٩٨٠)ی زاینی بەگەرمیی بەڕێ کرا. لەو گەرمایەدا (صەدام)شەڕی بەناحەق دروستکراوی عێراق ئێرانی هەڵگیرساندو پەیماننامەی جەزائیری ونجڕ ونجڕ کرد، ئیتر ئەمجار زیاتر سەردەمی نەدامەتیو نەگبەتی گەلی عێراق بەگشتی دەستی پێ کرد؛ هەشت ساڵی ڕەبەق لاوانی عێراقو ئێران بوونە سوتەمەنی جەنگی ماڵوێرانکەری دروستکراوی (صدام حسین)و بە ملیۆنو زیاتریش کوژراوو برینداڕو شەلو سەقەتو دیلی لێ کەوتەوە.

شان بەشانی ئەو شەڕە دژوارو درێژ خایەنە شۆڕشی کوردیش تێوەگلاو بارودۆخی بۆ ڕەخسا.....!! بەتایبەتی کە لەساڵی (١٩٧٧)ی زاینی ڕژێم دەستی کرد بەوێران کردنو ڕاگواستنی گوندە سەر سنورییەکانی نێوان عێراق ئێرانو بە قوڵایی سی کیلۆمەتر کوردستانی بەهەشت ئاسای کردە ناوچەی یاساغو سوتەمەڕۆ، کانیاوەکانی تەقاندنەوەو گوندو مزگەوتو قسنو نزرگەی پیاو چاکانی کوردستانی بەسەر یەکدا ترشاندنو ڕەزو باخی وەرزێرانی ئاگر تێ بەردا!!

دانیشتوانی ئەو گوندو شارۆچکانەی لەچەند ئۆردوگایەکی زۆرە ملێدا گرد کردەوەو وردە وردە بەگوێرەی نەخشەو پیلانی داڕێژراوو تۆکمە کەوتە وێزەی گەلی کوردو دامو دەزگا جۆراو جۆرەکانی خۆی هاندان بۆ ڕوخاندنی ئەخلاقو ڕەوشتی ڕەسەنی کوردایەتیو پەرەپێدانی سیاسەتی تەعریبو تەبعیث!!

زۆڵە کوردی کردنە چەکاو خۆرو کەوتە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەو ڕوخاندنی ورە لەناخی جەماوەردا. دامو دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی وەگەڕخستنو زیندانی سامناکی ڕابەستنو سێدارەی هەڵخستن، هەرکەسێ بیگوتایە (لەل) کاتێکی بەخۆ دەزانی وا لەچوار دیواری زیندانێکی سامناك دایە.

تا شەڕ لەگەڵ جمهوری ئیسلامی ئێرانیدا گەرم بوایە مەینەتی گەلی کورد پتر دەبوو زیاتر تەنگی پێ هەڵدەچنراو پەتی قەنارە لەملی نزیك تر دەبووەوە، هەتا شۆڕشگێڕانی کوردو هێزی پێشمەرگە زیاتر پەرەیان بەشەڕی سیاسیو پارتی زانی خۆیان بدایە، ڕژێمی بەعس زیاتر سوور دەبوو لەسەر خاپوور کردنی

کوردستان‌و راگواستنی گوندو شارۆچکەکان بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکان‌و بەرفراوانکردنی ناوچە یاساغکراوەکان تا لەساڵی (١٩٨٨)ی زایینیدا گەیشتە چڵە پۆپەو قەڵاچۆکردنی گەلی کوردو خاپور کردنی وڵاتی بەهەشت ئاسای کوردستان لە کیمیابارانی هەڵەبجەو چەند ناوچەیەکی تری داو وێرانکردنی (٤٥٠٠) گوندو شارۆچکەدا رەنگی دایەوە.

ئەنفالکردنی هەشت هەزار بارزانی‌و (١٨٢٠٠٠) سەدو هەشتاو دوو هەزار کوردی تری بێ دیفاع‌و بێ تاوانی کردە سەرباری تاوانە زۆرو هەمەجۆرو فاشیستەکانی!!

ساڵی (١٩٨٨)ی زایینی، عێراق بەگشتی‌و کوردستان بەتایبەتی بەندینخانەیەکی پڕ ئازارو ئەشکەنجە بوو، دەریایەك بوو لەخوێن‌و فرمێسك‌و جگە لەپێدا هەڵدانی دیکتاتۆرو (قادسیە) پیرۆزەکەی هیچ دەنگێکی تر نەدەبیسترا!!

رۆژی (١٩٨٨/٨/٨)ی زایینی بەڕەسمی شەڕی عێراق ئێران راگیرا، عێراق خۆی بەسەرکەوتوو دەزانی (هەرچەند واش نەبوو!) ئیتر دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم ئەوەندەی تر دەستیان بەتاڵ بوو بۆ چەوساندنەوەی کوردو خاپورکردنی کوردستان‌و توندکردنی پەتی قەنارە لەملی رۆڵەکانی‌و کپ کردنی دەنگی ئازادیی.

کار گەیشتە ئەوە خەڵکی کوردستان بەجیددی بیریان لەوە دەکردەوە کەی رژێم دەست دەکا بەڕاگواستنی شاری سلێمانی‌و دهۆك‌و شارەکانی تر بۆ خوارووی عێراق، بەڵکوو بۆ وڵاتانی عەرەبی ترو هێنانی عەرەب لەدەرەوەی عێراق‌و خوارووی عێراق بۆ نیشتەجێ کردنیان لە کوردستان!

تەنانەت لە کۆنگرەیەکی عەرەبیدا لە وڵاتی مەغریب (صدام) بووبەڕووی سەرانی عەرەب گوتبووی من کێشەی کوردەکانم هەیە؛ چوار ملیۆن کوردم هەیە دەمەوێ دابەشیان بکەم بەسەر وڵاتە عەرەبیەکانداو لەشوێنی ئەوان عەرەبم بدەنێ نیشتەجێیان دەکەم لە (شمال الوطن)دا چونکە من بڕوام بەکورد نیە!

## کۆتایی

بەڵێ بەرِاوەستانی جەنگی عێراق ئێران بەعسی فاشی یەك چاو بووەوە بۆ قەلاچۆکردنی شۆرِشی کوردو ویستی ئاسەواریی پێشمەرگە لەهیچ کون‌و قوژبنێکی کوردستاندا نەهێڵێ، بۆیە هێرشێکی پاکتاوسازی کردە سەر دەڤەری خواکورك، هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە لەو ناوچەیە کۆبووبوونەوە، دوایی بەرگرییەکی قارەمانانەی کەم وێنە ناچار بوون بەرەو ئێران پاشەکشە بکەن، ئیتر بەتەواوی کوردستان لە پێشمەرگە چۆڵ بوو، رێگا بۆ حوکمەتی بەعس ئاچۆغ بوو بەئارەزوی خۆی پەل بهاوێ، کیوەکانی کوردستانی کردنە سەنگەرو رەبیە، هێزە سەربازییەکانی لەنگەری تێدا گرت‌و وڵاتی بەهەشت ئاسای کوردستانی کردە دۆزەخ‌و بەهەموو جۆرێك ئیرهابی تێدا پەیرەو دەکرد.

**رەببی موی لێ بێ زوبانی پەنجەکانی هەڵوەرێ**
**هەرکەسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ**

بەلام کوردی گوتەنی ئەوەی لای بەندە خەیاڵە لای خودا بەتاڵە، ئەوە بوو(صدام حسين) لەبوغرایی خۆی لە رۆژی (١٩٩٠/٨/٢)ی زاینیدا هەڵەیەکی مێژووی گەورەی کردو بەدەستی خۆی گۆرِی بۆ رژێم‌و دامودەزگاکانی هەڵکەند، ئەوەبوو لەو رۆژەدا پەلاماری دەوڵەتی کوێتی داو کۆنترۆڵی کردو کردی بە پارێزگای ژمارە نۆزدەی عێراق.

دەستی کرد بەکوشتن‌و برِینی دانیشتوانی ئەو وڵاتەو تالان‌و برِۆ کردنی سەروەت‌و سامانی.هەر لەگەڵ دەنگوباسی داگیرکردنی کوێت لە ئاژانسەکانی دەنگوباسدا بلاو کرایەوە دەنگی نارەزایی لەهەموو جیهاندا دژی (صدام حسين) بەرز بووەوەو دونیای لێ راپەرِی‌و داوایان لێ کرد چی زووە ئەو ولاتە جێ بێڵێ‌و کێشەکانی نێوان عێراق‌و کوێت لەرێگای دانوسانەوە چارەسەر بکرێت.

بەڵام (صدام) سواری گای هار بوو گوێی بەکەس نەدەداو سوربوو لەسەر داگیرکردنی کوێتو تەحەددای جیهانی کرد. ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنسا بەهاوکاریی بیستو حەوت دەوڵەتی ترو بەسەرۆکایەتی ئەمریکا هێزیان لێ کۆکردەوە، شەوی (١٩٩١/١/١٧) ی زایینی دەست کرا بە بۆردومان کردنی شوێنە ستراتیجیەکانی ناو عێراق، لەماوەیەکی کەمو کورتدا لە پەلو پۆیان خست هیچ دەستی بۆ نەکرایەوە.

هەر ئەوەندەی بۆ کرا ئەو فڕۆکانەی مابوونی لەبۆردومان ڕزگاریان بوو هەڵیفڕاندن بەرەو ئێرانو تائێستاش نەگەڕێندراونەتەوە، ژمارەی ئەو فڕۆکانە (١٢٠) سەدو بیست فڕۆکە بوون.

بەڵێ هێرشی هاوپەیمانان دەستی پێ کردو پاش بۆردومانێکی چڕوپڕ لە پەلو پۆخەرو گشتگیر، ئەمجار هێرشی زەمینی دەستی پێ کردو دەستکرا بەدیل کردنی هێزی سەربازی عێراق لەناو کوێتداو ڕاماڵینیو ڕاونانی سەربازانی بۆ ناو خاکی عێراق، ئەم تێشکانە ئابڕوبەرە وای کرد ڕاپەڕین لەخواروی عێرا دژی ڕژێمی (صدام حسین) دەستی پێ کردو لەماوەیەکی کورتدا سەرانسەر شارەکانی باشور کۆنترۆڵ کران.

لەڕۆژی (١٩٩١/٣/٥) ی زایینی لە کوردستانیش ڕاپەڕین دەستی پێ کردو لەماوەیەکی کورتو قیاسیدا کوردستان لەبەعس پاککرایەوە، ئەوەبوو ڕۆژی (١٩٩١/٣/٢٠) ی زایینی زۆربەی زۆری شارەکانی کوردستانی عێراق بە کەرکوکی خۆشەویستیشەوە ڕزگار کرا، هێندەی نەمابوو بەتەواوی هەموو عێراق ڕزگار بکرێو دامو دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی (صدام حسین) سەرنگون بکرێن.

بەلام بەداخەوە لەوکاتەدا کە ڕژێمی (صدام حسین) لەگیانەلادابوو بەرژەوەندی ڕۆژئاوا وا داخواز بوو کە (صدام حسین) ببوژێندرێتەوە، گڵۆپی سەوزی بۆ هەڵکراو ڕێگەی پێ درا ڕاپەڕین سەرکوت بکرێ، هاوپەیمانان وازیان لێ

هێناو چی دی هەڵمەتی هەوایی‌و زەمینییان لەدژ ئەنجام نەدا، ئەمەش کارەساتێك بوو بۆ گەلی عێراق.....

بەڵێ واز هێنانی هاوپەیمانان لەهێرش کردن بۆسەر داموو دەزگاکانی (صدام حسین) کارەسات ڕویدا ڕۆژێکی ڕەش بەربینگی گەلی عێراقی گرت. چونکە لەگەڵ هێرشی هاوپەیمانان ڕاوەستا ڕژێم کەوتە خۆو هێرشی خوێناوی دەست پێ کرد بەرەو باشورو باکور فڕۆکەی هەلیکۆبتەر دەبابەو ڕۆکێت‌و هێزی تۆپخانەو هێزەکانی گاردی کۆماریی لەدانیشتوانی بێ چەك‌و پەنا وەکار خست.

بەدەیان هەزار لەشارەکانی حیللەو نەجەف‌و کەربەلاو بەصرەو عەممارەو شارو شارۆچکەکانی جنوب کوشت‌و بڕ کرد، دەیان هەزاریشی لێ ڕاپێچی بەندیخانەو زیندانە سامناکەکانی کردو خستنیە بەر زەبری ئازارو ئەشکەنجەو بەوپەڕی دڕندەییەوە ڕاپەڕینی جنوبی سەرکوت کرد، ئەمجار شاڵاوی بەرەو باکور هێنا، گەلی کورد بەتێکڕا لەسەرانسەری کوردستاندا لەترسی چەکی کۆکوژی ڕژێمی (صدام حسین)و قەلاچۆکردنی بەسەڵتە زەلامی دەستی کرد بەکۆڕەو بەرەو سنورەکانی ئێران‌و تورکیا، کۆڕەوەکە هێندە گشتی‌و سەرەنج ڕاکێش بوو ویژدانی جیهانی خۆرئاوای هەژاند، دەنگی ناڕەزای دژی قەلاچۆکردنی کورد لەهەموو لایەکەوە بەرز بووەوە.

حکومەتی فەرەنسا داوای ناوچەی ئارامی کرد بۆ گەلی کورد، ئەمریکاو بەریتانیاو وڵاتە خۆرئاواییەکانی تر پشتگیریان لێ کردو ئەمریکاو بەریتانیا بڕیاریان دا گەلی کوردو شیعەکانی جنوب لەدەستی ڕژێمی (صدام حسین) بپارێزن، ناوچەی ئارامیان لەباکورو باشور داناو چەند قاعیدەیەکی عەسکەریان کردە چاودێر بەسەر هێزەکانی (صدام حسین)ەوە نەیانهێشت چیتر درێژە بەتاوانەکانی بدا، ئابڵوقەی ئابوریان خستە سەرو کڕینی ئامێری سەربازیان لێ یاساغ کردو لەگەڵیا کەوتنە ململانێی سیاسی‌و ئابورییەوە، زیاد لە دوانزە ساڵ هێنایان‌و

بردیانو جۆرەها پێشنیارو داواکاریان ئاراستەی (صدام حسین) کردو هەردەمە بیانوییەکی دەهێنایەوە دەیوست خۆی لەو تەنگژە گورچکبڕە ڕزگار بکا.

ساڵی (٢٠٠٣)ی زایینی خۆرئاوا بەتایبەتی ئەمریکاو ئینگلیز گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە جگە لە بەکارهێنانی هێز هیچ شتێکی تر چاری (صدام حسین) ناکا، بۆیە لە مانگی ئازاری دووهەزارو سێدا ئەمریکاو بەریتانیا سەرۆکایەتی هێزی هاوپەیمانیان کردو لە (٢٠٠٣/٣/٢٠)ی زایینیدا هێرشی ئاسمانیو دەریاییو زەمینییان کردە سەر عێراقو بەتوندی لێیان دا، لەماوەی کەمتر لەمانگێکدا دوا شاری عێراق کە شاری تکریت بوو دەستی بەسەر گیراو هەموو شارو شارۆچکەکانی عێراق کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی هێزی هاوپەیمانانەوە، (صدام)و داردەستەکەی لەبەرچاو هون بوونو هەوڵدان بۆ دەستگیرکردنیان لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە تا ئەمڕۆ کە (٢٠٠٣/٤/١٠)یە بەردەوامە. بزانین ئاکام بەچی دەگا؟؟

**مەلا محمود أحمەد**

**٢٠٠٣/٤/١٠**